# خورجەیەک

## لە فۆلکلۆری دەشتی هەولێرو
## چەند واریقات و بابەتی دیکە

عەزیزی مەلای ڕەش

بەرگی یەکەم

هەولێر ٢٠٢٤

چاپی دووەم





* ناوی کتێب: خورجەیەك لە فۆلکلۆری دەشتی هەولێر و چەند واریقات و بابەتی دیکە

* نووسەر: عەزیز مەلای ڕەش

* بەرگ و سەرپەرشتیاری هونەری: عوسمان پیرداود .

* نەخشەسازی: عیسام موحسن.

* چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر.

* تیراژ: ٥٠٠ دانە.

* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی( ٢٥٩٧ )ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە.

**پێشکەشە بە:**

گیانی پاکی مامۆستای خوالێخۆشبوو: "عەلی فەتاح دزەیی"، کە بەم تەرزە هانیدام: "لەو چاوەتە من نەخۆشم و لە توانامدا نەماوە، بەس تۆ دەتوانیت هەرچی فۆلکلۆری ناوچەکەیە لە مردنی ڕزگار بکەیت".

هەر ئەوسات قۆڵ و باسکم توورندیانە هەڵماڵی و درێغیم کەم و زۆر نەکرد و چەند بابەتی گرینگم لەبن کەندووان خستە سەر کاغەز.

بابەتە درێژەکانی ناو ئەم کتێبە بەرهەمی هاندانەکەیە. تەنیا لەم دواییەدا کەمێکم دەستکاری کردوون و بەس.

**سەرایییەكی پێویست**

ئەوانەی لەم كتێبەدا نووسراون هەموویانم بە تێر و تەسەلی و بێ مانەوەی خاپەڕۆك، لە گۆڤارە كوردییەكان بڵاو كردووەتەوە. هەندێكیان زۆر لەمێژە و بۆ هەشتاكانی سەدەی ڕابردوو دەگەڕێتەوە. بە ونبوو لەقەڵەم دەدران. بۆیە هەر نووسەرێك پەنجەی بۆیانی درێژ كردبێت مافی خۆی بووە و بەهیچ شێوەیەك حەرەجی لێناگیرێت. كەچی دوای بڵاو بوونەوە یان لەم كتێبەدا هەركەس بە ئاستەمیش لێیان بدوێت و ئاماژەیان كەم و زۆر بۆ نەكات بە دزی دەخەملێنم.

نووسەر

**چخامیر:**

(چخامیر): خۆی لە قەرەی سەت ماڵ دەدا و نیوەیان بە "فەلاحەتی" و کشتوکاڵ و مەڕدارییەوە بەڕێوە دەچوون. نیوەکەی دی "ئاوخۆرەوە".

بەڕاستی میللەتی کورد بۆ هێندە شتان ناوی پڕ بەپێست هەڵبژاردووە. ئەمەش بەڵگەی زیرەکی و لێزانی بووە.

"ئاوخۆرەوە" بەو کەسانە دەگوترا، کە لە ئاواییدا فەلاحەتیان نەبووە. واتا لە خاکی گوندەکە هیچ سوودیان وەرنەگرتووە. تەنیا ئاو نەبێت.

ئەمانەش کەمێکیان بە "عەتاری" و "بەقاڵی" و "قەسابی" و "ئاسنگەری" و "دوکانداری و....." دەیانگوزەراند. قارەمەندی ڕەنجبەری. "ڕەنجبەر = جوتیار و سەپان و شوان و...." تەنیا ماڵی ئاغا و ئێمە نەبێت سایەوەی بەرسێبەر. ئەوانی دی بەبتوونی ساڵ دوازدە مانگ ئارەقەی ڕەش و شینیان بۆ گوزەران دەردەدا.

ئەوسا باراشی دوازدە مانگ لەماڵ بووایە خاوەن ماڵ پشتی دڵنیایی خۆی دەکردەوە.

ئاغا بەناوی تاپۆی زەوییەوە موڵکانەی "٢٠٪" سەتابیست، کە پێیدەگوترا: "بیستی چار" بەرهەمی ڕەنجی خەڵکەکەی قەلۆش دەکرد. کەچی ئێمەی ماڵە مەلاوەك "کوندەبۆ" بە حەز و خوایشتەوە بۆمانیان دەهێنا ماڵەوە.

***

چخامیر = چەغەمیرە. ئەو گوندەیە لێی پەروەردە بوومە.

**کەندی کەندێناوە:**

ئەو کەندە لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات ئاواییەکەی بۆ دوو بەرشەق کردبوو. بەری باکوور و بەری باشوور.

ڕێگەی گشتی پێچەوانەی کەندەکەوە: لەباکوورەوە بەرە و باشوور. دێیەکە بووبووە چوار گەڕەکی گەورە.

گەڕەکەکانیش بەهۆی تیرە و بەرەبابی جیاجیا هەر یەکەیان چەند گەڕەکێکی بچووکی لێ ببوەوە.

گەڕەکی: "سنجاویان، شێروانیان، کارەوانان، باغەمرەییان، قیتان. مەلۆکان، ئاغا"

ماڵی ئێمە لەسەر لێوی باشووری کەندەکەبوو. شوێنەکەی چەند مەترێك بڵند بوو. لەگەڵ دوو ماڵی دیکە، بەیەکەوە نووسابوون و داوێنی باکووری خۆرئاوای گەڕەکی ئاغا بوو. زۆرجار ئاوی کەندەکە دەهات، هەرکە بگەیشتبووایە دیواری حەوشەی ئێمە دوو سێ ماڵی لەوبەر دەبرد.

ساڵێك کەندەکە شوانێکی گوندی "لاوەر"ی بە مێگەلەوە، لە قەدی چیای "قەرەچوغ"ەوەی هێنا و بەیانی لە نزیك گوندەکە مانەوە، بەهۆی پرچییەوە، دەرویش بوو، لەژێر لیتە قوڕی ڕۆخ کەندەکە دۆزرایەوە.

ساڵی "١٩٤٦" ئەگەر لێم نەبێتە درۆ سەرەوەی ئاوی کەندەکە بە بارستایی چوار پەنجە زیاتر تەزرەبوو. ئەوسا عەمرم "١٠" دە ساڵان بوو باشم بەبیر دێت. چەند جار گۆڵم لێ پڕ دەکرد و دوو سێ قلم دەخوارد و ئەوی ترم فڕێ دەداوە.

ئەگەر زۆر بهات بووایە حوشتری بەبارەوە دەبرد. هەفتەیەك زیاتر نەدەپساوە.

***

**خەڵکەکە دووشتیان بەزۆر لە خوا دەستاند:**

یەکەم: ئاو. بیری "١٨" هەژدە بەژن قوول بوو. دەبووایە "تۆپە کندڕ" و "دەولك" و پەلە دەولك و "بەکرە = گرگرە"ی تایبەت بکرێت. جگە لە ئەوەش بیرەکە دەبووایە دوو "قانات" و "کەروکە"یەکی بۆ درووست بکرێت، بەولاخ و گوێدرێژ، یان کۆمەڵە کەسێك رابکێشرێت.

رۆژێك دوو خۆشناو دەیانەوێت وڵاخیان ئاو بدەن. یەکیان سەری کندری بە دەولکەکەیەوە بوو لە تەنگەی خۆی دەبەستێت و رایدەکێشێت. دەولکیش ئەوسا بەلا کەمیەوە نێو تەنەکە ئاوی دەگرت. لەنیوە رێدا تاقەتی راکێشانی لەبەر دەبڕێت و بە هاورێکەی، کە لەبەر بیر وەستا بوو دەڵێت:

- کورە چاوانم تۆقی دەبلێ: یاللا.

ئەویش دەڵێت:

- کورە چ بڵێم: یاللا وا هێشتا لە تەپانی بنیدایە.

ئاوایی یەکە لە "٢٠" بیست بیری زیاتر هەبوو، ئاوی زۆربەیان تاڵ و سوێرێکی وا هەرگیز بە کەلك خواردنەوە نەدەهات. تا هەندێکیان ئەگەر لە زەوی ڕوو کرابووایە سپیی دەکرد. تەنیا بە کەڵك رێژە و پێژە دەهات. ئاوی پێنج شەش بیران تۆزێك شیرین بوو. بۆ شیو و کوڵ و چایە و خواردنەوە لەبار بوو. لەوانە بیری "فاتە سۆرێ. قادر کارەوان. برایم کارەوان. شەریفە قیت. نووری حاجی مستەفا. سمایل خەزال. عەولارەش. مام خول. حاجی مەحموود. حاجی تەها". نەخەسەلە ئاوی ئەمەیان لە هەمووان شیرینتربوو. رۆژ تا ئێوارە جیرەی دۆلابی لەسەر دەهات و مرانی زۆربەی خەڵکەکەی بەجێ دەهێنا. ئەوجا ئاوەکەی نە کەمی دەکرد، نە شێلوش دەبوو. ئەویش هەرتاڵ بوو، بەڵام لەچاو شلان پەیت بوو.

لەبەر ئەوە شیرناوی بیرەکان سابوون کەفی باش پێنەدەکرد، بۆیە کە باران دەباری و کەندەکان پڕ ئاو دەبوون، بەڵگە نەویستیشە ئاوی باران شیرینە و سابوون کەف باش پێدەکات، ئافرەتانی ئاوایی لە رۆژانی سامالی وەرزی زستان و بەهاردا دەچوون کۆڵیان لە دەشت دەکرد.

***

**کۆڵکەری کەندی قەپقەپۆکان:**

**پێشکەشە بە:**

- کۆڵکەرانی کەندی قەپقەپۆکان، ئەو دایك و خوشکانەی کە لە ژیاندا ماون. بەتایبەتی "رابیحە" خانی پلکە "عەیشێ".

***

ئاوڕێژی ڕێگای نێوان شاروچکەی "دیبەگە" و "مەخموور"، بەری خۆرهەڵات تا دەگاتە بەرزایی گوندی "کەندالّ" و ئاوی گوندی (خدر جیجە) و (چیغلۆك) خڕیان لە کەندی (دێمەکار) دەکەنەوە و بەرەو گوندی تایەن مل دەنێن. لەبن ئاوایی بەرەو خۆرئاوا کەندەکە پێچ دەکاتەوە. نزیکەی (٥٠٠) پێنج سەت مەترێك ڕاست و ڕاست ڕووە و (قیبلە) تا چەند ماڵێکی گوندەکە، لەڕۆژهەڵات بەجێ دەهێڵێت. جا ڕوو لە گوندەکە دەکاتەوە. لەبەر ئاوایی چەند مەترێك ئاوی کەندی (چیا) = ئاوی گوندی (لاوەر) و (حاجی شێخان و....) و بەرزایی ڕۆژهەڵاتی چیای گۆڕین تێی دەکاتەوە. ئاوەکەی بە قەدەر نیوەی ئاوی کەندی دێمەکار نەدەبوو، کەچی لەبەر ئەوەی لە لێژایی دەهاتە خوارەوە ئاوی کەندی تایەنی، تا تەوژمی کز دەبوو رادەگرت. کەندە پێنج سەت مەترەکە ناونرابوو: کەندی (قەپقەپۆکان). قەپقەپۆك دڕکێکە بڵندی بەقەد بنە (خڕنووك) و (حوشترالووك) نابێت، بەرێکی هەندێ گێوژ دەگرێت. تەرزی (دەبدەیە). ناوی بۆش و ڕەنگی پەمبەی سپییات. هەرکە پیربێت سپی هەڵدەگەڕێت. ئێمەی منداڵ ئەوسا توند لەنێوچەوانی خۆمان دەدا و لەگەڵ تەقینیدا شەقەی دەهات. تۆباتیش پێماندەگوت: (شەقشەقە).

نێو کەندەکە قووڵ و ئاوی زۆر ڕادەگرت.

ئافرەتانی ئاوایی سبیانەیەکی سامالّ، بەتایبەتی لە سەرەتای کڕی بەهاردا ڕۆژ درێژ و گەرم و باراناویش زۆر دەبوو بەرەو کەندەکە دەچوون. سووتەمەنی بە زۆری (قشپل) بوو.. و بابەتی کۆڵ (مەنجەڵ) (پەقرەج) و (تەشت) و (جام) و (چۆغان) و (سابوون)ی خۆکردیان لەگەڵ خۆیان دەبرد.

(چۆغان) گیایەکی بەهارییە و پەلکی وەك کەرەوزە و دوای وشکبوونی دەکوترێت و کەف دەکات و شمەکی پێ دەشووررا.

(سابوون)ی خۆکردی: دۆن و (قرێشان) و (قسڵ) و پەلکەلیمۆیان دەکوڵاند، تاکو وەك لۆلکەی لێدەهات: (حەوشۆکە)یەکی بچووك، تەرحی خانووچکۆڵەی منداڵان، بەقوڕی چوار پەنجە بڵند و درێژی و پانی نزیك مەترێك لۆلکەکەی لەنێو ڕوودەکرا. هەرکە سارد دەبووەوە و تۆزێك پەیت دەبوو بە (سیکارد) خەتخەتیان دەبڕی و بە بەرەواژییەوەش. ئەوجا لێدەگەڕان تا تەواو وشك دەبووەوە. (١٢) دوازدە، تا (١٦) شازدە سەلکە سابوون دەچوو.

***

لەرۆخ کەندەکە قۆرتێکیان لێدەداو سێکوچکەیان دادەمەزراند و مەنجەڵە زنجیرداری پڕ ئاویان لەسەر دادەنا و ئاگریان دەدابنێ. نەدەهێشترا مەنجەڵەکە بێ ئاو ببێت. هەرکە قیچەکی لێ سەرف دەکرا خێرا بە سەتڵانیان پڕ دەکردەوە.

***

لە هەوەڵەوە شمەکەکانیان، کە زۆر دڕوون و چڵکن بوون بە هەڵپشافتنی دەستی خاوێن نەدەبوونەوە، بە (شوونك) دەیان کوتا، دەشووشت. دوایی سەری منداڵان و خۆیان.

کەندەکە لەبن ئاوایی بوو، بەڵام شوێنەکەی نەدیوبوو. بەهۆی بڵندبوونی دووکەڵەوە دەزاندرا چەند کولکەرن.

نێر لە منداڵی شەش، حەوت ساڵان بترازێت قەدەغەبوو. ئەو ڕۆژە، پیاو مەگەر بە کارێکی گەلەك زەرووری دەنا بە نزیکیاندا ڕەت نەدەبوو. زۆربەی ئافرەتەکان یەك کراسییان هەبوو، کە دەشووررا، ناچار دەبوون تا وشك دەبووەوە بە ڕووتی گوزەر بکەن. تەنیا پیرێژنە کامڵەکان لەبەر بەدینی چارۆك = (بەرامپیلیان) لەخۆ دەوەراند.

من بەبیرم دێت لەنێو ئاوی کەندەکە شەڕە ئاو دەکرا. نەخەسەلە کیژە عازەبەکان.

جارێك دووان منیان چەندجار لەناو ئاوی کەندەکەیان نقوم دەکردم و دەریان دەهێنامەوە. ئەوکات زۆرم لەدڵ گران بوو. کەچی ئەمڕۆ بەو ئاخیرییەی عەمرەوە هەرکە دێتەوە بیرم شادی دامدەگرێت و خۆزگە دەخوازم دووبارە بێتەوە.

دایکم لەنێو تەشتە ئاوی دانام. سووی ئەو ڕۆژانە ساردبوو لە سەرمان دەلەرزیم، ناوە ناوە بۆ گەرمبوونەوەم، جامە ئاوی گەرمی پێدا دەکردم. بە لیفکە و سابوونی خۆکردی دەست و لاق و پشت و تا گەڵ و گوانیشمی شوشت. کراسەکەم هێشتا وشك نەبووەوە خوشکەکەم جاحێڵ بوو، خێرا چوو کراسەکەم هیشك بکاتەوە. زانی بە هەڵگێڕ و وەرگێڕی بەر هەتاو پێڕاناگات، لەبەر گڕی ئاگری بن مەنجەڵەکەی هیشك کردەوە. هەرکە کراسەکەم لەبەر کرد چووم لەناو قۆرتێکی بانەگر، تا بەتینی ڕۆژ گەرمبوومەوە دانیشتم.

***

* شونك دارێکی تایبەتی دروستکراو نزیکەی (٥) پێنج پەنجە پان و درێژییەکەی بستێك و ئەستوورایيشی بە ئەندازەی چوار پەنجە دەبوو... و دەسکەکەشی خڕ بوو.

* قرێشان = کرێشان گیایەکە.

* قسل = بەردێکە ورد دەکرێت لەگەڵ قرێشانیان دەکوڵاند و دەبووە سابوون. بەردەکەش بە سووتان دەبێتە گێچ.

***

* چارۆك، چارۆگە: دوو جۆر بوو:

یەکەم: قوماشێکی تەنکی سادە، یاخۆ ڕەنگاوڕەنگ و گوڵداری لاکێشی بوو. درێژییەکەی بە ئەندازەی باڵای ئافرەتەکە. لایەکی بەرینەکەی دەخستە بان سەری و لچەکانی لەبن گەردەنی گرێ دەدان. گرێیەکەی تیز و فیز

هەڵدەخست لەملی خۆی هەڵدەکێشا. دەبووە هۆی ڕاگرتنی چارۆگەکە و بزرکردنی کڵاو و دەسرۆك و هێزاری سەرو ئەوی تر بە پشتیدا شۆڕ دەبووەوە و کراس و کورتەك و کەوای بەری دادەپۆشت.

دووەم: چارۆك، بەزۆری (بەرامپیل)ی پێ دەگوترا. ئەمەیان دوو جۆر بوو.

أ- قوماش بوو، بەزۆری چاوپانی سپی بوو. تاکو زوو پیس نەبێت بە (خم) ڕەش، یان شینیان دەکرد. چوارگۆشە بوو. دوو سەری بەیەکەوە گرێ دەدران و ئافرەت بە ملی خۆی شۆڕ دەکردەوە. بەجۆرێك گرێیەکە دەکەوتە سەر شانی راستەی و چارۆگەکەش بەلای چەپییەوە شۆر بووەوە. کاتی ئیش و گزووژدا شمەکەکانی بەری لە پیسی دەپاراست، لەلایەکی دیکەوە کاتی پێویست شتی پێهەڵدەگرت.

ب-چارۆکە (بووزی) بوو. واتە وەك رانك و چۆغە لە (مەرەز) درووست دەکرا و بە (کر) ناو دەبردرا.

***

**بیر لێدان**

بیری ئەو گوندە (جەغەمیرە)ی ئەمن لێی بووم نزیکەی (١٨) هەژدە بەژن قووڵ بوو. واتە (٣٠) سی مەتر دەبوو.

لەبەر قووڵی هەموو کەس نەیدەتوانی لێی بدات. بیر لێدەری تایبەت هەبوو.

بیراز = (ئەندازە)ی (بەرین)ی دەبووایە: جێگەی دانیشتنی یەك کەس بێت. ئەگەرنا تەواو نەدەبوو.

وەستا گولینگ و چەمچەیەکی پێبوو. کڵاوێکی وەك خودەی عەسکەری، لەبەر هاتنە خوارەوەی پلوکە بەرد و گرمتە کەستەك لەسەر بوو.

وەستا لەکاتی لێدانی بیردا چۆکی چەپی لەسەر عەردی دەنوشتاندەوە. ئەوەی ڕاستەش قیت.

نێوان هەردوو چۆکی بۆشاییەکی (٤/١) یەك لەسەر چواری عەردی بیرەکە بوو.

هەرکە تۆزێك خۆڵ پەیدا دەبوو، بە چەمچە هەڵیدەدایە پشت ئەو لاقەی لەسەر عەردی بوو.

لەسەرەوە بە کندڕ و دۆڵاب جۆرکێکیان: (تورەگە) بۆ شۆڕ دەکردەوە. ئەویش خۆڵەکەی پشت ڕانی بە چەمچەکە تێدەگرت و دەیگوت:

– یەڵڵا.

واتە: هەڵکێشە.

ئەوەی سەرەوەش هەڵیدەکێشا.

هەرجارێ چوار پێنج پەنجە ناو بیرەکەی قووڵ دەکرد و لەگەڵیش دەسووڕا. واتە بەچوار کەڕەت (دەستێکی لێدەدا).

(ئەگەر لێم نەبێتە درۆ بەژن بە نیو دینار لێدەدرا. لەو دواییەدا بوو بە دینارێك، نووسەر).

هەرکە دەگەیشتە تەڕاتی وەستا تامی دەکرد و دەیزانی ئاوەکە تاڵە، یان شیرین. ئەگەر ئەمەیان بووایە داوای مزگێنی لە خاوەنەکەی دەکرد. ئەویش ئەو ڕۆژە خواردنێکی باشی دەدایە. خۆ ئەگەر سوێر بووایە بە نابەدڵیەوە دەیگوت:

– تاڵە.

پاش تەڕاتی کونە ئاوی سەرچاوە پەیدا دەبوو.

وەستا بۆ ئەوەی ئاو کارەکەی نەوەستێنێت بە پەڕۆ.. و پاتاڵ توندی دەگرت. ئەوسا لەشی سەرتاپا دەبووە قوڕاو. کە دەهاتە دەرەوە دەتگوت (هرسە).

***

**پاراو:**

پاراوی بیر ئەوەیە، نزیکەی بەژنێك زیاتر لەخوار یەکەم سەرچاوە لێ بدات و چەند سەرچاوەی بێتەوە سەر و دوا ڕۆژ هیشك نەکات. هەرکە بیرەکە تەواو دەبوو کونەکانی دەکردنەوە و لەچەند لاوە ئاو شۆڕەی دەکردە بنی بیرەکەوە.

***

**وەستای باش:**

وەستای باش = (بیرلێدەر)ی باش و چازان لەسەری هەتا بنی بیرەکە ئەندازەی بەرینی و تەسکی وەك یەك دەكرد.

شوێن گوڵینگەکان لە دیواری بیرەکە (ڕێ ڕێ) دیار بوو. ئەگەر زەوییەکە (قەسپۆك) بووایە شوێنەکان دەبریسکانەوە و هەتا ساڵێك دوان ئاولێهەڵێنجان هەر دەما.

***

**جۆری بیری ناوچەکە:**

یەکەم: لەڕووی قووڵیەوە: سێ جۆر بوو.

أ- بیست و سێ بەژن قووڵ.

ب - یەکدوو باڵ قووڵ.

پ - دەسهەڵێنج.

دووەم: لەڕووی لێدانەوە دوو تەرز بوو:

أ- بیری دەستکردی خۆماڵی هەروەك باسکرا.

ب - بیری گاور کار:

ئەو بیرەبوو نەدەزاندرا کەی و کێ لێیداوە و دەگوترا: (گاور کارە): واتە (کەسانی کافر لێیداوە).

زۆر بیرم دیوە قولی (٣٠) مەتر لە بنی ڕا هەتا لێواری دەرەوەی بەکەرپوچ گەورە هەڵێنرابوو... دەیانگوت: (گاور کارە).

***

**بیر دەحیلێنێت:**

بەدەیانجار وام بەرگوێ کەوتووە، بەڵام بەچاو نەمدیوە دەگوترا: (بیر هەیە دەحیلێنێت).

وام دێتەوە زەین، ئەگەر لێم نەبێتە درۆ، جارێك گوتیان (بیری کەندێ) حیلاندیتی.

ئەو بیرە لەڕۆخ کەندی ئاوایی لێدرابوو... و هەر جارێ کەندەکە بهات بووایە پڕ ئاو دەبوو. بیرەکە هی ماڵی ئاغا بوو.

لەمێشکی خەڵکی ئەو زەمان چەسپابوو (بۆیە دەحیلێنێت خوێنی دەوێت). واتا پێویستی بەخوێن هەیە و ئەگەر بە زووترین کات خوێن نەڕژێتە ناوی، ئەوسا هەر بنیادەم، یان زیندەوەرێك نزیك بکەوێت لێ نێو دەروونی خۆی بکێش دەکات. واتە دەیکوژێت).

ئەمەشم بیستووە بەچاو نەمدیوە: بیر حیلاندیتی و مریشکێکیان لەسەر لێواری سەربڕیوە و بە خوێنەوە فڕێیان داوەتە ناو بیرەکەوە).

***

**چوونە ناوبیر:**

هەر بیرێك لە ئاوایی تۆژەن لێ بدرا بووایە، هەرکە دەگەیشتە ئاو مەراق دایدەگرتم و دەمبووایە بە قاڵدرمانی بچمە خوارەوە و دوو سێ گۆڵم ئاویم لێ فڕ دەکرد. ئەوجا دڵم دادەکەوت، بۆیە ترسم لە چوونە ناو بیر شکابوو. بیر هەبوو لەبەر ئاو لێهە لێنجانێ لێواری پێشەوەی ڕما بوو... و ببووە لەغەم = "گەوەڕ". هەموو کەس تاسای نەدەکرد لەسەر دەرگاکەی ڕاوەستێت و دەولکە ئاو... وەرگرێت. کەچی من بە تەنیا، بەبێ کندڕ دەچووم کێشکە و کۆترەشینکەم لە گەوەڕەکانی دەردەهێنا.

هەر شتێك بکەوتبووایە ناو بیر من دەچووم دەرم دەهێنا. تاکو جارێك "بەکرە"ی بیری ماڵی مام "حاجی مەحموود شێروانی" کەوتە ناو بیر. بە قسەی خوالێخۆشبوو: مامۆستا "حاجی مەلا عومەر"ی کوڕی بە رووبەێك بە دوو کندڕ منیان شۆڕ کردەوە. تەنیا یەکەمجار کە دەگەیشتمە ئاوەکەی دەترسام و... واشم دەخەملاند: ئاوەکە ماری تێدابێت. بۆیە نیومەتر دەما بگەمە ئاوەکە دەمگوت: "بەس". ئەوانیش شۆڕکردنەوەکەیان ڕادەگرت.

گڕگڕەکە زۆر لە جەستەی من قورستر بوو... و دەرم هێنا و پارەکەشیان نەدامێ.

***

**دۆلاب**

**ئاو هەڵێنجان لەبیر**

دەولك ئەوسا لاستیك، یان موشە مابوو، یا خۆ پێستە. چوار قەفیزی بۆ دەكرا و هەر چوار سەری پەلە دەولكیان لێ شەتەكدەدرا. كندرِ لەناوەندی پەلە دەولكەكە دەیەخرا و بۆ ناو بیر شۆرِ دەكرایەوە. سەری دووەمی كندرەكەی لەتەنگەی ولاخ یان گوێدرێژ دەبەسترا و یەكێك سوار دەبوو.

ئەوەی لەبەر بیرەكەی دەوەستا كندرەكەی بەرز و نەوی دەكرد تاكو دەولكەكە پرِ ئاو دەبوو. ئەوجا بە دۆلابچییەكەی دەگوت:

- یاڵلا.

واتە برِۆ.

سوارەكە لێیدەخورِی هەركە دەگەیشتە سەری كەركێشەكە و دەولكەكە وەدەردەكەوت، ئەوەی بەر بیرەكە دەولكەكەی دەگرت و دەیگوت:

- یاڵلا

واتە بگەرِێوە. سوارەكە دەگەرِاوە، هەتا دەهاتەوە تەنگەی گوێدرێژەكەی لەگەڵ كەرووكەی بیرەكەی دەكردە یەك.

**دووەم: سووتەمەنی**

سووتەمەنی ئاوایی ئەوسا، لە ئەمانە بەدەر نەبوو: "قشپل و كا و قەسەڵ و سەرگین و پنچك و پەرِۆشە و گۆگەم و قەلۆغان و شتی تر".

هەرماڵێك لە وەرزی ساردیدا قشپلی هەبووایە پاشا بوو، باشترین ئاگر كە شانازی پێوەدەكرا ئاگری سۆبای بە قشپل بوو.

مەرِدارەكان هەیانبوو بەس بۆ سۆبە و ئاوگەرمكردن و شیولێنان و چایە قشپلیان بەكار دەهێنا. دڵیان نەدەهات نانی پێ بكەن. بەشیشی نەدەكرد. خەڵكەكە نانیان بە كاوكۆت و زبڵی سەر گوفەكان دەكرد. ئەوسا لەبەر ئەوە دەرِاسە نەبوو. قرشە بە جەنجەرِ دەكوترا ناو ئاوایی و سەر گوفەكەكان ئەم تەرحە سووتەمەنییەیان زۆر بوو.

ئاو خۆرەوەكان مەگەر كوو دەنا قشپلیان دەست نەدەكەوت. ساڵێ یەك دوو هەوێزیان دەماڵی ئەویش هەر بەشی دوو هەفتەی دەكرد.

ئێمە ماڵە مەلا بووین هەوێزمان لەبران بوو. مەڕدارەكان لێكرا بێبەشیان نەدەكردین. زۆر جاریش شوانەكانی ئاوایی دوو سێ شەوان "شەو بەكێو"یان لە شوێنێكی ناو ئاقار بۆ ڕادەگرتینەوە. من و دایكم و خوشكێكم و دوو ژنی دراوسێ: تایبەت "پلكە عەیشێ، ڕابیحە خان"ی كچیمان لەگەڵ خۆمان دەبردن.

دیاریمان بۆ شوانەكان دەبرد. ئەویش بە ئەندازەی دوو پرتەقاڵ "خۆرما"مان دەكردە سەرك و لەئاردما وەردەدا و لەگەڵ دوو نووردییە نانی گەنم. باشترین دیاری ئەوسا بوو.

دوو سێ تێڕكە و جەواڵ و خرار و گوشە قشپلمان دەهێناوە.

وێڕای ئەوەی گوتمان خوشكێكی زۆر ئازام هەبوو. دوو سێ ساڵ لەمن بە تەمەنتر بوو: "فاتم"ی ناو بوو. هەركە وەرزی بەهار دادەهات ئەمن و ئەو بە سواری گوێدرێژ دەچووینە نكاری چیای "قەرەچوغ" سەرگینمان خڕ دەكردەوە. ئەو ڕۆژەش سایەدی گاڕانمان دەكرد. لە هەر كەرخێك دەلەوەڕا، بۆ بەیانی زوو دەچووین. هەر جارێ تێڕكە و گوشێكمان پڕ دەهێناوە.

گوندەكانی دەوروبەرمان بیلبتون گاڕانیان هەبوو تەنیا گوندەكەی ئێمە نەبێت. ڕەنگەی خوا غەزەبی لێگرتبێت.

***

**خانوو**

خانوو لە ناوچەكەدا زۆربەی هەرە زۆری "جزیری" بوو.. و تاك تەرا (شارستانی).

بابێین جارێ باسی ئەمەیان بكەین.

خانوو شارستانی بەم شێوەیە بوو:

(سەری ڕێزە كاریتەی لەپاڵ یەكتر و نێوانیان نزیكەی بیست، سی سەنتیمەتر دەبوو. پاشدان شەقرەیان لەسەر ڕێز دەكرا. ئەوجا كە بەر و

قەسەڵ. بە قورێکی بێ (کا)ی ئەستوور، بە پەستان و بێ مارنج سواق دەدرا. ئەمە (قورە پەست)ی ناو بوو: سەرەکەی قۆرت قۆرت بوو. هەرکە هیشك دەبووەوە، قورە پەستەکە، لەبەر بێ کایی دەرەزی گەورە گەورەی لێ پەیدا دەبوو. ئەوسا بە قورێکی پڕکا و خوساوەی دوو ڕۆژان مارنجێکی ئەستوور دەکرا. قوڕی دووەم کەلێنەکانی قورەپەستەکەی پڕ دەکردەوە. واتە دەبوونە یەك قوڕ و بە هیچ نەوعێك لە یەکتر نەدەپچڕان. ئەوجا لە تەنیشتێکی خانووەکە (قاڵدرمە)ی بۆ درووست دەکرا و شەوانی هاوین لە سەری دەنووستن.

***

لەو دوایی یەدا کەبەر نەما و بووە قامیش و حەسیر. پاشدان لەجیاتر شەقرە تێلیان بەکار دەهێنا. تاك لۆکیش شەپکەیان بە بزمار لە کاریتەکان دەدا.

**خانووی جزیری:**

لە خانووی خۆمان شارەزامە و جزیری بوو. واتا لای درێژی لە بەرینی نەویتر بوو. دیوارەکەشی جزیری بوو. (خشتی بە درێژی لێدرابوو). نەك بە پانی. ئەمەیان (شارستانی)ی پێدەگوترا. سێ چاوە بوو. یەکیان سەرەکی و دوانیان لابیانە. خانووی جزیری کاریتەیەکی ڕاست و ڕاست دەخرایە بان سەرتیلەکان و شەقرەیان لەملاو لەولا دەهاتەوە سەری. ئەمە (دارە ڕێ)ی ناو بوو.

درێژی خانووەکەمان نزیکەی (٦) شەش مەتر دەبوو. یەك کاریتەی نە دەگەیشتە ئەم سەر و ئەوسەر، (پرد)ێکی زۆر لە کاریتەکان ئەستوور تر، لەناوەڕاستی ژوورەکاندا بوو. دووکاریتە، سەری هەر یەکەیان، لەسەر بەرزایی (سەر تیلە)کان بوو، سەرەکەی تریان لەسەر پردەکە.

چاوەکانی دیش هەر بەو نەوعە. شەقرەکانی بەرەواژی کاریتەکان لەسەر ڕایەڵ کرابوون. شەقرەکان لای ئەستووریان لەسەر دیواری خانووەکە بوو.

سەرەکەی دیش لەسەر کاریتەکان. نێوان هەر شەقرەیەك لەگەڵ شەقرەیەکی دی نزیکەی (٢٠) سەنتیمەتر دەبوو.

***

چەند کەسی خەڵکی ئاوایی چوون لەدەشت کە بەریان بەم چەشنە هێنا: گوێدرێـژیان لەگـەڵ خۆیـان بـرد، لەگـەڵ داس و شـەنەیەکی ئاسـن. هێشـتا تەرەکتەر پەیدا نـەبووبوو دەور و بـەری مـاڵان پـڕ کـە بـەر بـوو. بـەداس لـە بنەوەیان دەبڕی و بە شەنە دەیانخستە سەر پشتی کەر. لەبەر ئەوە، کەبـەر دڕ بوو بە کورتان وە دەنووسا و بەستانی نەدەویست. بەم شێوەیە هەتا کەر بیتوانیبووایە لێیان بار دەکرد. هێنانـە خوارەوەشـی ئاسـان بـوو. بـە دەوی شەنەی لایەکییان بڵند دەکرد و بە لایەکەیدیان ئاوا دەکرد.

***

**قەسەڵ**

چەند ئافرەت لـۆ قەسـەڵ چـوون. هـەر یەکـەیان پشـتییەك قەسـەڵی بـەم تەرحە هێنا:

لە هەوەلەوە قەسەڵ بە داسووکە لەناو پـەرێزدا خـڕ دەکـراوە سـەر یـەك. ئەوجا ئافرەتەکە گوریسی لەسەر عەرد دادەنا و باوەش باوەش قەسـەڵەکەی دەخستە سەر گوریسەکەوە و بە داسووکە دەیپەستاوە، هەتا باش دەچـووە بار یەك. ئەوسا گوریسەکەی لە ناوەڕاستی قۆمەتـە قەسـەڵەکەی تونـد تونـد گرێدەدا. سەرێکی ئەملاو سەرەکەی دی ئەولای پێدەبەستا. بەهۆی بەستانی لە هەر چوار لاوە قومەتەکە توند ڕا دەوەستا. ئەمـە بـە "پشـتییە قەسـەڵ" ناو دەبردرا. لەو جێیەی هـەر دوو سـەری گوریسـەکە لەیـەك گرێـدرابوون کـە ناوەڕاستی پشتییەکە بوو ئافرەتەکە سەرەکانی بـە قولفەکـە لـە ملـی خـۆی هەڵدەکێشا و لە بنی ڕاست دەبووەوە و بۆ ئەوەی قولفەکەی بن گەردەنی لە ڕێگادا نەبێتەوە و ڕیسەکەی لێ نەبێتەوە خـوری چـەند زلـە قەسـەڵی لەبـەر قولفەکەنا. ئەم قامکە قەسەلە بچووکە بە (خەسولکە) ناو دەبردرا. واتە کـوو

خەسوو هەتا مردن یەخەی بووك بەرنادات، دەسکە قەسەڵەکەش هەتا دەرنەهات بووایە قولفەکە نەدەبووەوە.
پشتییەکە نییوەی لەسەر پشتی ئافرەتەکە بوو، نیوەکەی دی لەسەری ڕەتدا بوو.

***

هەر کە (کەبەر و قەسەڵ) بای خانووەکە پەیدا بوون دوو پیاو چوونە سەر دیواری خانووەکە، دووی تریش لە خوارەوە کەبەریان بە شەنە لۆ ئەوانی سەر خانوو بڵند، دەکرد. ئەوانیش بە شەنە لێیان وەر دەگرتن. لەبەر تیژی دڕکی کەبەرەکە، کەس نەدەوێرا دەستی لێ بدات، یان بەپێ بچێتە سەری. هەتا دارە ڕێیەکە بە کەبەر دادەپۆشرا، بەس بە پشتە شەنە دەبەستراوە. ئەوجا ئەوانەی خوارەوە بە پەتێك، یان گوریس ناوەناوە ئامێزە قەسەڵیان دەبەستاو بە نووکی شەنە لۆ ئەوانەی سەرەوە بڵند دەکرد، یان بەدەست تێیان هەڵدەدا. ئەوانەی سەرەوە هەرکە بە دەستیان دەگەیشت، پەتەکەیان دەکردەوە و قەسەڵەکەیان لە پێشە خۆیان ڕوو دەکرد و بەشەنە و دەست پەرتیان دەکرد و دەیان پەستاوە و جابەپێ بەسەر دەکەوتن. ڕۆژی دوایی تەواو بوونی هەراشەکە بە قوڕ سواق دەدرا. کەبەر و قەسەڵەکە هەراش (هەلاش)یان پێدەگوترا.

***

**سواقدان:**
ماڵی هەندە گەڕەکی گوندەکەمان لەپاڵ یەکتر بوون و جێگە نەمابوو خۆڵی لێهەڵبقەندرێت. ناچار خۆڵیان لە دوورەوە بە تێرکان دەکێشاوە و ئەوجا دەیانکردە قوڕ.
ماڵی ئێمە خۆڵمان لە پشت حەوشەمان، ساکە گۆڕ و چۆڵ بوو هەڵدەقەناند و کامان تێدەکرد و بۆ بەیانی زوو دۆلابمان تێدەخست و یەکێك سواری کەری دۆلاب دەبوو. یەکێکیش دەولکی وەردەگرت. کەسێکی دیش

بە (تێڕ)ی مشەما لەسەر پشتی گوێدرێژ دادەنا و ئاوی بۆ قوڕ گرتنەوە پێدەکێشا.

هەر یەك لە قونکی لای پێشەوەی تێڕەکە کونێکی بچووکی چەند سەنتیمەتر هاتبوونە دەرەوە و پەلە دارێکی تایبەتیان لۆ درووست کرابوو. لە جیاتی (قەباخ) لە کونەکان دەندران ئاویان نەدەدا.

پەلە دارەکان، بۆ ئەوەی لەکاتی قوڕ گرتنەوەدا بزر نەبن بەداوە بەن لە لێواری کونەکان بەسترابوون.

کەسی بەر بیرەکە هەر جارێ ئاوی دەولکەکەی لەنێو کۆڵی بیرەکە ڕوو دەکرد. هەتا ئاو کێشەکە بەخۆ... و کەر و تێڕە ئاوی لۆ قوڕ دەبرد و دەگەڕاوە کۆڵەکەی پڕ ئاو دەکرد. نە دەوەستا و یەکسەر بە تەنەکە، یان پەقرەج تێڕەکەی پڕ دەکرد. ئەگەر لە کۆڵەکە نەکرابووایە، بەدەولك دەولك، تا تێڕەکە پڕ دەبوو زۆر تاخیر دەبوو. تێڕەکە ئاوی بەهۆی هەڵقۆز هەڵقۆزی گوێدرێژەکە لە دەرکەکانی دەڕژا و کونەکانیش پشك پشکیان لێدەهاتە خوارەوە، ڕێچکەی تەڕ بوونی زەوی هەتا دەگەیشتە لای قوڕەکە دیار بوو.

ئاو کێشەکە گوێدرێژەکەی لە قوڕەکەی زۆر دەبردە پێش. هەندەجار هەر دوو دەستی دەکەوتنە ناو قوڕەوە.

هەر دووکون بەیەکەوە دەکرانەوە و ئاو بەگوڕ دەردەهات.

خۆڵە هەڵقەنراوەکە بارستایی لایەك، لایەکەی دی قۆرتی زەوییەکە بوو ئاوەکە گۆمی دەبەستا. یەکێك، یان دوان خێرا خێرا قوڕیان شل شل دەگرتەوە و ئەو جابە پێیان، بۆ ئەوەی گرمتی خۆڵەکە بخوسێتەوە گێرەیان لەناو دەکرد. بەم تەرزە قوڕ دەگیراوە.

***

خۆڵی گوندەکە خۆڵە سۆر بوو. ئەو تەرحە گڵەش ئەگەر کای زۆر تێنەکرێت و باش نەخوسێتەوە، هەرکە هیشك بووەوە دەرز دەدات و جێیەکەی بەردەدات.بۆیە دووەم ڕۆژ قوڕەکە شل دەکراوە.

ئەو ڕۆژەی خانووەکەمان هەراش کرا قوڕەکە دوو ڕۆژ بوو گیرابووەوە. بۆ بەیانیی سێیەم ڕۆژ هەنۆب شل کراوە.

دوو سێ زەلام چوونە سەر خانووەکە. هەتا لەکاتی سواقداندا قەسەڵی هەراشەکە لەبن پێیان و تەوژمی لگەنە قوڕەوە، لەجێی خۆی نەخزێت شەغرەیان لەبن پێی خۆیاندانا. کاریان پەستان و لووس کردنی قوڕەکە بوو.

زەمانی زوو مارنج نەبوو. بەبنی قاپی قوڕەوە لووس دەکرا.

یەکێك تەنیا عائیدی قوڕ شل کردنەوە و خۆش کردنی بوو. کوڕە جاحێڵێکی بەجەم و لێزان لەتەك دیواری خانووەکە وەستا و دوو سێ منداڵ بە قاپان قوڕیان لۆ دەبرد و ئەویش هەر جاریَ لگەنە قوڕێکی بۆ کوڕە جاحێڵێکی وەك خۆی لەسەر لێواری خانووەکە بوو تێهەڵدەدا و ئەویش لە سەربان دەیگرتەوە.

لەبەر هەراشەکە ئامە شۆی قاپە قوڕ بردن و بۆش هێنانەوە نەدەکرا. بگرە دوو سێ کەس بەڕێز وەستابوون و لە جێگەی خۆیان نەدەجووڵان قاپە قوڕ دەست بەدەست دەچوو هەتا دەگەیشتە وەستاکان.

لگەنە بەتاڵەکە دەست بە دەست دەگەڕانەوە. ئەگەر شوێنەکە قیچێك دوور بووایە. ئەگەرنا: لۆ ئەوەی قاپە قوڕەکانی دەقۆستەوە و دەهاوێشت و ئەویش دوو سێ یەکی لەناو یەکتر دەنان و بۆ ئەوەی خوارەوەی دەهاوێشت، یان یەکە یەکەیانی تێهەڵدەدا ناو قوڕەکەوە.

وەستاکان هەرکە پێشەخۆیان بە ئەندازەی مەترێك تەواو دەکرد شەغرەکەیان نزیکەی مەترێك دەهێنا پاشەوە. ئا بەو شێوە خانووەکە قوڕ دەدرا.

***

قوڕدانی سەری خانووی کۆن واتە قوڕ لەسەر قوڕ بدرابووایە منداڵ قاپە قوڕیان لەسەربان تەرحی خوارەوە دەکێشاوە و بەتاڵیان دەهێناوە.

***

بۆ ئەوەی باران کار نەکاتە سەر دیواری خانووەکە سواندەیان لە هەر چوار لایدا لۆ درووست دەکرد و باراناوی پێدا دەهاتە خاورەوە.

هەندە سالّ لە وەرزی زستاندا شەو هەبوو سەر لە ئێوارە باران بووە و پاشان ئاسمان بووەتە سامالّ و دنیای دەبەستا و سواندەکان: (بلوورە = چلوورە) یان پێدا شۆڕ دەبووەوە و دەگەیشتە عەردی. لەبەر ئەوە خانووەکەمان ڕووە و کوێستان بوو بلوورەی هەتا ڕۆژی دواییش نەدەتواوە. من چەندین جار لە نێوان دیواری خانوو... و چلوورەکان هاتوو چۆم کردووە.

هەر وەکو گوتم: (زۆربەی خانووی گوندەکانی ناوچەکە جزیری بوون. قوڕی سەری تەنك بوو و مندالّ، یان ئاژەلێك بەسەر بکەوتبووایە دەقەپا و باراناوی ڕانەدەگرت. لۆیێ سالآنە، ناچار لە وەرزی پایزدا بە تەنەکە قوڕێك سواق دەدراوە.

***

**سواندە:**

سواندە = پاسار = پاسارە، سوانە، گوێسوانە = لێواری سەری خانوو. بە ئەندازەی بستێك دەبوو. (بە بۆچوونی من ئەگەر لێم نەبێتە درۆ — چونکە تەواوم لەیاد نەماوە، لە دەشتی هەولێر سواندە تایبەت بوو بە لێواری بانی خانووی جزیری، سواندەی خانووی شارستانی (گورگە)ی ناو بوو. لە هەندە گوندان سواندە بۆ دیواری حەوشەش دەکرا تاکو باران کاری لێ نەکات و شەوان دەعباش پێ هەلّنەگەڕێت ئەمەش گورگەی ناو بوو — نووسەر).

***

**نان خواردن:**

هەرکە لێدەبوونەوە، دەست و چاو و پێیان دەشوشتن شمەکیان هەر بە قوڕ بوو شیویان لەلایەن کابانی مالّەوە ئامادە کرابوو. نیسك، یان دانەوکی بە سلق بوو. کەچی ئێمە لەبەر ئەوە گوزەرانمان خۆش بوو: خانووەکانیشمان زۆر بوون (سێ ژووری مالّەوە و چوار خانی دیکە) خەلّکەکە

بە سـواقدانیان زۆر مانـدوو دەبـوون شـێوی پـلاو بـرنج بـە گۆشـتی دوو سـێ مریشکەوە دەدانێ.

***

**دالان:**

ژوورێکی بچووك و دەرکەی حەوشەی بـە سـەرەوە بـوو. ئـەملا و ئـەولای هۆلی ولاخان بوو. ئەمەش لە ماڵە ئاغا و دەوڵەمەند و خاوەن ولسات هەبوو. سەکۆیەکی یەك کەسی، بلندی نزیکەی مەترێکی لێ کرابوو.
لە ماڵە ئاغان (ناومالّ) ئەو پیاوەی لە ژوور و حەوشـەی ئاغـا کـاری دەکـرد، شەوان لە سـەری دەنووسـت. کەچـی لـە ماڵـە دەوڵەمەنـدان شـوان لـە سـەر دەنووست.

***

**قەمتەرە:**

قەمتەرە بە دوو مانا دێت:

یەکەم: بەر گرتنی جۆگەلە ئاو، بە چین و چین و قات قاتی بـەرد و شـتی تر، هەتاکو ئاوەکە بە هێواشی بڕژێتە نێو کێلگەکەوە.

دووەم: ئەو دەرگایەی سەر بە دالان بوو.

دەرگا هەبوو دوو دەری، یان یەکێکی گـەورە. لـە هێنـدە مالانـدا بـەرمیل بوو. بە بزماری گەورەی جەنجەڕی لە دار کوترابوو. لە هێندە مـالانیش داری پتەو بوو. ئەویش بزمار ڕێژ کرابوو.

***

**قۆچ:**

هەندەمالێ، تایبەت ڕاوچی دوو قۆچی کەلـەکێوی لەسـەر دەرکـەی ژووری ماڵەوە، لای دەرەوەی دابوو. ئەملا و ئەولای دیـواری دەرگاکـە نـەینۆکی لـە قوڕ چەسپ کردبوو.

***

ڕۆژئاوای بنەبانێ ژوورە سەرەکییەکەیان کتێبخانەیەکی بەرینی (٨٠)سم و درێژی (١٢٠)سم بوو. لە سەرەتای سییەکانی سەدەی ڕابردوودا خوالێخۆشبوو: (حاجی محەمەد نەجاڕ)ی گوندی (عالڵا)، ئەوسا ماڵی ئێمە و ئەوان لە ئاوایی (دێمەکار) بوو درووستی کردبوو. هەشتا ساڵە ئێستاش ماوە.

بەرەو ڕۆژهەڵاتی سەندووقی نوینان و دوو دەری بوو. پڕی وردەواڵە بوو. تایبەت کەل و پەلی لەبەر کردن.

چوار جامی تێگیرابوو. جامێکیان وێنەی (ئیمامی عەلی) و دووەم (بۆراق) و سێیەم (تاوس) و چوارەم ڕەنگاوڕەنگ. سەرەوەی هەرزاڵەی نوینان. نوینەکان دوو: (بەستەك) بوو. بە چوار شەوی تەنك و ڕەنگاوڕەنگ ڕەنگی (کەشکۆڵ)ی داپۆشرابوون. ئەم جۆرە دەستوورەش تەنیا لە ماڵی ئاغای گوند هەبوو.

زاوییەی خۆرهەڵاتی (قوناگردان) بوو. مەتر و نیوێك وێرەوەی کەرەستەی تەون بوو.

هەموومان، تەنیا باوکم نەبێت لەوژوورە دەنووستین.سەرمان لە خۆرئاوا بوو... و پێشمان لە ڕۆژ هەڵات.

***

هەروەکو گوتم ژوورەکە دوو (لابیانە)ی بەسەرەوە بوو. هەریەکەیان بۆ ڕووناکی دەلاقەیەکی (٥٠ × ٥٠)سم، جامی بێ ئیتار تێ گیرابوو. خۆرئاوای ژووری باوکم بوو. ئەویتر (زەخیرە). بنەبانێی ئەمەیان (هەرزاڵە)ی زەخیرە بەم شێوە بوو: سێ دیواری بەرزی (٤٠)سم لێکرابوو. سەرەوەیان شەقرە و شەپکەدار بوو. هەمبانە (ساوار) و (بڕووش) و (گەنمە کوتا) و (نیسك) و (برنج)ی لەسەر بوو. ژێرەوە پیازی تێدابوو. زۆرجار مریشك هێلکەی لەسەر پیازەکان دەکرد.

بن ساپیتە = (بن میچ)ی ژووری ناوەند و خۆرهەڵات دەقەلای تێدابوو. زۆرجار من کۆترم تێیاندا پەروەردە کردووە.

***

مانای ئەم وشانە:

١- سەرتیلە: بەرزترین دیوارە لە خانووی جزیری.

٢- هەرزاڵە: بەم مانایانە دێت:

أ- کەپری ناوبستان ورەز.

ب - کەپری داری لەسەر نووستن.

پ - ئەو سەندووقەی پێخەفی لەسەرە.

ت - ئەو شوێنەیە لە ژووری زەخیرەدا هەمبانە و شتی زەخیرە تێکراوی لەسەرە = شوقە لەت.

٣- کەشکۆل = لێرە مەبەست جاجمی بە نەخشە

***

خۆرهەلاتی ژووری ماڵەوە (زەرووری) = (ئاودەست) بوو.

دیواری باشور و خۆرهەلاتی دوو مەتر دەبوو. دیواری باکووری خانوێکی گچکەبوو. پێشتر گوێدرێژمان لێدە بەستاوە. پاشدان لەبەر پیسی و لە ژووری ماڵەوە نزیك بوو بۆنی میز و قەرسەقولی دەهات، خانوێکمان لە تەك دەرکەی حەوشە، بۆ گوێدرێژان درووست کرد. ئەم خانووە چۆل مابووەوە. باکووری (سەرگیندان) بوو. ژووری تایبەتی قشپل و سەرگین و پنچك و پەرۆشە و دارودوی سوتەمەنی بوو، بۆ وەرزی ساردی. پاش ئەو (نانەدین) = (مەتبەخ)ی وەرزی گەرمی بوو. لەکاتی گەرمادا نان و شێوەی لێدەکرا.

***

**نانەدین:**

ژووری نانەدین = "مەتبەخ"ی وەرزی ساردی لەگەڵ ژووری نووستن یەك خانوو بوو، بەس هەریەکەیان لە "لابیانە"یەك بوو. لەوەرزی ساردیدا بۆ گەرمی نان لە ژوورەوە دەکرا. شیویش لەسەر سۆبا. بە گەرماش لە حەوشە یان لە ژووری — نانەدینی هاوین.

خۆشترین جێ ئەوسا دانیشتنی ناو "قورناگردان" بوو. لەکاتی سەرما و سۆڵدا. بەر هەموو منداڵێك نەدەکەوت.

ئێمه ئەوسا دوو برا و دوو خوشکی فەراقە بووین. هەریەکەمان بەیانیان لەگەڵ هەستانی دایکمان بۆ نان کردن، یان شەو بەترپێکی دەما لەبن جێ قووناگردانمان بەم شێوەیە گڕدەدا:

"دایه سبیانێ ناو قووناگردان لۆمنه".

- ئەویش دەیگوت:

"باشه ڕۆڵه باشه".

ئەو دەستوورەش دایکم دابنابوو. تاکو گەورە نەتوانێت گچکە دەربکات.

ئەو ڕۆژە ناو قووناگردان، بێ گێر و گرفت بەر ئەوەمان دەکەوت کە زووتر لۆخۆی گڕدابوو.

ئای چەند خۆشبوو: هەرکە لەناو کاو کۆتی قووناگردان دادەنیشتم و جاروبار لە تەنانێك، یان پارچە ئەستووکێکی گەرمم دەخوارد. هێندەجاریش دایکم پەپۆکەی تایبەتی بۆ دەکردم. دووکەڵی ئاگری "کا" زۆر تێژ بوو. هەرجار چڵم و ئاوی دیدەم تێکەڵ دەبوون و شۆڕابەیان بەملاو بەولای ڕووم دەبەست. نۆبەتان چڵمەکەم هەڵدەکێشاوە و نۆبەتیش بەسەر دەستەی کراسم فننەم لێوە دەهێنا و دەم سڕیەوە.

من منداڵە مەلا بووم دایکیشم مەلا ژنێکی ئیش جوان و خاوێن بوو لەزۆربەی منداڵانی هاوڕێم پاك و تەمیزتر بووم.

منداڵ هەبوو لە یەك تاقە کراسی پتر نەبوو. ئەوەندەی چلم و لیکاوی بەسەر دەستە و قۆڵە کراسییەوە دەسڕیەوە، سابوونیشان زۆر کەم تاکو نووزوو بیانشوشت بووایە پێوە ڕەق دەبووەوە. هەرکە تیشکی ڕۆژی لێدەدا، لە دوورەوە دەبریسکاوە.

منداڵ هەبوو، (بن هەنگڵ)ی کراسی، یاخۆ کورتەکی بەری ڕشك و ئەسپێی پێوە دیار بوون.

ڕشك هێلکەی ئەسپێ بوو. کە دەردەهات بانگۆلەی ناو بوو. منیش بن هەنگڵی خۆم بە ڕشك و ئەسپێ دیوە، بەڵام دایکم زوو شمەکەکانمی لەنێو مەنجەڵی ئاوی دەکوڵاندن و ئەوجا لەبەر هەتاو هەڵیدەخست.

من چەند جار لەدیار وەستاوم: (زستانان بەری کورتەکی منداڵ و گەورانیان لەسەر گڕی ئاگر ڕاگرتووە و بەبەری دەست حێل لە پشتە کورتەکەکانیان دەدا و قرچە قرچی سووتانی ئەسپێ لەنێو ئاگرەکەوە دەهات[1].

***

دایکم هەرکە دەیدیتم بە دووکەڵ حاڵم شڕە، بەڵام جێگاکەم گەرمە و سەرمام نابێت دەیگوت:

– قەیدیناکات ڕۆڵە، قەیدیناکات، هەرچەندی دووکەڵت زۆر لۆ بێت قازانج دەکەیت و لەوسەری دەستگیرانت جوان دەبێت دەسگیران).

ئەگەر بەم قسەیە بووایە خێزانی من دەبوایە وەك فریشتەی بەهەشت جوان بووایە. کەچی بەداخەوە چ واش دەرنەچوو.

***

بەردەمی ناندینەکەی دەرەوە جۆگەی ئاوڕێژی بارانـاو بوو. دیواری باکووری لەگەڵ دیواری حەوشە و خۆرئاوا یەك دیوار بوو و بەرزی دیوارەکە، بەرەو دەرگای حەوشە دەچوو دوو مەتر پتر بوو.

دەرگاکە لە تەنەکە و شەپکەدار و تەژە درووست کرابوو. بەرینی دوو مەتر و بەرزیشی سێ (٣) مەتر و سەرتیلەشی هەبوو. بارە دەغڵی بە سواری هێسترەوە پێدەچووە حەوشە.

خۆرئاوای دەرگا خانووی گوێدرێژ و بەرەو باکوور تا دەگەیشتە (عەمبار)ی دەغڵ. بۆ ئەوەی مشك نەتوانێت کونی بکات لەسەر خشتی (تی)ی بنیات نرابوو. خشتەکە وەك پێچکە وابوو. لە ڕواڵەتی دەرەوە یەك عەمبار بوو. کەچی لە سەرەوە دوو دەرکەی هەبوو. یەك گەنم و ئەوی دی جۆ. لە ژوورەوە بەناوبڕە کرابووە دوو چاوە. پشت عەمبارەکە تا دەگەیشتە دیوی حەوشەی خۆرئاوای ژووریماڵەوە، حەوشەیەکی گچکە بوو. ئاخوڕیشی لێ

---

[1] ئەمە ژیانی ئەو سەردەمە بوو، بەڵام ئەو کەسانەی واریقاتی ژیانی خۆیان نووسیوەتەوە و باسیان کەم و زۆر نەکردووە، ئەوە خوێنەر دەزانێت.

درووست کرابوو. ئەمەش بۆ دابەستی و بەرخە کۆرپەمان، مەڕدارەکانی ئاوایی بەهاران دەیاندایێ، تێیدا بەخێو دەکرد.

حەوشەکەمان نزیکەی ٣٠سی بە سی ٣٠ مەتر دەبوو. لەبن حەوشەی دەرەوە سەکۆیەکی یەك مەتر بڵند و بەرینی دوو مەتر و درێژی نزیکەی ١٠ دە مەتر دەبوو. بە خۆڵ پڕ کرا بووەوە. بە قادرمە بەسەر دەکەوتین. شەوی هاوین لێکرا لەسەر دەنووستین. باوکم لە پەڕگەی لای دەرگای حەوشە بوو، دایکیشم لە پەڕگەی دی. کوورەکان لە کەرخی باوکم و کچەکانیش لە کەرخی دایمکم دەنووستین.

***

**تەون و تەونکاری:**

سەرابیەکی پێویست:

لە سەرەتای سییەکانی سەدەی ڕابردوودا تەونکەر، لە ناوچەی کەندێناوە بە دەگمەن هەبوو. ئەویش بەڕەی ساکار و نەخشین و جەوال و خرار و تێڕ و تێرکە و تور و ملآکدان و هەگبە و خورجە بوو. مافوور نەبوو. کەچی دایکم مافوورێکی لەساڵی "١٩٣٤"دا دروست کردبوو. ڕەنگەکەی دەرمان "ڕۆنیاس"ی تێکەڵ کرابوو. و سپی نەدەبووەوە و تان و پۆشی تەنك نەبوو بوو. لەگەڵ چەند کەل و پەلی دیکە دامانە ئاوارەکانی بەحرکە و جەژنیکان.

خوشکێکم لە "١٩٤٤"دا بە نەخۆشی گرانەتا وەفاتی کرد، لەسەر دەستی دایکم فێرە تەون بوو بوو. تا مرد چەند مافووری ناو جێ و سەرنازی دروست کرد.

پاشدان خێزان و دوو کچم تەونکەر بوون. کەواتە من لەنێو تەون و تەونکاری و بەن و ڕیسدا ژیاوم و هیچ شتێکم لەم نووسینەدا لەملا لەولا وەرنەگرتووە. هەمووی لەماڵەوە فێر بوومە. باوەڕناکەم ئەمڕۆ لەشاری هەولێر و دەوروبەری بە قەدەرە من لە کەرەستەی تەون و بەن و ڕیس و ڕەنگەکانی شارەزاتر هەبێت. هەندێ لە ناوەکانم لەیاد نەمابوون لەدایکی منداڵانم پرسیار کردووە.

***

مانای چەند وشەیەك:

١- تەون = ڕایەڵی مافوور و بەڕ و جەوال بەدارەوە بێت بۆ تەنین.

٢- تەونکەر = کەسێکە، مافوور و بەڕ و جەواڵ و شتی تر بە تەون درووست دەکات.

٣- تەونکەری = ئیش و کاری تەون.

بەشی یەکەم:

جۆرەکانی بەن کە لە مافوور کردندا بەکار دەهێندرێن:

١- خاوك:

ڕێسراوی خورییە بۆ یەکەمجار.

٢- کشت: دوو خاوکە بەیەکەوە بادەدرێنەوە تا کشت دەبن.

ئەمەش دوو جۆرە:

أ- پشتەك: تۆزێك باریکە و بەکەڵك جاجم و دووگوردیش دێت.

ب - فرێت: لە پشتەك ئەستوورترە.

٣- دوولارە:

دوو داوە خاوکە، بەبێ بادانەوە، بەیەکەوە هەڵ بکرێنەوە، یان بە ئاستەم بایەکی بدرێتێ.

٤- سێتا:

بەنێکی ئەستوور و کشتە. لەسێ داوە خاوکی ئەستوور، یان دوو داوی زۆر ئەستوور پێك دێت.

سێتا زۆربەی لە (پەتە) درووست دەکرێت، یاخۆ لە (ڕونگ) نەك لە خوری.

لەسێتا ئەستوور تر بێت پێیدە گوترێت "پەت = پەتك".

٥- خرێنە:

ئەمە وەك سێتا وایە، بەڵام لە موو درووست دەکرێت نەك لە خوری.

***

بەشی دووەم:
کەرەستەکانی تەون و مافوورچنین ئەمانەن:
١- سمتەك:
دوو داری تایبەتن و درێژیان دوو مەتر پترە. سەریان بە ئەندازەی "٣٠" سی سەنتیمەتر دوو گۆییە: "دوو لق"ە. چەند سەنتیمەترێك لەسەرەوەی بنکیان کونکراون. نزیکەی "١٥"پازدە سەنتیمەتر لە زەوی دەچەقێندرێن. بەجۆرێك کونەکانیان دوو سێ سەنتیمەتر زیاتر لە زەوی بەرزتر و بەرامبەر یەکتر بن و لە سەرەوەش گوێیەکانیان.
٢- بنەتان:
دارێکە هەردوو سەری دەخرێنە ناو کونی سمتەکان و چەند سەنتیمەتر لە زەوی بەرزە و بەبەنی سێتاش پێچراوە.
٣- سەرەتان:
دارێکە ئەم سەر و ئەو سەری دەخرێنە ناو گوێی سمتەکان.
٤- ڕایەڵ:
چەند هەودایەکی "فرێت"ە، کە(پۆ)ی مافووری لێدەتەندرێت. فرێت دەزووش دەبێت.
ڕایەڵ چنین بەم تەرزەیە: "دوو سینگ بەرامبەر یەکتر دەچەقێندرێن. ماوەی نێوانیان بە گوێرەی درێژی مافوورەکەیە.
وەستا ژن لەلای سنگێك دادەنیشێت. سەری گلۆڵە بەنە فرێتەکەی کە دەیکاتە ڕایەڵ بەدەستەوە دەگرێت و گلۆڵەکەی دەداتە دەست منداڵێك.
منداڵەکە گلۆڵەکەی دەبات لە سینگەکەی ئەوسەر دەیسوڕاندەوە و بۆ وەستا ژنی دەهێناوە.
وەستا ژن لێی وەردەگرت و لەگەڵ بەنێکی دی کە پێی دەڵێن: "بن ترنە"، لە دواییدا باسی دەکەین، لەپشت سینگەکەی لای خۆی دەیهوناندەوە و دەیداوە دەست منداڵەکە. منداڵەکە دیسان گلۆڵەکەی دەبردە ئەوسەر و دەیگەڕاندەوە.

ئافرەتەکەش لەگەڵ بن ترنەکە وەك جاری پێشوو دەیهونانەوە. بەم جۆرە تاکو ڕاچنینەکە تەواو دەبوو.

لەگەڵ هەر سووڕانەوەیەکدا، دوو داوە ڕایەڵ پەیدا دەبوو: یەکیان دەکەوێتە ئەملای سینگەکان و ئەویتر ئەولا.

ئەو دوو داوە کە پێیانەدە گوترێت "گورد و شێرە" هەموو جارێ لەناوەڕاستی سینگەکان بەیەکەوە دەخرێنە نێو قولفەیەکی سێتای باریك. کە ناو بە "کێسرە" دەبردرێت. لەمەودوا باسی دەکەین.

هەرکە ئافرەتەکە دەستی لە ڕاچنینی ڕایەڵەکە بەربوو، لە سینگەکانی دادەکەلێنێت. ئەوکات ڕاستی سنگەکەی ئەوسەر لە سەرەتانەکە هەڵدەکێشێت. بن ترنەکەی بەخرێنە مووێك لە سێتای بنە ئانەکە دەدوورێت.

ڕایەڵەکە ئەوسا دەبێتەوە دووچین:

**أ- چینی پێشەوە پێیدە گوترێت "شێرە".**

**ب-چینی پاشەوە بە "گورد" ناو دەبردرێت.**

ڕایەڵەکە لە سمتەکەکان درێژترە و شۆڕ دەبێتەوە. بۆ ئەوەی لەگەڵ درێژی سمتەکەکان ڕێك بکەوێت تەونکەرەکە چین چین هەردوو ڕایەڵەکە = گورد و شێرە" لەسەر پشتی سەرەتانەکە بە قولفانگە لە یەکیان گرێ دەدات.

**٥- گە:**

بریتییە لە "٨" هەشت داوە ڕایەڵ "٤" چوار گوردە و "٤" چواریش "شێرە" یە.

مافوورەکە بە حیسابی "گە" ڕادەچیندرێت. تەسك ترین مافوور لە "٣٥" سی و پێنج گە کەمتر نابێت.

واتە "٨ × ٣٥ = ٢٨٠" دوو سەت و هەشتا داوە ڕایەڵە.

**٦- چێرگ:**

پاشماوەی ڕایەڵە دوای مافوور بڕین. ئەوکات "گە" ناوی نامێنێت "چێرگ" جێیدەگرێتەوە.

٧- بن ترنه:

ئەو بەنەیە کە لە ژێرەوە هێڵی بەیەکگەیشتنی ڕایەڵی گورد و شێرەیە و یەکەمجار مافووری لەسەر دەست پێدەکرێت.

٨- دار گورد:

لەبەرینی تەونەکە درێژترە و لە سمتەکانیش ڕەتدەدات و لە باسکی مرۆڤ ئەستوورترە و بە سێتایەکی باریك پێچراوە و لە پێشەوە ڕایەڵی گوردی پێ بەستراوە. بەهۆی ئەو دار گوردەوە ڕایەڵی گورد دێتە پێشەوە لەگەڵ ڕایەڵی شێرە تێکدەپەڕێت.

گریمان ڕایەڵەکان جوان تێز و فێز نەکەوتن لەئاست قەدی سمتەکەکان لنگە پێڵاوێك، یان شتێکی تر دەخرێتە ژێر ئەمسەر و ئەوسەری دار گوردەکەوە تاکو بێتە پیشەوە و ڕایەڵی گوردەکەی لەگەڵ خۆی بهێنێتە پێشتر.

٩- کێسرە:

پەتێکە دەکەوێتە سەرەوەی دارگوردەوە هەردوو داو، دوو داوی ڕایەڵەکە، یەك گورد، یەك شێرە لەیەك دەبەستێتەوە و تێکیان دەپەڕێنێت.

تەونکەر بەهۆی ئەو کێسرەیە ژمارەی گەیەکانی لێ تێکناچێت.

١٠- زەمۆمە "یان" سپێر:

پەلەدارێکە دوای بەستانی ڕایەڵەکان بە سەرەتان و بنەتانەوە، بە توندی لەسەرەوە بنەتانەکە، لە کونی سمتەکەکان دەکوترێت. تاکو بنەتانەکە دابکەوێت و ڕایەڵەکە توند بێت.

١١- قامیش:

قامیشێکی تایبەتە لە خوار کێسرە و لەسەرەوەی دار گوردە و دەکەوێتە نێوان ڕایەڵی گورد و شێرە. بۆ ئەوەیە تیز و فیزی نێوان هەردوو ڕایەڵەکاندا بەزێنێتە خوارەوە. لە دواییدا لێیدە دوێن.

١٢- نەزانمە:

داوە بەنێکە لەجێگەی قامیشە و تەونکەری نەزان بەهۆی ئەو داوە بەنەوە بەهەڵە ناچێت و دەزانی قامیشەکەی بخاتە جێگەی خۆیەوە.

١٣- گوفك:

قولفێکە هەردوو داو دووداو، یەك گورد، یەك شێرە لەم سەری مافوورەکەوە بۆ ئەو سەر، لەیەك دەبەستێتەوە. گوفك بە زۆری خاوکی ڕەنگاوڕەنگە. دوو لا ڕەش دەبێت.

١٤- تێوەڕێخ "یان" پشت:

بەنێکە دووجار لەنێوان گورد و شێرەوە، لەسەر هەموو ڕێزە گوفکێك ڕایەڵ دەکرێت، تاکو گوفکەکان هەڵنەوەشێنەوە. تێوەڕێخ بەزۆری بەنی پشتە. هەندە جار دوو لارەش دەبێت.

١٥- بەر:

کە مافوورەکە بڵند بوو.. و گەیشتە نزیك سەرتانەکە، بەر دەدرێتەوە. واتە فولفەی ڕایەڵەکان لەسەر پشتی سەرەتانەکە دەکرێنەوە و دروومانی بن تڕنەکەش دەپچڕێنن. مافوورەکە ئەوەندەی کراوە لوول دەدرێت و دەخرێتە لای پشتەوەی تەونەکە. تەنیا نزیکەی پێنج پەنجە نەبێت دووبارە چنینەکەی لەسەر دەکرێتەوە. ئەویش بە خرێنە موو لە سێتای بنە تانەکەوە دووبارە دەدوورێتەوە. ئەوکاتە بن تڕنە دەوری نامێنێت. مافوورەکە ئەوەندەی لوول دراوە پێیدەگوترێت "بەر"، مافوور هەیە دوو بەرە، هەیە سێیە و هەتا پێنج بەریش دەبێت.

١٦- پیشك:

شتێکە سەرەوەی دارە. وەك دەسکە خەنجەر وایە. ژێرەوەی دارێکی پانە، یان ئاسنە. هەشت نۆ ددانی ئاسنی هەیە و مافووری پێدەکووترێت. بۆ ئەوەی لەکاتی کۆتاندا دەنگی خۆشی لێوە بێت سێ چوار پوولەکەی بەملا و بەولاوەی یەخرا بوو.

١٧- ڕتۆك:

داره، یان ئاسنه لەشێوەی دەستی مرۆڤە، سێ تا چوار ددانی هەیە. کلکەکەی باریکە. لەنێوان هەردوو ڕایەڵەکە تێوەرێخی دادە بەزێنتە سەر گوفکەکان، تاکو بکەوێتە بەردەمی پیشکەوە.

١٨- ساکار:

بە ئەندازەی چوار پێنج سەنتیمەتر، بەبێ گوفك تەونی ساکار، تەرزی بەڕەی ساکار یەکەمجار لەسەر بن ترنەکە دەکرێت. بۆ ئەوەی لەدوا ڕۆژدا ئەگەر بن ترنەکە بپسێت گوفکەکان هەڵنەشێنەوە.

ئەو تەرزە ساکارە لەلای سەرەوەش کاتێك کە مافوورەکە تەواو دەبێت دەکرێت.

لە تەونی ساکاردا تەنیا تێوەرەێخ دەوری دەبێت.

١٩- لێوار:

بە ئەندازەی ئەستوورایی پەنجەیەك لێواری مافوور بە بەنی دوولارە، لە هەردوو لاوەی بەگرێ چن بەبێ گوفك دەچندرێت. بۆ ئەوەی ببێتە پاڵپشتی گوفکەکان و هەڵنەوەشێنەوە.

٢٠- مێراب:

نەخشێکی ناولەسپییە لەدوای لێوار دێت. پانی بەقەدەر چوار پەنجەیە و لە هەر چوار لاوەی مافوورەکە دەسووڕێتەوە. بۆ نەخشی مافوورەکە وەك چوار چێوەی لێدێت.

٢١- قوچەك:

کە مافوورەکە تەواو بوو، پێش بڕینی لەسەر ساکارەکەی سەرەوەی مافوورەکە دوازدە ((١٢)) داوە ڕایەڵی گورد و شێرە بۆ جوانی بەگرێ چن وەك قەزمە نووشتی لێدەکرێت.

٢٢- هەرزاڵە:

کە پرێکی بچووکە لەلای پێشەوەیە بە سمتەکەکان ڕادەگیرێت، کە بەری مافوورەکە بەرز بووەوە تەونکەر وەك کورسی لەسەر دادەنیشێت.

٢٣- گلۆڵە:

بەنی خڕی هەڵکراوەیە. لەکاتی مافوور کردندا تەنیا بە نە خاوکە ڕەنگاوڕەنگەکان دەکرێنە گلۆڵە و بەتە و نەکە هەڵدەواسرێن.

٢٤- ماشەر:

بەنێکە ئافرەت بە چۆك هەڵیدەکاتەوە. واتە لە دەورەی چۆك دەسووڕێتەوە ئەمەش لەکاتی تەون کردندا دەکونجێت و تایبەتە بەبەنی تێوەرێخ. ماشەر بۆ ئەوەی بەنەکەی دەق بگرێت بە دارێك هەڵدەواسرێت بەردێکی قورس لەلای خوارەوەی دادەندرێت و دوای تەڕکردنی بۆ ماوەی چەند سەعاتێك.

٢٥- هێندێك لە نەخشەکانی ناو مافوور:

(پێ مریشکە) لە تەرزی پێ مریشکدا دایە.

(کرمۆکە) وەك کرم وایە.

(فنجانە) و (ئەستێرە) و (ئەستوورك) ئەمەیان نەخشێکی گەورەیە لە ناوەڕاستی مافوورەکەیە.

ئەم نەخشانەی باس کران ڕەنگیان نابێ لەگەڵ ڕەنگی مافوورەکە یەك بێت.

مافوور... ڕەنگی ناوەوە سۆر بوو دەڵێن (مافوورەکە ناو لە سۆرییە)، یان ناو لە کەسکیە، ناو لە زەردییە).

***

بەشی سێیەم:

تەون کردن:

هەرکە کەرەستەکە تەواو بوو، تەونەکەر نیمدەرەیەك لەژێر خۆیەوە دادەنێت و چوار چمکی دادەنیشێت.

پیشك و ڕنۆك و مەقەس و قەڵەمبڕێکی دەمتیژی لە تەك خۆیداناون.

هێندەجار دەمە (مووس)ی سەرتاشین لەجیاتی قەلەمبڕ دەخرایە نێوان دوو پەلە قامیشەوە بەکار دەهات.

دار گوردەکە نزیکەی دوو بست لەسەرەوەی کێسرەیە. گلۆڵە بەنە خاوکە ڕەنگاو ڕەنگەکان: ((شین و سوور و کەسک و سپیلك و ڕەشك و پەمبە و زەردی نارنجی و زەردی لیمۆیی و زەردی فستقی و مۆر))، بەهۆی بەنێکی سێتاوەبە سمتەکەکان هەڵواسراون. سەری هەموویان دەکەونە سەردار گوردەکە و بەردەمی تەونکەرەکە.

ماشەرە پشتەکە: ((واتە ئەو بەنەی دەکرێتە تێوەرێخ)) بە سەرێکی دار گوردەوەیە.

پێشەکی تەونکەرەکە قامیشەکەی دەهێنێتە سەر دارگوردەکەوە. بۆ ئەوەی تیز و فیزی هەردوو ڕایەڵەکە: "گورد و شێرە))، کەلەتەك دار گوردەکەیە دابەزێتە سەر بن ترنەکەوە. ئەوکات ڕایەڵی گوردەکە لەپشتەوەیە دێتە پیشەوە و شێرەش دەچێتە پشتەوە. تەونکەرەکە ئەوسا دەست دەداتە ماشەرە پشتەکە و بەدەست داوێکی لەنێوان گورد و شێرە هەڵدەکێشێت. هەروەك لە تێوەرێخ دا باسمان کرد.

قامیشەکەی بڵند دەکاتەوە و تیز و فیزەکە دەچێتەوە جێگەی خۆی و ڕایەڵی گورد. دەگەڕێتەوە پشتەوە و شێرەش دێتە پێشەوە.

تەونکەرەکە داوە تێورێخێکی تر لەنێو هەردوو ڕایەڵەکان وەك جاری پێشوو هەڵدەکێشێت و بە دەمی ڕنۆکەکەوە دەیباتە سەر داوەکەی تر و جا بە پیشك داوەکان دەکوتێت. بەم جۆرە تاساکارەکەی باسمان کرد تەواو دەبێت و کاتی گوفك دادێت.

تەونکەرەکە هەر.. ڕەنگێکی پێویست بوو، بابڵێین: (سوور)، دەست دەگەیێنتە داوە سوورەکەی بەردەمی. ئەو ڕێزە چەند گوفکی سووری بووێت تەواو دەکات. مەرج نییە گوفگە سوورەکان (تەسەلسول) لەدوای یەکتر بن. بەگوێرەی خواستی ئەو نەخشەیە کە تەونکەرەکە نیازێتی.

تەونکەر بە هۆی ژمارەی گەیەکان دەزانی نەخشەکان دابنێت و لەم ڕێزە چەند ڕەنگی دەوێت و لەکوێندەر یان دانێت. هەر گوفکێکی لێدا بە قەڵەمبڕەکەی دەستی دەیبڕێت. هەرکە ئیشی گوفکی سوور تەواو بوو سەرە

داوە سوورەکەی لەبەر دار گوردەکە ڕا دەکاتەوە و دەست دەداتە ڕەنگێکی تر. بەم جۆرە تا ئەم ڕێزە گوفکە تەواو دەبێت. ئەوکاتە تەونکەرەکە قامیشەکەی دادەبەزێنتە سەر دارگوردەکەوە. تیز و فیزەکە دەچێتە سەر گوفکەکان و داوە تێوریخێکی لەنێوان گورد و شێرە ڕایەڵ دەکات و قامیشەکەی بەرز دەکاتەوە. دیسان داوە تێوەڕێخێکی تر تێهەڵدەکێشێت و داوەکان بەدەمی ڕنۆکەکەوە دەباتە سەر گوفکەکان. بەپیشك توند توند دەیانکوتێت. جا بە پەنجە سەری گوفکەکان لەم سەر بۆ ئەوسەر بە قاییم ڕادەکێشێت. تا توندیان وەك یەك لێبێت ئەوجا بە مەقەس ڕێکیان دەخات.

لەسەر هەر ڕێزە گوفکێك دووداوە تێوەڕێخ ڕایەڵ دەکرێت.

مافوورەکە بەم جۆرەی گوتمان تەواو دەکرێت.

بەشی چوارەم:

ئەو شتانەی بە تەون دەکرێن ئەمانەن:

١- مافوور:

مافوور ئەگەر درێژ و تەسك بێت ((سەرەنان))ی ناوە. ئەگەرنا ((مافوور))ی ((ناوجیێ))یە.

٢- بەڕەی ساکار:

ئەمە بەبێ گوفك دەکرێت، بەس تێوەڕێخە. هەروەك لە ساکاری مافووردا باسم کرد.

بەڕە بەرینە و بەو جۆرە کەرەستەیە، بەیەك کەڕەت درووست ناکرێت. بەڵکو تەختە تەختەیە و پاشدان لە یەکتر دەدوورێن.

٣- بەڕەی نەخشین:

ئەمە نە گوفکە، نە بە تێوەڕێخە. بەڵکو تاتەواو دەبێت بە گریێ چنە. لای پێشەوە لووس و بەخشە. لای پشتەوە بەڕیشەیە.

بەڕەی ساکار و نەخشین کاتی خۆی لەجیاتی لێفە و جاجم، شەوان بەخۆدا دەدران.

٤- جەواڵ:
هەروەك بەڕەی ساكار درووست دەكرێت، بەڵام بەنەكەی ئەستوور ترە.
٥- خرار:
هەروەك جەواڵە، بەڵام بەن نییە، مووە.
جەواڵ و خرار بۆ دەغڵ و دانەوێڵە تێكردن و گواستنەوە بەكار دەهێندران.
٦- تێڕ:
ئەمە دوو جۆرە:
یەكەم: تێڕی نەخشینە.
وەك بەڕەی نەخشین درووست دەكرێت. لای لووسەكەی دەكەوێتە ژوورەوە و لای ڕیشەكەی دەكەوێتە دەرەوە.
كاتی خۆی تێڕ لەجیاتی سەندووق بووە و بوغچە و كەل و پەلی ماڵەوەی تێدە كرا.
زۆربەی بووك كە دەگوازرانەوە ئەو تێڕەیان هەبوو، ئێستاش ئەو جۆرە تێڕە لە دێهاتەكانی دەوروبەری شاری هەولێر ماوە.
دووەم: تێڕی ئاسایی و تێڕكەش دەگرتەوە.
٧- تێڕكە:
لەبەن، یان لە مووەوە، لەوێنەی جەواڵ و خرار دروست دەكرێت. لە تێڕ گچكە ترە. ئەملا و ئەولای شتی تێدەكرێت و دەخرێنە سەر پشتی وڵاخ.
تێڕكە بەزۆری بۆ شت فرۆشتن بەكارهاتووە. وەك: خوێ، گڵەسەر و پیاز و شووتی و گندۆرە و هتد. لایەك شتەكانی تێدەكرا و لایەكەی تریش دەغڵ.
تێڕكەی ئاو لە موشەما درووست دەكرێت.
٨- توور و ملاّكدان:
وەك بەڕە درووست دەكرێت هەیە نەخشینە، هەشە ساكار.
أ- توور:
سێگۆشەیە، تایبەتە بە منداڵی ساوای ژنە كوردە كۆچەرەكان لە پشتی خۆیان هەڵدەدا، بەڵام لە دەشتی هەولێر دەیانخستە سەر پشتی وڵاخ.

ب–ملاّكدان:

وەك جۆرك وايە و لەگەلّ توور لەسەر پشتی ولاّخ دەبووە هاوسەنگ. ملاّك و کەوگیر و تەشی و تیرۆگ و ناوبرێشك و شتی تری تێدەکرا.

٩– هەگبە:

لەچەشنی تێرکەیە، بەلاّم بچووکە و کاتی خۆی سوار ئەسپ، بۆ کەل و پەلی پێویست و خۆراك لەگەلّ خۆی هەلّدەگرت. هەندێجار نالّبەند و پینەدۆزیش بەکاریان دەهێنا.

١٠– خورجە:

جۆرکێکی گەورەیە، بەقەدەر لایەکی هەگبەیە و سوار بە سێتایەك لە پشتەخۆی دەبەستا.

خورجە سەردەمایەك کچی جاحێلّ وەك جانتا بەکاریان دەهێنا.

١١– قەرێتە:

بەگرێ چن وەك بەڕەی نەخشین لە چەشنی قایشی پشت دروست دەکرا. بەرینی چوار پەنجە زیاتر نەبوو. لەگەلّ زەنگولێك بۆ جوانی لەملی بەران، یان نێری دەکرا. هێندەجار بۆ تاژیی ڕاویش بەکاردەهات.

***

تورەگە:

ئەوەی من بزانم (٥) پێنج جۆرە توورەگە هەبوو:

١– توورەگەی ئالیك:

جۆرکێکی وابوو قەپۆزی ولاّخی پێوە دەچوو. وەك جەوالّ و خرار دروست دەکرا. یاخۆ مشەما بوو. ئالیکی ولاّخی تێدەکرا و بەسەرییەوە وەدەکرا.

زۆرجار وا دەبوو... ولاّخەکە پشووی تێدا سوار دەبوو... و پرمەیەکی گەورەی لێوە دەهات.

**٢–توورەگەی خوێ:**

لە خام، یان مشەما بۆ خۆی دروست کرا و لە ژووری نانداین بەسینگێك وەدەکرا.

**٣–توورەگەی شوان:**

تێشووی شوانی تێدەکرا و شوان لە پشتە خۆی هەڵدەدا. سێ گۆشەیی لە بەن، یان خام دروست دەکرا.

**٤–توورەگەی خۆڵ دەردان:**

خۆڵی لە نێو بیر و چاڵ پێدەردەدرا. لە مشەما بوو. قەفیزێکی ئاسنی لە لێوار گیرا بوو تاکو بە گرانی خۆڵەوە، لەکاتی هەڵکێشانا لێوارەکەی نەپچڕێت.

**٥–توورەگەی شێخ ڕەزایان:**

جۆرێکی خام بوو شێخ ڕەزا گەڕۆکەکان لە ملی خۆیان هەڵدەدا و هەرکە دەگەیشتنە هەر ئاواییەك لەسەر شوێنێکی بەرزی ناوەڕاستی دێ دەفەیان لێدەدا و مقامی ئایینیان لەگەڵ دەگوت. خەڵکەکەش ئاردیان بۆ دەبرد و لەنێوان جۆرکەکەیان دەکرد.

***

**جوت و جوتیاری لەدەشتی هەولێردا:**

**بەشی یەکەم: جوتیار**

جوتیار ئەو کەسەیە کە زەوی دەکێڵێت.

جا خاوەن زەوی و جووتەکەبێت، یا کرێکار و ڕەنجبەر.

کرێی جوتیار کەپێی دەڵێن (شەرت) ئەمانە بوون:

١– نان خواردن.

٢– کراسێك.

٣– جوتە کڵاشێك.

٤– ڕانك (بەبێ جۆغەر).

٥– نیو عەڵبە شکارتە.

٦- دینار و نیوێك پارە.

ئەگەر جوتیارەکە جوتیارێکی باش بووایە پارەکەی بۆ دەکرا بە (١,٧٥٠) فلس.

جوتیارەکە بەرامبەر بەم کرێیەی سەرەوە نزیکەی هەشت مانگ جوتی بۆ ئاغاکەی دەکرد. واتە لە سەرەتای مانگی ئەیلولەوە تا دوا دوای مانگی نیسان.

لە هەوەڵەوە تا بارانی پەڵە تۆی دەکرد. لەدوای بارانی پەڵە شۆی دەبڕی. لەئاخری زستان و سەرەتای بەهاردا دەستی بە وەردانەوە دەکرد.

هەموو ڕۆژ دەچووە جوت تەنیا کە باران دەباری و تا دەبووەوە (کڕ): واتە زەوی کزر دەبوەوە.

جوتیارە کە لەکاتی جوت وەستاندا دەستە وەستان ڕانەدەوەستا و بۆ ئاغاکەی دەچووە ئاش، یان وڵاخەکانی دەبردە لەوەڕاندن ئەگەر وەرزی بەهار بووایە.

**بەشی دووەم: لەبارەی کێڵگەیە:**

**١- بەیار:**

بەم زەویە دەڵێن: لەساڵێك زیاتر نەکێڵدرابێت، یا هەر نووکی گاسنی پێنەکەوتبێت.

**٢- بوور:**

ئەم زەویەی کە تەنیا ساڵێك نەکێڵدرابێت.

**٣- شۆ، شێف:**

زەویی جارێك کێڵدراو. ئەمەش بەزۆری لە دوای بارانی پەڵەیە و لە دوادوای وەرزی پایز و سەرەتای زستان دەبێت. واش دەبێت خاوەنەکەی بۆی نارەخسێت بۆ وەرزی زستان، یان بەهار دوای دەخات.

کێڵگەی شۆ دەبێ زۆر دابخرێت و خەتەکانی بەرین بن. بۆ ئەوەی ڕەگی پنچك و درك و گیا و گوڵ هەڵتەکێت و ڕۆژیش لە قولایی خەتەکان بدات و وشکی بکاتەوە.

٤- وەرد:

زەوی دووجار کێڵدراو گاسنی یەکەم شۆیە و گاسنی دووەم: وەردە.

کێڵگەی وەرد دەبێ ورد و لەپاڵ یەك بێت. یەکەم: تا هەر گیا و گوڵێکی بە شۆ بڕین نەفەوتابێ و لەسەر لێواری خەتەکان شین بووبێت هەڵکەندرێت.

دووەم: تالەو سەر لەکاتی تۆکردندا هەوجاڕ هەڵقوز نەکات.

٥- خرتە و پرتە:

ساڵ وا دەبێت جوتیار شۆ و وەردی پێنەدەبڕا، جا زەویەکەی پەرێزبێ، یا بوور و بەیار، دەچێتە سەری تۆی بکات بەڵام بەگاسنێك خۆڵی ئەوەندە لێ پەیدا نابێت کە تۆیەکەی بشارێتەوە ناچار گاسنێکی پێش تۆکردن لێدەدات و جا تۆی دەکات و گاسنی دووەمی لێدەداتەوە. ئەمە خرتە و پرتەی ناوە.

٦- گەرد و وەرد:

لەشێوەی خرتە و پرتەیە: گاسنێك لە زەوی دەدرێت و تۆ دەکرێت جا گاسنی دووەمی لێدەدرێت.

بەڵام دەبێت تۆکردنەکە لەپاش باران بێت.

٧- هیشکاوز:

دەغڵێکە لەپێش بارانی پەڵە تۆ بکرێت، یان خۆ پایز بمێنێت تۆ بکرێت.

٨- تەڕاوز:

دەغڵێکە لەدوای بارانی پەڵە تۆ بکرێت، یاخۆ پایز نەمێنێت.

٩- خێلۆك:

تۆکردنەوەی دەغڵ بۆ دووەم جار. ئەمەش بەم جۆرەیە: ساڵ وا بووە دەغڵ لەبەر خراپی نەدووراوەتەوە. خاوەنەکەی بەدارێك یان شتێکی تر گوڵی دەغڵەکە دەوەرێنێتە ناو زەوییەکە جا گاسنێکی لێدەدات.

دەغڵی خێلۆك لەبەر ئەوە بە دەست تۆ ناکرێت بەزۆری تۆیەکەی ناڕێك و قان قان دەبێت: هەندە جێی بۆڕ دەبێت هەندە جێی چی لێ شین نابێت.

١٠- شکارتە:

وا بووە خاوەن زەوی لە زەویی خۆی و بە کەرەستە و جووتی خۆی تەنیا تۆیەکە نەبێت بە ڕبە و دوو ڕبە تا نیو عەلبە دەغڵی بۆ ئەم جۆرە کەسانە چاندووە کە پێیدەگوترا: شکارتە:

أ- مەلای گوندی.

ب-خزمێکی خۆی.

پ- شێخ و سەید.

ت-جوتیاری خۆی.

ج- شوانی خۆی.

تەنیا بۆ جوتیار و شوان لە بریتی کرێ بووە بۆ ئەوانی تر بە خێر و پیاوەتی بووە.

جۆرەکانی زەوی:

١- چڕ گەڵان: (چڕگە) گیایەکی زۆر ورد و لەپاڵ یەکە و بە مووی سەر دەشبهێندرێت. گاسن کاری لێناکات هەڵیتەکێنێت بۆیە ناچێندرێت.

٢- ڕەشە عەرد: ئەو زەوییە زۆر بەهێزە. هەرچەند بارانی زۆربێت دەغڵی دەڕسکێت.

٣- سۆرکەڵان: (سۆرکان) زەوییەکە خۆڵەکەی سۆر بێت. ئەمەش لەبەر ئەوە درز و قەڵەشی زۆرە ئاوڕا ناگرێت دەغڵی لێ ناڕسکێت.

٤- گامێشە عەرد: عەردێکە لە تەرحی ڕەشە عەردە و بۆ چاندن بەسوودە.

٥- چەقێن: زەوییەکە بەردە وردەی زۆربێت = بەردەلان. دەغڵی وەك سۆرکەلان باش نابێت و پنجی دەغڵی باش لێ ناڕسکێت. بە زۆر باران ڕەپکە دەکات. واتە زەرد هەڵدەگەڕێت لاسکی باریك دەبێت. مەگەر گەرمای زۆر بەتینی لێبدات ئەگەرنا دەغڵی باش وەبەرهەم ناهێنێت.

**بەشی سێیەم: ئەو وشانەی کە لە وێنەکەدا هەن پێوندیان بە جووتەوە هەیە:**

**(ا) نیر:**

نیر بریتییە لەمانەی خوارەوە:

**١- دارخەزنە:**

دوو پەلەداری بچووکن. وەك بزمار نزیکەی دە دوانزە (سم) لە یەکتر دوور لە ناوەڕاستی دارنیر کوتراون تا هیرتەکە بەملا و بەولادا نەچێت.

**٢- هیرتە، وێژە:**

پارچە قاییشێکە لەنێوان دارخەزنەکان بە دارنیر شۆڕ بووەتەوە. لەدوایی دا باسی دەکەین.

**٣- دار کلاوە:**

چوار داری دوولقن دەخرێنە ناو کونی دارنیرەکەوە دوو لەم سەر و دوو لەو سەر لەدواییدا لێیدەدوێین.

**٤- دارنیر:**

نیمچە تەژەیەکی تایبەتە نزیکەی مەتر و نیوێك درێژ دەبێت چوار کونی تێدایە. دوو لەم سەر و دوو لەو سەر دەخرێتە سەر ملی ولاخ.

**٥- بۆسە، وێژانبەر:**

زەنگولێکی =((قەفین)) دارە بەهیرتەوە شۆڕ بووەتەوە سەری مژانەکەی تێدەخرێت.

**٦- بەربۆسە:**

پەلە دارێکە بەقەدەر دوو پەنجە پانە و لەناوەڕاستی بۆسە دراوە و گاینجەکەی ڕاگیر دەکات.

(ب) هەوجاڕ: ئەمانەی خوارەوە دەگەیەنێت:




٧- سەرمژانکە، گاینجە:

پەلە دارێکی نیمچە چەماوە دەخرێتە کونی مژانە. دوای ئەوە کە سەری مژانە کە لە بۆسەکە هەڵدەکێشرێت. تاکو مژانەکە لەجێگەی خۆی دانەماڵێت.

٨- مژانە، مژانکە:

دارێکە نزیکەی دوو مەتر درێژە. سەرێکی بە کلکی ئامورەوە بەندە و سەرەکەی تری بە بۆسەوەیە.

٩- قەفیز:

شتێکی بازنەییە، بەرمیلە، یاسفەیفە، بنکی مژانەکە بە کلکی ئامورەکەوە ڕاگیر دەکات.

١٠- کرمۆکە:

پەڵە دارێکی زۆر بچووکە. لەسەری خەپەوە دەدرێت تاکو خەپەکە لە کونەکەی خۆی نەچێتە خوارەوە. یاخۆ خەپەکە خۆی وەك بزمار سەری خڕە.

١١- دەستەندوو:

دارێکە درێژی مەترێك دەبێت وەك بزمار لە قوونی ئامور کوتراوە. سەرەوەشی دەستە مستەی پێوەیە.

١٢- دەستەمستە:

پەلە دارێکە لەشێوەی دەسکە خەنجەرە لەسەری دەستەندوو کوتراوە و جوتیار دەستی پێوە دەگرێت.

**١٣- قونك:**

بەشی دواوەی ئاموورە.

**١٤- زمانە، دوندە:**

پەلە بچووکەکەی ئاموورە و گاسنی پێوە دەکرێت = زمانە

**١٥- بوغازە، گرانگ:**

شوێنی بەیەك گەیشتنی هەردوو لقی ئاموورەکە لەکاتی جوتدا خۆڵ بەملا و بەولای خۆیدا پەرت دەکات.

**١٦- هێسە، بەرگۆرە، مۆرە، سەرخە:**

پەلە دارێکی پانە دەکەوێتە نێوان مژانە و کلکی ئامورەکە. بۆ ڕشت و ماڵ کردنی زمانەی ئاموورەکە بەکاردێت.

**١٧- خەپە، هەپە:**

پەلە دارێکە، یا دووە وەك بورغی کلکی ئاموور و مژانەی بە یەکەوە بەند دەکات.

**١٨- هەوجاڕی قەرۆمە:**

بە هەوجاڕێك دەڵێن کە زمانەی ئاموورەکە دەست کردبێت. هەروەك لە وێنەکەدا دیارە.

**تێبینی:**

أ- هەوجاڕ ئەگەر ڕووت بوو، واتە مژانە و دەستەندوو، گاسنی پێوە نەبوو پێیدەگوترێت ئاموور.

ب-هەوجاڕی هێستر زۆر لە هەوجاڕی گوێ درێژ گەورەترە.

**(ج) کۆپەلان:**

بەمانە دەڵێن:

**١٩- بارێنە:**

بالۆلەیەکی لبادە، یا گوشە خراوەتە ناو کیفکێکی قایشی چەماوە. لەدواییدا باسی دەکەین سوودی چییە.

**٢٠- فڕ فڕۆك:**

دوو پەلە داری بچووكن بە خرێنە موو لەم سەر و لەو سەری بارێنە خراون.

**(د) گاسن:**

ئەمانەی خوارەوە دەگەیەنێت:

**٢١- نووك:**

نووكە تیژەكەی گاسنە. كە وەك مێخە لە زەویدا دەچێتە خوارەوە و هەڵیدەتەكێنێت.

**٢٢- كووپ:**

جێگەی زمانەی ئامووره.

**٢٣- پەڕ:**

**٢٤- ئەملا و ئەولای دەمی گاسنەكەیە خەتی جووت بەرین دەكات.**

***

**بەشی چوارەم:** ئەو وشانەی كە ماون و پەیوەندییان بە جووتەوە هەیە ئەمانەن:

**١- بن مل:**

چەند قەدە لبادێكە بە یەكەوە دووراون و قاییش، یا لاستیكی لە سەرەوە یان دراوە لەكاتی جووتدا دەخرێنە سەر ملی وڵاخ تاكو ملی وڵاخەكە برینـدار نەبێت.

**٢- بەڕووله:**

گاسنێكە كە نووكی دوای كول بوون تیژ بكرێتەوە.

**٣- بەرینە:**

گاسن كە پەڕەكانی خورا بوو بێت ئاسنگەر هەندێك لە ئاسنی كووپەكەی دەكاتەوە، دەیخاتە سەر پەڕەكانی بەرینیان دەكاتەوە.

**٤- بنەتۆ:**

دانەوێڵەیەکە، کە جوتیار بە زەویەوەی کردبێت، یاخۆ دایانابێت بۆ تۆکردن.

**٥- بەرەجووت:**

بە پارچە زەویەك دەڵێن: کە بە جووتە وڵاخێك بە بەرهەم بێت. یان بە جووتە گوێدرێژ. بۆ وێنە فلان کەس بەرە جووتێکی زەوی هەیە، یادوو بەرەجووت.

**٦- بەن قادە:**

بەنێکە لە سێتا ئەستوورترە و لە گوریس باریکترە. لە سەری دار کڵاوەکانی لای سەرەوەیە خراوە و نیر و کۆپەڵانی بەیەك دەبەستێت.

**٧- پەرە:**

بەیارێکە لەنێوان دوو خەتە جووتدا بەرگاسن ناکەوێت بە هەڵ نەقەندراوی بمێنێتەوە.

**٨- پەڵە:**

بە بارانێکی تێکڕا دەڵێن. کە زەوی وەك ڕەباس لێ بکات.

پەسەندترین کاتی پەڵە مانگێك پایز بمێنێت. باشترین پەڵەش پەڵەی یەعقوباغاییە. ئەمەش بەم جۆرەیە: وڵاخ لەدوای بارانبارین لەناو کێڵگە بڕوات یەکسەر جێی سمەکانی پڕ ئاو بێت، یا گۆزەیەك لەبەر باران بێت تا پڕئاو دەبێت.

**٩- توورەگە:**

جۆرێکی مووتاوە. کا و جۆی تێدەکرێت کە جوتیارەکە پشوو بدات لەسەری وڵاخەکانی دەکات. بەن و مشەماش دەبێت.

**١٠- جدووم:**

داردەستێکی تایبەتە سەرێکی دوولقە جوتیار لەجیاتی لاپووتە بەکاریدەهێنێت.

**١١- جەلعە:**

لە شێوەی جەڕەیە، بەڵام بچووکە و نیوەی ئەو دەبێت. جوتیار ئاوی خواردنەوەی پێدەباتە سەر جوت.

**١٢- خرار:**

وەك جەواڵە بەڵام ڕیسەکەی بەن نییە مووە. جەواڵیش دەبێت جوتیار تۆی پێدەباتە سەر زەوی.

**١٣- دارجوت:**

دار دەستێکە سەرێکی نەقیزەدارە جوتیار لەکاتی جوتکردنیدا وڵاخی پێ لێدەخورێت.

**١٤- دوو شاخ:**

گاسن کە نووکی زۆر خوراو و باریك بووە و کەلکی بەڕوو لە کردنی نامێنێت ئەوکات ئاسنگەر لەناو ئاگردا جۆشی دەدات و بۆ پشتەوەی خوار دەکاتەوە و دوو پارچە پۆڵا لەم لاو و لەو لای دەدات و سەر لەنوێ دەیکاتەوە نووك.

**١٥- دەستجلەو = دەسجلەو:**

گوریسێکە لەم سەر و ئەوسەری بە قەوچی وڵاخەکان بەستراوە و ناوەڕاستیشی بەدەستەندووەوەیە. لەدوایی دا باسی دەکەین.

**١٦- ڕپە:**

جۆرە دەفرێکی دارە. دانەوێڵەی پێدەپێورێت نیو تەنەگە دەگرێت.

**١٧- زەناخە:**

قوڵفەیەکی قەڕاسەیە. دەکەوێتە ژێر چەناگەی وڵاخ.

**١٨- سەدە:**

ئەو ماوەیە کە دەکەوێتە نێوان دەست پێ کردنی دێرە جووت و بادانەوەی جوتیارەکەیان ئەو خانە زەوییەیە کە جوتیار دەیکێڵێت.

سەدەهێستر نزیکەی دوو ئەوەندەی سەدەکەرە.

١٩- سەرسەدە:

ئەو شوێنەیە کە جوتیارەکە جوتەکەی لێهۆ دەداتەوە. واتە ئەمسەر و ئەوسەری خەتەجوتە.

٢٠- عەڵبە:

(٨) قەزناخە = (١٦) تەنەکە = (٣٢) ڕبە.

٢١- **قەزناخ:** (٢) تەنەکەیە = (٤) ڕبەیە.

٢٢- **کێشە، قەتارکێش:**

قوڵفەیەکی مووە بە لاتەکی کورتانەوەیە. بەن و ئاسنیش دەبێت.

٢٣- لاپووتە، مەساسە:

لەوێنەی پیشەقانە، بەڵام دەمی خڕە. جوتیار لەکاتی جوتکردندا قوڕی هەوجاڕی پێ لێدەکاتەوە.

٢٤- لات:

ئەو خانە زەوییەیە کە جوتیار تۆی پێوە دەکات و جا دەیکێڵێت.

٢٥- مارە، (ماڵە):

دارێکی درێژ و پانە، کورتە کاریتەش دەبێت، ئەم سەر و ئەوسەری گوریسی پێوەیە. دوای کێلان و تۆکردن بە وڵاخی جووت وەك کوچکوچە بەسەر کێڵگەکەدا دەیگێڕن تا گرێ و گواری کێڵگەکە لووس ببێت. ئەمەش بەزۆری لە بێستانی دێمی بووە.

٢٦- مامزە:

ئاسنێکە بە سەری قەوچەوەیە بۆ دەست پێوەگرتنە.

٢٧- مەکینە:

لەسەرەتای چلەکانی سەدەی ڕابردوودا کەرەستەی جووت جۆرە پێشکەوتنێکی بەخۆیەوە بینی: شتێکیان داهێنا پێیان دەگوت: مەکینەی جوت.

هەبوو بۆ هێستران دروست کرابوو، پێنج گاسنی پێوەبوو، هەر جارێ پێنج خەتی لێدەدا. هەش بوو بۆ گوێدرێژان دروست کرابوو سێ گاسنی هەبوو هەر جارێ سێ خەتی لێدەدا.

٢٨- نیوەتۆ:

وابووە خاوەن زەوی دەستی کورت بووە و توانای تۆکردنی وەرد و شۆیەکەی نابێت دەچێت بە قەدەر وەرد و شۆیەکەی تۆ (چ گەنم، چ جۆ) لە یەکێکی تر دەستێنێت و تۆی دەکات لەوسەر دەغڵەکە چەندی کرد دەیکەنە نیوە، یان خاوەن تۆیەکە دەچێت وەرد و شۆی جوتیارەکە تۆ دەکات.

ئەم جۆرە بنەتۆشی پێدەڵێن.

٢٩- هاونیر:

بەو وڵاخ و گوێ درێژانە دەگوترێت کە لە ژێر نێردان و بەرزیان وەك یەکە.

**بەشی پێنجەم چوونە سەر زەوی:**

جوتیار هەموو بەیانیان کە لەگەڵ مەلا بانگدان لەخەو هەڵدەستا، شیوی بۆ ئامادە کرابوو: دەیخوارد.

شیوەکەش بەزۆری ئەمانە بوون: (شلە ساوار، نیسك، برویش، دۆ بەکەشك دۆینە). لە هەندە گوندان ئەم شێوە نەبوو.

نێوەرۆیان ئەگەر نەهاتبوایەوە نانی لەگەڵ یەك لەمانە بۆ دەچووە سەر جووت: توور، تەرەپیاز، قەسپ، مێوژ، ماست.

دوای نان خواردن وڵاخەکانی بابلێین: (ئێستر بوون) کورتان دەکردن. ئەگەر بۆتۆ کردن بووایە. ئەگینا تەنیا ئەو ئێسترەی سوار دەبوو کورتان دەکرد.

خرارە تۆیەکەی دەهاوێشتە سەر پشتی ئێسترە نێرەکییەکە و مامزەی قەوچی ئێسترە نێرەکییەکەی لەکێشەی تەنکێشی کورتانی هێسترە ماچەکەی هەڵدەکێشا. بەخۆی سواری ئێسترە ماچەکە دەبوو چونکە ئێستری ماچە لە ئێستری نێرەکی عەجوول ترە و نایەتە دوێ.

هەوجارەکەی بە بەرەواژی لەپێشەخۆی دادەنا و ڕەفیسکی لە بوغازەکەی گیر دەکرد و بۆ پارسەنگیش دەستێکی دەهاوێشتە سەر کلکەکەی.
جەلعە ئاوی بە هەوجارەکە شۆڕ دەکردەوە. یاغر یاغر بۆ سەر زەوی دەڕۆیشت. کە دەگەیشتە سەر زەوییەکە، هەوجار و تۆیەکەی دادەنا و کورتانی لە ئێسترەکان دەکردەوە و بۆ جەلعەکەی دەکردنە سێبەر.

### ١- جووت دابەستن:

هەردوو ئێسترەکانی لەگەڵ یەکتر جووت دەکردن، پێکەوە بە قەوچەکانیانی جەلە دەکردن. بن ملەکانی دەخستە سەرملیان و جا نیرەکە. بە جۆرێك ملی هەر ئێسترێك دەکەوتە نێوان دوو دار کلاوان. تا ئێسترەکان نەتوانن بەملاو بەولادا بچن. کۆپەلانەکانی بەپشت نیرەکەوە دەخستە سەرملیان. سەری دار کلاوەکانی کە کەوتوونەتە لای پەڕگەی: ((دەرەوە)) لەلەیان لێکرابوو و بە قولفە بەنقا دەکەی لێگیر دەکردن. جا سەری کۆپەلانەکانی لەژێر ملی ئێسترەکان بۆیەك دەهێناوە و بەهۆی فرفرۆکەکانەوە لەگەڵ دار کلاوەکانی پەڕگەی دەبەست. بە نقادەکە چەند بمابووایەوە لە قەدی کۆپەلان و دار کلاوەکانی لای ژوورەوە دەئالاند و سەرەکەی لە دار نیرەکە گرێ دەدا. لایەکەی تریش هەروا. بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت: کۆپەلان دوو سوودی هەیە:

أ- وەك بازنە لە ملی ئێسترەکان هات و چۆ دەکات و نایەڵێت توندی بکەوێتە قوڕگیان و تەنگە نەفەس ببن.

ب-لەسەرەوە نایەڵێت دارنیرەکە بچێتە سەر شانی هێسترەکان و برینداریان بکات.

سەری مژانەکەی لە بۆسەکەی هەڵدەکێشا و گاینجەکەی لە کونی مژانە دەنا و گوریسێکی درێژ کە پێی دەگوترا دەستجلە و لە زەناخەی قەوچی ئێسترەکانی دەخست و ناوەندی گوریسەکە بە سەری دار نێرەکە بۆ پشتەوە دەهێناوە و لە دەستەندوەکەی دەئالاند.

بە دەستی ڕاستە، دەستە مستەکەی دەگرت و بە دەستی چەپەش دارجوت، هەچەی لە ئێسترەکان دەکرد. لەگەڵ ڕۆیشتنی ئێسترەکان دەستی دادەگرت و نووکی گاسنەکە لە زەوی ختم دەبوو. پەڕەکانیش تیژ بوون خەتەکەیان بەرین دەکرد تا دەگەیشتە سەر سەدەکە. پێش بادانەوە بۆ ئەوەی ئێسترەکان ئەزیەت نەخۆن جوتیارەکە هەوجاڕەکەی بڵند دەکرد تا نەسووڕابایەوە نەیدەهێشت نووکی گاسنەکە بە زەوی بکەوێت. جوتیارەکە لەگەڵ هۆدانەوە ئەمەی دەگوت:

هۆ... ۆ... ۆ... وەرە، یان دەیگوت... هۆ... ۆ... ۆ... وەرە هەرە دایکم.

ئەگەر بەلای چەپدا بای بدابووایەوە دەستجلەوی چەپەی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا، ئەگەر بادانەوەکە بەلای ڕاستەوە بووایە دەستجلەوی ڕاستەی ڕادەکێشا. ئەگەر جوتیارەکە بیویستبایە هێسترەکان ڕابگرێت پێی لەسەر قونکی ئاموورەکە دادەنا و بە هەردوو دەست، دەستجڵەوەکانی بەیەکەوە ڕایدەکێشان و ئەوجا دەیگوت. هۆ... ۆ... ۆ...... ش.

سەرەو بنە لە جوت کردن دا نییە. ئێسترێك دەکەوێتە لای کێڵگەکە و ئەوی تریش دەکەوێتە لایەکەی تر و لەگەڕانەوە بەپێچەوانەوە، بەڵام لە گێرە و جەنجەڕا وانییە یەکیان هەر لەلای چاوەیە و پێی دەگوترا ((بنە)) و ئەوەی تر لەلای ڕۆخەیە. پێیدەگوترا ((سەرە)).

جوتیاری باش لە کێڵگەی ڕا دیاربوو. بەتایبەتی لە وەرد و شۆدا. قوڵایی خەتە جوتەکانی، لەدوورەوە لەم سەر بۆ ئەو سەر دیارە بوو.. و هەمووی لەپاڵ یەك و ڕاست وەك پشتی تفەنگ.

ئەم جۆرە جوتیارە هەروەك گوتمان (٢٥٠) فلس لە جوتیاری تر پتر دەدرایێ.

کێڵگەی جوتیاری نەزان، لە هەندە جێیان خەتەکانی تێکەڵ و پێکەڵ دەبوون و لەهەندێ جێیانیش شاش و پەرە لە نێوانیاندا دیار بوو.

### ٢- تۆکردن:

پێش تۆ کردن جوتیارەکە زەوییەکەی لات لات دەکرد. بەرانپیلێکی دەست دەدایە و دوو سەری لەیەك گرێ دەدان و لەملی خۆی هەڵدەکێشا و لە تۆپڕی دەکرد و دوو سەرەکەی تری بە دەستە چەپ دەگرت و دەچووە ناو لاتەکە و لەلایەکەوە دەستی پێدە کرد: چنگی ڕاستەی لە تۆیەکەی پڕ دەکرد و کە لە بەرانپیلەکەی دەردەهێنا دەیپرژاند تا پشتەخۆی و هەنگاوێکی گەورەشی دەنا. ئەوەندە تۆیەی لە چنگی مابووایە لەگەڵ دەست گێڕانەوە دەیپرژاند و هەنگاوێکی تری دەهاوێشت. بەم جۆرە تا دەگەیشتە سەری لاتەکە. ئاوا بەلایەکەی تریش دا دەگەڕایەوە. بەم دوو جارە تۆدانی لاتەکە تەواو دەبوو. ئەگەر لاتەکە تەسك بووایە. ئەگەر بەرینیش بووایە بۆ جاری سێیەم بە ناوەندی لاتەکەدا دەچۆوە کە پێیدەگوترا ((ناولات))، بەڵام وەکو جاران چنگی خۆی تەواو پڕ نەدەکرد.

کێڵگەی تۆ داخستنی زۆر ناوێت. هەر تۆیەکە داپۆشرێت بەسە. بۆ ئەوەی ئەگەر گەندە بارانیش ببارێت. پێ شین ببێت. دەغڵیش کە شین بوو درەنگ دەفەوتێت بەڵام ئەگەر کێڵگەکەی قووڵ بوو بە گەندە باران شین نابێت و لەژێرەوە دەپەنمێت و بەچەند ڕۆژێك دەفەوتێت. لێرەدا پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت:

شەڕ لەشۆییێ نەك لە تۆییێ. واتە کێڵگە لە شۆ دا بکەوێت نەك لە تۆکردن.

***

**قەرسیل:**

قەرسیل: بە دوو مانا دێت:

یەکەم: گەڵا و لاسکی دەغڵی گەنم و جۆی کەسك، دەگوترێت: (دەغڵ ئەوڕۆ بۆتە قەرسیل)، واتە گەڵا و لاسکی ئەمڕۆ لە زەوی جیا بوونەتەوە.

دووەم: پارچە جۆیەك بوو بۆ کار و بەرخان لەڕۆخ ئاوایی دەچێندرا.

قەرسیل: لەبەر ئەوە لەبن ماڵان دەچێندرا و زبڵی زۆربوو پێش دەغڵی ئاقار دەڕوا و زێدەی دەکرد.

هەرکە کار و بەرخ دەستیان بە لەوەڕ دەکرد لەناو قەرسیلیان دەکرد و گەلاَ و لاسکەکانی لە خواردندا ناسك بوون و بە کار و بەرخی ساوا دەخورا.

هەرکە کار و بەرخ هەراش دەبوون، بۆ لەوەڕ دەبردرانە ئاقار و تێر دەلەوەڕان و پێویستیان زۆر بە قەرسیل خواردن نەدەما. ئێواران زاك و ماك لە قەرسیل دەکران.بە یەك دوو ڕۆژان لە کارتەیان دەدا. واتە لاسکەکانیان لە بن ڕا دەخوارد. تەنیا ئەوەندەی ددانیان لێ گیر نەدەبوو. ئەو تەرزە قەرسیلە بەردەدرا و مالاَتی خەلَك دەیتوانێت بەناویدا گوزەر بکات. پێشتر قەدەغە بوو.

سالێ وا بووە باران لەو ساتەدا زۆر دەباری و کارتەکە سەر لە نوێ شین دەبووەوە و مەڕ و مالاَتی تێدەکراوە.

***

**بەرکوت:**

وادەبوو هێندە جوتیاری خێزاندار باراشی لە سەرەتای دروونان لێدەبڕا و دەچوو لە (تەبارە)ی جۆ، یان گەنم، بە قەدەر پێویست دەدوریەوە و بە گێرە دەیکوتا و بەبای دەکرد.

ئەمە بەرکوتی پێ دەگوترا ئەوجا دەیبردە ئاش.

***

**شیکوت:**

هێندە جوتیار باراشی لەسەر و بەری دروونەی جۆدا نەدەما دەچوو لە تەبارەی جۆ، کە دانی تەواو پڕ دەبوو هێندێکی دەدوریەوە و ئەوجا بە شیش، یان شوڕکە دار لە گولَەکانی دەدا هەتا دانەکەی دەوەری و لەبەر هەتاو... وشك دەکردەوە و دەیکردە ئارد. ئەمە شیکوتی ناو بوو.

وشەی (شیکوت = شیشکوت)، بەلاَم گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووە بە (شیکوت).

***

**قاویت:**

قاویت: دوو جۆره:

١- نانی مەزرەقە ورد ورد دەكرا پێماندە گوت (قاویت).

٢- گوڵە دەغڵی جۆ کە پرشیر دەبوو پێش ئەوەی ڕق ببێت دەبرژا و بەدەستاڕ ورد دەكرا. وردەكە (قایت) بووە و درشتەكە (چەرخوس).

قاویت نابێ لەبەر با بابخورێت. چونكە تا لەناو لەپت بۆ دەمت دەبەیت با دەیبات.

دەڵێن: (عەرەبێك بە سواری حوشتر و ڕووە و ڕەشەبا قاویت دەخوارد. پییانگوت:

- یابە ئەوەچدە خۆت؟

ئەویش گوتی:

- هەتا ئەو بایەی بێت هیچ.

زۆر جار چەرخوس لە (كەرە) دەكرا زۆر بەتام بوو. من جارێكم چەرخوس بە كەرە خواردووە.

***

**قەرە خەرمان:**

هەركە دەغڵی گەنمە ڕەشگوڵ پڕ شیر دەبوو... و پێش ئەوەی ڕەق بێت جوتیار دەچوو هێندێكی دەدوورییەوە و دەیكوتا و بەبای دەكرد. دانەكە قەرە خەرمانی ناو بوو.

كەواتە قەرەخەرمان فەریكە دەغڵی ڕەشگوڵە.

لە هێندە فەرهەنكاندا، دەگوترێت: (فریكە دەغڵی برژاو).

***

ئێمەی منداڵ دەچووین نزیكەی (سوارە)یەكمان داو داو دەقرتاند و گوڵەكانمان ڕێك دەخست و بە بەنێك دەمانبەستا و لەسەر ئاگر دەمان برژاند و دەمانخوارد.

***

شـیوی قــەرە خــەرمان زۆر زۆر لــە شـێوەی بــرنج و ســاوار خۆشــترە، نەخەسەلە ئەگەر بە گۆشت مریشك لێبندرێت.

***

**تەبارە:**

تەبارە دەغلێکە (گەنم، یان جۆ) تەواو پێگەیشتبێت، واتە کـاتی دروونـەی هاتبێت.

ئەگەر سالْ هاتبووایە دەغلْ پنجی زۆر گەورە دەبوو. دەچووە پـالْ یـەك. ئەوسا دەگوترا: (بێژینگ)ی لەسەردانێیت ڕادەگرێـت، یـان دەگـوترا: (تـیری تێناچێت). کەچی ژێرەوەی بۆشایی زۆر هەبوو.

جار وا بووە (قەتیْ) هێلانەی لەنێو ئەو تـەرزە دەغلـەی کـردووە. قەتێکـە لەبـەر چڕی دەغلەکـە نـەیتوانیوە ڕاسـتەوخۆ لەسـەر هێلانەکـەی هـەلْفرێت، بەدەسـت دەگـیرا. چـونکە قـەتیْ لەجێگـەی ئـەوها دەبووایـە بـەپیْ لەسـەر هێلانەکە قیچێك بڕوات. تا دەگەیشتە بۆشاییەك و ئەوسا دەیتوانی بفرێت.

***

**سەپان:**

**سەپان:** ئـەو کەسـەبوو بەشـداری لەیەکـەم ڕۆژی دروونـە و تـاکو کێشـە و کوتانی جۆخین و داکردنی ((دان)) و ((کا)) دەکـرد. کرێیەکەشـی شەشـێکی گەنم و پێنجێکی جۆ بوو.

پێشتریش ئەمانەی دەدرایێ کە پێی دەگـوترا: ((نانانـە)). ((نیـو عەلْبـە مزاش، خورییەك، بزنە بە دۆیەك، بۆ دۆشین. نیۆ حۆقـە ڕوون، سـێ ئێـزرەم توتن. دوو دینار دەسگر)). ئەوە ئەگەر سالْ هـات بووایـە. ئەگـەرنا کـەمتری دەدرایێ.

**پالْە:** ئەوکەسە بوو کە دروونەی دەکرد. جا خاوەن دەغلەکە بووایـە، یـان سەپان و کرێپارە.

**سەرپالْە:** ڕابەر و تەکبیرکەری دروونکەران بوو.

**کرێپارە:** (کرێپاڵە) کەسێك بوو دروونەی ڕۆژانە بەپارە دەکرد نەك بە دەغڵ.

***

**تێلەکێش:**

((گیشەکەر))یشی پێ دەگوترا. ئەو ئافرەتە بوو ((سوارە = مەلۆ))ی لەدوای سەپان هەڵدەگرتەوە.

ئەگەر ژنی خاوەن دەغڵەکەبووایە حسێبی نەبوو. ئەگەرنا ئەمانە حەقی بوو:

١- دە قەزناخ مزاش.

٢- بەرامپیل.

٣- جووتەکڵاش.

قرشەی جۆیەکەی دەکردە ((گیشە)) و دەبووایە گوڵە جۆیەکە لەبەر دوو هۆیان لە ژێرەوە بێت و قاچك لەدەرەوە.

یەکەم: تاکو مەڕ و ماڵات و باڵندە نەیخۆن.

دووەم: گوڵەکان لە ژێرەوە ئارەقەیان دەکرد و دانەکە ڕەش دادەگەڕا. جۆی ڕەشیش ئەوسا پەسەند بوو.

قرشەی گەنمی دەکردە گەلاوێژ و گوڵەگەنم: لەبەرئەوەی پەلکەکەی گڕ بوو ئاژەڵ و باڵندە نەیاندەتوانی بیخۆن لەدەرەوە بووایە.

سێییەم: هەرچەندە تینی ڕۆژ لە گوڵەکەی بدا بووایە دانەکەی زەرد هەڵدەگەڕا و جوان دەبوو.

***

ئەگەر (پاڵە = دروونەکەر) زۆر بوون کێشەکەرێك دەرەقەتی سوارە هەڵگرتنەوەیان نەدەهات و کێشە کەرێکی دی یارمەتی دەدا.

ئەگەر پاڵەکەمبوونایە کێشەکەر پێیڕادەگەیشت و سایەوە دەبوو.

هێندەجار تێلەکێشی مەفتووف گاڵتەی بەپاڵەکە دەکرد و سوارەیەکی لەکاتی دروونەدا، لەسەر پشت دادەنا. واتە تۆ لە دەروونە ئازانیت و من بێ منەتم لێت.

خوالێخۆشبوو (مام داوود)ی گوندی مورتکە، گوایا بەتەنیا دروونە دەکات و کێشە کەرەکەی سوارەیەکی لەسەر پشت دادەنێت. ئەوسا مام داود لە تۆغیانی لاوێتیدا بووە و پیاوێکی توند و تۆڵ و بەوەج، کات چێشتان دەبێت و مل لەبەر دروونە دەنێت و پشوو نادات هەتا نیوەڕۆ لەگەڵ دەکەوێت. ئەوسا کێشەکەرەکە لەتاو هیلاکی و ماندوێتی دەست بە گریان دەکات. مام داود ئەوجا واز دەهێنێت.

***

کیشەکەر ئەگەر کابانی ماڵ بووایە و پاڵەکانیش کەم بوونایە، لەبەر نان کردن و مەشکە هەژان و (منداڵ)ی ساواش هەر هیچ درەنگ دەچووە سەر پەرێز. تا ئەو ساتە سوارەی زۆر لە سەری خڕ دەبووەوە و زۆر جاریش وا بووە دروونە کەرەکان یارمەتیان داوە و هەتا دەچوو سوارەکانیان لەجیاتی هەڵدەگرتەوە. بە مەرجێك کێشەکەرەکە هەڵس و کەوتی لەگەڵیان باش بووایە.

هەبوو کابانی ماڵ نەبوو.. و دروونە کەریش زۆر بوونایە لەگەڵیان دەچوو.. و جار وابووە تێلە کێشەکە جاحێڵ بووە و لەپشت کوڕە جاحێڵێك سواری ولاخ بووە. ئەوسا بەعەیب نەدەشیا. بەڵام هەمان کوڕ و کیژ لەنێو ئاوایی دابە یەکەوە بۆ قسەکردن بووەستا بووانایە، حەرجیان لێدەگیرا.

***

زۆرجار وابووە ئەگەر تێلەکێش سوحبەتچی بووایە سەرپاڵە لەکاتی دروونە کردندا دەیگوت:

- هیَ دروونە دروونە دروونە.
- دەسکیَ داسێم بەڕوونە.
- کیشەکەر فێرە قوونە.

***

**دروونه:**

هەرکە پاڵە و دروونەکەر یەکەمجار دەچنە دروێنە، ئەگەر لایەکی تەبارەکە زەوی بەتاڵ، یان کێڵگەبووایە لە بەراییدا (کەپرۆکە)یان هەڵدەدا. خۆ ئەگەر هەرچوار ئالی دەغڵ بووایە، بە ئەندازەی جێی کەپرۆکە تەبارەکەیان دەدووری و کەپرۆکەیان لێهەڵدەدا. هەتاکو لەکاتی ماندووبووندا پشووی لەژێر بدەن.

***

گاز: وشەی گاز چوار مانای هەیە:

١- یەگەم: (گاز = قەپ) = گەز: (ئازاد گازێکی لەقۆڵمدا خوێنی لێ هێنا).

٢- گاز: ئەو ئاسنە دوو دەمییەیەکە بزمار و شتی پێدەر دەهێندرێت.

٣- گاز: (ئازاد گازی نەوزادی کرد) واتە بانگی کرد.

٤- گاز:خەت لێدانە لە تەبارە.

(سەرپاڵە)پێش پاڵە ودروونەکەرەکانی دی دەچوو (گاز)ێك، هێڵێکی، بەقەدەر دەمی داسی دەستی: (واتە زەلام پێوە بچێت) لە تەبارەکە دەدات. درێژی بابڵێین، دوازدە (١٢) مەترە. بەرینیشی بەگوێرەی ژمارەی دروێنەکەرەکان بوو. ئەگەر زۆر بوونایە بەرینی لێدەدا، خۆ ئەگەر کەم بوونایە تەسك.

دوازدە مەترەکەشی دەکردە دوو بەش. هەر بەشێك (بەر)ی پێ دەگوترا. بەرەکەش بۆ ئەوەبوو تاکو کاتی پشوودان بزاندر بووایە. چونکە ئەو کات سەعات نەبوو کاتیان پێ بزانیبووایە ئیتر دەست بە دروێنە دەکرا و تاکو هەردوو بەری سەرپاڵەکە، تەرخانی کردبوو تەواوی دەکرد. ئەوجا دەچوونە بن کەپرۆکەکە دادەنیشتن.

لەکاتی پشوودانادا (داس)ەکانیان دەسووی. واتا تیژیان دەکرد.

لە دەشتی هەولێر (داس)ی (سۆربەش)ی بەناوبانگ بوو. کەتیژ دەبوو (موو)ی دەکرد و درەنگیش کول دەبوو.

(کەڵەشاخ) شووشەیەکی بچووك، یان (شاخ)ی ئاژەڵ بوو... و ڕوونی بۆ داس سوین تێدەکرا. بۆ ئەوەی ڕۆنەکە لەبەر گەرما نەتاوێتەوە لەبن کوندەلانیان دەنا.

کوندەلان ئەو کێشە، یان ئەو گەلاوێژە بوو، کەوا کوندەیان لەبن دادەنا و ئاوی کوندەکەی زۆر سارد دەکرد.

پاڵەکە هەر جارێ، بە پووشکەیەك ڕۆنی لەداسەکە هەڵدەسوی و ئەوجا بە (هەسان) دەیسوی تاکو داسەکە تیژ دەبوو.

***

ڕۆژێك پیاوێکی ئینگلیزی گەڕۆك دەچێتە پەرێزی ماڵێکی ئەو گوندانەی دەشتی هەولێر: (بەداخەوە ناوی گوندەکەم لەیاد نەماوە). سەیر دەکات لە سەرتای وەرزی هاوینە و پاڵەکان وا بەو گەرمایە نان و دۆ و تەرە پیاز دەخۆن، لەدڵەوە دەڵێت: (هەنووکە لەبەر گەرمی شتاقە لنگیان عەردی ناگرێت).

هەرکە دەیان بینێت هەر جارێ گەوزێکی گەورە دەهاوێن و واتە: (دامی داسیان بۆ دروێنە تەبارە بەگەڕ دەخست و بە ئەندازەی قامکێك قرشە دەدوورن ئەوسا بە دڵنیایی یەوە دەڵێت: ئەو پاڵەوانێتییە خوارد نەکەیان حەل دەکات).

***

**قەیناخ** = (قەیناغ):

دەسکێشی دەروونەکەران بوو. هەبوو لە تەگەنە درووست کرابوو، هەشبوو لەد (مشەما). تاکو لەکاتی دروێنە کردندا داس دەستیان نەبڕێت. ئەمەیان پەسندتر بوو. ئەویان گەرمی ڕۆژ ئەزیەتی پەنجەکانی دەدا.

قەیناغ: (تیل)ی لەسەری پەنجەکان، بۆ درووست کرا بوو. هەتا لەکاتی دروونەدا (قرشە زۆر بێتە ناو لەپ). زۆر جاریش لەکاتی دروونەدا، دەمی داس بە نووکی قەیناخەکە دەکەوت دەنگی لێوە دەهات.

قەیناخ تەنیا لەو دەستە دەکرا کەقرشەی پێدەگیرا. ئەگەر پاڵەکە ڕاستان بووایە قەیناغەکە لە دەستی چەپەی دەکرد، ئەگەرنا لە دەستی ڕاستە.

***

**قەلانگ:**

قەڵانگ: ئاسنێکی کەوانی وەك داس بوو، بەڵامی دەمی تیژ نەبوو.. و خڕبوو. کێشەکەر (سوارە = مەلۆ)ی پێهەڵدە گرتەوە و، یاخۆ قرشەی پێدەخستە سەر قادەی شەغرەوە.

***

**داسوکە:**

داسوکە: داسێکی گچکەبوو. دەمی زۆر تیژ نەبوو. کاری قەرانگی پێدەکرا. هێندە جاریش مێرد منداڵی تازە بێ خۆی فێرە دروونەبکات، دروونەی پێدەکرد.

***

لەبەر ئەوەی ژیانی خەڵکی دەشتی هەولێر بەزۆری لەسەر دەغڵ و دان بوو، دروونەکەری زۆر ئازای لێهەڵکەوتبوو.

بۆوێنە: برادەرێکی من ناوی (عەلی حوسێن حەوێز)ە، ئێستاش لە ژیاندا ماوە، ساڵێك دەچێتە گوندەکانی ناوچەی (چەمچەماڵ) دەبێتە سەپان و لە دروونەدا زۆر لەخەڵکی ناوچەکە ئازاتر بووە و ناویان نابوو (عەلی تەیارە).

**کێشە:**

کێشە: بەسێ مانا دێت:

١- کێشە: (سیراع) = ناکۆکی و ململانێ: (ئازاد و نەوزاد کێشەیان لەسەر پارەیە).

٢- قولفەیەکی (بەن)ە، یان (ئاسن)ە و لە دوا دامێنی کورتانی ولاخ و.. گوێدرێژ دەدرێت، بۆ ئەوەی ولاخ، یان گوێدرێژی دووەمی پێ قەتار کێش بکرێت.

٣- کێشه: کێشانەوەی (قرشه)یە، له پەرێزەوه بۆ سەر جۆخینان.

***

**شەغرە:**

قرشه له دەشتی هەولێر بە شەغرە دەکێشراوە، کەچی لەنێو کێو... هەڵەتان، بەکەلك نەدەهات. قرشەیان به شەڵتە، یان کۆڵ دەکێشاوه.

شەغرە چوار پەله داری تۆزێك له بالآی مرۆڤ بەرزتر بوو، لای سەرەوەیان کون بوو.. و بەهۆی دارێکەوە، کە بە (بەکرە) ناو دەبردرا، لەیەك دران بوون.

ئەولایەی بەرز و نەوی دەبوەوە (نێرە)ی ناو بوو ئەویتر (مێیە).

پەلە شەغرەکان هەر چوار، لای بنەوەیان لەلەی لێکرابوو، (بەنێکی ئەستووریان تێخرابوو. (بەنقادە)ی ناو بوو.

(قادە) دارێکی کەوانی بوو.بەنقادە سەرێکی بەقادەوە بەسترابوو سەرەکەی دی به شەغرەوه.

قادە قرشەی دەخرایە سەری و ڕایدەگرت و نەیدەهێشت لەکاتی شەغرە کێشانەوەدا قرشەکە بکەوێت.

شەغرە به قیتی لەسەر زەوی دادەنرا. پێچکەکانی دەبووایە نزیکەی مەتر و نیوێك لەیەك دوور و قادەکەش لەئاستیدا لەسەر زەوی دادەنرا.

دارێکی ڕاست، بەقەدی شەغرەکە هەڵدەواسرا و (ناوتیرە)ی پێدەگوترا، تاکو دانانی قرشەکە لەسەر قادەکە ڕاست هەستێت و بەلای ناوەوەی شەغرەکە نەخزێت.

تێلەکێش، یاخۆ پالّە، بە قەڵانگ، ئامێز ئامێز قرشەی لەسەر قادەکەی دادەنا. بە مەرجێك گوڵی قرشەکە له دیوی دەرەوە بێت، لەناوەوە بە هۆی بەقایم کردنی قرشه بە گوریسەوە دەپەڕی.

قرشەکە هەتا نیو مەتر زیاتریش له پێچکەی شەغرەکە بڵندتر دەبوو.

شەغرە لێنەرەکە گوریسێك بۆ قایم کردن، بە بەکرەی شەغرەکەوە بوو (له قادەکەی هەڵدەکێشا و لەو زەنگوڵەی کە بەکرەی شەغرەکەوە بوو)

دەخست و دەیهێناوە لە قادەکەی دووبارە هەڵدەکێشاوە. بۆ ئەوەی زۆر توووند بێت و قرشەکە لە ڕێگادا نەترازێت گوریسەکەی لە قەدی خۆی دەپێچا و هەردوو پێی دەدا بەرقادەکەوە و ڕایدەکێشا، تا زۆر توند دەبوو.

ئەو سەری گوریسەکەی لەو گوریسە دەبەستا کە لە نزیك قادەکەوە بوو.

شەغرە لێنەری چاك هەتا دەچووە سەر شەغرەیەکی نەدەزا.

شەغرەزان ئەوەیە قرشەکە لە ڕێگادا، لە قەدی شەغرەکەوە دەربێت. ئەو سادە بووایە دووبارە شەغرە لێنەرەکە بچێت قرشەکەی لە شەغرەکەی بنێتەوە.

***

**شەغرە کێش:**

منداڵ بوو، یاخۆ پیاو و ئافرەت قرشەی بە شەغرە لە پەرێزەوە دەکێشاوە بۆ سەر جۆخینان.

ئەگەر ڕێگاکە نزیك بووایە، مامزەی قەوچی وڵاخ، یان ئەو گوێدرێژەی شەغرەی لەسەر پشت بوو دەگرت و دیهێناوە سەر جۆخینان.

ئەگەر دوو وڵاخ، یان دوو گوێدرێژ بووانە، مامزەی قەوچی وڵاخ، یان ئەو گوێدرێژەی لە دوواوە بوو لە کێشەی کورتانی ئەوی یەکەمی هەڵدەکێشا و بە قەتار لە دواوەی دەهات. ئەگەر ڕێگاکە دوور بووایە، شەغرە کێشەکە سواری گوێدرێژێك دەبوو بە (مینەك) ناو دەبردرا.

شەغرە هەرکە دەگەیشتە سەر جۆخین، شەغرە کێشەکە، ڕووی دەکرد و سواری پشتی یەکەم دەبوو.. و ئەوی تر وەك پێشان بەدواوەی خۆی بکێش دەکرد و بەغار دەگەڕاوە سەر پەرێز. خۆ ئەگەر منداڵ بووایە، پیاو، یان ژنی خاوەن دەغڵەکە دەچوو شەغرەکەی ڕوو دەکرد.

***

قرشەکە لەسەر جۆخینەکە پەرت دەکرا و ئێوارە نزیکەی سەعاتێك، بۆ ئەوەی بچێتە پاڵ یەك و گەردەلوولە و هوڕە کاری لێنەکات گێرەی لەسەر دەکرا.

پێش ئەوەی پەرت بکرێت ژنانی ئاوایی دەچوونە سەر ئەو جۆخینەی کە لاسکی قرشەکەی درێژ و پتە و بوو قرشەیان دەسک دەسک دەکرد و گوڵەکانیان لە تاتە بەردێك دەدا، تاکو دەپەڕین و دەیانبردەوە و کەسێگیان لێ دروست دەکرد.

***

**وشی:**

منداڵ، یان ئافرەتی نەبووە و کەم دەرامەت، یان ئافرەتی گیشە کەری پەرێز، پاش دروونەی دەغڵ و هەڵگرتنەوەی سوارەکان، گوڵەگەنمی لە زەوی کە وتە هەڵدەگرتەوە، ئافرەتی کاسب هەبوو لەڕێگای شەغرە کێشانەوەی هەڵدەگرتەوە و دەیکرد دەسک دەسک و دەیبردە ماڵەوە بەکوتك، یان شوونك، یاخۆ کوتە دارێك گوڵەکانی دەکوتا و پاشدان بە بای دەکرد و دەغڵێکی باشی دەست دەکەوت. هەڵگرتنەوەی گوڵەگەنم بەم تەرزەی سەرەوە (وشی) پێدەگوترا.

***

**داس مەبە بۆ دروونە:**

وام بیستووە، بەڵام لەیادم نەماوە لە چ گوندێك ڕوویداوە:

بێوەژنێکی خاوەن یەك دوو منداڵی سەرکە و بنکە نیو عەلبە جۆی چاندبوو لەکاتی پێگەیشتنیدا کلۆ دێت و ئەویش ئێوارە لە مەلا بانگداندا دەچێتە لای برای و داوای لێدەکات و:

- برام من لە دارەتی دنیاپێدا ئەو تەبارە جۆیە شك دەبەم، کلۆش وا سەری تێناوە جا تکایە تا خلاس نەبووە سبەی لۆم بدوورەوە.

براکەش دەڵێت:

- پێمان ناکرێت.

بەیانی زوو، پێش ڕۆژهەڵاتێ بێوەژن دەست دەداتە داس و بەخۆی بچێت جۆیەکەی بدوورێتەوە.

برایەکەی پێی دەڵێت:

- خوشکم داسێ مەبە بۆ دروونە، قەلانگی سوارە هەڵگرتنەوە ببە.
توومەز شەو دەچێتە دروونەی جۆیەکە و دەیدوورتەوە و پێش ڕۆژهەڵات دەگەڕێتەوە.

***

**قاوەچی:**

پێشتر لە دیوەخانی گوندەکان (قاوە) لێدەندرا.

ئاغا دوو دیوەخانی هەبوو. یەك هی میوانی پیاو ماقووڵ و ئاغا و فەرمانبەران بوو.

پێشتر ئەویش وەك دیوەخانی کرمانجان ڕایەخی هەبوو. کەچی بەو دوا دواییە بەکورسی و مێز و قەنەفە ڕازابووەوە. قەدەغەی دانیشتنی کرمانجان بوو.

دیوەخانێکی گەورە زۆر لە ئەوەی یەکەم گەورەتر بوو.. و کرمانج لێیدادەنیشتن.

قاوە جاخ قۆرتێکی لاکیشی بوو. ئەملا و ئەولا قووناگردانەکەی دیواری دوو بیست بەرز و بەرینی خشتی تی بوو. ڕووی ئاگرەکە لە بنەبانێ بوو. دوو پەلە ئاسنی یان لەسەر لێواری دەرگاکەی گیرابوو.. و سێلۆکەی لەسەر دادەندرا، کە (بەردەسێڵ)ی ناوبوو.

پیاوی ئاوایی ڕۆژ تا ئێوارە وشەویش تا بە ترێکی دەچوو لێیدادەنیشتن. شەوانی زستانیش گەنجەکان (کەرەمستانێ) یان لێدەکرد. بەیانی زوو.. و نیوڕانان و ئێواران قاوە هەبوو.

قاوەکە ئاغا دەیکڕی.

قاوەچی پیاوێك بوو.. قاوەی لێدەنا. دوو سێ گۆلمە قاوەی لەنێو سێلۆکەکەی دەکرد.

(سێلۆك) وەك مەقلّی وابوو، بەڵام تەرحی حەوت جۆش بۆ ناو ئاگر پتەو بوو. کلکێکی درێژ و سەرێکی خڕی هەبوو. لەسەر ئاگری دادەنا و بە ئەستیو هەڵگێڕ و.. وەرگێڕی دەکرد. تاکو قاوەکە هەموولای وەك یەك ببرژێت.

ئەستیو ئاسنێکی پانی وەك لاپوتە و کلکدار بوو. سەری کلکەکەی خڕ بوو هەتا لەکاتی تێکدانی قاوە لەدەست گیر بێت.

سەری کلکی هەردووکیان ئەڵقەیەکی بۆ وەداریێ وەکردن پێوەبوو.

دووکەڵی ئاگرەکە جار وا بووە زۆر دەبوو.. و کەچی لەبەر ئەوەی دیوەخانەکە زۆر بڵند و پەنجەرەی هەبوو.. دانیشتووانی هەراسان نەدەکرد.

هەرکە قاوەکە دەبرژا لەنێو (ئاون = هاون = ئاونگ) ڕوو دەکرا.

(ئاون) لە مەفرەقی زەرد، درووست کراو و ناوی نزیکەی (٢٠) بیست سەنتیمەتر قووڵ بوو.

(مەفرەق) کانزایەکە وەك مس و حەوت جۆش و شتی تری لێدرووست دەکرا.

ئاون دیوارێکی پتەوی هەبووە. ژێری تەسك و دەرکی بەرین و بنکی دەرەوەی بە ئەندازەی دوو سێ سەنتیمەتر هاتبووە دەرەوە، هەتا لەکاتی قاوە کوتاندا نەکەوێت.

بە دەسکە ئاون قاوەکە لەناو ئاونەکە دەکوترا.

دەسکە ئاون لەهەمان کانزا درووست کرابوو. لای سەرەوەی خڕ و بنکی پان و ئەستوور تر بوو. لە نزیك سەرەوە گرێیەك هەبوو تا لەکاتی کوتاندا دەستی مرۆڤ لەشوێنی خۆی نەترازێت.

قاوە چییەکە بەدەستی چەپ لێواری ئاونەکەی دەگرت و بە دەستی ڕاستیش دەسکە ئاونەکەی لە قاوەکەی دەدا. هەتا قاوەکە لەژێر زەبری دەسکە ئاوندا نەپەڕێتەوە دەرەوە، لە هەوەلەوە قاوەچی دەسکە ئاونەکەی دادەگرت و لەسەر قاوەکەی دەسووڕاند. چونکە قاوە قلی خڕە و ئەوەی تەواو نەبرژێت لەکاتی کوتاندا هەڵدەقۆزتە دەرەوە. زۆر جاریش پیاوی ئەملا و ئەولا قاوەکەیان دەکوتا. ناوە ناوە قاوەچییەکە لەکاتی کوتاندا بنکی دەسکە ئاونەکەی لەملا و ئەولای ئاونەکەی دەدا و دەنگی قایمی لێوە دەهات. ئەمەش بۆ ئەوەی پیاوانی ئاوایی گوێیان لێبێت بۆ قاوە خواردنەوە بێن.

هەرکە کوتانەکە تەواو دەبوو لە نێو (جزوە) دەکرا.

جزووە مەسینەی قاوە لێنان = (حەوت جۆش) بوو.. و تایبەت بۆ قاوە دروست کرابوو.

جزوە دووان بوون و. گچکە و گەورە

قاوەکە لەنێو گچکەکە لێدەندرا.

هەرکە قاوەکە پێدەگەیشت قاوەچییەکە ڕاست دەبووەوە، بەڕێز قاوەی دەدا.. دانیشتووان.

(فنجان) = پیاڵەی قاوە = (پیاڵەی سینی) شوشەکەی وەك شووشەی فەخفوور سپیی شیری بوو.. و لێواری ئەستوور و پتە و بوو.

ناوەوەی لووس و سپی و دەرەوەش تەوشوتراشی ڕەنگاوڕەنگ. لێواری سەرەوەی قیچێك هاتبووە دەرەوە. لێواری بنەوە کەمتر و لەنێو سینی و شتی تردا بندرابووایە نەدەکەوت.

قاوە هەرکە دەخوراوە تامی دەم خۆشدەکات. کەچی چایە دەم دەترشێنێت.

هەرکە قاوەکە خلاسدەبوو خلتەی = (پاشماوەکە) لەنێو جزوە گەورەکە دەکرا. جار بەجار لەکاتی لێنانی قاوە، هێندە لە خلتە (شەربەتی جزوە گەورەکە). بۆ تام خۆشی لە قاوە تازەکە دەکرا.

هەرکە قاوەکە کۆتایی دەهات جزوەکان لەسەر بەردەسێڵەکە دادەنران و ئاگرەکەش دەکوژێندرایەوە.

***

**سووتەمەنی:**

سووتەمەنی قاوە لە ئاوایی خڕ دەکراوە.

قاوەچی بەنۆرە دەچووە ماڵە مەڕدارەکان قشپلی لێدەستاندن و قاوەی پێ لێدەنا.

***

قاوەچی جگە لە ئەوەی ڕۆژانە خەریکی قاوە لێنان بوو، هەردەم وەك (ناومالّ = دەست و پێوەند = خزمەتچی) لە مالّی ئاغا کاری دەکرد.

قاوەچی کرێیەکەی لەبەر ئەوە قاوەی دەدا جوتیاران لەسەر جوتیار = (فەلاح)ان بوو.

هەرکە کێشەی قرشەی گەنم دەست پێدەکرا قاوەچی هەر چاوێکی دەکردە چوار چاو و کام شەغرە بەدان بووایە = (گولّی قرشەکەی گەورە) سەری ئەو... ولاّخ و گوێدرێژەی دەگرت کە شەغرە قرشەیان لێبارکرابوو.. و بۆ سەر جۆخینی خۆی دەبرد.

ئەگەر فەلاحەکان (٦٠) شەست مالّ بوونایە، قاوە چییەکە (٦٠) شەغرە گەنمی پەیدا دەکرد.

شەغرەش ئەو سالّە (٦) شەش ڕبە گەنم هەتا (٨) هەشت ڕبەی تێدابوو. ئەوەندە (×) شەست بکە بزانە چەند دەکات. واتە جۆخینێکی گەورەی دەبوو.

ئەمەش ژیانی قاوەچی بوو.

***

**گێرە:**

گێرە دوو جۆر بوو:

یەکەم: چەند ولاّخ، یان گوێدرێژ قەوچیان بە یەکەوە شەتەکدەدران و لە سەر قرشە یان دەگێڕا. هەتا قرشەکە ورد دەبوو.

دووەم: جەنجەر:

جەنجەر لە چەند شت پێکهاتبوو:

١- دوو لای هەبوو... و پێشەوەیان کەوانی درووست کرابوو.. و (حوشترۆکە)ی ناو بوو.

٢- لە دیوی ژوورەوە لە ناوەڕاستی هەردوولا پارچە بەرمیلێکی لێدرابوو. (سێرۆکە)ی پێ دەگوترا. لەناوەندی سێلۆکەکە، کونێکی قوولّی حەوت هەشت سەنتیمەتر ئاسنی لێکرابوو.

٣- تۆپ: دارێکی ئەستووری پتە و نزیکەی مەترێك درێژ تایبەت بۆ باڵتە دروست کرابوو.

٤- باڵتە: دەمی جەنجەر: چەند ئاسنی تایبەت، لە شێوەی پێشەقان، دەم بەرینتر و زۆر تیژ دروست کرا بوون، بە پێچەوانەی یەکتر لە تۆپەکە قاییم کرابوون.

٥- ئەمسەر و ئەوسەری تۆپەکە پارچە ئاسنێکی درێژی نزیکە دەدوازدە سنتیمەتر تێگیرابوو. (کلچووکە)ی پێ دەگوترا. لەنێو کونی سێلۆکەکەی دەندرا لە کاتی جەنجەر گێڕاندا. بۆ ئەوەی کلچووکەکە. کار نەکاتە سەر کونی سێلۆکەکە (بەزوکارەموو = مووی کار)ی لە جیاتی گریز تێدەکرا.

٦- هەردوو سەری لایەکانی جەنجەڕ دارێکی چوار گۆشەیی و نزیکە بیست سەنتیمەتر بۆ کرابوو (پرد) یان پێدەگوترا.

٧- دوو داری سەرەوەیان خڕ و ژێرەوەیان تەرحی شەپکە، ئەمسەر و ئەوسەریان کون دەخرانە پردەکەوە (جسر) یان ناو بوو.. و نەیاندەهێشت لایەکان بکەونە خوارەوە.

٨- پێش و پاشی خەنجەرەکە شەپکە داری لێدرابوو (دەفە) یان ناو بوو.

٩- دارێك درێژی مەترێك زیاتر، لە پێشەوە، لەژێر حوشترۆکە، هەر دوو لا جەنجەڕی بەیەکەوە بەستابوو. بە (دار ئەقرەبە) ناو دەبردرا.

١٠- (ئەقرەبە) ئاسنێکی پتەو و ئەستوور بە ئەندازەی دوو پەنجان درێژ، لەشێوەی کلکە دووپشك بوو. لە ناوەندی دار ئەقرەبە = کوتەدارێکی ئەستوور بوو لە بنەوە حوشترۆکەکەکانی ڕاگیر کردبوو، کوترا بوو.

١١- دار مژانە سەری لای جەنجەڕی قەفیزێکی پێوەبوو لە ئەقرەبەکەی هەڵدەکێشرا و سەرەکەی دی بەهۆی کونێکەوە لە (بۆسە)ی = قەفیزێکی دار بوو، بەنیرەوە بەسترابوو هەڵدەکێشراو جەنجەڕەکەی ڕادەکێشا.

١٢- دار نیر و کۆپەران و بۆسە و بەر بۆسە لە باسی جوت و جوتیاری بە تێر و تەسەلی باس کراون، پێویست ناکات لێرەدا دووبارە بکرێتەوە.

١٣- لەلای پشتەوەی جەنجەڕەکە دارێك بوو وەك دار ئەقرەبە هەردوو لای جەنجەڕەکە بەیەکەوە بەستابوو.

١٤- چانە: ئەمەیان دوو بابەتە:

أ- لە دار شەقرە و بەرچیغ و کەبەر و شتی تر درووست دەکرا و شتی گرانیان دەخستە سەر و پێشتر لە جیاتی جەنجەڕ قرشەیان پێدەکوتا.

ب-چانە = چانچانۆکە = (کوچکوچە). لە پەلەدار و کەبەر و شتی تر درووست دەکرا و بەرینی و درێژی لە مەترێك زیاتر نەدەبوو.. و بە پەتێك لە داری پشتەوەی جەنجەر دەبەسترا. تاکو قۆرت و گرێ و گواری ژێر دەمی جەنجەر نەهێڵێت و لووسی بکات.

١٥- بنی دار خوشترۆکەکان، ئەو کەرخانەی لەسەر قرشە دەخزێن، بۆ ئەوەی لەکاتی جەندەڕ کردندا بە قرشە نەسوێن پارچە ئاسنێکی تەنك لەشێوەی بەرمیلیان لێدرابوو بە (شیرۆکە) ناو دەبردران.

***

سەپان، یان خاوەن ماڵ هێندە قرشەی، بە (شەنە)ی ئاسن لەبەر نووك تیژی و ڕەقی لەقرشە دەچووە خوارەوە، بەشەنەی دار نەدەکرا، بە ئەندازەی دەمی جەنجەڕ قرشەی لە جۆخینەکەی دادەبڕی و بە (پێ) ناو دەبردرا.

دارێك لە ناوەڕاستی جۆخینەکە دەکوترا (ستوون)ی ناوبوو. دوو وڵاخ، یان دوو گوێدرێژ، ئەوەی جەستە سووك و خۆشڕەو بوو لە (سەرە) = لای دەرەوە دەیەخرا، ئەویتر دەبووایە جەستە گران و بە هێزتربێت و گرانی زۆری لەسەرشان و ملی ئەم بوو. (بنە)ی پێدەگوترا.

مامزەی قەوچی سەرە لە زەناخەی بنە دەبەسترا.

گوریسێك لە قەوچی بنە دەیەخرا و سەرەکەی دی (هێچکدرا) بوو لە دار ستوونەکە هەڵدەکێشرا. بەهۆی ئەم دارەوە لەنگەری گێرەکە ڕادەگیرا و

ولاخــەکان نەیانــدەتوانی بــۆ دەرەوە بچــن. بــە بێدەســەڵاتی خۆیــان دەسووڕانەوە.

جەنجــەڕ هەرکــە بەگڕدەکــەوت ئــەو قرشــەیەی دەکەوتــە لای دەرەوەی جەنجەڕەکە (ڕۆخە)ی ناوبوو. ئەویتر (چاوە). ناوەناوە جەنجەڕوانەکە چاوە و ڕۆخەکەی هەڵدەداوە ناوەڕاستی پێیەکە.

بۆ ئەوەی قرشەی ژێرەوەش ورد ببێت، تاو نا تاوێك، بە شەنە هەڵدەدرا و (پەڕە ناو)ی پێدەگوترا.

ئەمە (قرشە کوتی) ناو بوو. بەلای دەرەوە هەڵدەدراوە. هــەتا جۆخینەکــە تەواو دەبوو.. و ناوەڕاستی چۆل دەمایەوە.

کوتانی دووەم (وردەکوت) بوو. دار ستوونەکە ئەوسا لــە زەوی دەکــوترا. ورد کراوی جاری دووەم بە لای ناوەوە هەڵدەدراوە.

هەرکــە وردە کوتیشــی تــەواو دەبــوو.. هــەموو هەڵــدەدراوە ســەر یــەك و (تارمە)ی ناو بوو.. تارمەکە دەبووایــە درێــژی بــەلای ڕۆژهــەڵات و ئــاوا بێــت. کەچی بەری تەسکەکانی بەبەرواژی بوون.

***

**شەنەبا:**

شەنەبا لەکاتی هەڵکردنی (بــا)ی (شــەماڵ) دەکــرا. چــونکە نــەرم بــوو.. و (با)ی (هوڕە = ڕەشەبا) بەهێزە و دانی لەگەڵ خۆی دەبرد.

ڕێزە بەردی پڕ چنگی لە دیوی خۆرهەڵاتی تارمەکە دادەندرا. هــەتا ببێتــە (فاسیلە)ی نێوان (کا) و (دان)دا.

هەرکە کاودان لەیەك جیا بوونایە، دەغڵەکــە (ڕەوســە) بــوو.. و کایەکــەش (تارمەی کا).

تاکو تارمەکە کای زۆر بووایە شــەنەبای بــە شــەنەی ئاســن دەکــرا. هەرکــە دەغڵ دەردەکەوت و کاش کەم دەبوو بەشەنەی دار دەکرا. چونکە دەغڵ لــە نووکی شەنەی ئاسن گیر نابێت و هەڵناسێت.

***

**شەقڵ:**

شەپکە دارێکی تایبەت دروستکراو درێژی نزیکەی (٢٠) سەنتیمەتر و پانیشی (١٥) پازدە. ڕووەکەی بە هێڵی چەوت و چەماوە قوول کرابوو.. و پشتی دەسکێکی هەبوو بۆ دەست پێوەگرتن.

لە گوندەکانی ئاغا نشین هەرکە لەکاتی شەنەبادا دەغڵ تۆزێك لە (کا) جوودا دەبووەوە، ئێوارە لە کاتی خۆرئاوابووندا شەقڵچی لەناو جۆخینان دەگەڕا و شەقڵەکەی لەسەر بڵندایی ڕەوسەکەیدا دەنا و بەرەو خوارەوەی دەهێنا، لە داوێنی ڕەوسەکەدا شەقڵەکەی دادەگرت، ئەو دەغڵەی لەگەڵ شەقڵەکە هاتبووە بنەوە، نەخشی شەقڵەکەی لە چەشنی مۆر پێوەی دیاربوو.. و کێشکە پێهەڵبگەڕابووایە دەزاندرا. ئەم شەقڵ کردنەش، بۆ ئەوەی بوو، نەبادا جوتیار شەوان هەندە دەغڵ بباتەوە ماڵ و زەرەر لە تاپۆی ئاغا بکەوێت.

شەقڵچی ئەو کەسەبوو بە شەقڵ کردنی ڕەوسەی دەغڵ هەڵدەستا. هەرگیز نابووایە شەقڵەکە بشکێت، هەتا بەیانی لەکاتی ڕۆژهەڵاتدا شەقڵچییەکە دەچووە سەیری شەقڵەکەی دەکرد، نەشکاوە، ئەوجا ڕێگەی بە جوتیارەکە دەدا شەنەبا بکات.

ئەگەر شەقڵە بشکابووایە، ئاغای هێندە گوندان زۆر تووڕە دەبوو.. و جوێنیشی بەدوا دەهاوێشت.

***

**ڕەوسە بڕ کردن:**

ڕەوسە بڕ کردن تەنیا لە زەمانی ئاغاکان بوو، کە زەوی دێهاتەکانیان لەژێر دەست دابوو.

لەدوای شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژی ساڵی (١٩٥٨)دا هەرچی جوتیار بوو، بووە خاوەن زەوی خۆی و ڕەوسە بڕ کردن نەما.

هەرکە بە جەواڵ، یان خراریان دەبردەوە، جەواڵێك و خرارێك دەپێورا ئەوانی دیکەیان بە گوێرەی ئەو جەواڵ و خرارە دەقرساند. خۆ ئەگەر بە

دەڕاسە بدووڕابووایەوە، دەغڵیان بە عارەبانەی تەرەکتەر دەبردەوە ماڵ و عارەبانەکییان دەپێوا.

ڕەوسە بڕ کردن لە زەمانی ئاغاندا بەم تەرزە بوو.

سەپانی ڕەوسەکە، بابڵێین: (چوار بوونە) و چواری دیکەشیان بە دەستەوا، لە دەور و جیران دەهاتن. دەستیان دەدا تەشت و بێژینگ، (سەرەند) دانی لێگیر نەدەبوو.. و بەکاریان نەدەهێنا، ملیان لەبەر ڕەوسەکە دەنا و هەرکەس ئامانەکەی دەستی لە ڕەوسەکە دەنا و بەسەری دەکرد و کەسێك لە شوێنی خۆی هەڵنەدەستا، هەتا سەرپاڵەکە هەڵنەستابووایە و ژمارەکەشی بەم جۆرە دەگوت:

ـ ئەوە یێك...

لە شەیتانیٚ پشکیٚ نێك.

لنگی ببێتە سێپێك.

یێ .. ك.. یێك.

دەچوون دوو سیٚ هەنگاو دوور لە ڕەوسەکەیان ڕوودەکرد و دووبارە ئامانەکانیان پڕ دەکردەوە و:

ـ ئەوە دوو...

بەرەکەت بیٚ لە کنە توو

لە شەیتانی ڕەشبیٚ ڕوو

چاو کوێرەی ڕدێن بە گوو

بەکۆڵانآندا دەچوو

منداڵی دەکەوتنە دوو

تا کونە گورگ و دارەتوو.

دوو.. دوو.

دەچوون لەسەر ئەوی دیکەیان ڕوو دەکرد.

ـ ئەوە سیٚ....

بەرەکەت بکەوتە ڕەوسیٚ

خودا بیدا و پێغەمبەر بنووسێ

یا شێخی ماڵ لە قدووسێ

چاوی چاوپیسان بنووسێ

سێ.. سێ.

بەم شێوە ڕەوسەکەیان بۆ پێنج کۆمەڵ وەك یەك بڕ دەکرد. دەستەیەکیان بە جیا دادەنا و بە ڕبە دەیان پێوا. ئەوسا بەهۆی زانینی ژمارەی دەستەکانەوە دەزاندرا ڕەوسەکە چەند بووە. لە هەوەڵەوە دەبووایە، کۆمەڵەی ئاغا (٢٠٪) بەیەك کەڕەت دابگرن و بۆ ئاغای ببەنەوە. جا با دەباریش بووایە.

***

**تاپۆی کوزر:**

ئاغای هێندە گوندان لەکاتی ڕەوسە بڕکردندا دەستی لەنێو کووزری جۆخینەکە دەگێڕا ئەگەر قلە دەغڵی بەرچاو بکەوتبووایە، ئەوسا ڕبە دەغڵێکی لە کۆمەڵەی جوتیارەکە دەبرد و لەسەر کۆمەڵەی خۆی ڕوو دەکرد و دەیگوت:

- ئەوەش تاپۆی ئەو. دەغڵەی لەناو کوزەرەکەمایە.

ئاغاش هەبوو ئەمەی هەر بە خەیاڵیش دانەدەهات.

***

**کرێی شەقڵچی:**

لەدوای ڕەوسەبڕکردناندا ئاغا، یەك دوو ڕبەی لە بەشی جوتیارەکەی دەبرد و دەیخستە سەر بەشەکەی خۆی و دەیگوت:

- ئەمەش حەقی شەقڵچییە.

***

لەبەر ئەوە مقامی دروونە و ڕەوسە بڕکردن و ساوار کوتان لە زۆر شوێنان بڵاو کراونەتەوە بۆیە بە پێویستم نەزانی لێرە بیانخەمە سەر کاغەزەوە.

***

**خەرمانلۆخە**

(خەرمانلۆغە)شی پێدەگوترا.

ئێمە منداڵ هەرکە دەمانزانی (ئەمڕۆ ڕەوسەی فلان جوتیار بڕ دەکرێت) دەچووین و دەمانگوت:

- خەرمان بەرەکەت.

ئەویش دەیگوت:

- خێر و بەرەکەت.

هێندە کەسیش هەبوو لە ژیاندا سوحبەتچی بوو لەجیاتی (خێر و بەرەکەت) دەیگوت:

- .... بە .... کەرەکەت.

دوو سێ مستی گەورەی پڕ هەردوو ناو لەپی کراوەی لە کۆشمان دەکرد.

ئەو وەختانەش خۆشناو میوەیان بۆ فرۆشتن دەهێنا. ڕۆژنەبوو خۆشناو نەیەتە گوندەکەمان. بە زۆریش ترێیان دەهێنا. خەرمانلۆغەکەمان بە ترێ دەدا و کۆشمان پڕ دەبوو. دوای تێر بوونمان بۆ ماڵەوەمان دەبردەوە. کراسمان لە ئاوی ترێ هەڵدەگەڕا. هەندە کەس درەنگ دەیشوشت و ئاوی ترێی پێوە ڕەق دەبووەوە و لە دوورەوە دیار بوو.

***

**کا کێشان:**

هەرکە کاری ڕەوسە کۆتایی دەهات، ئەوجا کایان بە (شەلتە) و (ڕەشکە) دەکێشاوە. ئەمەیان تایبەت لە موو درووست کرابوو، کەچی ئەویان بەڕی ساکار بوو. هەر دوولای تەسکیان دەدووری و لایە درێژەکەی کای تێدەکرا. چوار قولفیان بۆ درووست دەرکرد و دوای کا تێکردن گوریسیان لە قولفەکان هەڵدەکێشا و توندیان دەکرد. کەچی ڕەشکە، کونی خۆی هەبوو ئەمەی نەدەویست. بە شەنە کایان لەناو ڕەشکە و شەڵتەکە دەکرد و دەیان پەستاوە و جا بە گوریس دەیانبەستاوە و دەیانخستە سەر پشتی گوێدرێژ، یان وڵاخ و یەکێك بە دەستێك شەڵتەکەی دەگرت و بە دەستەکەی دی

ڕەشمەی وڵاخەکە و کایەکەی دەبردە ڕۆخ (لەودە) و فڕێیدەدا ناوی و ئەوجا گوریسەکەی دەکردەوە و کایەکەی ڕوو دەکرد.

هێندە جوتیار خانوویان لە جیاتی (لەودە) بۆ کا درووست کردبوو. هەرکە وەختی کاکێشان دادەهات پشتەوەی خانووە کادینەکە) یان، بەو ئەندازەیەی کون دەکرد شەڵتەی پێوە بچوو بووایە پێیدە گوترا: (کاڕێژ).

***

**لەودە:**

جوتیار هەبوو (لەودە)ی بۆ (کا) درووست دەکرد. ئەگەر کایەکەی زۆر بووایە لەودەیەکی دە پازدە مەتر درێژ و دوو مەتر (٢) بەرین و بەرزیش مەتر زیاتر. بۆ ئەوەی لە زستاندا ئاو نەدزێت دیواری هەر چوار لای دەرەوە مارنج دەکرا. (کا)ی بە پەستان تێدەکرا. بەهۆ پەستانی کاوە، دیوارەکان بەلای دەرەوە دانەچن (پاڵپشت) بۆ هەرچوار لا دەکرا. پێیدەگوترا (گولتە)، یان (ڕکە). لام وایە لە ناوچەی ساڵەییدا (پاڵەوانە)ی ناوە. هەرکە لەودەکە لە (کا) بەسەر کرا تەنکە قەسەلێکیان لەسەر دادەنا و.. وەك سەری خانووی (جزیری) سواق دەدرا. لە هێندە شوێنان هەرکە لە وەرزی زستا لەودەیان دەشکاند، بۆ ئەوەی لەکاتی باراندا (کا)یەکەی کەرخی شکاوەکە تەڕ نەبێت کونیان لە دیوارێکی تەسکایی دەکرد و کایان بەبن کۆڵیدەهێنا دەرەوە و سەرەکەش بە نەشکایی دەمایەوە.

***

**بن جۆخین:**

هەرکە ڕەوسەی گەنم، یان جۆ هەڵگیرا (دان) لە بنی جۆخینەوە دەمێنێت. خاوەنەکەی بە گەسك جوانی دەماڵێت و خڕی دەکاتەوە و لە هەوەلەوە، تا خۆڵەکەی لێ جودا ببێتەوە بەبای دەکرد. جا بە تەتەڵە کردن دانەکەی لە بەردە وردەکانی جێی جۆخین پاك دەکردەوە.

هەندەجار بەردە وردی هەر دەما و ئەوسا بەردەشۆری دەكرد. واتە دەیشوشت. دانە وێڵە سووكە و بەسەر ئاو دەكەوێت بەردیش گرانە و بن دەكەوێت و لە یەك هاوێر دەبوون.

***

**خاپەرۆك:**

هەركە كا و دانی جۆخین كۆتاییان هات و دەست بەبن جۆخیندا هێندرا، ژن و منداڵە فەقیر و نەبووەكان دەچوون خۆڵی ژێر جۆخینانیان دەماڵی و پاشدان خۆڵەكە یان بەبا دەكرد، دوو سێ گۆڵمە گەنم و جۆیان دەست دەكەوت. ئەمەش بە (خاپەرۆك) ناو دەبردرا.

***

**ساوار كوتان:**

قۆرتێك بە گوێرەی جێگەی چوار سەرەكوتكان و دوو تەنەگە ساوار پتر بگرێت لێدەدرا و ناو و ڕۆخی و نزیكەی مەترێك دوور بە قورە سۆر سواق دەدرا. چەند ڕۆژ لێدەگەڕان هەتا وشك دەبووەوە. ئێوارەیەك، پاش نوێژی مەغریب خاوەن ساوار لە دوای گەنجەكانی ئاواییان دەنارد و كوڕ گەلێ بەو پەڕی زەوق و گوراحی خۆشییەوە ڕێچكەیان دەبەستا. هەر چوار دەوری قۆرتەكە، مەوج ڕێژ دەكرا. تاكو ئەگەر قلە ساوار لەگەڵ كوتك لێداندا بپەڕێت بكەوتە سەر مەوجەكانەوە.

ئافرەتی ماڵەكە قۆرتەكەی لە ساوار پڕ دەكرد و بۆ ئەوەی ساوارەكە، بە زەبری كوتكان ورد نەبێت، تەنیا تفرەكەی هەڵبدات ساوارەكەی بە ئاو تەڕ دەكرد.

چوار كوڕە جاحێڵ دەستیان دەدا كوتك و دوو، دوو بەرامبەر یەكتر، سەرۆكەكە ئەو كەسەبوو مقامەكەی دەگوت و لەگەڵ بەرامبەرەكەی بەیەكەوە كوتكەكانیان بەرز دەكردنەوە و بە یەك كەڕەت بە ساوارەكەیان دادەدا و لەگەڵ بەرز كردنەوەدا دووەكەی دی بە ساوارەكەیاندادەدا. ئیتر بەم جۆرە دوو كوتك لەناو قۆرتەكە بوون و دووانیش لەحەوا.

هـەرجارێ بـە ئەنـدازەی سـەری کوتکـەکان گەنجـەکان پێـی خۆیـان دەگواستەوە و بازنەیی دەسووڕان.

سەرۆکەکە دەستی بە گوتن کرد و دووەکەی دی دەیانگێڕاوە.

ـ حاللا یاللا، حاللا یاللا.

حاللا یاللا، حاللا یاللا.

ئەو ساوارە گەنمی پارە

ئاگات لێبێ کابان هارە.

حاللا یاللا، حاللا یاللا.

ـ لەگەڵ تۆومە توو بگێڕەوە

چاوی مۆنت مەشێرەوە

ئەوەی لەکنت بینێرەوە

حاللا یاللا، حاللا یاللا.

ـ هەروا دەڕوا بناو بنە

سۆلی زەردە و مەحس چنە

خۆی لێ مەدەن بێوەژنە

حاللا یاللا، حاللا یاللا.

ـ دانیشتووە لەبن تووێ

ئارووی دەخوا بە چەقوێ

سوبحانەڵلا تەبعم چووێ

حاللا یاللا، حاللا یاللا.

هەرکە ساواری نێو قۆرتەکە دەهاتـە ئـاخر و ئـۆخری، پـێش تـەواو بـوونی ئاوازەکەیان بە سووکتر دەگۆڕی و کوتکەکانیان سووك و توندتر لێدەدا.

ـ لەتەیران وەزئەیرۆکم

لە باخان گوڵی کۆکم

وەز ئاشقی ناو عەیشۆکم.

حاللا یاللا، حاللا یاللا.

لە تەیران تەیرە سپیمە
لە باخان هەڵنیشتیمە
وەز ئاشقی ئاو ئەستیمە
حاللا یاللا، حاللا یاللا.

ماوەی هەر دە، دەقیقە، چوارێگێك كوتك لە مستەكان ڕادەوەستان و ئافرەتەكە، ساواری ناو قۆرتەكەی هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەكرد و ئەوساوارەی پەڕیبووە دەرەوەی قۆرتەكە لەناوی دەكردەوە. بەم تەرزە هەتا ساوارەكە تەواو (پەركۆ) دەكرا. واتە تفرەكەی سەری فڕێدەدا. قۆرتەكەی بەتاڵ دەكرد و چینێكی دیكەی تێدەكرد: بە نزیكەی سەعات و نیو، دوو سەعاتێك ساوارەكە پەركۆ دەكرا.

ماڵەكە پێشتر قەرتاڵە ترێیەكیان لە خۆشناوان كڕیبوو لەگەڵ داندۆك لە پێشیان دانان. ئەوانەی دەستیان بە كوتكیش نەكە وتبوو لە خواردن بەشدار دەبوون.

دوای دوو سێ ڕۆژ هەڵخستن و كرزبوونەوەی ساوارەكە ئەوجا بە دەستاڕ لێدەكرا. لەم دواییەدا ئاش پەیدابوو.. و پێویست بە دەستاڕ نەما.

***

**بڕووش** = بڕووێش

گەنمی بڕووشی وەك ساوار نەدەكوڵا. تەنیا گەنمی ساغ بوو بە دەستاڕ لێدەكرا. بەو دواییە لە ئاش لێدەكرا.

***

مقامی ساوار كوتان یەكجار زۆرن، بەڵام لە زۆر شوێنان بڵاو كراونەتەوە بۆیە بەپێویستم نەزانی لێرەیان بڵاو بكەمەوە. نووسەر)

***

**مەڕ و ماڵات:**

مەڕ و ماڵات لە دوو وشە پێكهاتووە:
یەك مەڕ. دوو ماڵات.

مەڕ بەو سپیانە مێیەی دەڵێن کە دوو ساڵ و نیوی تەواو کردبێت و بۆ دووەم جار بەران بخوات.

کەچی فەرهەنگی خاڵ دەفەرموێت: ((ئەو سپیانەیە کە پێی نابێتە چوار ساڵ)).

بە فەرموودەی مامۆستا دەبێت لەدوو بەرخ ڕەت بدات جا پێیدەگوترێت ((مەڕ)).

ئەمە لە دواییدا باس دەکرێت.

مالات سپیان و ڕەشان و ڕەشەوڵاخیش دەگرێتەوە. مەبەست لێرەدا سپیان و ڕەشانە.

مەڵات بە تەنیاش ئەم مانایەش دەگەیەنێت. دەگوترێت ((مالاتەکەم قڕی کرد)). واتە سپیان و ڕەشانەکانم یەکیان نەمان.

مەڕ و مالات دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: ئەوەی خوریدارە و لەمەڕە، گەورە و بچووک (سپیان)ی پێدەگوترێت.

جۆری دووەم: ئەوەی مووادارە و لە بزنە گەورە و بچووک ((ڕەشان))ی ناوە.

***

**مێگەل:**

مێگەل = گەلە: کۆمەڵە ڕەشان و سپیانێکە ژمارەیان بگاتە (٤٠) چل و حەدی دەرکردنی زەکات. ئەو سا دەگوترا فلان مێگەلە مەڕێکی تەواوی هەیە و زەکاتی لێدەکەوێت.

لە چل کەمتر پێی دەگوترا: (کوتە مێگەل).

مێگەلوان = مێگەلەوان، شوانی گەلە.

## بەشی یەکەم: سپیان

سپیان لە دەشتی هەولێر سێ جۆرە:

١- سپیانی کوردی: باڵابەرز و درێژ و بەتەنگە و دونگ شۆڕە و خوری زۆرە و تیسکنە. لە ڕۆیشتندا شل و خاوە زۆر بەشیرە.

٢- سپیانی عارەبی: خڕ و گورج و توند و تۆڵە و کەلەش گچکەیە و کەم خورییە، بەڵام لە خوری سپیانی کوردی سپی ترە. شیری کەم و زۆر چەورە.

٣- سپیانی تورکی: لە ڕەسەنە مەڕی کوردی و عەرەبی پەیدادەبێت. خوری سپی و پەل ئەستوور و باڵای هەندێ مەڕی کوردی دەبێت، بەڵام بە تەنگە و شۆڕە نیە لە ڕۆشتندا توند و تۆڵ و زۆر بەشیرە.

***

**سپیانی پەسەند بۆ ڕاگرتن:**

بابزانین کام جۆرە سپیان لەم سێ جۆرە ڕاگرتنی لە دەشتی هەولێر پەسندە.

لە ئاخر و ئۆخری وەرزی بەهار و سەرەتای وەرزی هاویندا هەرکە شینکە نەما ڕووەکێك شین دەبێت پێی دە ڵێن: ((سورناتك)) بەتایبەتی لەنێو کێڵگەی وەرد و شۆدا. ڕووەکەکە هەوەلجار زۆر ناسکە و سوریشە و مەڕ و ماڵات باشی دەخۆن. ئەو سپیانەی کە پێستەی زۆر سپییە، هەرکە ئەو ڕووەکە بخوات هەموو لەشی دەبێتە برین و شەقار شەقار دەبێت. نەخەسەلە سەروچاو و گوانی.

سپییانە سورناتك پردووەکە دەم لەخۆ دەنێت. واتە بە ددان برینەکانی دەخورێنێت و گەورە تریان دەکات.

خاوەنەکەی بە خوێ و کەرە و تەنی برینەکانی تیمار دەکات. بەڵام بێ سوودە. ئەگەر سپیانەکە مەڕە زابێت ئەوساڵە شیری وشك دەکات. زۆر جاریش گوانی سەقەت دەبێت.

بۆیـه شـوانی بـاش و مـەعلان تـا سـوڕناتك پـیر نەبووایـه و كـاتی بەسـەر نەچووبووایە مێگەلی خۆی بەناو كێڵگەی وەرد و شۆدا نەدەگێڕا.

سـپیانی عـارەبی و تـوركی پێسـتەیان زۆر سـپییە و بەرگـەی سـوڕناتك خواردن ناگرن. ڕاگرتنیان لە دەشتی هەولێر پەسەند نییە.

سپیانی كوردی زۆربەی هەرە زۆریان بێ (قۆچ)ن، تەنیا كەمێكیان نـەبێت. ئەویش پێیـدەگوترێت ((كـەرین)). بـە بۆچـوونی مـن لـە وشـەی ((قـەرن))ی عەرەبی وەرگیراوە هەرچۆنێك بێت موڵكی كوردە.

***

**ناوی سپیانی كوردی بەگوێرەی ڕەنگ ئەمانەن:**

١- بازی: سپیانێكە پەلەكانی، سپی بێت، یان دوو ڕەنگ.

٢- بەڵەك: سپیانی ڕەنـگ ڕەش و سـپی، یـان سـوور و سـپی، یـاخۆ زەرد و سپی.

٣- تە = ((چەرموو)): ئەمە چوار جۆری هەیە:

أ- ((تە)) ڕوومەت ڕەش: ئەو سپیانەیە كـە خورییەكـەی هـەموو سـپییە تەنیا دەم و چاوی ڕەشە.

ب-((تە)) ڕوومەت زەرد: سپیانێكە لەش سپی و دەم و چاو زەرد.

پ- ((تە)) ڕوومەت سپی: سپیانی لەش و دەم و چاو سپی.

ت- ((تە)) ڕوومەت شـین: ئـەو سـپیانەیە جەسـتەی سـپی و ڕوو شـین = ((كەوی)).

ئەم دوو جۆرەی دوایی زۆر كەمن.

٤- تەبەش: سپیانی دەم و چاو ڕەش و نێوچەوان سپی.

٥- ڕسەر: ئەمە دوو جۆرە:

أ- ڕسەر شین:

سپیانێكە خورییەكەی هەموو سپییە، تەنیا لەكاتی ساواییدا دەم و چـاو و ملی شینە. كە گەورەبوو بـە ئاسـتەم بـۆرایی ملـی دەمێنێـت و دەم و چـاوی مەیلە و ڕەشدا دەگەڕێت = ((كەوی)).

بۆیە شوانی باش و مەعلان تا سورپناتك پیر نەبووایە و کاتی بەسەر نەچووبووایە مێگەلی خۆی بەناو کێڵگەی وەرد و شۆدا نەدەگێڕا.

سپیانی عارەبی و تورکی پێستەیان زۆر سپییە و بەرگەی سورپناتك خواردن ناگرن. ڕاگرتنیان لە دەشتی هەولێر پەسەند نییە.

سپیانی کوردی زۆربەی هەرە زۆریان بێ (قۆچ)ن، تەنیا کەمێکیان نەبێت. ئەویش پێیدەگوترێت ((کەرین)). بە بۆچوونی من لە وشەی ((قەرن))ی عەرەبی وەرگیراوە هەرچۆنێك بێت موڵکی کوردە.

***

**ناوی سپیانی کوردی بەگوێرەی ڕەنگ ئەمانەن:**

١- بازی: سپیانێکە پەلەکانی، سپی بێت، یان دوو ڕەنگ.

٢- بەڵەك: سپیانی ڕەنگ ڕەش و سپی، یان سوور و سپی، یاخۆ زەرد و سپی.

٣- تە = ((چەرموو)): ئەمە چوار جۆری هەیە:

أ- ((تە)) ڕوومەت ڕەش: ئەو سپیانەیە کە خورییەکەی هەموو سپییە تەنیا دەم و چاوی ڕەشە.

ب-((تە)) ڕوومەت زەرد: سپیانێکە لەش سپی و دەم و چاو زەرد.

پ- ((تە)) ڕوومەت سپی: سپیانی لەش و دەم و چاو سپی.

ت- ((تە)) ڕوومەت شین: ئەو سپیانەیە جەستەی سپی و ڕوو شین = ((کەوی)).

ئەم دوو جۆرەی دوایی زۆر کەمن.

٤- تەبەش: سپیانی دەم و چاو ڕەش و نێوچەوان سپی.

٥- ڕسەر: ئەمە دوو جۆرە:

أ- **ڕسەر شین:**

سپیانێکە خورییەکەی هەموو سپییە، تەنیا لەکاتی ساواییدا دەم و چاو و ملی شینە. کە گەورەبوو بە ئاستەم بۆرایی ملی دەمێنێت و دەم و چاوی مەیلە و ڕەشدا دەگەڕێت = ((کەوی)).

**ب– ڕسەر زەرد:**

خوری سەرتاپا سپی و مل و دەم و چاو زەرد.

٦– **ڕەش:** سپیانی خوری سەرتاپا ڕەش.

٧– **زەرد:** سپیانی خوری زەرد.

٨– **سوور:** سپیانی جەستە سوور.

٩– **سەر بە پۆرد:** سپیانێکە خوری تەپڵی سەری وەك کڵاو بەرز بوو بێتەوە.

١٠– **سەر... ڕەش:** سپیانی خوری سپی، تەنیا سەر و چاو و ملی ڕەشە.

١١– **قولە:** سپیانی خوری سپی و دەم و چاو سوور. ئەمەش سێ جۆرە:

أ– **قولە تارە:** سوورەکەی زۆر تۆخە.

ب– **قولەسیسە:** سوورەکەی ((ئاچوغ = سپیواژی))یە، یان قولە زەردی پێدەگوترێت. لەجیاتی: سیسە.

پ– **قولەمس:** جگە لە سووری دەم و چاو خەتی ڕەش، یان زەردی هەبێت. ئەمەش دوو تەرحە:

**یەکەم:** قولە مس تارە، ئەگەر سوورییەکەی تۆخ بێت.

**دووەم:** قولە مس سیسە: ئەگەر سوورییەکەی کراوەبێت.

١٢– **کەویسار:** سپیانی ڕەنگ شین و سپی تێکەڵاو.

***

**کەواتە ناوی سپیان بەگوێرەی ڕەنگ نۆزدە ((١٩)) ناوە ئەمانەن:**

١– بازی.

٢– بەڵەك.

٣– تەڕوومەت ڕەش.

٤– تەڕوومەت زەرد.

٥– تەڕوومەت سپی.

٦– تەڕوومەت شین.

٧– تەبەش.

٨– ڕسەر زەرد.

٩- ڕسەر شین.

١٠- ڕەش.

١١- زەرد.

١٢- سۆر.

١٣- سەر بە پۆرد.

١٤- سەر.. ڕەش.

١٥- قولەتارە.

١٦- قولەسیسە.

١٧- قولەمس تارە.

١٨- قولەمس سیسە.

١٩- کەویسار.

***

**ناوی سپیان بەگوێرەی چەشنی گوێ:**

سپیانی کوردی لە دەشتی هەولێر لەو ڕەنگانەی سەرەوە بەدەر نین. کەچی هەندە ناوی دی هەن، بەهۆی چەشنی گوێ، کە پێنج جۆرە خۆیان وەگەڵ ناوی ڕەنگ دەدەن. وەك ئەمانەی خوارەوە:

یەکەم: ئەگەر سپیانەکە گوێی زۆر پان و شۆڕ بوو ((حەمدانی))ی پێدەگوترێت. بۆ وێنە:

١- بازی حەمدانی.

٢- بەڵەك حەمدانی.

٣- تەروومەت ڕەش حەمدانی.

٤- تەروومەت زەرد حەمدانی.

٥- تەروومەت سپی حەمدانی.

٦- تەروومەت شین حەمدانی.

٧- تەبەش حەمدانی.

٨- ڕسەر زەرد حەمدانی.

٩- ڕسەر شین حەمدانی.

١٠- ڕەشی حەمدانی.

١١- زەردی حەمدانی.

١٢- سۆری حەمدانی.

١٣- سەر بە پۆردی حەمدانی.

١٤- سەر... ڕەش حەمدانی.

١٥- قولەتارە حەمدانی.

١٦- قولەسیسە حەمدانی.

١٧- قولەمس تارە حەمدانی.

١٨- قولەمس سیسە حەمدانی.

١٩- کەویسار حەمدانی.

***

دووەم: ئەگەر سپیانەکە گوێی ئاسایی بوو ((ڕەشۆکی))ی ناوە، یان (ئاسایی) بۆ... وێنە فەرموون سەیری ئەمانە بکەن:

١- بازی ڕەشۆکی.

٢- بەڵەك ڕەشۆکی.

٣- تەڕوومەت ڕەش ڕەشۆکی.

٤- تەڕوومەت زەرد ڕەشۆکی.

٥- تەڕوومەت سپی ڕەشۆکی.

٦- تەڕوومەت شین ڕەشۆکی.

٧- تەبەش ڕەشۆکی.

٨- ڕسەر زەرد ڕەشۆکی.

٩- ڕسەر شین ڕەشۆکی.

١٠- ڕەشی ڕەشۆکی.

١١- زەردی ڕەشۆکی.

١٢- سۆری ڕەشۆکی.

١٣- سەر بە پۆرد ڕەشۆكی.

١٤- سەر ڕەش ڕەشۆكی.

١٥- قولە تارە ڕەشۆكی.

١٦- قولە سیسە ڕەشۆكی.

١٧- قولەمس تارە ڕەشۆكی.

١٨- قولەمس سیسە ڕەشۆكی.

١٩- كەویسار.. ڕەشۆكی.

***

سێیەم: ئەگەر سپیانەكە گوێی (لوول) واتە كۆلانی بێت پێی دەگوترێت (بەل). وەك ئەمانە:

١- بازی بەل.

٢- بەڵەك بەل.

٣- تەڕوومەت ڕەش بەل.

٤- تەڕوومەت زەرد بەل.

٥- تەڕوومەت سپی بەل.

٦- تەڕوومەت شین بەل.

٧- تەبەش بەل.

٨- ڕسەر.. زەرد بەل.

٩- ڕسەر.. شین بەل.

١٠- ڕەشی بەل.

١١- زەردی بەل.

١٢- سۆری بەل.

١٣- سەر بە پۆرد بەل.

١٤- سەر... ڕەش بەل.

١٥- قولە تارە بەل.

١٦- قولە سیسە بەل.

١٧- قولەمس تارە بەل.

١٨- قولەمس سیسە بەل.

١٩- کەویسار بەل.

***

چوارەم: سپیانەکە ئەگەر گوێی بە ئەندازەی پەنجەیەك بوو ((کورپیس))ی ناوە. بۆ وێنە سەیری ئەمانە بکەن:

١- بازی کورپیس.

٢- بەڵەك کورپیس.

٣- تەرووومەت ڕەش کورپیس.

٤- تەرووومەت زەرد کورپیس.

٥- تەرووومەت سپی کورپیس.

٦- تەرووومەت شین کورپیس.

٧- تەبەش کورپیس.

٨- ڕسەر.. زەرد کورپیس.

٩- ڕسەر.. شین کورپیس.

١٠- ڕەشی کورپیس.

١١- زەردی کورپیس.

١٢- سۆری کورپیس.

١٣- سەر بە پۆرد کورپیس.

١٤- سەر... ڕەش کورپیس.

١٥- قولە تارە کورپیس.

١٦- قولە سیسە کورپیس.

١٧- قولەمس تارە کورپیس.

١٨- قولەمس سیسە کورپیس.

١٩- کەویسار کورپیس.

***

پێنجەم: ئەگەر سپیانە گوێی هەر نەبوو. تـەنیا بەقـەدەر نینۆكێك بـوو بـە ((كەرە)) ناو دەبردرێت. سەیری ئەمانە بكە:

١- بازی كەرە.

٢- بەڵەك كەرە.

٣- تەڕوومەت ڕەش كەرە.

٤- تەڕوومەت زەرد كەرە.

٥- تەڕوومەت سپی كەرە.

٦- تەڕوومەت شین كەرە.

٧- تەبەش كەرە.

٨- ڕسەر.. زەرد كەرە.

٩- ڕسەر.. شین كەرە.

١٠- ڕەشی كەرە.

١١- زەردی كەرە.

١٢- سۆری كەرە.

١٣- سەر بە پۆرد كەرە.

١٤- سەر... ڕەش كەرە.

١٥- قولە تارە كەرە.

١٦- قولە سیسە كەرە.

١٧- قولەمس تارە كەرە.

١٨- قولەمس سیسە كەرە.

١٩- كەویسار كەرە.

كەواتە ٥ × ١٩ = ٩٥ سپیانی بێ قۆچ.

***

**سپیانی کەرین:**

ئەوانەی باسکران گشتیان سپیانی بێ قۆچ بوون. ناوی چەند سپیان گوتراوە، ئەوەندەی تریش بۆ سپیانی ((کەرین)) = شاخدار ماوە. بۆ دڵنیایی فەرموون سەیری ئەمانە بکەین:

١- بازی کەرین حەمدانی.

٢- بەڵەك کەرین حەمدانی.

٣- تەڕوومەت ڕەش کەرین حەمدانی.

٤- تەڕوومەت زەرد کەرین حەمدانی.

٥- تەڕوومەت سپی کەرین حەمدانی.

٦- تەڕوومەت شین کەرین حەمدانی.

٧- تەبەش کەرین حەمدانی.

٨- ڕسەر.. زەرد کەرین حەمدانی.

٩- ڕسەر شین کەرین حەمدانی.

١٠- ڕەشی کەرین حەمدانی.

١١- زەردی کەرین حەمدانی.

١٢- سۆری کەرین حەمدانی.

١٣- سەر بە پۆرد کەرین حەمدانی.

١٤- سەر... ڕەش کەرین حەمدانی.

١٥- قولە تارە کەرین حەمدانی.

١٦- قولە سیسە کەرین حەمدانی.

١٧- قولەمس تارە کەرین حەمدانی.

١٨- قولەمس سیسە کەرین حەمدانی.

١٩- کەویسار کەرین حەمدانی.

٢٠- بازی کەرین ڕەشۆکی.

٢١- بەڵەك کەرین ڕەشۆکی.

٢٢- تەڕوومەت ڕەش کەرین ڕەشۆکی.

٢٣- تەڕوومەت زەرد کەرین ڕەشۆکی.

٢٤- تەڕوومەت سپی کەرین ڕەشۆکی.

٢٥- تەڕوومەت شین کەرین ڕەشۆکی.

٢٦- تەبەش کەرین ڕەشۆکی.

٢٧- ڕسەر زەرد کەرین ڕەشۆکی.

٢٨- ڕسەر شین کەرین ڕەشۆکی.

٢٩- ڕەشی کەرین ڕەشۆکی.

٣٠- زەردی کەرین ڕەشۆکی.

٣١- سۆری کەرین ڕەشۆکی.

٣٢- سەر بە پۆرد کەرین ڕەشۆکی.

٣٣- سەر... ڕەش کەرین ڕەشۆکی.

٣٤- قولە تارە کەرین ڕەشۆکی.

٣٥- قولە سیسە کەرین ڕەشۆکی.

٣٦- قولە مس تارە کەرین ڕەشۆکی.

٣٧- قولە مس سیسە کەرین ڕەشۆکی.

٣٨- کەویسار کەرین ڕەشۆکی.

٣٩- بازی کەرین بەل.

٤٠- بەڵەك کەرین بەل.

٤١- تەڕوومەت ڕەش کەرین بەل.

٤٢- تەڕوومەت زەرد کەرین بەل.

٤٣- تەڕوومەت سپی کەرین بەل.

٤٤- تەڕوومەت شین کەرین بەل.

٤٥- تەبەش کەرین بەل.

٤٦- ڕسەر زەرد کەرین بەل.

٤٧- ڕسەر شین کەرین بەل.

٤٨- ڕەشی کەرین بەل.

٤٩- زەردی کەرین بەل.
٥٠- سۆری کەرین بەل.
٥١- سەر بە پۆرد کەرین بەل.
٥٢- سەر.. ڕەش کەرین بەل.
٥٣- قولەتارە کەرین بەل.
٥٤- قولە سیسە کەرین بەل.
٥٥- قولەمس تارە کەرین بەل.
٥٦- قولە مس سیسە کەرین بەل.
٥٧- کەویسار کەرین بەل.
٥٨- بازی کەرین کوڕیس.
٥٩- بەڵەك کەرین کوڕیس.
٦٠- تەڕومەت ڕەش کەرین کوڕیس.
٦١- تەڕوومەت زەرد کەرین کوڕیس.
٦٢- تەڕوومەت سپی کەرین کوڕیس.
٦٣- تەڕوومەت شین کەرین کوڕیس.
٦٤- تەبەش کەرین کوڕیس.
٦٥- ڕسەر زەرد کەرین کوڕیس.
٦٦- ڕسەر شین کەرین کوڕیس.
٦٧- ڕەشی کەرین کوڕیس.
٦٨- زەردی کەرین کوڕیس.
٦٩- سۆری کەرین کوڕیس.
٧٠- سەر بە پۆرد کەرین کوڕیس.
٧١- سەر.. ڕەش کەرین کوڕیس.
٧٢- قولەتارە کەرین کوڕیس.
٧٣- قولە سیسە کەرین کوڕیس.
٧٤- قولەمس تارە کەرین کوڕیس.

٧٥- قوله مس سيسه كه‌رين كوپيس.
٧٦- كه‌ويسار كه‌رين كوپيس.
٧٧- بازى كه‌رين كه‌ره.
٧٨- به‌ڵه‌ك كه‌رين كه‌ره.
٧٩- ته‌پرووه‌ت ره‌ش كه‌رين كه‌ره.
٨٠- ته‌پرووه‌ت زه‌رد كه‌رين كه‌ره.
٨١- ته‌پرووه‌ت سپى كه‌رين كه‌ره.
٨٢- ته‌پرووه‌ت شين كه‌رين كه‌ره.
٨٣- ته‌به‌ش كه‌رين كه‌ره.
٨٤- رسه‌ر زه‌رد كه‌رين كه‌ره.
٨٥- رسه‌ر شين كه‌رين كه‌ره.
٨٦- ره‌شى كه‌رين كه‌ره.
٨٧- زه‌ردى كه‌رين كه‌ره.
٨٨- سۆرى كه‌رين كه‌ره.
٨٩- سه‌ر به پۆرد كه‌رين كه‌ره.
٩٠- سه‌ر.. ره‌ش كه‌رين كه‌ره.
٩١- قوله‌تاره كه‌رين كه‌ره.
٩٢- قوله سيسه كه‌رين كه‌ره.
٩٣- قوله‌مس تاره كه‌رين كه‌ره.
٩٤- قوله مس سيسه كه‌رين كه‌ره.
٩٥- كه‌ويسار كه‌رين كه‌ره.

٩٥ سپيانى بێ قۆچ + ٩٥ سپيانى كه‌رين = ١٩٠ سپيان.

**سپیانی نا پەسند بۆ ڕاگرتن:**

ئەو سپیانانەی باسکران هەموویان لای خاوەن مەڕی دەشتی هەولێر، بۆ ڕاگرتن و هێشتنەوە پەسەند نەبوون. هێندێکیان لەبەر ئەوە خورییەکانیان تەواو سپی نییە و قیمەت باش ناکەن وەك ئەمانە:

١- بەڵەك.

٢- ڕەش.

٣- زەرد.

٤- سور.

٥- سەر... ڕەش.

٦- کەویسار.

هێندێکیشیان لەبەر ئەوە جەستەیان زۆر ناسکە و بەرگەی سوڕناتك خواردن ناگرن. ئەمانەن:

١- تەبەش.

٢- تەڕومەت سپی.

٣- قولەسیسە.

سپیانی کەرینیش لەبەر قۆچەکەی، کە دوو زەرەری هەیە:

١- بەرخی کەرین بەهۆی شوێنی قۆچەکەوە، کە تۆزێك بەرزە لەکاتی زاندا ئازار بە ((زێ))ی = عەورەتی دایکەکە دەگەیەنێت.

٢- لەکاتی ئالیك خواردندا، یان لە شەڕە قۆچانێدا ئازاری هاوڕێکانی دەدات.

***

**پەسەندترین سپیان بۆ ڕاگرتن ئەمانەن:**

١- تەڕوومەت ڕەش.

٢- تەڕوومەت شین.

٣- ڕسەر شین.

٤- قولەتارە.

٥- قوله تاره مس.

باشترینیان لەمانەی سەرەوە ((حەمدانی))ی بن.

چاکترین ڕەسەنە سپیانی کوردی لە دەشتی هەولێر سپیانی ((حاجی سادق))ی گوندی ((خەزنە))یە.

***

**بەرخ بەران:**

بەرخی نێر کە بۆ بەران ڕابگیرێت پێویستە ئەم مەرجانەی خوارەوەی لێ بێتە دی.

١- پاشەڵ بەری بێت.

٢- کاپێلك ڕاست و ئەستوور.

٣- دونگ شۆڕ و ڕێك.

٤- کلێنجە ڕاست بێت، نەك خوار.

٥- سینگ بەرز.

٦- بەناوزگ بێت. واتە ((ورگ))ی گەورە بێت.

٧- کەلەش درێژ.

٨- لموزی مەڕانی نەبێت. ((کەوانی)) بێت. نەك ڕاست.

٩- خوری بۆڕ و تیسکی درێژ بێت.

١٠- ڕەسەنی دایك و باوکی بزاندرێت.

١١- دەم = ((دەو))سە نەبێت. واتە لچی ڕێك بێت. نەك گرە.

١٢- یەکێك بێت لەو جۆرانەی کە گوتمان بۆ ڕاگرتن پەسەندن.

ئەگەر بەران دایك و باوکی ڕەسەن بوو نایە لەکاتی پەڕیندا پێویستی بە شوان نەبوو مەڕی بە بەرانی بۆ بگرێت و دونگی بۆ هەڵبداتەوە. بەرانەکە پێش ئەوەی بۆ پەڕین دەستەکانی بەرز بکاتەوە بە سینگ دونگی مەڕەکە هەڵدەداتەوە و ئەوجا دەپەڕی.

**بەرخەوان:** ئەو کەسەبوو دەچووە بەر بەرخان. واتە دەبووە شوانی بەرخان. بەزۆری منداڵ بوو.

ئەگەر کار لە بەرخانیش زۆرتر بوونایە هەر بەرخەوان دەگوترا. ئەگەر هەمووی کار بوونایە ئەوسا دەگوترا (کارەوان).

## بەشی دووەم: ڕەشان

هەرچی لە بزن بێت نێرومێ گەورە و گچکە ((ڕەشان))ی ناوە.

ڕەشان بە گشتی سێ جۆرە:

١- ڕەشانی موو.

٢- ڕەشانی مەرەز.

٣- ڕەشانی دوڕە. ئەمەیان نەمووی تەواوە نە مەرەزیشە.

دەشتی هەولێر ناوچەیەکی گەرمیانە ڕەشانی ((مەرەز)) و ((دوڕە))ی لێ هەڵناکەوێت. خۆشم لەم دووانە باش ئەگادار نیمە بۆیە لێرەدا هەر باسی ڕەشانی موو دەکەم.

**ڕەشانی موودار:**

ڕەشانی موودار زۆربەیان قۆچدارن و شاخیان خوارو خێچ و کەوانییە. بە دەگمەن شاخ قیت و ڕاست دەبێت. ئەویش بە ((هەورامی)) ناودەبردرێت.

کەمێکیشیان بێ شاخن ((کۆریس = کۆڵ)) یان پێدەگوترێت.

**ڕەشانی موودار دووجۆرە:**

**یەکەم: ((شامی)) یان ((حەمدانی)):**

ئەم چەشنە ڕەشانە کەلەش گەورەو درێژ و بەرزو کاپێلک ئەستوور و لموزی وەك بەران کەوانییە و گوێی زۆربەیان زۆر پان و گەورەیە. بەجۆرێك کە دەلەوەڕێن نزیکەی چوار پەنجە لە زەوی دەخشێت. ئەم تەرزە لەچاو جۆرەکانی تر کەمن و لە دەشت نەبێت، لەچیاو هەڵەت هەڵناکەون. کەمێکیشیان گوێ گەورە نینە و قوتەشیان هەیە بۆ ڕاگرتن پەسندترین ڕەشانن لە دەشتی هەولێر.

**دووەم: ئەوەی لە شامی بەدەربێت پێی دەگوترێت:**

**((ڕەشۆکی = ئاسایی))**

***

**ناوی ڕەشان بەگوێرەی ڕەنگەکانیان:**

**پازدە ناون. وەك ئەمانە:**

١- بازی: ڕەشانێکە پەلەکانی سپی بن، یان دوو ڕەنگ.

٢- بەڵەك: ڕەشانی ڕەش و سپی قان قان نەك تێکەڵاو، یان: سپی لەگەڵ زەرد و سوور.

٣- پۆش: ڕەش و سپی تێکەڵاو: ((ماش و برنج))، یان تەنیاهەر گوێیەکانی وابن.

٤- ڕەش: ڕەشانی سەرتاپا ڕەش.

٥- زەرد: ڕەشانێکە مووەکەی زەرد بێت.

٦- سپی: ڕەشانی موو سپی.

٧- سۆر: ڕەشانی موو سۆر.

٨- سەرە ڕەش کوور: ئەو ڕەشانەیە لەشی سەرتاپا سپییە تەنیا سەرو ملی ڕەشە.

٩- شین: ڕەشانی جەستە شین.

١٠- غەڕ: ڕەشانێکە ناوەڕاستی نێوچەوانی هەندی ناولەپێك سپیەو قارەمەندی ڕەش.

١١- قەش: بە ڕەشانێك دەگوترێت نیوچەوانی، یان سەروچاوی هەمووی سپیە. ئەوی تری ڕەش.

١٢- کار: ڕەشانێکە دەم و چاو سۆر، یان زەرد بێت یان تەنیا گوێیەکانی. جەستە ڕەش.

١٣- کەژ: ڕەشانی موو سپی و شینی تێکەڵاو.

١٤- مجاخ: ئەو ڕەشانەیە بناگوێی سۆر، یان زەرد بێت.

١٥- مس = ((هەمس)): ڕەشانی دەموچاوی خەت سۆر، یان زەرد بێت.

***

**هەر یەکێك لەو ناوانەی سەرەوە ئەو ناوانەشیان وەگەڵ دەکەوێت:**

یەکەم: ئەگەر.. ڕەشانەکان گوێیان پان و گەورە بوو: ((گۆردی)) یان پێ دەگوترێت:

١- گۆردی بازی.

٢- گۆردی بەڵەك.

٣- گۆردی پۆش.

٤- گۆردی ڕەش.

٥- گۆردی زەرد.

٦- گۆردی سپی.

٧- گۆردی سۆر.

٨- گۆردی سەر: ڕەش کوور.

٩- گۆردی شین.

١٠- گۆردی غەڕ.

١١- گۆردی قەش.

١٢- گۆردی کار.

١٣- گۆردی کەژ.

١٤- گۆردی مجاخ.

١٥- گۆردی مس.

***

دووەم: ئەگەر گوێیان ((لوول)) بێت پێیان دەڵێن: ((بەل)) بۆ وێنە:

١- بەلە بازی.

٢- بەلە بەڵەك.

٣- بەلە پۆش.

٤- بەلە ڕەش.

٥- بەلە زەرد.

٦- بەلە سپی.

٧- بەلە سۆر.

٨- بەله سەره ڕەش کوور
٩- بەله شین
١٠- بەله غەڕ.
١١- بەله قەش.
١٢- بەلەکار.
١٣- بەله کەژ.
١٤- بەله مجاخ.
١٥- بەله مس.

***

**سێیەم: ئەگەر گوێیان ((کول)) بێت بە ((قوتـە)) نـاو دەبـردرێن. وەك ئەمانە:**

١- قوته بازی.
٢- قوته بەڵەك.
٣- قوته پۆش.
٤- قوته ڕەش.
٥- قوته زەرد.
٦- قوته سپی.
٧- قوته سۆر.
٨- قوته سەر.. ڕەش کوور.
٩- قوته شین.
١٠- قوته غەڕ.
١١- قوته قەش.
١٢- قوته کار.
١٣- قوته کەژ.
١٤- قوته مجاخ.
١٥- قوته مس.

**ژمارەی ڕەشان:**

گوتمان: ناوەکان بەگوێرەی ڕەنگەکان پازدەنە کە ئەمانەن:

((بازی. بەڵەک. پۆش. ڕەش. زەرد. سپی. سۆر. سەرڕەش کوور. شین. غەڕ. قەش. کار. کەژ. مجاخ. مس)).

ئەم پازدەیە، بەهۆی گوێیەکانیانەوە لە ژمارە ((٣)) سێ دەدرێت: واتە: ((١٥ × ٣ = ٤٥)).

٤٥ شاخدار + ٤٥ کۆریس + ٤٥ شاخ هەورامی = ((١٣٥)). بە گوێرەی چۆنیەتی شاخ و بێ شاخییەوە.

سەت و سیی و پێنج ناوی ڕەشان هەیە.

فەرموون سەیری ناوەکان بکەن:

١- گۆردی بازی شاخدار.

٢- گۆردی بەڵەک شاخدار.

٣- گۆردی پۆش شاخدار.

٤- گۆردی ڕەشی شاخدار.

٥- گۆردی زەردی شاخدار.

٦- گۆردی سپی شاخدار.

٧- گۆردی سۆری شاخدار.

٨- گۆردی سەر.. ڕەش کوور شاخدار.

٩- گۆردی شینی شاخدار.

١٠- گۆردی غەڕی شاخدار.

١١- گۆردی قەشی شاخدار.

١٢- گۆردی کاری شاخدار.

١٣- گۆردی کەژی شاخدار.

١٤- گۆردی مجاخ شاخدار.

١٥- گۆردی مسی شاخدار.

١٦- بەلە بازی شاخدار.

١٧- بەلە بەڵەکی شاخدار.
١٨- بەلە پۆشی شاخدار.
١٩- بەلە.. ڕەشی شاخدار.
٢٠- بەلە زەردی شاخدار.
٢١- بەلە سپی شاخدار.
٢٢- بەلە سۆری شاخدار.
٢٣- بەلە ڕەش کووری شاخدار.
٢٤- بەلە شینی شاخدار.
٢٥- بەلە غەڕی شاخدار.
٢٦- بەلە قەشی شاخدار.
٢٧- بەلە کاری شاخدار.
٢٨- بەلە کەژی شاخدار.
٢٩- بەلە مجاخ شاخدار.
٣٠- بەلە مسی شاخدار.
٣١- قوتە بازی شاخدار.
٣٢- قوتە بەڵەکی شاخدار.
٣٣- قوتە پۆشی شاخدار.
٣٤- قوتە ڕەشی شاخدار.
٣٥- قوتە زەردی شاخدار.
٣٦- قوتە سپی شاخدار.
٣٧- قوتە سۆری شاخدار.
٣٨- قوتە سەر.. ڕەش کووری شاخدار.
٣٩- قوتە شینی شاخدار.
٤٠- قوتە غەڕی شاخدار.
٤١- قوتە قەشی شاخدار.
٤٢- قوتە کاری شاخدار.

٤٣-قوته کەژی شاخدار.

٤٤- قوته مجاخ شاخدار.

٤٥- قوته مسی شاخدار.

٤٦-گۆردی بازی شاخ هەورامی.

٤٧- گۆردی بەڵەك شاخ هەورامی.

٤٨-گۆردی پۆش شاخ هەورامی.

٤٩- گۆردی ڕەش، شاخ هەورامی.

٥٠- گۆردی زەردی شاخ هەورامی.

٥١- گۆردی سپی شاخ هەورامی.

٥٢- گۆردی سۆری شاخ هەورامی.

٥٣-گۆردی سەر.. ڕەش کووری شاخ هەورامی.

٥٤- گۆردی شینی شاخ هەورامی.

٥٥- گۆردی غەڕی شاخ هەورامی.

٥٦-گۆردی قەشی شاخ هەورامی.

٥٧-گۆردی کاری شاخ هەورامی.

٥٨-گۆردی کەژی شاخ هەورامی.

٥٩-گۆردی مجاخ شاخ هەورامی.

٦٠- گۆردی مسی شاخ هەورامی.

٦١-بەلە بازی شاخ هەورامی.

٦٢-بەلە... بەڵەکی شاخ هەورامی.

٦٣- بەلە پۆشی شاخ هەورامی.

٦٤-بەلە ڕەشی شاخ هەورامی.

٦٥-بەلە زەردی شاخ هەورامی.

٦٦- بەلە سپی شاخ هەورامی.

٦٧- بەلە سۆری شاخ هەورامی.

٦٨- بەلە سەر.. ڕەش کووری شاخ هەورامی.

٦٩-بەلە شینی شاخ هەورامی.

٧٠- بەلە غەڕی شاخ هەورامی.

٧١-بەلە قەشی شاخ هەورامی.

٧٢-بەلە کاری شاخ هەورامی.

٧٣- بەلە کەژی شاخ هەورامی.

٧٤-بەلە مجاخ شاخ هەورامی.

٧٥-بەلە مسی شاخ هەورامی.

٧٦- قوتە بازی شاخ هەورامی.

٧٧- قوتە بەڵەکی شاخ هەورامی.

٧٨- قوتە پۆشی شاخ هەورامی.

٧٩-قوتە ڕەشی شاخ هەورامی.

٨٠-قوتە زەردی شاخ هەورامی.

٨١-قوتە سپی شاخ هەورامی.

٨٢-قوتە سۆری شاخ هەورامی.

٨٣- قوتە سەر.. ڕەش کووری شاخ هەورامی.

٨٤-قوتە شینی شاخ هەورامی.

٨٥-قوتە غەڕی شاخ هەورامی.

٨٦- قوتە قەشی شاخ هەورامی.

٨٧- قوتە کاری شاخ هەورامی.

٨٨- قوتە کەژی شاخ هەورامی.

٨٩-قوتە مجاخ شاخ هەورامی.

٩٠- قوتە مسی شاخ هەورامی.

٩١- گۆردی بازی کۆریس.

٩٢-گۆردی بەڵەك کۆریس.

٩٣-گۆردی پۆش کۆریس.

٩٤-گۆردی ڕەش کۆریس.

٩٥–گۆردی زەرد کۆریس.

٩٦–گۆردی سپی کۆریس.

٩٧–گۆردی سۆر کۆریس.

٩٨–گۆردی سەر.. ڕەش کوور کۆریس.

٩٩–گۆردی شین کۆریس.

١٠٠– گۆردی غەڕ کۆریس.

١٠١– گۆردی قەش کۆریس.

١٠٢– گۆردی کار کۆریس.

١٠٣– گۆردی کەژ کۆریس.

١٠٤– گۆردی مجاخ کۆریس.

١٠٥– گۆردی مس کۆریس.

١٠٦– بەلە بازی کۆریس.

١٠٧– بەلە... بەڵەک کۆریس.

١٠٨– بەلە پۆش کۆریس.

١٠٩– بەلە ڕەش کۆریس.

١١٠– بەلە زەرد کۆریس.

١١١– بەلە سپی کۆریس.

١١٢– بەلە سۆر کۆریس.

١١٣– بەلە سەر.. ڕەش کوور کۆریس.

١١٤– بەلە شین کۆریس.

١١٥– بەلە غەڕ کۆریس.

١١٦– بەلە قەش کۆریس.

١١٧– بەلە کار کۆریس.

١١٨– بەلە کەژ کۆریس.

١١٩– بەلە مجاخ کۆریس.

١٢٠– بەلە مس کۆریس.

١٢١- قوته بازی كۆریس.

١٢٢- قوته بەڵەك كۆریس.

١٢٣- قوته پۆش كۆریس.

١٢٤- قوته ڕەش كۆریس.

١٢٥- قوته زەرد كۆریس.

١٢٦- قوته سپی كۆریس.

١٢٧- قوته سۆر كۆریس.

١٢٨- قوته سەر.. ڕەش كوور كۆریس.

١٢٩- قوته شین كۆریس.

١٣٠- قوته غەڕ كۆریس.

١٣١- قوته قەش كۆریس.

١٣٢- قوته كار كۆریس.

١٣٣- قوته كەژ كۆریس.

١٣٤- قوته مجاخ كۆریس.

١٣٥- قوته مس كۆریس.

١٣٥ ڕەشـان + ١٩٠ سـپیان = ٣٢٥ ژمـارە سـپیان و ڕەشـانەلە دەشـتی هەولێر.

***

## بەشی سێیەم: ناوی سپیان و ڕەشان بەگوێرەی تەمەنیانەوە.

لەبەر گرینگی ئەم بابەتە، بە پێویستم زانی لە بەشی یەکەم و دووەمی داببڕم و بە بەشێکی سەربەخۆی بنووسم.

فەرهەنگە کوردییەکان جیاوازیان تەواو لەنێوان ((گیسك)) و (چوشتیر)) و ((کاوڕ)) و ((شەك)) و ((خرت)) و ((بەردیل)) و ((بەربوارد)) نەکردووە. لە تەمەنی هەندێکیان بەهەڵە چوونە.

پێشەکی

سەرەسالی مەڕو ماڵات لە وەرزی بڕینەوەی سپیان دەست پێدەکات. کە سەرەتای مانگی ((ئایارە)) و لەسەروبەی دروێنەی ((جۆ))یە. نەك وەرزی زان.

مەڕ بە بەران هاتن لەمانگی تەمووز ئاب و نیوەی یەکەمی ئەیلوولە.

بزنیش زۆربەی لە مانگی ئەیلوولدا تەگە دەگرێت = ((دەخوات)).

زانی سپیان بەزۆری لە مانگی تشرینی دووەم و کانوونی یەکەم و دووەمدا دەبێت و بزنیش دوای مەڕە.

***

### ناوی سپیان بەگوێرەی تەمەن

### بەم تەرزەیە:

١- نێرومێ:

لەو ڕۆژەی بەرخ لەدایك دەبن، بابڵێین: لەمانگی تشرینی دووەمدا، تا دەبڕێنەوە و.. وەگەڵ داکییان دەدرێنەوە، کە دەکاتە شەش مانگ پێیان دەگوترێت ((بەرخ)). لەدوای شەش مانگ، تا ساڵیان بە سەردا دەسووڕێتەوە، واتە تاکو دەبنە ساڵ و نیو: ((کاوڕ))ن.

٢- مێ:

کە ساڵ و نیویان تەواو کرد و بڕانەوە بە ((بەردیل)) ناو دەبردرێن = ((شەکەمێ))ی ناوچەی سلێمانی.

بەردیل ئەو ساڵە بۆ یەکەمجار بەران دەخۆن و لە زستاندا دەزێن. کە ئەوکات تەمەنیان دەبێتە دوو ساڵ ((بەردیلە زا = شەکەمەڕ)) یان پێ دەگوترێت.

ئەگەر ئەو ساڵە نەزان ((هیشکە بەردیل = شەکە کاڵ)) یان ناوە. لەمانگی ئەیاردا، کە تەمەنیان دەبێتە دوو ساڵ و نیوو دەبڕدرێنەوە و بێچووەکانیشیان لێدا دەبڕێن پێیان دەڵێن ((مەڕە بەربوارد)).

تا دەبنە دوو بەرخیش هەر بەربواردن.

وشەی ((بەربوارد)) لە فەرهەنگە کوردییەکاندا نییە. تەنیا لە فەرهەنگی ((زەبیحی)) نەبێت. لە بەرگی دووەم لاپەڕە ((١٥٤))دا بەم جۆرە هاتووە ((بەربوارد بەردیلێك بەرانی نەخوارد بێت شەکەمێ ئەستێور)). مامۆستا زەبیحی لێرەدا، لەگەڵ ڕێزم بۆی بە هەڵە چووە.

مانای وشەی ((بەربوارد)) بەم چەشنەیە بەری بوارد واتە بەرێکی = ((بەرخێك))ی گەورە کرد و لێی جوودا بووەوە)). ڕاستی قسەکەی من دەچەسپێنێت.

فەرهەنگی ((خاڵ)) و ((کشتوکاڵ)) دەڵێن: ((بەردیل مەڕی سێ ساڵانە)). کەچی وەکو گوتم: ((بەردیل درێژ ترین تەمەنی لە دووساڵ و نیو ڕەتناکات. سێ ساڵ بەربواردە و دەبێت خاوەن دووبەرخ. ئەوکاتە مەڕەو لە بەردیل دەترازێت.

بۆ سەقادانی بۆچوونەکەی من ((بەردیلە زەکات مەشهوورە لەدوای برینەوە و پێش تەواوکردنی دوو ساڵ و بەران دەخوات و بە زەکات دەدرا مەلای گوند.

هەروەها لەم باسەدا چەند وشەیەکی تر هەن لەماناندا لەگەڵ فەرهەنگەکان یەك ناگرنەوە. بەتایبەتی لەبارەی تەمەنەوە. لەدواییدا دێت، بۆیە پێویست ناکات لێرە لێیان بدوێم.

لە دوای بەربوارد مەڕەکە بەپێی زان ناودەبردرێت. بۆ وێنە سێ بەرخی و چوار بەرخی: (هتد). مەڕ لەچوار بەرخ ڕەتبوو دەڵێن: ((ئەو مەڕە سەرەیە)). واتە پیربووە.

٣- نێر:

لە ساڵ و نیو تا دوو ساڵ نیو سپیانی نێر پێیان دەگوترێت ((شەك)). لەدوای شەش دەبنە بەران.

بەران تاسێ ساڵ و نیو ((خرت)) = ((بەختەك))ە. جابە قەیرە ناودەبردرێت. بۆ وێنە لە خرت بەسەرەوە تا چوار ساڵ و نیو: ((یەك قەیرە))ی ناوە. لەدوای یەك قەیرە تا پێنج ساڵ و نیو دوو قەیوەیە. ئیتر هەروەها.

***

**ناوی ڕەشان بەگوێرەی تەمەن:**

١- نێرومێ:

لە ڕۆژی بوونیان تا لە شیردا دەبڕێن و.. وەگەڵ مێگەڵ دەکەونەوە پیاندە گوترێت ((کار)).

ڕەشان لە یەکەم ساڵدا نابڕد ڕێتەوە. کە تێکەڵ کرانەوە تا دەگەنە ساڵ و نیوێك ((گیسك))ن.

٢- مێ:

لە ساڵ و نیو تا دوو ساڵ و نیو، کە تا ئەوساتە دەشزێت ((چوشتیر، چشتیر))ە. هەروەك لە بەردیلدا باسم کرد. لە چوشتیر بەسەرەوە تا دەبێتە دوو کاریش بەربواردە. جا بەگوێرەی زان ناودەبردرێت بۆ.. وێنە سێ کاری و چوار کاری و... هتد.

٣- نێر:

لە ساڵ و نیو تا دوو ساڵ و نیو ((کوورە)). لەکوور ڕەتیدا: ((تەگە = سابڕێن))ە.

تەگە بەسێ ساڵ و نیو خرتە. دوای تەمەنی خرتی: تا دەبێتە چوار ساڵ و نیو ((یەك قەیرە)) یە. بە پێنج ساڵ و نیو دوو قەیرەیە.
ئیتر هەروا.

***

**نێری:**

تەگە هەر کاتێك بخەسێندرێت دەبێتە ((نێری)). نێری بۆ جوانی و پێشەنگی مێگەڵ دەهێڵدرێتەوە. بۆ ئەوەی نێری باش برِسکێت و جەستەی گەورە بێت وابووە بە ساوایی خەساندوویانە.

***

وابووە لە ساڵی هات و لەوەڕ زۆریدا بەدەگمەن شیرپەڕیوە تەگوانی گیسك/ بەبێ زان. ئەوسا پێدەڵێن ((شوان هەڵخەڵەتێنە)).

**خشتەی ناوی سپیان و ڕەشیان بە گوێرەی تەمەنەوە**

| جۆری سپیان و ڕەشان | ڕۆژی لەدایك بوونەوە هەتا تەمەنی ٦ شەش مانگ | تەمەنی ٦ شەش مانگەوە تاکو تەمەنی ساڵ و نیو | تەمەنی ساڵ و نیو هەتا دوو ساڵ و نیو | تەمەنی دوو ساڵ و نیو تاکو تەمەنی سێ ساڵ و نیو | تەمەنی سێ ساڵ و نیو تاکو تەمەنی چوار ساڵ و نیو |
|---|---|---|---|---|---|
| سپیان نێر: | بەرخ | کاوڕ | شەك | بەرانی خرت = بەختەك. | بەرانی یەك قەیرە. |
| سپیان مێ: | بەرخ | کاوڕ | بەردیل = شەکەمێ | مەڕە بەربوارد. | مەڕی سێ بەرخی. |
| ڕەشان نێر: | کار | گیسك | کوور | تەگەی خرت = سابرێن. | تەگەی یەك قەیرە. |
| ڕەشان مێ: | کار | گیسك | چوشتیر = چشتیر | بزنە بەربوارد | بزنی سێ کاری |

ئەوانەی کەوتوونەتە یەك خانە ئاوزەی یەکترن. واتە بێچووی ساڵێکن بەم جۆرەی خوارەوەیە:

١- کار و بەرخ.

٢- کاوڕ و گیسك.

٣- شەك و بەردیل و کوور و چوشتێر.

٤- بەرانی خرت و مەڕە بەر بورادو تەگەی خرت و بزنە بەربوارد.

٥- بەرانی یەك قەیرە و مەڕی سێ بەرخی و تەگەی یەك قەیرە و بزنی سێ کار.

***

چەند تێبینییەك لەبارەی ئەو دوو بەشەی رابردوو:

١- هەموو سپیانێك مەڕ نییە. نێرەکان بە گەورە و بچووکیانەوە و مێیەکانیش تا دەنە بەردیل پێیان ناگوترێت ((مەڕ)).

ڕەشانیش هەروەها. بۆیە من لە باسەکەمدا بە ((سپیان)) و ((ڕەشان))م دەست پێکرد، نەك مەڕو بزن.

٢- لە ناوی سپیاندا ناوی ڕەنگەکان پێش ناوی گوێیەکان دەکەون. بۆ وێنە ((مەڕە قولە حەمدانی. کەویسار بەل. ڕسەرشین کوڕیس.. هتد)) کەچی لە ڕەشاندا بە پێچەوانەیە. بۆ وێنە: ((بزنە قوتە مس. گۆردی پۆش. بەلە کار)).

٣- ئەو ناوانەی باسمان کردن چ ناوی سپیان، چ ناوی ڕەشان تەنیا تەنیاش دەگوترێت.

بۆ وێنە لە سپیاندا: ((مەڕە بەل. سەر.. ڕەش . کەڕە. گوڕیس. ڕسەر. حەمدانی. هتد)).

لە ڕەشاندا: ((بزنە کەژ. گۆردی. مجاخ. مس. قەش. قوتە. هتد)).

تەنیا لە ڕەشاندا وشەی ((کار))م بە تەنیا نەبیستووە. بەڵکو هەر بەم تەرحەم گوێ لێبووە: ((بەلە کار. قوتە کار. گۆردی کار. هتد)).

٤- وشـەی ((قـۆچ)) بـەزۆری بۆسـپیان بـەکار دێـت. وشـەی ((شـاخ)) بـۆ ڕەشـان. کەچـی هـەردوو لاش هـاتووە. لـە سـپیان دەگوترێـت قۆچـی بەرانەکـە -، یـان شـاخی شـکاوە. لـە ڕەشـانیش دا قۆچـی بزنەکـە یـان شاخی خوارە.

٥- گوتمان مەڕو مالاٌت لە مـانگی تشـرینی دووەمـدا دەسـت بـەزان دەکـەن. تەمەنی بێچـوەکانیان تـا مـانگی ئـەیار پـالٌ بـە شـەش مانگـەوە دەدات. ئاشکراشە مەڕو مالاٌت لە یەك کاتدا نازێن بـەلٌکو ناوەناوەیـە. هەنـدێکیان دەکەوێتـە ئـاخر و ئـۆخری وەرزی زسـتـان و سـەرەتای بـەهار. ئەوکاتـە تەمەنی بێچووەکان تا مانگی ئەیار لە دوو مانگ و نیـو، سـێ ڕەتناکـات. لەوەوە بۆمان دەردەکەوێت. تەمەنی کاروبەرخ بەگشتی لەسـێ مـانگ تـا شەش مانگە. لەو تەمەنە بەسەرەوە لە پلەی کارو بەرخ دەترازێن. منیش لە باسەکەمدا درێژ ترین تەمەنم بۆیان داناوە کە شەش مانگە.

٦-واشـدەبێت مـەڕ، یـان بـزن ((سـاوازێ)) دەبـن. واتـە درەنـگ دەزێـن. هەنـدێکیان دەگەنــە دروێنــەی جـۆ. بێچـووەکانیان پێیــان دەگوترێـت ((کۆرپـە)). تا ئەوکاتە ((شینکە)) نامێنێـت بۆیـە کۆرپـە وەك دابەسـتوو لەماڵەوە بەخێو دەکرێت. کە گەورە بوو توانـای گـەڕانی دەشـت و دەری نابێـت، تـا وەگـەڵ مێگـەل بـدرێت. بۆیـە زۆربـەی کـارو بـەرخی کۆرپـە دەکوژێنـەوە. مەگـەر بەدەگمـەن رابگیرێـن. بـەردیلی ئـەو جـۆرە بەرخـە پێیدەگوترێت: ((کورکە بەردیل)).

***

**بانۆك:**

کەسێکە مـەڕی نـەبان، لەسـەر بێچـووەکەی خـۆی، یـان مـەڕێکی بـەرخ مردوو، لەسەر بەرخێکی دایك مردەی ببانێتەوە. ئەمەش بەم چەشنە بوو:

کابرا مەڕەکەی چەند جار لەسەر یـەك دەسـووڕێنێت تـاکو کێـژ دەبێـت. ئەوسا دووسـێ پـەنجـەی ڕەوانـەی نـاو ((زێ))ی دەکـات و مەڕەکـەش لەبـەر کاس بوونی خۆی وا هەست دەکات بەرەژانە و دەزێت.

بانۆکەکە ئەوسا لەشی بەرخەکەی بە خێواوك تەڕ دەکات و دەیخاتە بەر دەمی مەڕەکەو بۆنی خێواوکەکەی دەکات و تەرحی ((لێبان = ئەو شتە لیچەیە دوای لەدایك بە جەستەی بەرخەوەیە)) دەیلێستەوە و لەسەری دەبانتەوە.

***

**شوان:**

ئەو کەسە بوو دەچووە بەر مێگەلە مەڕ. واتە لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە دەیلەوەڕاند.

شوان دوو جۆر بوو:

یەکەم: خاوەنی مێگەلەکە، یان کوڕی بوو. ئەمەش هیچ حسێبێکی بۆ ناکرێت. واتە کرێی نەبوو.

دووەم: شوانی بەکرێ.

ساڵ بۆ دامەزراندنی شوان کرابووە دوو شەرت:

١- شەرتی زستان: هەشت ((٨)) مانگ بوو. ئەمەش کرێی بوو: ((دوو قەزناغ شکارتەی بۆ دەکرا. سێ جلك و یەك دینار و خواردن)).

٢- شەرتی هاوین چوار مانگ بوو. بە ((١٠)) قەزناغ دەغڵ. واتە عەڵبەیەك و دوو قەزناغ و خواردن)).

***

مێگەل لە وەرزی گەرمادا، لەناو ئاوایی، نزیك بیری ئاو، یان حەوشەی خاوەنەکەی ڕادەگیراوە.

شوانەکەش دوو سێ خشتی دەکردە سەکۆ و لە سەری دەنووست.

کەچی لە وەرزی ساردیدا مێگەڵ لە حەوشە، یان لە نێو هۆڵدا دەنووست.

گەر لە حەوشە بووایە شوانەکە لەبن هەیوانی حەوشەکە دەنووست.

نووستنی شوان لەبەر دەرگەی هۆڵ بوو ئەگەر مۆڵگەی مێگەلەکەی لەنێو هۆڵ بووایە.

شوانی باش بەمانە دەناسراو ساڵی بەرنەدەکەوت و هەر خاوەن مەڕ بوو دەیویست بیکاتە شوانی خۆی. کرێشی کەمێك لە شوانان زیاتر بوو.

١- هەتا بۆی بکرابووایە نەیدەهێشت مێگەلەکە بەناو سوڕناتکان بکەوێت و بیخوات.

٢- شەوانی زستان وابووە دووسێ مەڕ بەیەکەوە دەزان شوانەکە قیچە خوریی دایکەکەی لەپێی بەرخەکە دەخست، بۆ بەیانی بەهۆی خورییەکەیەوە دەیناسییەوە.

٣- ئەگەر مەڕێك بزربووایە، بە پێنج دەقیقە لەنێوان سەتان مەڕ دەیزانی کام مەڕە.

چونکە پێشتر حسێبی کردبوو لە ڕووی شێوەو ڕەنگەوە. بۆ وێنە دەیزانی ((١٠)) دە مەڕ قولەسیسەیە و ((٥)) کەویسارە و ((٨)) ((ڕسەرە)) و ((١٢)) قولە تارەیە. هەرکە ڕەنگەکانی دەژمارد و دەیگوت: فلان مەر دیارنییە.

٤- بۆ تەجروبە: وا بووە شوان لەبن کەندالێك دادەنیشت و مەڕێکیان بەسەر کەندالەکە لێدەخوڕی و بەهۆی سێبەرەکەیەوە دەیناسییەوە.

٥- ئەو تەرزە شوانە ساڵێ کەڕەتێك، دووان شوانباشی خۆی بەخاوەنەکەی دەسەلماند و مێگەلەکەی لەکەل دەدا. ئەمەش بۆ کاتی تالانی مەڕو مالات سوودی هەبوو.

**مەڕ لە کەلدان:**

خەڵك بەڕێز ڕادەوەستان و لەناوەڕاستیاندا، بە درێژایی دوو مەتر ((تەنەکە)) و ((مەنجەڵ)) و ((بەرمیل)) و ((داربێڕ)) یان ڕیز دەکرد و.. وەك شوورەی لێدەهات.

دوو کەس لەملاو لەولا شوورەکە رادەوەستان و تەنەکەیان لێدەدا تاکو مەڕەکان لە تەقەکان بترسێن و نێنە پێشەوە.

شوانەکە پێشتر چەند سەر مەڕو بەرانی، بە پەلکە نان و خوێ ((لچ = کەمۆ)) کرد بوون. هەرکە بانگی دەکرد: ((توڕ.. پڕڕ..، توڕ.. پڕڕ.)) مەڕو بەرانە لچ بووەکان، یەك لەدوای یەك، بەبارە بار لەناو مێگەلەکە دەهاتنە دەرەوە و دوای شوانەکە، دەکەوتن.

مەڕیش عادەتی وایە، ئەگەر دووسێیەك ڕێچکەیان بەستا، ئەوانی دی بیلبتون، بەدوایا جلیتە دەکەن. نەخەسەلە شوانەکە، هەرکە دەگەیشتە شوورەکەو بە دەنگدانی لەسەریەك و بەبێ پسانەوە، تەنەکەش هەر لێدەدرا. یەکەم مەڕ تۆزێك لەشوورەکە و تەقەکان دەسەنگرایەوە، بەلام کە دەنگی شوانەی دەبیست گوێی پێنە دەداو بازی دەداو مەڕەکانی تریش یەك لە دوای یەك هڕ دەکەنێ.

***

**سپیاتی:**

شیرو هەرچی لە شیر پەیدا دەبێت ((بە سپیاتی)) ناو دەبردرێت. کە ئەمانەن:

**١- ماست:**

شیر دوای کوڵان لێدەگەڕێن تاکو سارد.. دەبێتەوە. ئەوسا سەرتووێکی تەنك لەسەری پەیدا دەبێت.

کابان بەقەدەر درهەمێك سەرتووێژەکەی لادەبات و هەوێنی تێدەکات و بەملاك دەیشەقێنێت، هەتا لەگەڵ شیرەکە تەواو تێکەڵ ببێت. شتێکی بەسەردا دەدات. بەزۆری ((دەرخۆنە)) بوو. بۆ بەیانی دەبووە ماست. هەوێنەکە تەنیا ماست بوو.

ماستی چاك و خراپ بە کابان دەگۆڕێت. گریمان:

أ- ئەگەر شیرەکە، گەرمی تەواوێك مابێت هەوێن بکرێت کە بە ((گەرمە هەوێن)) ناو دەبردرێت: ماستەکە ئاوی دەکەوتێ.

ب- ئەگەر ((ساردە هەوێن)) بێت، ماستەکە شل دەبێت.

پ- ئەگەر هەوێنی لە حەدی خۆی زۆرتر بێت ماستەکە ترش دەبێت.

ت- ئەگەر هەوێنی کەم بێت شیرین دەبێت.

بۆ وێنە کابان دەوری هەیە:

مێگەلە مەڕی کورد و عەرەبان لـە دەشـتی قـەراج بەیەکـەوە دەلـەوەڕان ماستی کـوردان پـەیت و تـرش و مـزر بـوو، کەچـی ماسـتی عـەرەبان شـل و شیرین بوو.

تەنیا کچی ((عەلی عیسا تـورك)) سـەرۆکی عەشـیرەتی ((جبـوور)) نـاوی ((زەریفە)) بوو، ماستی لەگەڵ ماستی کوردان هیچ فەرقی نەبوو.

لەبەر ئەوە سێ ساڵ لەناویان مامۆستا بووم پەیوەندیم لەگەڵ بنەماڵەکە زۆر بەهێزبوو پێمگوت:

- کوو دەزانی ماستی ئەوها باش هەوێن بکەین.

گوتی:

لەژنە کوردان فێر بوومە.

کەواتە کابان لە باشی و خراپی ماست دەوری هەیە.

***

**ماستی هەولێر:**

سەردەمایەك ماستی هەولێر باشترین ماستی ناوچەکانی تـری کوردسـتان بوو.

لـە شـەقامی ((ڕەشـید))ی شـاری ((بەغـدا)) دووکانێـك تایبـەت ماسـتی هـەولێری دەفرۆشـت و ناوبـانگی لـە سەرتاسـەری بەغـدا دەرکردبـوو. تـاکو جارێك یەکێك پرسیاری ((وەزارەتی دیفاع)) دەکات و پێیان گوتبـوو: ((قـرب لبن أربيل)).

**واتە لە وەزارەتەکە مەشهوورتر بووە. هۆیەکەش بۆ ئەمانە دەگەڕێتەوە:**

أ- ئاژەڵی دۆشینی زۆربەی هـەر زۆرری مـەڕبوو، بـزن و چـێڵی کـەم بـوون. شـیری مـەڕیش لەشـیری ئـەو دووانـە چـەورترەو ماستەکەشـی بـەتامتر دەبێت.

ب- لەوەڕ. خاکی ناوچەکە زۆر بە پیت و بەهێزە و هەر ئاژەڵێك تێری لێ بخوات درەنگ برسی دەبێت و شیرەکەشی چەورترە.
پ- سەرچاوەی ناوچەی ((قەراج)) گوندی کەم و چۆل بوو. مەڕدارانی سەنیە و مرکیە و شەمامك و کەندێناوە دەچوون هەتا جۆ دروونان مەڕیان لێرە لەوەڕاند. ئاژەڵەکانیان زۆر پێ قەڵەو دەبوون لەوسەر زووبەهاران دەهاتن.

***

٢- پەنیر:
شیلك = ((شیلاڤ، شیلاڤك)) جێگەی هەزم کردنی ئاژەڵی کاوێژکەرە. لێرەدا مەبەست شیلکی بەرخی ساوایە.
ئەمەیان وشك دەکردەوە و هەڵیان دەگرت.
((گەنگر))یان دەکوڵاند و دەیان پاڕزنی و ئاوەکەیان لەگەڵ ئەمانە تێکەڵ دەکرد:
أ- شیلکە وشك کراوەکە.
ب- تۆ تەرۆزی.
پ- سۆدکە.
ت- قەنەفل.
ج- ((شەب)) دەبووە هەوێنی پەنیر.
هەرکە قیچێك لە شیر دەکرا دووسێ دەقیقەی نەدەبرد پەیتەکە لە ئاوەکە جوودا دەبووەوە و پێیدەگوترا: ((دەڵەمە)). لە خواردندا زۆر خۆشبوو.
کابان دەڵەمەکەی لە جۆرکێکی خام دەکرد و دەیکوشی. تاکو ئاوەکەی دەچۆڕاوە و پەیتەکەی لەنێو قونگی جۆرکەکە دەماوە و دەبووە سەلکە پەنیر.
زۆربەی سەلکە پەنیر، بەهۆی قونکی جۆرکەکەوە سەری قیت دەبوو. ئاوەکەشی شیری تێدەکرا دەبووە لۆر. زۆر چەورە.

بۆ ئەوەی هەوێنەکە زوو خلاس نەبێت هەرجارێ هێندە ئاوی پەنیرەکەیان تێدەکرد.

***

پەنیری حکومی و خۆکردی:

پەنیری هەوێنی خۆکردی و هەوێنی حکومی بە ئەمە لەیەك جیا دەکرێنەوە: ((هەرکە پەنیرەکە لەڕۆنکرا، یان لەگەڵ خورمان لە ڕۆن بکرێت، پەنیری حکومی دەبێتە پتك پتك. واتە لەیەك جوودا دەبێتەوە. کەچی پەنیری خۆکردی وەك لاستێك لەیەك ڕادەکێشرێت)).

کەواتە هەوێنی خۆکردی باشترە، لە هەوێنی حکومی.

***

٣- فرۆ:

هەر ئاژەڵێکی دۆشین بزێت گوانی پڕ شیرەو بە بێچووەکەی خلاس نابێت. لەبەر ئەوە شیرەکەی زۆر لەنێو گوان دەمێنێتەوە، هەوێنی ناوێت، تەنیا لەسەر ئاگر دادەندرێت و تێك دەدرێت دەبێتە ((فرۆ)). فرۆ شیری هەڵبزڕکاوە و زۆر بەتامە.

***

تێبینی:

ماست و فرۆ بەهۆی کوڵاندنیان میکرۆبی دامێنی ئاژەڵ و دەستی کابان دەکوژێت، کەچی پەنیر ناکوڵێت و شیری خاوە. بۆیە ئەگەر میکرۆبی بکەوتێ نافەوتێت و خەڵك هێندە جار بەخواردنی پەنیرەوە تووشی نەخۆشی دەبێت.

***

مەشکە:

مەشکە دەبێ لە پێستەی ڕەشان بێت پێستەی سپیان ناسکەو بەرگەی هەژاندن ناگرێت.

پێستەی کۆلك و جوانەگاش دەبێت. ئەوسا پێی دەگوترێت ((مەشکەی گاوس)). لەبەر گەورەیی بە دوو ئافرەت نەبووایە نەدەژاندرا. یەك لەم سەرو ئەویتر لەوسەر.

پێستە بەم شێوەیە دەکرا مەشکە:

یەکەم: هەرکە ئاژەڵ سەردەبڕدرا ئاو.. و ئاردە ساوار، کە پێی دەگوترا ((لۆرکە)) لە پێستەکەی دەکراو لە شوێنێکی گەرم دادەندرا. ئەوسا مووەکە بەدەست دەوەری.

دووەم: ترش و خوێی پێدا دەکرا هەتا دوو ڕۆژان.

سێیەم: دوو هەفتە پەلکە هەنار و خوێی تێدەکرا.

چوارەم: غاراندن:

١- بەدار و شونك دەیان کوتا.

٢- پڕ جۆیان دەکرد و بەداران لێیان دەدا.

٣- ئەوسا بە ساپیتەی خانوویان هەڵدەواسی. چەند شەو و ڕۆژ دووکەل و گەرمانی ئاگری بۆ دەچوو. تا دەبخ دەبوو.

***

**دۆدان و هەمبانە:**

دۆدان و هەمبانەش بەشێوەی مەشکە خۆش دەکران.

دۆدان لە پێستەی ڕەشان بوو.. و دۆی تێدەکراو لەسەر ((کوندەلان)) دادەندرا. کەچی هەمبانە پێستەی سپیان بوو. بۆ هەلگرتنی دانەوێڵە: ((ساوار و بروێش و پیرخەنی و گەنمە کوتاو.....)) لەسەر هەرزاڵەی زەخیرە هەڵدەگیرا.

***

**کوندە:**

دەبخ کردنی کوندە ترش و خوێ و جەفت بوو. بۆ ئەوەی باش دەبخ ببێت و بەرگەی ئاو هەڵگرتن بگرێت دووبارە جەفتیان تێدەکردەوە. کە بە ((خۆشە)) ناودەبردرا، یان ((دوو بۆنگ))ی پێدە گوترا. کوندە بە دوو بۆنگ

کەسك هەڵدەگەڕێت. وا باوە: ((فلان وەك کوندەی دوو بۆنگی کەسکوون هەڵگەڕاوە واتە: تووڕە بووە)).

***

**پێستەی ئاژەڵ:**

هەر ئاژەڵێك دوای سەربڕین پێستەکەی بۆ مەشکە و دۆدان و کوندەیان بەکار بهێنا بووایە، گۆشتەکەیان لەلای ملیەوە دەردەهێنا و پاشەڵی کون نەدەکرا. کەچی لەناوچەی سیوەیل و شار بازێڕ لە دامێنیان دەردەهێنا و پاشدان دەیان دوورییەوە.

**مەشکە هەژاندن:**

مەشکە گوتمان لە پێستەی ڕەشانە و پێستەی پەلەکانی پێشەوە بە ((لۆلەپ))ێك دەبەستراو هی پشتەوەش بەلۆ لەپێکی تر.

((لۆلەپ)) پەلە دارێکی درێژی نیومەترە و تایبەت بۆ مەشکە هەژاندن درووست کرابوو. ئەمسەر و ئەو سەری ((لەلە)) بوو.. و ناوە ڕاستیشیان کون.

((ناودۆك)) پەلە دارێکی تایبەت بوو.. و درێژی بە ئەندازەی درێژی مەشکە دەبوو. ئەمسەر و ئەو سەری ((پان)) بوو.. و دەخرایە کونی لۆ لەپەکانەوە. تاکو لەکاتی هەژاندا مەشکە نەقەپێتە باریەك.

هەر چوار پەلی مەشکە، بەهۆی کشتەکە بەنێکەوە، لەسەری لۆ لەپەکان شەتەك دەدران.

کابان سەری گوریسێکی لەناوە ڕاستی لۆلەپێك و سەری ناودۆکێك دەبەستاو سەری دووەمی گوریسەکەی بەسەر سێپێك ئاو دیو دەکرد و لەناوە ڕاستی لۆلەپ و سەری ناو دۆکی دووەمی دەخست. بە جۆرێك مەشکەکە نیو مەترێك لەزەوی بەرز دەبووەوە.

کابان بەیانیان زوو ماستی لە مەشکە دەکرد و پاشدان ئاو.

کابان هـەبوو دەیویسـت دۆیەکـەی تیربێـت و لـەزار خـۆش بێـت و خـەڵك بیخواتەوە، دوو هەندی ماستەکەی ئاوی تێدەکرد. کابانیش هەبوو بۆ ئەوەی چەوری زۆر ببێت ئاوی زۆرتر تێدەکرد، کەچی دۆیەکەی وەك ئەوەی پێشـوو بەتام نەدەبوو. ئەوجا دەیهەژاند. هەتا ماستەکە لەگەڵ ئاوەکە تەواو تێکـەڵ دەبوو.. و چەورییەکە جوودا دەبووەوە.

کە هەژانەکە تەواو بوو کابان پـەتی پاشـڵی مەشـکەکەی بەسـێپێکەکەوە هەڵدەواسی و دەرکی دوای کردنەوە دەگرت و ناوەناوە دەسـتی خـۆی شـل دەکـات تـاکو دۆیەکـە بـە پەلـەمیزە بێتـە دەروە و چـەورییەکەش لـەناوی بمێنێتەوە.

هەر پتکە چەورییەك لەگەڵ دۆیەکـە بهاتبووایـە دەرەوە، لەبـەر سـووکی بەسەر دۆیەکە دەکەوت و بە ملاك جوودای دەکردەوە.

دوای تەواو بوونی دۆیەکە کابـان مەشـکەکە ڕادەهەژێنتـە نێـو دەفرێکـی تایبەت و چەورییەکە دێتە دەرەوە.

نەبادا چەوری لـەناو مەشـکەکە مابێـت کابـان ئـاوی سـاردی تێـدەکات و ڕادەهـەژێنێت، چـەوریيە پاشماوەکـە بـەهۆی ئـاوە سـاردەکەوە دەمـەیێت و دێتە دەرەوە. چەورییەکە بە ((کەرە = کەرە ڕۆن)) ناو دەبردرێت.

کەرەی ئەو ڕۆژە ((بەرە مەشکە))ی پێیدەگوترێت.

کابان چوار پێنج بەرە مەشکەی لەسـەر ئـاگر دەتوێنتـەوە و ترپاتەکـەی دەگرێت و ئەویتر دەبێتە ڕۆنی خۆماڵی.

***

**سێپێك:**

سێ ((٣)) داری تەڕە نزیکەی دوو مـەترو نیـو درێـژ: ((کورتـە کاریتـەش دەبـوو))، سـەرێکیان بەیەکـەوە دەبەسـتاوە. سـەرەکانی دیـان لەیـەك دەترازانـد. وەك سێکوچـکەی لێـدەهات. پێـی دەگـوترا ((سـێپێك)). یـان لەجیاتی سێپێك مەشکە بەکاریتەی دەرەوەی خانوو هەڵدەواسرا.

***

**تازییە:**

((تۆراخ))یشی ناوە:

جۆرکێکی خامی شاشی گەورە بوو رۆژانە دۆی تێدەکراو لەسەر ((کوندەڵان))یان دادەنا. تاکو ئاوەکەی چك بکات و پەیت ببێت.

بۆ ئەوەی کونی خامەکە، بە چەوری دۆیەکە نەگیرێت و هەردەم ئاوەکەی لێ بێتە دەرەوە، کابانی ماڵ ناوەناوە بە چەقۆ سەری خامەکەی خاوێن دەکردەوە. هەتا جۆرکەکە پڕ دۆی پەیت دەبوو.

ئەوسا دەریان دەهێنا و بۆ دوو بابەتیان بەکار دەهێنا:

یەکەم: ساواریان تێدەکرد و نزیکە دوو سەعاتێك لەسەری دەوەستان، تاکو ساوارەکە لەناویا دەخوساوە. ئەوسا جوانیان دەشێلاو دەیانکردە ((داندۆك)) و لەبەر هەتاویان دادەنا هەتا وشك دەبووەوە. پێش لەبەر هەتاو دانان ((تەڕە داندۆك))ی ناوبوو.

داندۆك لە شەوانی درێژی وەرزی ساردیدا، تەرحی شەو چەرە، بە چایە دەخورا. یاخۆ دەیانکردە شیو.. و بە سلقیان لێدەناو زۆر بەتام بوو.

دووەم: دۆیە پەتیەکەیان لەبەر... رۆژ هەڵدەخست.

ئەگەر بیانکردبووایە سەلك سەلك ((کەشك))ی ناو بوو. ئەگەرنا پێی دەگوترا ((شیرێژ)). سبیانان بە چایە دەخوران: زۆرجار کەشکەکەیان لەگەڵ گەنمەکوتا دەکردە شیوی ((دۆ بە کەشك)) زۆر بەتام بوو.

لە هێندە شوێنان ماستیان دەکردە داندۆك. داندۆکەکەی زۆر لە داندۆکی بەدۆی بەتامتربوو. بەڵام لەبەر چەورییەکەی زوو تێکدەچوو.

***

گاوان ئەو کەسەبوو دەچووە بەر چێڵان: ((گاران)). لەناو ئاواییدا شوێنێك بۆ گارانی لێراوەستان تەرخان کرابوو. هەر ماڵە و چێڵی خۆی سبیانان زوو دەبردە شوێنەکە.

گاوان بەیانیان زوو لێی دەخوڕین هەتا ئێوارە. ئەوسا دەیهێنانەوە شوێنەکە.

هەندە ڕەشـەوڵاخ بـەخۆیان دەچـوونەوە مـاڵی خاوەنیـان و هەنـدێکیش دەبووایە، بەدوایدا بچن.

گاوان لە بریتی کرێی ڕۆژانە هەر خاوەن چێڵێك نانێکی دەدایە.

گاوانەکە هەرکە دەچووە بەر دەرگەی هەر ماڵێك دەیگوت:

- نانی گاوانی ڕەحمەتتان لێبێت.

ماڵەکەش نانێکیان دەدایە.

مەسرەفی هەرە گەورەی ئەوسا نانەکەبوو.

وێـڕای ئـەوەش گـاوان لـە هـەر چـێڵێك میقـدارە پارەیـەکی مانگانـەی وەردەگرت. لە ((١٥)) درهەم، هەتا دینارێك کرێی یەکسەر ڕەشەوڵاخ بوو.

***

## ئەو بابەتانەی پەیوەندیان بە مەڕو ماڵاتەوە هەیە

**ئاو شنگ:**

مەڕ یان بزنێکە بێچووی نەمابێت و شیریش بدات.

بەرامبەر بە ((کەندۆ))یە لە ڕەشەوڵاخدا.

واتە هەر چێڵێك گوڵکی نەمابێت و شیریشی هەبێت ((کەندۆ))ی پێ دەگوترێت.

**باقۆ:**

کار، یان بەرخێکە، بەهۆی کەم شیری دایکییەوە، یاخۆ داك مردە بێت، لەکاتی ساوایی تێر شیر نەبوو بێت. هەرکە بە تەمەن کەوت جەستەی تەواو ناڕسکێت و هەڵنادات و پەلەکانی باریك و بێهێز و.. ورگ گەورەیە.

ئەم تەرزە کارو بەرخە بۆ ڕاگرتن دەستنادەن و دەکوژرێنەوە.

**بەلەباقە:**

نەخۆشییەکی کوشندەیە و تووشی ڕەشان دەبێت، نەك سپیان و دەیکوژێت.

**بێر:**

لە بەراییدا پێویستە مانای ئەو.. وشانەی خوارەوە بزانن:

١- بێر: ڕیزبوونی مێگەلە بۆ دۆشین و هەتا دۆشینەکە تەواو دەبێت.

٢- بێرکردن: هەستان بە کاری دۆشینی مەڕ لەبێردا.

٣- بێری: ((بێریوان)) بێرڤان ئەو ئافرەتەیە مەڕ دەدۆشێت لە بێردا.

٤- بەربێر: ئەو کەسانەن لەکاتی دۆشینی مەڕ لەبێردا بەدوو کار هەڵدەستن:

یەکەم: لە ملاولەولای مێگەڵ ڕادە وەستن و نایێڵن مەڕ و بزنی دۆشینێ لە ڕیز بچنە دەرەوە هەتا دەدۆشرێن.

دووەم: ئەو سپیان و ڕەشانەی نادۆشرێن لە ڕیزەکەی هەڵداوێرن.
لەبەر زۆر دووبارەبوونەوەی بێر کردن ئەو تەرحە ئاژەڵانە فێردەبوون و بەخۆیان لە ڕیزی مێگەلەکە دەچوونە دەرەوە.
٥- داربێر: دووداری لەشێوەی شەپکە شەغرە تێکپەڕیون و نابێت لە بالآی ئاژەڵ بەرزتر بێت.
٦- سەربێر: ئەو کەسەیە لەسەر دار بێردا دەنیشێت و لەکاتی دۆشیندا سەری ئاژەڵ دەگرێت.
نێوان سەربێر و بێریوان نزیکەی مەترێك دەبێت.
مەڕەکە هەرکە سەری گەیشتە ڕاست داربێرەکە، پاشەڵی دەکەوێتە پێش بێریڤان و ئەوسا سەربێرەکە ملی دەگرێت و ئەویش دەیدۆشێت.
بێریوان هەر جارێ لە دۆشینی یەکێك بووایەوەدەیگوت:
- بەرەکەتدا.
واتە دۆشراو بەریدە.
مەڕ لە مەنجەڵێکی گچکە = ((مەنجەلۆك)) دەدۆشرا بە ((مەڕدۆش)) ناودەبردرا. هەرکە پڕدەبوو بێری شیرەکەی لە مەنجەڵێکی لە مەڕدۆش زۆر گەورەتر و پارزوونگدار دەکرد.
پارزوونگەکە بەزۆری پارچە بوزی بوو. واتە لەشێوەی کری ڕانك و چۆغەدابوو.
زۆرجار: مەڕ، یان بزن لەکاتی دۆشیندا میز، یان قشپلی دەکرد و لەگەڵ شیری نێومەڕ دۆشەکە تێکەڵ دەبوو. ئەگەر میزبووایە شیرەکە دەڕژاو ئەگەر قشپل بووایە بێریوان بەدەست لە شیرەکەی دەردەهێنا، یان شیرەکەی یەکسەر ڕوودەکردە نێومەنجەڵە گەورەکە و ئەوسا قشپلەکە لەسەر پارزوونگەکە دەوەستێت و فرێیدەدا.
لەبەر ئەوە قشپل شتێکی وەك بریوانی پێوەیە دەیانگوت: نایەڵێت شیرەکە پیس بێت.

ئەگەر بێرکردنەکە لە ئاوایی بووایە، لایەکی مێگەلە ڕیزبووەکە بۆ دۆشین دیوار و لایەکەی دی کەسانی بەربێر. خۆ ئەگەر لەدەشتیش بووایە بەربێر لە هەردوولای دەوەستان.

هێندەجار بەگشت ئەو کەسانەی خەریکی بێرکردن بوون دەگوترا: ((لەبەر بێرە)).

لە بێردان بەمانا دۆشینی مەڕو بزن دێت: ((مەڕەکان لەبێر دران)) واتە دۆشران.

***

**پاشبەران و پاشتەگە:**

ماوەیەك دوای تەگەو بەران خواردن هەندێك لە بزن و مەڕ بەتەگە و بەران دەهاتنەوە. ئەمە ((بە پاشتەگە و پاشبەران)) ناونرابوون.

هەرکە وەرزی پەڕین بەسەر دەچوو شوانەکە بۆ ئەوەی بزانێت فلان مەڕ، یان فلان بزن بەران و تەگەیان گرتووە، لەبەر بێچووەکە دڵی نەدەهات دەست لە ورگیان بدات. بگرە دەستی دەدا گوانیان. ئەگەر لەژێر گوانیان گرێیەك پەیدا بووایە دەیگوت: ئاوسە ئەگەرنا ئاوس نەبوو.

***

**پاوان:**

پاوان شوێنێکە لە چیاو زوورگ و هەڵەت و شوێنی تر پووش و پەلاشی لەوەڕی زۆر بێت و مۆڵگەی مەڕدارێك بێت و قەدەغەی مێگەلە مەڕی ئەملاو ئەولا بێت.

ئەمەش لە دەشتی هەولێر، بەزۆری بۆ.. وەرزی زستان، کە ئەوسا لەوەڕ لە دەشتەکە نەدەما بەکار دەهات. پووش و پەلاشی خاوێن و دەق نەشکاو مەڕومالات باشی دەخۆن، هەرکە بارانیش بباریت گیا، لەژێر پووشەوە، کەوا بنکی گەرمەو ساردی کاری لێناکات، لە گیای ئاسایی زووتر شین دەبێت و نموو دەکات.

ئەوسا مەڕومالاتی لە وەرزی ساردیشدا بێبەش نەدەکرد.

**پەلەفیرکە:**

پەلەفیرکــە: ((زەحــیری))ی مەڕومالاتــە = ((ڕیخانــدن)). ئاژەڵــە تووشبووەکە ڕێخێکی زۆر شلی بە دامێنی دێتە خوارەوە.

**پسکە:**

**پسکە بە سێ مانا دێت:**

١- قسە کردن بەدەنگی زۆر نزم: ((ئازاد و نەوازاد ئـەو پسـکە پسکەیان لـە چییە)).

٢- ڕووەکێکــە زۆر هــەڵنادات و گــوڵی زەرد و ســپی دەگرێــت. قــەدی بــە ئەندازەی پەنجەی گەورە ئەستوورە و ناوەکەشی وەك قامیش بۆشە.

٣- نەخۆشییەکە لە ساردییەوە تووشی مەڕ و مالاّت دەبێت وەك پەسیو ئـاو لە لووتییەوەی دێت.

ئەوسا قەدی دار پسکەکەیان لەت لەت دەکرد و.. چەشنی مێروو بـە داوەوە دەکراو لە ملی ئەو ئاژەڵەی تووشی نەخۆشی پسکە بووبوو هەڵدەواسـی. گوایا پێ چاك دەبووەوە.

((لاموابــوو: ئەگــەر لێمنەبێتــە درۆ نــاوی نەخۆشــییەکەش هــەر لــەناوی ڕووەکەکە.. وەرگیراوە. نووسەر)).

***

**پێستەی ئاو خواردنەوە:**

**ئـەو پێسـتە ئاژەلانـەی لـە زەمـانی زوو ئـاوی خواردنـەوەی تـێ دەکـرا ئەمانەن:**

١- **کوندە:**

باسی کوندە بەتێرو تەسـەلی کـراوە بۆیـە پێویسـت ناکـات لێرەشـدا چـیرەی بدەمێ.

٢- بنۆره:

کونده هەرکە زۆر بەکاردەهات لەبەر ئەوە لای دامێنی ناسکتربوو زووتر لە پێشەوە دەڕزی. کابان ئەوسا لای ڕزییەکەی لێدەکردەوە و ئەویتری دەدوورییەوە و.. وەك پێشوو ئاوی خواردنەوەی تێدەکراوە. ئەوسا بە ((بنۆره)) ناو دەبردرا، نەك کونده.

کیژی پارچەڵە وەك هەست بکات گەورە بووە لەسەر بیر ئاوی تێدەکرد و بە پشتەخۆیدادەدا و دەیبردەوە.

٣- جەوەندە:

کونده بوو، بەڵام بچووك و لە پێستەی کار دروست دەکرا.

لە وەرزی گەرمادا شوان ئاوی خواردنەوەی تێدەکرد و بۆ ئەوەی ئاوەکەی تێدا گەرم نەبێت بە بن زگی ئەو گوێدرێژەی هەڵدەواسی کە ڕۆژانە لەگەڵ خۆی دەبرد. لەلایەك بەهۆی جەستەی کەرەکەوە تینی ڕۆژی پێنە دەکەوت و لەلایەکی دیکەوە لە ملاو لەولادا بای پێدەکەوت.

٤- دێمکە:

کونده هەرکە دەڕزی ئەو شوێنانەی ساخ بوو تەرحی جۆرگ دەیان دووری. ئەملاو ئەولای سەرەوە ((قوڵفە))ی هەر لەخۆی بۆ دروست دەکراو بە پەتێك بەتەنگەی گوێدرێژی شوانەوە هەڵدەواسرا. لە ناوەڕاستیدا کونێکی تایبەتی بۆ دروست کرابوو، دارێکی وەك دەبەی سەرەشووشەی ئەمڕۆ لەنێو دەرگاکە دەنراو نەیدەهێشت ئاوەکە بڕژێت.

شوان لەکاتی ئاو خواردنەوە دەری دەهێناو ڕووی دەمی خۆی لە حەوا دەکرد و کونەکەی لە دەمی نزیك دەخست و بنکی دێمکەکەی بەرز دەکردەوە و ئاو شووڕەی دەکردە نێو دەمیەوە.

دێمکە هێندە جار لە مشەماش دروست دەکرا.

***

**تەمغە:**

هەر کاوڕەمێ و کاوڕە بەرانێکی ساڵێ بۆ ئەوەی دوا ڕۆژ بزربن و کەس نەتوانێت بیانکاتە ماڵی خۆی و زوو بدۆزرێنەوە، خاوەنەکەی لە وەرزی مەڕ بڕینەوەدا تەمغە: ((مۆر))ی تایبەتی خۆی لەنێو ئاگر سوور دەکردەوە و گوێیانی پێداخ دەکردن.

شوێنە سووتاوەکە هەتا مردن لەگوێی ئاژەڵەکەوە دیاربوو.

هەندێك مەڕدار لەجیاتی تەمغەی سەرەوە گوێیانی بەشێوەیەکی تایبەت کەل دەکردن.

***

**جەوبڕانێ:**

**= ((مەڕبڕینەوە)):**

ئەو سپیانانەی ئەستەوبرن، لەبەر ئەوە نەزابوون و خورتبوون، هەتا گەرمی بەهۆی خورییەکانیانەوە کاریان لێنەکات و زوو قەڵەوبن پێش مەڕە زایان دەبڕانەوە. واتە پێش دروونەی جۆ، کەچی بڕینەوەی مەڕەزاو کاوڕ لە سەر و بەری دروونەی جۆ بوو.

لە بەراییدا دەمەوێت لەمانای هێندە وشەی پەیوەست بە بابەتەکەوە بدوێم.

١- جەو = مەقەسی مەڕ بڕینەوە.

٢- جەوبڕ = ئەو کەسە مەڕ دەبڕێتەوە.

٣- جەو بڕانێ = مەڕ بڕینەوە.

ئەمانەی سەرەوە تایبەتی دەشتی هەولێرن.

٤- برینگ: بە بۆچوونی من بە سپییەکی تازە دەرکەوتە: تازە پەیدا بوو بێت دەگوترێت. بۆ وێنە:

أ- هەورەکە لەبنەوە ((برینگ))اندی. واتە ڕوون بووەوە و ساماڵ دەرکەوت.

ب-مەڕەکە ((برینگ))ی هێناوەتەوە.

سپیان لە دەشتی هەولێر، لە کڵۆی زستان. لەبەر ئەوە لەوەڕ نەدەما و نەمری و نەژی ((کاو جۆ))ی دەدرایێ زۆر لەڕولاواز و بێهێز دەبوو، نە گۆشتی دەگرت نە خورییەکەشی زێدەی دەکرد. هەرکە وەرزی بەهار دادەهات و تێر شینکە دەبوو، ڕۆژ بەڕۆژ قەڵەو دەبوو.. و لەژێرەوەش خورییەکی نوێی زۆر سپیی لەچاو خورییە کۆنەکەی دەردەدا. ئەوسا دەگوترا: ((مەڕەکە برینکی هێناوەتەوە)).

٥- برینگە: جگە لە دەشتی هەولێر بە مەقەسەکە دەڵێن: برینگە.

٦- بڕینەوەی مەڕ لە ((برینگ))ەکەوە، واتە لە خورییە تازە و سپییەکە دەست پێدەکرێت. نەك لە خورییە کۆنەکە.

٧- هەر لەبەر ئەوەشە بەمە قەسەکە دەگوترێت ((برینگە)).

***

**جۆرەکانی بڕینەوە:**

**ئەمانەن:**

١- **سابڕ**: خوری و مووی جەستەی ئاژەڵەکە سەرتاپا نەهێڵدرێت. واتە لووس بکرێت.

ئەمەش تایبەت بوو بە مەڕی هەراشزاو ئەستەویر و بەردیل و شەك و کاوڕە نێر و ڕەشانی ئەستەویر.

٢- **لانکانی**: بەس سینگ و مل و دونگ و بن زگی سپیانەکەیان دەبڕیەوە.

ئەمەش تایبەتی بەران و شەکی نێر بوو. تاکو گەرما کاری لێنەکات بۆکاتی پەڕین بەهێز بێت.

٣- **بزنانی**: تەنیا لای پێشەوەی دەبڕێتەوە و تایبەتە بە بزنە زا.

٤- **بە دامێن**: تەنیا خوریی پاشەڵی مەڕەکە دەهێشتراوە ئەمەش بەزۆری بۆ مەڕە زابوو. تا ڕۆژ کار نەکاتە سەر گوانی.

٥- **بە پشتەك**: هێندە خوری لەسەر تیلەقەی پشتی سپیانەکە دەهێڵدراوە. تاکو گەرمی کار نەکاتە سەر جەستەی.

ئەمەش تایبەتی مەڕە ساوازێ و کاوڕەمێ و کاوڕە نێرەی بۆ بەران ڕادەگیرا.

***

پۆژی جەوبڕانێ:

خاوەن مەڕ ئەو ڕۆژە، لەدوای دووسێ جەوبڕی ئاوایی دەنارد.

دوو کەسیش، جگە لە جەوبڕەکان بەم تەرزەکارانە هەڵدەستان:

١- مەڕیان پەل دەبەستاو دەیان بردنە بەر دەستی جەوبڕ.

٢- هەرکە مەڕێك دەبڕاوە، مشکیان بەجەستەدا دەکرد تاکو گەرما کاری لێنەکات.

٣- هەر مەڕێك لەکاتی بڕینەوەیدا جەستەی برینداربووایە بۆ ئەوەی خوێنەکەی ڕاوەستێت و گەرما ژۆش نەبێت ڕیخیان لە برینەکە هەڵدەسوی.

٤- خوریيە براوەکانیان بە گەنجی و پیسییەوە لوولدەدان.

٥- ناوەناوە کۆتکە دۆیان بۆ جەوبڕەکان دەبرد.

***

خاوەن مەڕ ئەو ڕۆژە بەرخێکی سەردەبڕی و بە پڵاوساوار و مەرەگەی پیازاوی پڕ گۆشت لێدەناو ئەوەی بەشداری کارەکە بوو بوو دەیخوارد.

دوای بڕینەوە خاوەن مێگەلەکە هەتا دووسێ ڕۆژان ئاژەڵە براوەکانی تاکو لێڕادەهاتن، نەیدە هێشت بچنە بەرگەرمای بەتین. واتە بۆ لەوەڕ پێش نیوەڕۆ زوو دەیهێناوە و لەبەر سێبەری ڕەشماڵ بوو، یان کەپری تایبەتی ڕأدەگرتن.

دانی ئێوارانیش هەتا فێنك دەبوو ئەوجا بۆ لەوەڕی لێدەخوڕین.

هەتا هەفتەیەك، زیاتر هێندە سپیان خوار دەبوون. واتە پشتیان بەلایەکدا دەچەماوە. ئەمەش بەهۆی باران و تینی خۆرەوە بوو.

***

**چڕدۆ:**

ئـەو بزنەیـە، کـە لـەکاتی دۆشـینیدا گـوانی خـۆی چـڕدەکاتەوە. تـاکو شـیرەکەی تـەواو لـە گـوانی دەرنەیـەت و بـۆ بێچـووەکەی بمێنێتـەوە. واتـە دەیکوشێت.

ئەمەش هەر لە کاتی دۆشینی بزنەکە دیاربوو زگی خۆی بەرز دەکردەوە و پشتیشی کووڕ.

دووەم: چڕدو لەقەبی بنەماڵەیە کە، لە گوندی مورتکەی گەورە.

***

**حالۆری:**

لە وەرزی مەڕ بە بەران و بزن بە تەگەهاتندا دوو شوانی دۆسـتی یـەکتر، هەریەکەیان مەڕێکی بە بەران، یا بزنێکی بە تەگەی لەنێو مێگەلەکـەی خـۆی جیادەکردەوە و بۆ نزیك مێگەلەکەی ئـەویتر دەبـرد. ئـەویش سـەری بـەران، یاخۆ تەگەی خۆی دەگرت و بۆلای مەڕ و بزنی هاوڕێیەکەی دەبردن.

ئا.. ئەم کارە وایدەکرد بەران و تەگەکە فێر ببن و لە نێو مێگەلی خۆیـان گیرنەبن و بۆ پەڕین بەرەو مێگەلێکی نزیکیانەوە بچن. ئەمە بـە ((حـالۆری)) ناو دەبردرا.

***

**خوری:**

مـەڕدار سـاڵێ خوورییەکـەی دەفرۆشـت. جوولەکـە دەهـاتن بـە لـۆری دەیانگرى و دەیانبرد.

کەچی هێندە مەڕدار چەند خوورییەکیان بـۆ ڕیسـتن دەهێشـتەوە. خـوری دوای برینـەوە بۆر و زۆر پیسە و بەکەلك ڕستن نەدەهات دەیانشوشتەوە. ئەو جا دەیان ڕست. کابانیش هەبوو تاکو ڕیسەکەی جوان بێت خورییەکەی پێش ڕستن وەك شانە کردن بە دەست خۆشی دەکرد.

ئالـەتی ڕسـتن لـە دەشـتی هـەولێر تـەنیا تەشـی بـوو. دۆم بـە خـەرەك درووستی دەکرد.

سەرێکی بە ئەندازەی داندۆکێك، لای سەرەوەی پانتر بوو لە بنەوەی. لە ناوەڕاستیدا کونێکی تێدابوو.

کلکـە تەشـی دارێکـی درێـژ نیـو مـەتر و بەقـەد پەنجـە دۆلەدرێـژە ئەستوورەکەی دەخرایە کونی سەرەکە و قاییم دەبوو. سـەرە باریکەکەشـی دەبووە کلك.

بزمارێکی قـولابی بچووك لـە سـەرەکەی درابـوو بەنەکـەی پـێ لـە کـاتی ڕستندا ڕاگیر دەکرا.

تەشـییەکە داری کـەوت بـوو.. و ڕەنـگ سـپی دۆمـەکان بـۆ جـوانی سەرتاپایان ڕەنگ دەکرد. کەچی بەو دوایـی یـەدا تـەنیا سـەرەکەیان ڕەنـگ دەکرد و کلکەی سپی بوو.

کابـان هـەوەلجار تیسـکە خورییـەکی بەدەسـت بـادەدا هـەتاوەك بـەنی لێدەهات. ئەوجا لـە قـولابی تەشـییەکەی دەخسـت. خورییەکـەی وا باریـك و ڕێك دەخست بە ڕستن هەرزوو دەبووە ڕیس.

هەتا تەشییەکە بەتاڵ بوو کابان سەری کلکـی تەشـییەکەی بـە پەنجـەبا دەدا.

هەرکـە تەشـییە قـورس دەبـوو کلکـی تەشـییەکەی لەگـەڵ بڵنـد کردنـی ڕانێکی دەخستە سەرو بەدەست دەیسووڕاند.

هەوەڵ ڕستن. واتە خوری بکرێتە ڕیس بەنەکە ((خاوك))ی ناوە.

زۆرجار کابان دوو داوە خاوکی ئەگەر بەیەکەوە بۆ گشت بایدابووانایـەوە هـەر دوو گلۆڵـە خاوکـەکانی لـە زەوی دادەنـاو سـەری داوە خاوکـەکانی بـە نێوقـەدی دارێکـی دوو گـوێ = ((دوو لـق)) کـە بەسـاپیتەی خـانووەوە هەڵواسراو بوو دادەبردن و لـە تەشـی دەخسـتن و ئـەوجا بەهـەر دوو ناولـەپ کلکە تەشییەکەی حێل بادەدا و زۆر بەگوڕ دەسـووڕا. بەمـە کارەکـە خێراتـر دەڕۆیشت. کە پێیدەگوترا ((داوە دولکە)).

***

**ڕوونگ:**

جار وابووه مەڕێك کراوەتە دابەستوو. هەتا زوو قەڵەو بێت خاوەنەکەی دەیبڕییەوە. لەبەر ئەوە بەهاریش بڕابووەوە خورییەکەی وەك ئەوەی پێشوو درێژ و تیسکن نەبوو. ((ڕوونگ))ی ناو بوو. نابێتە ڕیس. بگرە دەکرا پەتەو شتی تر.

**خوێڕسك:**

ئەگەر مێگەلە مەڕ خوێ بدرابووایە خوێیان بە هێڵی باریك و درێژ لەسەر زەوی ڕوودەکرد و مەڕومالاَتەکە بەتاو دەهاتنە سەری.

جا بەو شوێنەی خوێیەکەی لێڕوو کرابوو دەگوترا:

((خوێڕسك)). لەگینە: ((خوێڕێژگ)) بووبێت و لەسەر زاران سواوە و بووە بە ((خوێڕسك)).

**خۆشگوان:**

ئەو بزن و مەڕەیە، کە چیلکەی گوانیان ڕێك و لووسە و لە کاتی دۆشیندا لە دەستی کابان خۆشە و بە تۆزێك کوشین شیری دەردێت..

***

**دابڕانی کارویەرخ لەداکیان:**

واتە لە شیر کردنەوەی کاروبەرخ. ئەمەش لەکاتی تێکەڵ کردنەوەی زاك وماك دادەبوو. دوو جۆرە:

١- بە پاشەراوی خم، یان ڕەنگی ئاسا ڕەنگ دەکران. ئەمە تایبەت بە بەرخان بوو.

بەرخ هەرکە ڕەنگ دەکران زۆربەی دایکەکەیان نەیاندەناسییەوە و نەیاندەهێشت بیانمژن، بەلاَم بێچووەکە هەرگیز لەدایکەکەی دانەبڕاو قەرەبەقەرەی دەڕۆیشت.

هەشبوو دایکەکە دەیناسییەوە. ئەو جۆرە بەرخەیان وەگەڵ مێگەلێکی لاییدە دەدا.

٢- بزمووك. ئەمەش تایبەت بەکار بوو.

پەلەدارێکی درێژی نزیکەی بستێك و ئەستووریشی کەمێك لە پەنجەتووتە باریکتر. ئەمسەر و ئەو سەریان لەلەی لێکرابوو بەنێکیان لە لەکان دەخست و لەدەمی کاریان هەڵدەکێشاو ناوەڕاستی بەنەکە دەخرایە پشت شاخەکانی.

کارەکە بەهۆی بزمووکەکەوە دەمی وێکنەدەهاتەوە تا گوانی دایکی بمژێت.

***

**دانکە:**

دانکە خوریکەی ئاژەڵ و پەلەوەرە. من دیومە ((سپیان)) دانکەی لێهاتووە. بەڵام لەیادم نەماوە چۆن تیمار دەکرا.

**دەوسە:**

دەوسە = ((دەم سە)). ئەو ئاژەڵەیە لچێکی لە لچەکەی دی گەورەتربێت. ((گڕە))شی پێ دەگوترا.

***

**درووست کردنی لباد لەلوا:**

خاوەن مەڕ هەرکە بەرخی دەبڕییەوە ((لوا))کەی دەفرۆشت. هەندێکیشی دەکردە لبادو کەرك و قاپوت.

لوا چۆن دەکرایە لباد:

- لوا ئەگەر نەشووڕابووایەوە لبادی بۆرو توندو ڕەق دەبوو.

ئەگەر بشووڕابووایەوە لبادی سپی و شل و خاودەبوو.

١- پەڕەچی ((ئەوکەسەیە لباد درووست دەکات)). لە هەوەڵەوە دەبێت لواکەی بە ((کوتك)) و ((کەوان))ی تایبەت پەڕە بکردبووایە.

٢- گوشێکی ڕادەخست و ((دارچیخ))ێکی بە بەرینی دەخستە ناوی.
٣- لواکەی بەشەنەی تایبەت، لەسەر گوشەکەی پەرت دەکرد.
٤- بەنمە ئاوێك دەپرشێنێت.
٥- دوای ڕشانەکە لوولی دەدات.
٦- دارەکە دەکەوێتە ناوی.
٧- بە کندرِ دەیپێچا.
٨- ئەوجا بەلەقە لێی دەدات و بۆ پاش و پێشی، بۆ ماوەی چوارێگێك، یان بیست دەقیقە دەیسووڕاند.
٩- ئەمە هەتا ئێر پێیدەگوترێت: ((خاوە)).
١٠- دەیکاتەوە و لواکە چووەتە باریەك.
١١- ئـەوجا نەخشـی، دوای خـاوەکردنی بەدەسـت لەسـەری دادەنێـت. ((ئەمەیان بە ((وەفد))) ناو دەبردرێت.
١٢- ڕەنگی نەخش بە کـەیفی خۆیـە و: ((ڕشـەش وسـۆر و زەرد و کەسـك و شین)).
١٣- دیسان ئاوی لێدەپرژێنیت و لوولی دەداتەوە و بە کنـدرِیش دەیپێچێت. پاش نیو سەعات هێناو بردنی دەیکاتەوە.
١٤- جاری سێیەم ئاوی لێدەداتەوە و بە باسك دەیسووڕێنیت.
١٥- ئەوجا دەیکاتەوە و بووەتە لباد و لەبـەر هـەتاو تـاکو وشـك دەبێتـەوە هەڵدەیەخرێت.

من چیم لـەو پەڕەیـە نـەدەزانی، لـە ڕێـزدار ((پـیرداود))ی مـام حەمـەدەمین پەڕەی مورتکەم وەرگرتووە. زۆرسوپاس.

***

**دۆنەدەر:**

ئەو مەڕدارە بـوو.. ڕەزیلـی بـەدۆی دەکـرد و هـەتا لـەدوبێڵی بهاتبووایـە قومە دۆیەکی نەدەدا دەورو جیران.

دووەم: لە قەبی بنەماڵەیەکە لە گوندی مورتکەی گەورە.

## ڕەشماڵ:

ڕەشماڵ لەمووی ڕەشان، تەرحی خرار، تۆزێك تەنك و شاشتر دروووست دەكرا. هەر جارێ یەك تەختە دەچێنرا. ڕەشماڵ بە زۆری چوار تەختە مووی ڕیسراو بوو.. و تایبەت درووست دەكرا.

ڕەشماڵ هەبوو گەورە چوار پێنج ئەستوندە. واتە چوار پێنج ئەستوندەی لەكاتی قیتكرنەوەیدا دەدرابەر.

هێندە ڕەشماڵ، لە ژوورەوە شوێنێكیان، بە چیخ، یا جاجم تایبەت بۆ ژن و منداڵ جیادەكردەوە. لاموابوو بە ((لابیانە)) ناو دەبردرا ((ئەگەر لێم نەبێتە درۆ)).

لە ڕاست هەر ئەستوندەیەك ڕەشماڵەكە ((قولف))ێكی ئاسن، یان مووی بۆ كرابوو و گوریسی تێدە خراو سەرەكەی دی لە سنگێكی دووسێ مەتر دوور لە زەوی كوترا و دەبەسترا. ئەمە تەوازووی ڕەشماڵەكەی ڕادەگرت. ئەستوندە نیمچە كاریتەیەك بوو.

((بەرچیخ)): دارێكە لە شەقرە تۆزێك ئەستوور و ڕاسترە و درێژی مەترێك زیاترە لە ڕاست قولفەكان لە ((بەرچیخ)) دەنراو وەك سینگ دەكوترا و چیخەكەی پێ ڕادەگیرا. هەر بۆیەش ((بەرچیخ))ی ناوە. واتە دراوەتە ((بەر)) چیخ.

***

## زان:

لەپێش زاندا گوان پڕ شیر دەبێت.

ئاژەڵەكە، لەكاتی زاندا ((با بڵێین: مەڕە)) ژانی دێتێ و تەكان لەخۆی دەدات تاكو بزێت.

لە هەوەڵەوە ((كیسە)) ئاوێك لە ((زێ))ی دەردێت.

دەگوترا: ((ئەوا سەرایی هات)).

هەركە كیسەكە دەتەقی و لموزو پەلی پێشەوەی بێچووەكە دەردەكەوتن ((ئەوا سەرایی تەقاند)) دەگوترا.

بێچووەکە لەکاتی بوونیدا شتێکی ((لیچ))ی بە لەشیەوەیە بە ((لێبـان = بریوان)) ناو دەبردرێت:[1]

دایکەکە لێبانەکەی دەلێستەوە. ئەمە ((بانین))ی ناو بوو.

لێبانلێس، بە کەسێك دەگوترێت مێچکە مێچکە لـە دەربـاران و ئاسـت کاربەدەستان زۆر بکات.

ئەم وشەیە من درووسـتم کـردووە: ((لێبـان))ی پێشـووەوە و ((لێس))شـم وەگەڵ داوە.

پاشــەڵی بێچـووەکە لــەجیاتی ڕیــخ شــتێکی زەردی پێوەیــە و نــاوی ((مارزا))یە.

شوانی مـەعلان و چـازان لـە هەوەلـەوە پـێش ((فرچـك))دانی بێچـووەکە گـوانی دایکەکـەی قیچـێك دەدۆشـێت. تـاکو ئـەو ((ژەك))ە کۆنـەی لـە نێـو چیلکەی گواندایە بێتە دەرەوە ئەوجا بێچووەکەی دەمژاند.

هێندە شوان ئەو هەستەیان نەبووە و هەرزوو.. وایان دەکرد بێچووەکەی یەکسەر فرچك بگرێت. ئەو ژەگەی چیلکەی گوان پەیتـەو هێنـدە جـار لـەنێو ورگی بێچووەکە ((هەرس)) نابێت بێچووەکەی تووشی لەرزەك دەکـات. واتـە گشت بەدەنی دەلەرزێت. خاوەنەکەی دەیزانی چارەی نییە و دەمرێت سـەری دەبڕی. ژەکەکە لەنێو ورگیدا هێندەی داندۆکێك وەك پەنیر پەیت بووبوو.

**سەردۆ:**

ئـەو ((کـەرە ڕۆن))ە بـوو کـە یەکـەمجار لەسـەرەوەی دۆی تـازە هـەژاو ڕوودەکرا نێو دەفرەوە پەیدا دەبوو.

**بەردۆ:**

ئەو ((کەرە ڕۆن))ە بوو، کە بۆ دووەم جار دۆیەکە لە دەفـری یەکەمـەوە ڕوو دەکرایە دەفری دووەم پەیدا دەبوو.

---

[1] لەناوچەی کەندێناوە و قەراج بە ((بریوان)) مەشهوورە. بە بۆچوونی من بریوان شتێکی سـپییە لە زێی ئەو مەڕو بزنە دەردێت کە لەسەر زان بن.

**بن دۆ:**

ئەو ((کەرە ڕۆن))ە بوو پاش ڕووکردنی دۆ بە بن دەفرەکەوە دەنووسا.

***

**شەلکە:**

نەخۆشییەکە تووشی سمی مەڕومالآت دەبێت و شەلی دەکات.

***

**شوانکارە:**

پیاوێك مێگەلە مەڕێك دەدا، یەکێك بۆی بەخێوبکات. بەم تەرزە بووە:

١- بەرخەمێ بۆ خاوەن مەڕ بوو.

٢- خوری بۆ خاوەن مەڕ بوو.

٣- بەرخەنێر نیوەیی بوو.

٤- لوا نیوەیی بوو.

٥- سپیاتی بۆ بەخێوکەرەکە بوو. کە پێیدەگوترا: شوانکارە.

***

**کا پێچ:**

مەڕومالآتی دەشتی هەولێر، لەبەر ئەوە لەوەڕ، لەوەرزی زستان لە ئاقار نەدەماو خاوەنەکەشیان ئەوەندە جۆیەی نەدەدانێ تاکو نەمری و نەژی پێ بژین، ئەوساش هەبوو، نەبوو تەنیا ((کا))یان لە پێش زۆر بوو.. و ناچار لە برسان ملیان لەبەر کا دەناو: هەتا ورگیان پڕ دەکرد. کاش بە هەوەنتە هەزم نابێت. هەندێك لەو ئاژەڵانەی کایان زۆر دەخوارد، تایبەت پیر و بێهێزەکان توانای هرس کردنیان نەدەبوو.. و دەیکوشت و ئەوسا دەگوترا: ((کا پێچ بووە)).

***

**کۆر گوان:**

مەڕ و بزنێکە چیلکەی گوانیان، لەدەستی کابان، لە کاتی دۆشیندا لووس و خۆش نییەو.. واتە لە دۆشیندا کوشینی زۆر دەوێت. ئەمەش بە کۆر گوان ناو دەبردرا.

**کۆڵ و حەوز:**

خاوەن ولساتی زۆر لە وەرزی گەرمادا، لە ئاودانی ئاژەڵەکانی تەنیا بەکۆڵ دەرەقەت نەدەهات، خێرا خێرا ئاو بە دەولکان لەبیر هەلێنجێنێت و لەکۆڵ بکات، بۆیە ناچار بووە: حەوز لە نزیك رۆخی بیردرووست بکات.

بەرین و درێژی بە زۆری مەتر، یان کەمێك پتر بووە. بەرزیشی نزیکەی دوومەتر. بۆ ئەوەی رۆژ لە ئاوەکەی نەدات و گەرمی بکات، یان تۆزی هەوێزی دەور و بەری نێتە ناوی، سەری وەك خانوو گیرابوو.

ئەوسا چەمەنتۆ نەبوو عەردو دیوارەکانی ناوەوەی بە گێچ مارنج دەکرا.

لەسەر دیواری خوارەوەی دەرگاوە، بە گێچ تاتەبەردێك بۆ ئەوەی تەوژمی دەولکی پڕ ئاو کاری لێنەکات چەسپ کرابوو.

پێش ئەوەی مێگەل و.. وڵاخ بهات بووانایە، بە کەرو دۆڵاب حەوزەکە بەم چەشنە پڕ ئاو دەکرا:

هەرکە بەربیرەکە، دەولکە ئاوەکەی وەردەگرت، یەکسەر دەیبرد لە حەوزەکەی دەکرد.

((لە هەندە حەوزاندا کونی دەسکرد بوو لەجیاتی بۆڕی)) لەژێرەوە بوو، بە پەڕۆ، یان بە پەرلەدار گیرابوو دەکراوە و ئاو شۆڕەی دەکردە ناو کۆلەکەوە، هەرکە پڕ دەبوو کونەکەیان دەگرتەوە.

***

کۆل ئەوسا بەزۆر بەخشت دروست دەکراو ناوی بەگێچ مارنج دەکرا.

کۆلیش هەبوو بەرمیل، یان تەنەکەی دەسکردبوو.

لە کژی گەرمادا زۆربەی رۆژ دەشوورا. بەدەست ئاوی تێوەردەدرا.

ئەو کۆلانەی بەرمیل و تەنەکەبوون، دوای ئاو دانی وڵسات، بۆ ئەوەی پیس نەبێت و سەگ نەچێتە ناوی وەریاندەگێڕا.

ئەو کۆلانەی گەچ بوون، کەچۆل دەبوون سەگ دەچووە ناویان. ئەوسا بەگەڵاو دانە دەندرا.

**گرکە:**

گرکـە نەخۆشـییەکی پێسـتیەو بـە ((گەچـەلی و گڕووو))ێتـی ئـاژەڵ نـاودەبردرا. پێسـتی ئاژەڵەکـە شـەقار شـەقار دەکـرد و ئاژەڵەکـە دەمـی لەخۆیدەنا. واتە بە ددان دەیخوراند. لەبەر ئەوە ئاژەڵی تر لێیدەگرتە وە، بە پیسترین نەخۆشی ناودەبردرا. خاوەنەکەی بە ((کەرە)) و ((دارکە تووتن)) و خـوێ تیمـاری دەکـرد. ((لـەیادم نـەماوە پـێ چـاك دەبـووەوە، یانـە نـا. نووسەر)).

**گنجی:**

گنجی = ((کەمێڵ)) ڕیێخێکە بەتیسکی خوری و مـووی پاشـەلّی سـپیان و ڕەشانەوە دەنووسا و پێوەی وا ڕەق دەبووەوە، بـە تـەوژمی بـەرد نەبووایـە نەدەشکا. هێندەجار گنجییەکە دەدوازدەیەك بوونەو لە ڕۆیشتنی ئاژەڵەکەدا بەیەك دەکەوتن و دەنگیان لێوە دەهات.

***

**مەڕ بەنیوەیی:**

ئازاد پەنجا سەر مەڕی هەبوو.. و دایە نەوزاد و ئـەویش ((٢٥)) بیسـت و پێنج سەر مەڕی هەبوو. هەموو شتێك بە نیـوەیی بـوو.. هـەتا حـەوت سـاڵی ڕەبەق.

لەبەر ئـەوە نـەوزاد بـەخێوی دەکـردن و پێوەیـان مانـدوو دەبـوو، پـاش حەوت ساڵەکە نیوەی بۆ خۆی دەبرد و نیوەکەی تری دەداوە ئازاد.

***

**مێشکە:**

مێشـکە کـار، یـان بەرخێکـە دایکی نـەمابێت و لەسـەر هـیچ دایکێکـیش نەباندرابێتەوە، خاوەنەکەی ڕۆژانە، بۆ ئەوەی تێری بکـات، بـەم مـەڕ و بـەم بزنی دەمژاند. بەمە کار، یان بەرخەکە فێردەبوو.. و چـاوی بـە هـەر مـەڕێك، یان بزنێك بکەو وتبووایە بۆ لای غـاردەدا و سـەری دەبـردە بـن زگـی و تـاکو

**گرکە:**

گرکە نەخۆشییەکی پێستیەو بە ((گەچەلی و گرووو))ێتی ئاژەڵ ناودەبردرا. پێستی ئاژەڵەکە شەقار شەقار دەکرد و ئاژەڵەکە دەمی لەخۆیدەنا. واتە بە ددان دەیخوراند. لەبەر ئەوە ئاژەڵی تر لێیدەگرتە وە، بە پیسترین نەخۆشی ناودەبردرا. خاوەنەکەی بە ((کەرە)) و ((دارکە تووتن)) و خوێ تیماری دەکرد. ((لەیادم نەماوە پێ چاك دەبووەوە، یانە نا. نووسەر)).

**گنجی:**

گنجی = ((کەمێڵ)) رێخێکە بەتیسکی خوری و مووی پاشەڵی سپیان و ڕەشانەوە دەنووسا و پێوەی وا ڕەق دەبووەوە، بە تەوژمی بەرد نەبووایە نەدەشکا. هێندەجار گنجییەکە دەدوازدەیەك بوونەو لە ڕۆیشتنی ئاژەڵەکەدا بەیەك دەکەوتن و دەنگیان لێوە دەهات.

***

**مەڕ بەنیوەیی:**

ئازاد پەنجا سەر مەڕی هەبوو.. و دایە نەوزاد و ئەویش ((٢٥)) بیست و پێنج سەر مەڕی هەبوو. هەموو شتێك بە نیوەیی بوو.. هەتا حەوتساڵی ڕەبەق.

لەبەر ئەوە نەوزاد بەخێوی دەکردن و پێوەیان ماندوو دەبوو، پاش حەوت ساڵەکە نیوەی بۆ خۆی دەبرد و نیوەکەی تری دەداوە ئازاد.

***

**مێشکە:**

مێشکە کار، یان بەرخێکە دایکی نەمابێت و لەسەر هیچ دایکێکیش نەباندرابێتەوە، خاوەنەکەی ڕۆژانە، بۆ ئەوەی تێری بکات، بەم مەڕ و بەم بزنی دەمژاند. بەمە کار، یان بەرخەکە فێردەبوو.. و چاوی بە هەر مەڕێك، یان بزنێك بکەو وتبووایە بۆ لای غاردەدا و سەری دەبردە بن زگی و تاکو

بیمرژێت، دایکەکەش قەبوولی نەدەکرد و بەقۆچان سەراودوی دەنا. ئەمە مێشکەی پێدەگوترا.

***

**هەوار:**

کاتی خۆی زۆربەی زەوی زاری دەشتی هەولێر کێڵگە بوو: ((دەغڵ و.. ورد وشۆ)). شوێنی لەوەڕی مەڕ و ماڵات زۆر کەم بوو. تەنیا لەدەم کەند و جۆمان نەبێت. ئەم شوێنانەش هەر بۆ. کوتە مێگەل دەستی دەداو بەکەلك مێگەلی گەورە نەدەهات. ناچار خاوەن ئەو تەرزە مێگەلە، لە وەرزی ساردی و تەڕ و تووشیدا مێگەلەکەی بباتە زورگ و هەڵەت و بنار چیایان. کەنە دەکێڵدران. ڕەشماڵیش هەڵبدات و بە ((هەوار)) ناودەبردرا. هەتا ساردی وەرزی زستان کار نەکاتە سەر خێزانەکە دڕك و داڵیان دەدا پاڵ دیوی دەرەوەی چیخی ڕەشماڵ و بای ساردی دەگێڕاوە. پێدەگوترا ((پەرژین)).

بۆ بەرخی ساوای تازە چیخیان لوولدەدا، تا وەك تەندووری لێدەهات و کایان تێدە کرد و شەوان بەرخیان تێدەنواند ((کۆز))ی ناو بوو.

مەڕ و ماڵات لە وەرزی ساردیدا لەسەر خانووان لە ژوور دەکرا پێدەگوترا ((هۆل))، کەچی لە هەواردا چێورمەیەکی بەهێشکە بەرد، خڕدرووست دەکراو مەڕ تێیدا ڕادەگیراوە ((غەر))ی ناوبوو.

لەڕۆژی ((١٨)) هەژدەی مانگی شوبات مەڕ لە هەواران هەڵدەقەندراو بەرەو دەشتی قەراج دەچوو.

***

**هۆبە:**

پێشتر هەرکە مەڕ لە هەوارە زستان هەڵدەقەندرا بەرەو دەشتی قەراج دەچوو.

لەپەنجاو شەستەکانی سەدەی رابردوودا دەشتی قەراجیش سەرتا پاکێلدراو کەلکی هۆبە ڕەشماڵی نەما.

مەڕدارەکانی کەندێناوە، ناچار لەجیاتی قەراج دەچوونە کلکە زورگی دارەبزماران. کە کەلکی کێڵانی نە بوو.

لەبەر ئەوەش شوێنەکە وەك دەشتی قەراج بەرفرەوان نەبوو چەند ڕەشماڵێك لە نزیك یەکتریان هەڵدەدا. کە پێیدەگوترا: ((هۆبە ڕەشماڵ)).

ماوەی چەند ساڵ بەردەوام بوو. لە نزیك هۆبە ڕەشماڵەکان دووگرد لە. زورگەکە بەهۆی خەڵکەکەوە ناویان دەرکردبوو.

خاوەن ڕەشماڵەکان، نەخەسەلە ئەو پیاوانەی هەندە وەختان کاریان کەم دەبوو ڕۆژیان لێیان بەسەر دەبرد. یەکیان ((گردی فیشالان)) بوو. هەرکە مەڕدارەکان ماست و پەنیریان بۆ فرۆشتن دەبردنە شارو دەگەڕانەوە، هەر یەکەیان درۆیەکی هەڵدەبەستاو دەیگێڕاوە.

دووەم ((گردی گەمبۆران)): لەنزیك هۆبەکە بوو، پیاوەکان، ئەوانەی کەم ئیش بوون، ڕۆژ تا ئێوارە لەسەر گردەکەوە تەماشای ئافرەتانی ناو هۆبەکەیان دەکرد.

***

**بەربووك:**

زۆر کەس لەسەر بەربووکیان بەکەم و کووڕی و ناتەواوی نووسیوە. ئەمە هانیدام بە تێرو تەسەلی لەبەر بووك، بە تەرزێکی وا بدوێم کەسی دیکە لەمەودوا نەتوانێت پەنجەی بۆ درێژ بکات.

بەربووك لەنێو شاری هەولێر و دەوروبەری دوو جۆر بوو:

یەکەم: بەربووکی ژن بەژنی:

هەر بەربووکێك ڕۆژی گواستنەوە بووکی خۆی دەڕازاندەوە و بارگە و بنەگەی تێکدەنا. کە بریتی بوو لە بەڕەی ((نەخشین)) و ((توور)) و ((ملاّکدان)) و ((جاجم)) و ((بالیف)) و ((دووگورد)) و ((وردەواڵە)). لەسەر پشتی وڵاخێك، بە ((کەژی نەخشین)) و گوڵینگدار دەپێچاوە و سواری سەر بارگەکە دەبوو.. و لەپشتەوە، یان قەرە بەقەرەی وڵاخی بووك = ((مایین،

یان بارگین و هێستر)) بوو کە یەکێك جلەوی ڕادەکێشا، دەڕۆیشت. هەتا دەگەیشتنە شوێنی پێکدادان.

هەردوو بەربووك، بووکەکانیان دادەبەزاند و هەر بە پێوە، وایان دەکرد، بە ماچ کردن یەکتر بناسن. ماوەیەك بۆ پشوودان و سانەوە، بەرامبەر یەکتریان دادەنان.

ئەگەر بووکێك جوانتر بووایە، بەربووکی بووك جوانێ ڕووی لەبەر بووکەکەی دی دەکرد و:

- بڕۆنێ بووکی من چەند جوانترە لە بووکی توو.
- ئەویش بۆ پاکانە دەیگوت:
- جوانی بەبچم نییە دایکم. جوانی ئەدەب و ئەخلاق و کابان باشییە. بووکی من حەفت ماڵان بەڕێوە دەبات.

**دووەم: بەربووکی ژن بە ماڵ.**

ئەو بەربووکە، ئەگەر ماڵی بووك لە گوندێکی دیکە بووایە، ڕۆژێ پێشتر بۆ ڕازاندنەوە و لە خەنەگرتنی دەست و پێی بووك پێش نووستن و ڕێکخستنی بارگە و بنەگەی دەچووە ماڵی بووك.

بەربووکەکە ئەگەر لە خێزانێکی خانەوادە و ناوداری ناوچەکە بووایە ژنی ئاوایی و دەستە خوشکانی بووك پێیان دەگوت: ((دەستی جەنابتمان شکایە ئەگەرنا ئێمە تۆڵەی خۆمان دەکردەوە)).

چونکە ئافرەتانی ئەوسا بووك بە ماڵیان بە دۆڕاو لە قەڵەم دەدا. کەم و زۆر دەخلی بەربووکەکەیان نەدەکرد.

خۆ ئەگەر بەربووك ئافرەتێکی ئاسایی بووایە، لە هەوەڵەوە لچی غەزەبیان لێدەقرتاند و گەشکەیان پێدەگرت و دەیانگوت:

- تەماشاکەن، تەماشا: ئەو مەیموونە بووەتە بەربووك.
- عەمرت نەمێنێت لەگەڵ خۆت و بەربووکیت.
- ژن قات بوو تەنیا ئەو پیرە سەیە بکرێتە بەربووك.

چەندین قسەی ناڕەوای دیکە.

بەربووکیش دەیزانی تەنیایە و دەم لەدەم نانیان هەر خۆی زەرەر دەکات قسەکانی بەهەندە هەڵنەدەگرت و خۆی هەرگیز لەگوورە نەدەبرد و دەهایانە هەر ئەوەندەی دەگوت:

- ئەمە شیشی خۆمان وەشاند ئەوجا ئەنگۆش هەر لۆخۆتان برێسن.

لەکاتی بووک بەڕێکردندا دەستە خوشکانی بووک بۆ تۆڵە کردنەوە: ((قەرسەقول))، یان ((قشپل))یان بە کلکە ئەنگوچکی کراسی بەر بووک وەدەکرد.

هەرکە بووک سوار دەکرا لێکرا بە چەپڵە وپێکەنین و تلیلیلی لێدان دەیانگوت:

- بەربووکی داوێن بە ریخ. بەربووکی داوێن بەڕیخ.

ئەمە لەو سەردەمدا، بە مەزەبی ئافرەتان بە تۆڵە دەخەملێندرا.

بەربووکیش هەبوو زیرەك و مەفتووق و چاوکراوە بوو.. و دەیزانی دنیا چ باسە. ئەو شەو و ڕۆژەی لە ماڵی بووك ((مەلاك))، یان کەوگیر)) و ((تەشی))یەکی ماڵە بووکی دەدزی و لە باخەڵی خۆی حەشار دەدا.

هەرکە بەشێوەی گۆڕین چەپڵەیان بۆ لێبدابووایە ئەویش لەکاتی بەرێکەوتندا شتە دزراوەکەی یەکسەر لە باخەڵ دەردەهێناو لەگەڵ هەڵشەقاندنیدا دەیگوت:

- پێم نالێن ئەوەی لە کیهانتان ڕاکەم.

ئەوسا دەستە خوشکەکان دەفامران لە سایەدنەکردنی بەربووك لەم شەو و ڕۆژەدا، کەم تەرخەمیان لەم رووەوە دۆڕان و زاریان دەبەستراو نقەی دیکەیان لەبەروە نەدەهات.

***

بەربووك بووکی دادەبەزاند و قۆڵی دەگرت و هەنگاوی لە سەرخۆی پێدەهاوێشت.

هەرکە بووک دەگەیشتە بەردەرگەی حەوشەی ماڵی زاوا: ((قەسپ و مێوژ و شەکرۆکە))یان، بە هەلهەلە لێدان بەسەر دادەکرد. هەندە جار ئەگەر ماڵی زاوا دەوڵەمەند بووایە ((عانە)) و ((دوو فلووسی و فلووس))یش بوو.

منداڵە وردکەی ئاوایی پڕیان دەدایە و هەڵیاندەگرتەوە. بووک لەبەر تێک قژقـژان و کەڕەسێسـانێی منـداڵان نەیـدەتوانی شـەقاو باوێـت و بـەربووک ڕایدەگرت هەتا منداڵەکان پەرتەیان دەکرد.

زاوا لەسەر دیواری دەرگەی حەوشە ڕادەوەستاو هەرکە بـووک دەگەیشـتە لای، بـۆ ئـەوەی پاشـەڕۆژ سـامی بەسـەر سـامی بکـەوێت قامیشـێکی لـە تەپلەسەری دەدا.

بەربووک ئەو ڕۆژە لـەبووک دانـەدەبڕا. هـەر پێویسـتیەکی هەبووایـە: وەك ((ئاوخواردنەوە و سەر دەستاوو شتی دیکە)) بۆی جێبەجێ دەکرد.

دوای شیوخواردنی بووک گواستنەوە، زاوا داوای ((گۆریە)) و ((کیسـە)) و ((دەستەسڕ)) و ((نەینۆکی بەرباخەڵ)) و.. وردەواڵەی دیکەی دەکرد.

بە فەرمانی بەربووک دەیـدرایێ و بەسـەر پیـاوانی میـوان و ئەوانـەی لـەدو بووکێ چووبوون دەبەخشییەوە.

ئافرەتانی میوان و ئاواییش وردەواڵەیان پێشکەش دەکرا.

کەچی هێندە ئافرەتی خانەوادە بەربووک بەبووکی دەگوت:

- ((دووگورد))، یان ((پارچە قوماش))، یـاخۆ دووسـێ وردەواڵـەی بدەرێ.

بەربووک لای بووک دەماوە هەتا کاتی ژووان ئەوسا دەچۆوە ماڵی خۆی.

بەیانی ڕۆژی دوایی، ماڵەکە بەبۆنەی بەزاوا بوونی کوڕیان شیویان دەکـرد و لەدوای بەربووک و چەند ژنی ناوداری دراوسێیان دەنارد و پـاش نـانخواردن خەسـوەکە نیشـانەی بـەزاوابوونی، کـە بەکراسـی سـپیی بووکێـوە بـوو نیشاندەدان و ئافرەتە میوانەکان لێکرا دەیانگوت:

- پیرۆزە. پیرۆزە.

بەربووك زۆری هەوەست پێدەهات کە بەربووکێکی سەربڵندەو نەك سەرشۆڕ.

ئەگەر بووکەکە ڕای لە ماڵەمێردی بووایە، پەیوەندی لەگەڵ بەربووك هەرگیز نەدەبری و تەرحی پلکی خۆی بۆی دەڕوانی و لە زۆرشتان پرس و تەکبیری پێدەکرد. ئەگەرنا هەردەم بەچاوی دەغەز و درِدۆنگییەوە سەیری دەکرد و ناوبەناو وەبەر گوێی هەڵدەداو:

- ((ئەگەر ژن بووایت نەدەبوویتە بەربووکی ئەو ماڵە دۆم و قەرەجە)).

***

**بەلەڕووس و عەنتەرناش:**

خوالێخۆشبوو: ((زەعیم))ی گەل و نیشتمان پەروەر و سەرۆکی کۆماری عێراق ((عبدولکەریم قاسم)) بۆ ئەوەی چینی جوتیاری چەوساوە و ژێرچەپۆکی دەرەبەگان لە کەرستەی کۆنی کێلان رزگار بکات تەرەکتەر و دەڕاسەی بۆ ناردن. بە ناوی ((ئیسلاحی زراعی))یەوە.

دوو تەرەکتەر هاتنە ئاوایی ((مورتکە))ی گەورە.

یەکیان ڕەنگی سوور سوور بوو ((بەلەڕووس))یان پێ دەگوت.

ئەویتر زەرد بوو. ئەگەر لێم نەبێتە درۆ: ((عەنتەرناش))ی ئەمەریکی ناوبوو.

خەڵکەکە لێکڕا بەلەڕووسیان خۆشتر دەویست. سەیوانێکی لە ئاست سەری شوفێری هەبوو. دەیانگوت: ((لەبەر ئەوەڕووس کرێکاری خۆشدەوێت بۆ ئەوەی لەکاتی ئیش کردندا سەرماو گەرمای نەبێت سەیوانیان بۆ درووست کردووە. کەچی ئەویتر هی ئیستعمارە وانییە.

ڕۆژێك گوتیان: ((وا باشە تەرەکتەرەکان تاقی بکەینەوە. تاکو بزانین کیهانیان بەهێز ترە)).

زنجیریان لە پشتەوەی هەردووکیان خست و دوو شوفێری بێلایەن ((نەرەجعی، نەنیشتمان پەروەر)) تەرەکترەکانیان بەیەکەوە گرِدا.

خەڵکە زۆربەیان هانی بەلەڕووسیان دەدا و دەیانگوت: ((دەی لەوچاوەتە بەلەڕووس خێرا سەری ئیستعمار شۆڕ بکە – دەی، دەی بەلەڕووس گیان)).
کاتێك دیتمان عەنتەرناش بەلەڕووسی کردە کوچکوچە.
هاندەرەکان لە جێگەی خۆیان ساردبوونەوە.

***

**برنجە سووکە:**

چەند فەقێیەك لە گوندێك دەعوەت دەکرێن. یەکێکیان یەکجار زۆر لە حەدی خۆی زیاتر دەخوات و توانای ڕۆیشتنی بە پێیان لەبەروە نامێنێت. هاوڕێکانی ناچار گوێدرێژێکی بۆ پەیدا دەکەن و پێش ئەوەی بگەنەوە گوندەکەی خۆیان گوندێکی دیکەیان لەسەر.. ڕێگابوو. یەك لە خەڵکی ئاوایی یەکە دەچێتە پێشیان و دەڵێت:

- دەبێ بۆ ئێوارە بێنە زیافەتی من.

ئەوانیش چییان پێنەدەخورا و بۆ ئەوەی لەکۆل خۆیان بکەنەوە گوتیان:

- ئەو فەقێیەی سواری کەربووە گەورەمانە.

هەرکە پێی دەڵێت، فەقێیەکە دەڵێت:

- شیوەکەتان چییە؟.
- برنجە قوربان.

یەکسەر ڕووی لە هاوڕێکانی دەکات و دەڵێت:

- ئادەی فەقێینە برنجە سوکە سەری کەرێ وەسووڕێتەوە.

***

**بۆش:**

خوالێخۆشبوو ((مەلا عەلی))ی گوندی لاوەری ناوچەی کەندێناوە ئاوزەی من بوو. یەکترمان زۆر خۆش دەویست و زۆرمان بەیەکەوە خوێندووە. جارێك لەگەڵ کاکم بە سەردان دەچنە ماڵێکی پێشکەوتووی سەردەم.

((بەداخەوە ناوی ماڵەکەم لەیاد نەماوە)). ماڵەکە زۆر ڕێزیان دەگرن و نیوەڕۆ شیوی برنجیان بۆ لێدەنێن. لەتەك لەنگەرییە پڵاوەکە فەخفووری بۆش و مڵاك لەسەر سفرەکە دادەنێن.

تازەش بۆش پەیدابوو بوو.. و مەلا عەلی نەیدیبوو.. و زۆر پێی سەرسام دەبێت و بەخۆی گێڕایەوە و گوتی:

- لەدڵەوە گوتم: تەماشای کاکۆك دەکەم ئەوچی کرد منیش چاو لەو دەکەم.

((ئێمە خوشك و برا بە برا گەورەی خۆمان دەگوت: ((کاکۆك)). ئەویش لەخۆشەویستی ئێمە بە کاکۆکی ناو دەبرد)).

- گوتی: هەرکە دیتم: کاکۆك فەخفوورییە بۆشەکەی دەستدایە و بەمڵاکان پڵاوی هێدی هێدی تێکرد، منیش چاوم لێکرد.

***

لە زەماوەندێکی ئاغای گوندەکەمان، یەك لە ژنە ئاغاکان، لە دوای گێڕدرابووەوە.

((ناوهێنانی هەموار نییە))، ڕوو لە ژنە ئاغاکان دەکات و دەڵێت:

- ئەرێ ژنە کرمانج دەیانزانی شیو لە بۆش بخۆن؟.

دایکم یەکسەر.. ڕووی تێدەکات و دەڵێت:

- ئەنگۆ بۆشتان دانەهێناوە هەتا کەشخەمان لەسەر لێ بدەن. لە ژنانی شار فێربوونە و با ئێمەش لە ئێوە فێر ببین چیتێدایە.

ژنەکە دەڵێت: ((کەس لەگەڵ جەنابتی نییە)).

خوالێخۆشبوو ((ئاسیا خان))ی کچی ئاغای گوند ڕوو لەدایکم دەکات و دەڵێت:

- دەگ زارت خۆش بێت!. توخوا ئەو قسە قۆڕە هی ئەو ڕۆژە خۆشەیە!.

((نووسەر))

**بێستانی دێمی لە دەشتی هەولێردا:**

دەشتی هەولێر کە بریتیە لە دەشتی ((قەراج و کەندێناوە و سەنیە و مرگیە و شەمامك و بەڕانەتی و پشتڕێ))، بۆ کشتوکاڵ چەندی بڵێی بە پیت و فەڕە. ئەگەر ساڵ وشکاتی بە خۆیەوە نەبینێت، نەخەسەلە شەختە و بەفری هەبێت، خەڵکەکەی لە هەموو رووێکەوە بێبەش ناکات. یەك لە ئەوانە بێستانی دێمی.

لە دوای بارانی ((پەڵە)) فەلاح دەستی بە ((شۆ)) بڕین دەکرد. ئەمەش بە زۆری تا دەورووبەری مانگی ((نەورۆز))ی دەخایەند. لە نەورۆزەوەش کژی ((وەرد)انەوە بوو تاکو نزیك جۆزەردان.

تۆ کردنی بێستانی دێمی حەق وابوو لە دوای وەردانەوە بووایە کە بڕکی باشتر لێدەڕسکێت، کەچی لەبەر دەست کورتی و نەبوونی لەگەڵ وەردانەوە تۆ دەکرا.

خۆم چەند ساڵ بێستانی دێمیم لە گوندی ((مورتکەی عەلی ئاغا)) کردووە. لەو رۆژەی کە ((بڕك)) دەبووە ((سێپەلکە)) دەستم تێدەگێڕاو بە بەرلێگرتن تەربیشم دەکرد. وێڕای ئەوە ((بژار))م بۆ سونەتیش تێدا نەدەهێشت: قۆرت و کۆسپە و گرێ و گواری کەستەکی کێڵگەکەم تەخت دەکرد و ئەوجا خۆڵی ورد و شێداری ژێر زەویم دەدایە پاڵ گەرووی بڕکەکان. کە پەلیشی دەهاویشت واتە ((تولە))ی درێژ دەبوو بڕك نەبوو ((تۆڵکیش))ی بۆ هەڵنەبەستم. بۆیە بەرهەمی بێستانی من بە قەدەر بەرهەمی گشت بێستانی ئاوایی زیاتر دەبوو.

ساڵ وابووە لە شوێنی نیو ((عەڵبە)) دەغڵ بێستانی من بۆماوەی مانگ و نیوێك زیاتر رۆژ نەبوو دوو فەردە گندۆرەی لێنەکەمەوە.

ئەگەر وەرزی هاوین فێنك بووایە و بای شەماڵی بهات بووایە بڕکەکان کزدەبوون و بەزۆری تووشی نەخۆشی ((خاڵۆزا)) دەبوون. خاڵۆزا گیانلەبەرێکی بچووکە و دەچێتە ژێر پەلکی بڕکەوە و شیلەکەی دەمژێت. ئەگەر بڕکەکە وشکیش نەبێت، بێ هێز و زەرد هەڵدەگەڕێت.

دوای گەلاوێژ هەڵاتن ئەگەر بڕکە بێستان تەڕاتی بە ئاستەم مابێت سەر لە نوێ شین دەبێتەوە، بەڵام وەك جاری هەوەڵ بە هێز نابێت و گندۆرەی بچووك، بچووك و زۆری لایەکی پووت کە بە ((لاقوزە)) ناو دەبردرێت، بەڵام زۆر لە جاری پێشوو بە تامتربوو. تەرۆزیش ((قونکە تەرۆزی)) پێ دەگوترا.

ئەو رۆژەی دنیا گەرم بووایە، یاخۆ بای هوڕە ((ڕەشەبا))ی بهات بووایە لەبەر ئەوە ژێر زەوی پێ فێنك دەبوو، بۆ بەیانی بڕکەکان گەش و بەعوباب دەبوون و کولیکان گەش و زۆرتر.

لە لادێدا گندۆرە فرۆشتن ئەوسا کارێکی زۆر چرووك و ناهەموار بوو. ئەوەی خۆمان دەمان خوارد ئەوانی دیکەمان بەسەر دەورودراوسێیان دابەش دەکرد. لەگەڵ هێندە دراوسێیان یەك ماڵ بووین بێ پێگوتن کە بێستانمان دەڕنی، دەهاتن بای خۆیان گندۆرەو تەرۆزییان دەبرد. کە هەرگیز بە شوورەیی لە قەڵەم نەدەدرا.

بەناوبانگترین گندۆرە لە دەشتی هەولێر گندۆرەی ((بەرحوشتر))ە، کە گوندێکە لەناوچەی ((بەڕانەتی)) ونزیك گوندی ((بەحرکە))یە.

گندۆرە زۆر جۆری هەیە. باشتر و بەناوبانگترین ئەمانەن:

**١- گندۆرەی قەرەقۆش:**

ئەمەیان بە زۆری درێژووکانی، واتە کالیاری هەڵدەکەوێت. پەلکی ئەستوور و گرنی گرنییە. ناوی زۆر بە گۆشتە. هەر ئەوەتە پەنجەی پێوە دەچێت. تۆشی زۆر کەمە. لە خواردنیدا جووینی زۆر دەوێت. زۆر بەتام و ئاو بوو.

**٢- کلاو قووت:**

ڕەنگی شینی سپیپاتەو پەلك زۆر تەنك. کە پێدەگات لە شیرینیان پەلکەکەی درز دەبات. لە ناوەڕاستی گوندۆرەکە نەختێکی وەك کڵاو قیتە. بۆیە ئەو ناوەی بەسەردا سەپاوە.. یەکجار زۆر بەتام و شیرینە. شیلەکەی وەك شەکراو بەدەستەوە دەلکێت.

٣- عارەبە ڕەشە:

ڕەنگی کەسکێکی مەیلەو ڕەشە و چەشنی کڵاوقوت پەلك تەنك و زۆر شیرین و بەتامە.

***

تێبینی:

١- تۆکردنی بێستانە دێمی ئەگەر لە دەوروبەری نەورۆز، بێت دوو کۆسپەی دێتە پێش:

أ- بەسەربژار دا دەگەڕێت. واتە بژار، یەکجار زۆر دەبێت و خاوێن کردنەوەی ماوەیەکی زۆر خاوەنەکەی شەکەت و هیلاك دەکات.

ب- زەوییەکە لەبەر باران زۆری دەکوترێتەوە. واتە توند دەبێت و ماوەی ڕسکان و ئەستووربوونی گەرووی بڕکەکان نادات. ئەمەش دەبێتە بەربەستی نەشونماکردنی و لاوازیی. ئەوسا خاوەن بێستانەکە ناچار دەبێت دەوروبەری گەرووی بڕکەکە شل کاتەوە، یاخۆ بۆ ئەوەی زەوییەکە بۆ خۆی شل ببێتەوە خۆڵی شێداری ژێر زەوی دەداتە پاڵ گەرووی بڕکەکەوە. بۆیە خاوەن بێستانی کارزان و مەعلان ((٢٠)) بیست ڕۆژ، یاخود مانگێك دوای نەورۆز تۆی دەکات. لەلایەك بژاری کەم دەبێت، لەلایکی دیکەوە زەوییەکە شل دەبێت و بڕك بە کەیف و ماشای خۆی دەڕسکێت بە تایبەتی ئەگەر دوای تۆکردن بارانی لێنەدات. چونکە بێستانی دێمی بە تەڕاتی ژێر زەوی دەڕوێت، نەك بە حوکمی باران.

٢- بەخۆم نەمکردووە، بەڵام بیستوومە و بووەش: خاوەن بێستان هەبووە: لەکاتی بێستان کردندا بنە ((خڕنووك))، یان ((حوشترالووك))ی لە ژێرەوە قوت کردووە و بە چەقۆ شوێنە قوت کراوەکەی قلێشاندووە و تۆ گندۆرەی خستووتە نێوان هەردو تلیش و خۆڵی بەسەر داکردووە. بڕکی ئەم تەرزە تۆیە، لەبەر ئەوە تەڕاتی لە بنەخڕنوك و حوشترالووکەکە

وەردەگرێـت، چەشـنی بڕکـە بێسـتانی ئـاوی = ((بـەراو)) دەڕسـکێت و لەبڕکی دێمی زلتر دەبێت و گندۆرەی گەورەو زۆرتر وەبەرهەم دێنێت.

٣- گندۆرەی وا لە بێستانی من هەڵدەکەوت کێشی لە ((٢)) کێلۆ پـتر بـووە. ئەمەش بۆ بێستانی دێمی دەگمەن بوو.

تولکێش: بەردو کەستەك لە ملاولـەولای ((تولـە))ی بڕکـە بێسـتان دادەندرێت، بۆ ئەوەی بای بەهێز لوولی نەدات.

***

**پیتەکانی (ئەبجەد)ی و چەند زانیاریەك:**

پێشکەشە بە: خەڵکی دێـی (پاشـبەرد)ی ناوچـەی پێنجـوین و پارێزگـای سلێمانی.

ژمارەی پیتەکانی ئەبجەدی (٢٨) بیست و هەشت پـیتن. بـەم شـێوەیە دەنووســرێن: (ا- ب- ج- د- هــ- و- ز- ح- ط- ی- ك- ل- م- ن- س- ع- ف- ص- ق- ر- ش- ت- ث- خ- ذ- ض- ظ- غ)

هەر یـەك لـەم پیتانـە ژمـارەی تایبـەتی خـۆی هەیـە. فـەرموون سـەیری ئەمەی خوارەوە بکەن:

**خشتەی ژمارەی پیتەکان**

| پیتەکان | ژمارەکان |
| --- | --- |
| ا | ١ |
| ب | ٢ |
| ج | ٣ |
| د | ٤ |
| هـ | ٥ |
| و | ٦ |
| ز | ٧ |
| ح | ٨ |
| ط | ٩ |
| ی | ١٠ |
| ك | ٢٠ |

| | |
|---|---|
| ل | ٣٠ |
| م | ٤٠ |
| ن | ٥٠ |
| س | ٦٠ |
| ع | ٧٠ |
| ف | ٨٠ |
| ص | ٩٠ |
| ق | ١٠٠ |
| ر | ٢٠٠ |
| ش | ٣٠٠ |
| ت | ٤٠٠ |
| ث | ٥٠٠ |
| خ | ٦٠٠ |
| ذ | ٧٠٠ |
| ض | ٨٠٠ |
| ظ | ٩٠٠ |
| غ | ١٠٠٠ |

پێشتر مەلایەکان ئەگەر مێژووی شتێکیان بنووسیبووایەوە، لەجیاتی ژمارەکان پیتەکانیان دەنووسی. هەر کەسێك بیویستبووایە مێژووەکە بزانێت پیتەکانی بۆ ژمارەکان هەڵدەوەشاندەوەو مێژووەکە دەردەچوو. بۆ ئاو خواردنەوەی دڵی خوێنەرانی ئازیز لەم رووەوە فەرموون سەیری ئەمەی خوارەوە بکەن. (باوکم بە دەستی خۆی ئەمەی لە کۆڵەگەی مزگەوتی گوندەکەی خۆیان) کە ناوی (پاشبەرد)ە و لە ناوچەی (پێنجوین)ی پارێزگای سلێمانی نووسیوە: (کل هم و غم سینجلی). با پیتەکانی ئەم رستەیە بۆ ژمارە هەڵبووەشێنینەوە:

| پیتەکان | ژمارەکان |
|---|---|
| | کلهم وغم سینجلی |
| ك | ٢٠ |
| ل | ٣٠ |
| ه | ٠٥ |

| | |
|---|---|
| م | ٤٠ |
| و | ٠٦ |
| غ | ١٠٠٠ |
| م | ٤٠ |
| س | ٦٠ |
| ی | ١٠ |
| ن | ٥٠ |
| ج | ٠٣ |
| ل | ٣٠ |
| ی | ١٠ |

کۆی ژمارەکان ١٣٠٤ هەزار و سێ سەت و چواری کۆچی بووە. ساڵی کۆچیش ئەمڕۆ (١٤٢٨) هەزار و چوارەست و بیست و هەشتە. کەواتە:

١٤٢٨ – ١٣٠٤ = ١٢٤ = واتە سەت و بیست و چوار ساڵە مزگەوتەکە دروست کراوە.

***

**زاراوەی ئەزەو وەزە لە ئاخاوتنی کوردیدا:**

بەڕاستی من نازانم قسەکردن بە زاراوەی (ئەزەو وەزە) و (ئەشکەو لەشکە) و (ئەرێ و لەرێ) لە کەینێوە پەیدا بووە و لەسەر زاری کێ سەری هەڵداوە، هەر هێندەم بەبیردێت، واشی بۆ دەچم لە تەمەنی (٧) حەفت ساڵییەوە ئەو شێوەزارەم دەزانی، ئەو سەردەماش گەلێك باوبوو.. ئەوجا لەبەرچی بوو نازانم، بە زۆریش لەگەڵ خوشك و براکانم و منداڵانی دراوسێ و ئاوقەرانەکانم بەم شێوە زارە دەدوام.

زۆر لە گەورەکان ژن و پیاو نەیاندەزانی، ئەگەر بیریشی لێ بکەینەوە زۆر قورس و گرانە، ئەمڕۆ من ناتوانم بە ڕەوانی قسەی پێ بکەم، کەچی بەبیرم دێت بە گچکەیی بێگرێ دەچوومە دوێ، بە دەگمەنیش هەڵەم لێنەدەکرد، کەچی لەم نووسینەمدا تەواو دڵنیانیم، بۆیە ئەگەر هەڵەشم کردبێت داوای چاوپۆشی لە خوێنەرانی ئازیز دەکەم، بەزۆری ئەم شێوە زارەی ئاخاوتن لە مەجلیسی فەقێیان باوبووە، چونکە ئەوان پتر کاریان لە زمانزانیدا دەکرد،

ڕەنگـە پتریـش بـۆ ئـەوەی قسـەیان بـەم شـێوە زارە کـردووە هـەتاکو نهێنیەکانیان شاراوەبن، بـەزۆریش بـەم شـێوەیەی خـوارەوە بـوو، وشـەیان دەکردە برگەو لەدوای هەر برگەیەك یان هەر پیتێـك برگـەی ((زە)) و ((زو))، یـان پیتـی ((ز)) دێـت واتـە پیتەکـەی پێشـتر بزوێنـدار بووایـە یـان نـەبزوێن ((ز))کەش لە شـێوەی ئـەو دەهـات و دەخرایـە نێـوان برگـەکان، بـۆ نموونـە (پەشۆکاوم) دەبێتە (پەزە شۆزۆ کازە وزەم) لە بەراییدا با چاوێك بەمانـەی خوارەوە دابخشێنین.

١- گەرچی هەردەم کزو مەلوول، پەشۆکاوم
٢- پشت چەماو و خاوەن چاویلکەیە چاوم.
٣- لە لۆچی رووم وا دەزانی کە سەت سالم.
٤- لەلای کچان حەیامێکە خالە ناوم.
٥- بەلام گەلێك سەر بلندم کە تا ئێستا.
٦- لەسەر ئەسپی کوردایەتی نەگلاوم.

**بە زاراوەی ئەزمو وەزە:**

١- گەزەر چزی هەزەر دەزەم کزو مە زەلووزوولز و پەزە، شۆ زۆکازا وزم.
٢- پزشت چەزەمازە وزوو خازە وەزەن چازە ویزیلکە زە یەزە چازە وزم.
٣- لە زەلۆ زۆچیزی روو زووم وازە دەزە زازەنیزی کەزە سەزەت سازالزم.
٤- لەزەلازەی کزەچازان حەزەیا زامیزێکەزە خازەلەزە نازەو زم.
٥- بە زەلازام گەزەلێنزێ سەزەر بزلزندزم کەزەتازە ئێزێستازە.
٦- لەزەسەزەر ئەزە سزپیزی کوزور زدازایەزە تیزی نەزەگز لازا وزم.

**زاراوەی ئەشکەو لەشکە یان ئەشکەو وەشکە**

ئەمەی خوارەوە بخوێننەوە.
١- هەتا هاتم بوو.
٢- هەر هات هاتم بوو.

٣- كە نەهاتم بوو.
٤- رووی زولماتم بوو.

به زاراوەی ئەشکەو لەشکە

١- هەشکە تاشکە ماشکە تشکم بوو شکوو.
٢- هەشکە رشکە ماشکە تشکم بوو شکوو.
٣- کەشکە نەشکە ماشکە تشکم بوو شکوو.
٤- رووشکوو یشکی زوو شکوو لشکماشکە تشکم بوو.

تێبینی:

زاراوەی (ئەرێ و لەرێ)یش یەکێك بوو وەك ئەم دووانەی سەرەوەو من پێی دواوم، بەڵام تەواوم لەبیر نەماوەو هەڵەی زۆر تێدا دەکەم بۆیە تاسام نەکرد خۆی لە قەرەی بدەم. داوای لێبوردن دەکەم.

***

تەموین:

لە ئاخرو ئۆخری چلەکانی سەدەی رابردوودا، لەبەر ئەوە دوو ساڵ لەسەر یەك نەهات بوو کە جووتە نەهاتی پێ دەگوترا حکومەت یارمەتی میللەتی دەدا. پێی دەگوترا ((تەموین)).

من بەسواری گوێدرێژ دەچووم لەشاروچکەی ((دیبەگە)) وەرمدەگرت. بە زۆری شەکرو قوماش بوو: ((چیت و خام)). بە خامەکایان دەگوت: ((چاوپان)) بەمانا ((چاومۆن)) دێت. بەزۆر بۆ منداڵ بەکاردێت: ((فلان منداڵ چاوی پانە پێدەچێت کەتنێکی کرد بێت)). رەنگە خامەکە ((یابان))ی بووبێت لام وابوو ئەوسا بە یابان دەگوترا: ((جاپان)). کوردیش کردوویە بە ((چاوپان)).

بەچیتەکەش دەگوترا: (چیت عارەبە)).

شەکرەکە هەندەجار درشت و چوار گۆشەیی بوو. هەندە جاریش زەردی گلۆت گلۆتی تێدابوو. هەرکە دەتشکاند ناوی دەتگوت: ((دۆشاوە)).

جارێـك لـەكاتی شـت وەرگرتنـدا ((١٢)) دوازدە درهــەمم لێـبڕا. خـوا لێخۆشبوو ((حوسێن چایەچی)) بە قەردی دامێ. لەو ڕۆژەوە بوومە برادەری و هەر کاتێك بچووبوومایە دیبەگە لە چایەخانەکەی ئەو دادەنیشتم.

***

**تلکی ئیستیعمار:**

سـاڵی ((١٩٥٨))، دوای بـەرپابوونی شۆڕشـی ((١٤)) چـواردەی گەلاوێـژ کێشەو دۆخەیەکی زۆر لەنێوان ئاغاوجوتیاران سەری هەڵدا.

جوتیارەکان ئاغایان بە هـەموو جۆرێـك تاوانبـار دەکـرد و هـەرجوتیارێك تۆزێك کەرامەتی خۆی ڕەجاوبکردبووایە، لەبەر ناوو ناتۆری دزێوو ناهەمواری گەنجەکان تاسای نەدەکرد ئامەشۆی ئاغای بکات.

کەریمی مەلای ڕەش تەمەنی ئەوسا ((٥)) ساڵ دەبێت و فسـەزمان بـوو. پیتی ((ك)) دەکردە ((ت)). لەبەر ئەوە بێبـاوك بـوو.. و هـەم لەبـەر خـاتری باوکیشی لە هەردوولا ڕێزیان دەگرت و خۆشیان دەویست.

ڕۆژێـك خوالێخۆشـبوو ((عـەلی ئاغـا))ی گونـدی مورتکـە بـۆ جەڕبانـدن دینارێك بۆ کەریم ڕادەگرێت و دەڵێت:

- وەرە بەس دەست لە دیواری حەوشەمان بدە ئەو دینارەت دەدەمێ.

دینار ئەوکات گەلێك زۆر بوو.

کەریم یەکسەر دەڵێت:

- دەست لێنا دەم.
- لۆ..؟
- دەبمە تلکی ئیستعمار = ((کلکی ئیستیعمار)).

***

**چاکە هەرچاکەیە و خراپەش هەر خراپەیە:**

هەرکە نـەمروودی زۆردار حـەزرەتی ((ئیـبراهیم))ی ((د. خ)) خستە نێـو ئاگرەوە، پەڕاسێلکە دەچوو قومی خۆی پڕ ئـاو دەکـرد و لـە ئاسمانـەوە بـە ئاگرەکەیدا دەکرد تاکو بکوژێتەوە.

قومقمۆکیش دەچووە نزیك ئاگرەکەوە تاکو گڕبستێنێت پفی لێدەکرد.
حەزرەتی ئیبراهیم ((د.خ)) فەرمووی:

- ئاگرەکە نە بە ئاوی پەڕاسێلکە دەکوژێتەوە و نە بە پفی قوموقمـۆکیش خۆشدەبێت. بەس چاکە هەر چاکەیە و خراپەش هەر خراپەیە.

لـەو ڕۆژەوە پەڕاسـێلکە بـەپیرۆز لـە قەڵـەم دەدرێـت و ڕێگـەی پێـدراوە هێلانـەی لەهـەر شـوێنێك درووسـت بکـات. بنیـادەم نابێـت دەخلـی بکـات و ئازاری بدات.

قومقمۆکیش لەو ڕۆژەوە بە دمۆر و بـەدیۆم لـە قەڵـەم دەدرێـت و ئەگـەر بنیادەم تووشی بوو دەبێ بیکوژێت.

***

**چەند بابەتێکی سەیرو سەمەرەی ناو فەقێیان:**

١- لوغزێکە لەبارەی زانینـی پیتـەکانی نـاو سـورەتی (قـل هـو الله)، لـە دڵـەوە. لـە بەراییـدا پێویسـتە ئـەم چـوار دێـڕە شـعرەی خـوارەوە بخوێندرێتەوە. کە چۆن فێربوومە وام نووسیوەتەوە.



یەکەم دێڕە شیعر بە ژمارە (١) یەك حسێب دەکرێت، دووەم دێڕ بە ژمارە (٢) دوو حسێب دەکرێت. سێیەم دێڕ بە ژمارە (٤) چوار. چوارەم دێڕ بە ژمارە (٧) حەوت. ژمارەکان (١٤) چواردەنەو لە بریتی هەر چوار دێڕە شیعرەکان بەکاردێن. ئەم وشانەش (بَصَم اَلَهَ حَني قو دکف)یش بریتین لە (١٤) چوارده پیت. هەر پیتەی ژمارەی تایبەتی خۆی هەیە. بۆ وێنە:

١- پیتی (ب = ١) و پیتی (ص = ٢) و پیتی (م = ٣) لە وشەی (بصم)دا.

٢- پیتی (أ = ٤) و پیتی (ل = ٥) و پیتی (ه = ٦) لەوشەی (الھ)دا.

٣- پیتی (ح = ٧) و پیتی (ن = ٨) وپیتی (ی = ٩) لەوشەی (حنی)دا.

٤- پیتی (ق = ١٠) و پیتی (و = ١١) لەوشەی (قو)دا.

٥- پیتی (د = ١٢) و پیتی (ك = ١٣) و پیتی (ف = ١٤) لەوشەی (دکف)دا. لوغزەکەش بەم شێوەیەیە:

یەکێك لە بەرامبەرت پیتێك لە پیتەکانی ناو سوورەتی (قل هو الله) لە دڵی خۆیدا دەگرێت. بابڵێین پیتی (ق)ی لە دڵ گرتووە. ئەم پیتەش شوێنی ژمارە (١٠)ی گرتووە. دەبێ ئێمە ژمارە (١٠) وەدەست بهێنین. یەکەم دێڕە شیعر: (مندر شرفم بعلم دفتر مطلق) بۆ بەرامبەرەکەی دەخوێنیتەوە و پێیدەڵێیت: پیتەکە لەم دێڕە شیعرەدایە؟. لەبەرئەوە پیتی (ق) لەوشەی (مطلق) دایە دەبێ بڵێت: بەڵێ تێیدایە.

ئەوجا ژمارەی یەك دەست دەکەوێت. دووەم شیعر (شمسم قمرم شریکی زهریی داصفق). پیتەکە لەنێو وشەی (قمرم) و (صفق) دایە. ئەویش دەبێ بڵێت: بەڵێ تێیدایە و ژمارە (٢) دەست دەکەوێت.

سێیەم دێڕ: (هردر گوهر لؤلؤ لا لا فَرَد فَرَد) ئەمە پیتەکەی تێدا نییە.

چوارەم دێڕ: (کین زفوف تحت دریك یك حق حق) ئەمە پیتی (ق) تێدایەو ژمارە (٧) حەوت چنگ دەکەوێت. ژمارە (١) یەکی دێڕ یەکەم + ژمارەی (٢) دووی شیعری دووەم و + ژمارە (٧) حەوتی دێڕی چوارەم = ژمارە (١٠). لەوشەی (بصم)را پیتەکان بە ژمارە دەخوێنینەوە دەبینین ژمارە (١٠)

لەسەر پیتی (ق)ی وشەی (قو) دەوەستێت کەواتە بەرامبەرەکەت پیتی (ق)ی لە دڵەوە گرتبوو.

**وێنەی دووەم:** بەرامبەرەکەت پیتی (ح) لەدڵ دەگرێت. ئەم پیتەش لە دێڕە شیعری یەکەم و دووەم و سێیەمدا نییە. تەنیا لە دێڕی چوارەم دایە. بڕوانە وشەی (تحت) و (حق حق) لە دێڕە شیعرەکەدا. ئەم دێڕەش ژمارە (٧) حەوتە. پیتی وشەکان (بصم اله حنى) بژمێرەو ژمارە (٧) لەسەر پیتی (ح) دەوەستێت.

**وێنەی سێیەم:** ئەگەر پیتەکە لەهەر چوار دێڕە شیعرەکە دابوو ژمارە (١٤) چواردەمان دەسگیردەبێت و لەسەر ئاخیر پیتی وشەکان کە پیتی (ف) دەوەستێت.

***

**٢- قەل و پاشایانێ:**

فەقێ کاتێ خۆی شەوی هەینی و سێشەمموان دەرس و دەوریان نەبوو. ئەو دوو شەوەیان بە شایی و بەستە و گۆرانی و گەمە و بەزم و ڕەزم بەسەردەبرد. یەك لە گەمەکان (قەل و پاشایانێ) بوو. لە هەوەڵەوە (پشتێن)ێکیان بە دوو قەدی بادەدا و تا توند دەبوو. بادراوەکەیان دووبارە دوو قەد دەکردەوە و.. وەك قامچی لێدەهات.

قەل و پاشایانێ هیچ مەبەستێك بەدەستەوە نادات. تەنیا بەزمی قامچی وەشاندن نەبێت.

بابڵێین: فەقێکان (١٠) دەکەس بوونە. (١٠) دە پارچە کاغەزی لە شێوەی (قونکە جغارە)، لە یەکیان (پاشا) و لەدووەم (قەل) و لەسێیەم (موشی) یان دەنووسی. لە هەفتەکەی دی ژمارە (١) یەك و (٢) دوو.. و (٣) سێ و تاکو ژمارە هەفتەکە تەواو دەبوو. یەکێك لە فەقێکان کاغەزەکانی دوای هەڵگێر و وەرگێڕیان بەسەر فەقێکان دابەش دەکرد.

هەرکەس بەدزی نووسراوی خۆی دەخوێندەوە. ئەوەی دەبووە (پاشا) هەڵدەستاوە و قامچییەکەی بەدەستەوە دەگرت و دەیگوت (من پاشا)مە. ڕووی لە یەکێك دەکرد و دەیگوت: ئەتوو چیت؟.

ئەگەر ژمارە (یەك) بووایە قامچییەکی لێدەدا. ئەگەر ژمارە (٢) بووایە دوو قامچی لێدەدا. ئیتر هەروەها.

ئەگەر (مۆشێ) بووایە ئەمەیان هێمای "حیزی و سەلامەتی" بوو، گەمەکە هەڵدەوەشاوە و سەرلەنوێ لە هەوەڵەوە دەستپێدەکراوە.

خۆ ئەگەر (قەل) بووایە، (قەل)یش بەدیۆم و ڕووڕەشە، نەك هەرپاشا، بگرە هەشتەکەی دیش یەك و قامچییان لێدەدا.

جاروادەبوو (مۆشێ) لە پێش قەل دەردەچوو، ئەوەی ببوایە قەل هیچی پێنەدەکەوت لە خۆشییان هاواری دەکرد و: (بەخوای چابوو مۆشێ دەرچوو).

ئیتر بەم شێوەیە کۆتایی بە گەمەکە دەهات.

***

٣- سەردەمایەکی زوو کچیش دەرسی لە حوجرەی فەقێیانی دەخوێند.

((٢)) دوو فەقێ یەك کوڕ و ئەویتر کیژ لە گوندێك لە گوندەکانی کوردستان دەبن.

ڕۆژێك کچە بە نامەیەك ئەمەی بۆ کوڕە فەقێ دەنێرێت:

- ((واهاً لحرح سلحفاة شكلها

أبيض لون ضيق منفذها)).

کوڕەش بەمە جەوابی دەداتەوە:

((واهاً لشطح كِبَر كالمطرق

أطرافها سَوداء كالشخص الشقي))

٤- ئەمەم هەر بەزار بیستووە جانازانم هۆی گوتنەکەی چییە ((نووسەر)):

(( وكل فرج مستحقِ للذكر

والأصل فيها أن تَكون تەسك و تەڕ)).

٥- له ((وانەی))ی ((قواعد = ڕێزمان)) ئەگەر باسی فیعلی مازی و فاعیل بکرا بووایە، بەزۆری ئەم ڕستەیە بەکار دەهات لەناو فەقێیان: ((ضَربَ زیدٌ عمرواً)).

وشەی ((عمرو)) ناوە، بەهۆی ((پیتی - و)) بووە بە ((عمرو)) و لە ((عُمر)) جیادەکرێتەوە.

پرسیار دەکرێت ئەوە لۆ هەر دەگوترێت ((ضَربَ زیدٌ عمرواً)) ناگوترێت ((ضرب عمروٌ زیداً)).

دەڵێن: کاتی خۆی وشەی ((داود = داوود)) بووە و ((عمر و)) واوێکی لێدزیوە و بەدوای خۆیەوەی نووساندووە. زەیدیش خزمی ((داود))بووە، بۆیە لە تۆڵە داهەر زەید لە عەمرو دەدات)).

***

**حوشترێکی زەمانی عوسمانلی:**

حوشترێکی زەمانی عوسمانلی زۆر کاری سوپایی پێکرابوو.. و چەندین تۆپ و چەك و تەقەمەنی پێ هەڵگیرابوو. ئەوەندەش پیربوو گۆشتەکەی نەدەخورا تاکو بیکوژنەوە. بۆیە حکومەتی عوسمانلی وای بڕیاردا: لە پاداشتی خزمەتەکەیەوە بچێتە ناو ڕەزوباخ و بێستانی هەرکەسێك نابێ دەربکرێت.

ڕۆژێك دەچێتە نێو بێستانی پیرێژنێك. لە ترسی حکومەت نەیدەوێرا دەری بکات ناچار بۆ ئەوەی بڕەوتەوە و لە بێستانەکەی بەخواستی خۆیەوە بچێتە دەرەوە: کراسی خۆی هەڵماڵی و بە شەپان وەردەگەڕێتە نێوگەڵانی خۆیەوە.

حوشترەکە ئاوڕی لێدەداتەوە و دەڵێت:

- پیرێژن من بە دەیان تۆپ لەسەر پشتم تەقێندرایتەوە نەڕەویمەوە، تازە بەتازە بە شەپە شەپی نێوگەڵانی جەنابت دەڕەومەوە.

**خەم مەخۆن کردمە، مەلا:**

ڕێوییەك بە مریشکی ئاوایی یەك فێر بوو.. و شەوبێری نەدەکرد. هەرجارێش مریشکێکی بەنسیب دەبوو. خەڵکەکەی بەجارێك هەراسان کردبوو. تاکو ڕۆژێك گەنجانی گوندەکە بڕیاریاندا ڕێوییەکە بگرن.

شەوێك هەریەك دووا نێکیان لە پەناو پەسارگەیەك خۆیان دانووساند.

هەرکە ڕێوییەکە دەگاتە نێو ئاوایی توانیان بیگرن.

یەکیان گوتی:

- پەلێکی ببڕین و بەرەڵلای بکەین.
- نا.. کلکی ببڕین.
- نەخێر هەردوو گوێ و کلکی ببڕین.

مەلای گوندی لەو ساتەدا پەیدا بوو.. و ڕێوییەکەی لێساندن و پارچەیەکی لە مەندیلەکەی خۆی کردەوە و لە ملی ڕێوییەکەی شەتەکداو بەرەڵلای کرد.

مەلا هەرکە دیتی خەڵکەکە بەکارەکەی ڕووگرژبوونە و گوتی:

- خەم مەخۆن. کردمە، مەلا. مەلاش رزقی هەردەم سوارە و پاش دووسێ ڕۆژی تر خۆراکی چنگ ناکەوێت و دەمرێت.

سێیەمین ڕۆژ قسەکەی مەلا ڕاست دەرچوو، بەڵام لەبرسان نەبوو، بەڵکو لە ترسی پارچە مەندیلەکەی سەری بوو. ئەوەندەی غاردابوو هەتا لە هیلاکیان دەپسێت و فەراقی لەبەر دەبڕێت.

***

**خێرم دیت لە عەولافات:**

کابرایەکی پردەیی مەڕێکی لە وەرزی پایز دەباتە لای دۆستێکی مەڕدار لە گوندی ((عەولافات))ی ناوچەی کەندێناوە.

ساڵ وەسووڕاوە پردەییەکە، بە دوای مەڕەکەی داچوو.

**عەوڵا فاتییەکە گوتی:**

- مەڕەکەت لە چلەی زستان زاو بەرخێکی نێری بوو.. و بەخۆی مردار بووەوە. بەرخەکەش ئێستا بووەتە کاوڕ.
- ئەویش پەت لەملی کاوڕەکە دەکات و لەگەڵ خوا حافیزیدا دەڵێت:
- خێر دیتم لە عەولافات مەڕ بردم کاوڕ هاوردم.

***

**دەست و پێ سووتاندن:**

نزیکەی لە سێزدە ((١٣)) جێگەدا من دەست و پێی خۆم سووتاندووە. گوایا لەوسەری بۆ سەپانی باش دەبێت و گەرمای پەرێز و سەر جۆخینان کارم لێناکات.

جێیەك لە دەستی ڕاست و جێیەکیش لە پێی ڕاستە پلیتە پەڕۆی ئەستوورم لەسەر دانان. هەر کە ئاگرەکە گەیشتە گۆشتی دەست و لاقم قرچە قرچی برژانیان لێوە دەهات، ئەوجا لاشم نەبردن. بگرە هەرکە کوژاوە بە پەنجە دامگرتن خۆڵەمێشەکە یانم تەواو بە برینەکانەوە نووساو بووە قەتماغەی سەریان.

پاش تەشەنە کردنیان و کێم و جەراحەتی زۆرە وەنزیکەی مانگێکی خایاند تا چاك بوونەوە.. ئێستاش شوێنەکانیان بە ئەندازەی درهەمێك دیارن.

***

**درهەم دزین:**

من و برادەرێکم لە حوجرەی ئاوایی، بەیەکەوە فەقێ بووین: ((لە ژیاندا نەماوە و ناتوانم ناوی بهێنم)). شەوێکی چلەی زستان، دنیا سامالّ و سایەقەیەك بوو داروبەردی بەستابوو. پێمگوت:

(( تۆ درهەمێك لەنێو دەستی خۆت بگرە و من دەچم لە دەرەوەی ژووری حوجرەوە سەری پشتێنەکەم لە کولانکەوە بۆت ڕەوانە دەکەم و تۆ

بەس دەستت لەنێو پشتێنەکە بنێ من دەتوانم لە کونی پشتێنەکەوە درهەمەکەت لێ بدزم. بێ ئەوەی تۆ هەست پێ بکەیت.

گوتی: وەڵڵا ناتوانیت.

- ئەگەر توانیم؟.
- ئەوکات باوەڕ دەکەم کە درۆ ناکەیت.

برادەرەکەم درهەمێکی توند لەنێو لەپی خۆی گرت و چووە ڕاست کولانکەیەك دانیشت.

منیش سەری پشتێنەکەی خۆم لە دەرەوە بۆ ڕەوانە کرد.

پشتێنی ئەوسا جۆرکانی بوو.

دەستی لەنێو قەدی پشتێنەکە ناو منیش سەرەکەی لای خۆم گورج کردەوە. هەتا نزیك دەرکی کونەکەوە. لەنکاو مەسینە ئاوێکی زۆر ساردم لەنێو پشتێنەکە کرد. ئاوەکە هەموو چووە ناو قوڵ و بن هەنگلی یەکسەر هاواری لێهەستاو گوتی:

- بە ڕاستی منت تڕاند.

چووە ماڵەوە و شمەکەکانی فڕێداو هیتری لەبەر کرد. بۆ بەیانی تووشی کۆخەو پەسیوێك بوو هەرمەپرسە.

لەو ڕۆژەوە لێم لالووت و دڕدۆنگ بوو. تاکو ڕۆژێك جووتە کۆترێکم بۆ بردە ماڵەوە و ماچم کرد ئەوجا لەگەڵم پێکهاتەوە.

***

## دزی بێستان:

شەو بەتەنیا دەچوومە دزیی بێستانە دێمی ئاوایی. لە ترسی دایکم نەدەوێرام کەس لەگەڵ خۆم ببەم. کۆشێکم گندۆرە دەهێناوە و هەتا هەنگڵم دەیەشا دەمخوارد و پاشماوەکەیشم فڕێدەدا ناو کەلاوەیەکی دراوسێکەمان. کە دەرگای گیرابوو. شەوێك لەگەڵ تەپەی ئەوانەی دەمهاوێشتە نێو کەلاوەکە دایکم بەخەبەر هات و بەس هەستی پێنەکرد. لەوساکەوە نەدەوێرام بیهێنمەوە و دەمبرد لەبن سەری شوانێکم دادەنا. ئەوسا مێگەڵە

مەڕ بەهاوینان لە ساکە گۆڕی ناو ئاوایی ڕادەگیراوە و شوانیش لە ناوەڕاست مێگەلەکە دەنووست.

بۆ بەیانی خاوەن بێستانەکە شکایەتی دەکرد و ئاغاش شوانەکەی تێروپڕ دەکوتا.

ساڵێك زەویی گەڕی ماڵی ئاغا، کە لە ڕۆژهەلاتی ئاوایی کەوتبوو. کرابووە بێستان. هەرکە شەو ڕاشکاو خەڵك نووستن لەبن جێ هاتمە دەرەوەو دەرگەی حەوشەمان زۆر گەورە بوو.. و لە شەپکە دار و تەنەکە درووست کرابوو.. و لە کردنەوە و پێوەدانی دەنگی دەهات بۆیە پێش نووستن دەرگاکەم قیچێك بە والایی هێشتبووە.

پێش ماڵمان کەندی کەندێناوە بوو. کەندو کەند ڕۆیشتم و گوفەکی ماڵێ خوالێخۆشبوو: ((مام عەولا پیرك))م بەجێ هێشتوو گەیشتمە کلکەی گردی ((مام ڕەسول = خەرابەی مام رەسول)). مانگە شەو بوو لەنکاو گورگێکم لێ پەیدا بوو. نزیکەی دوازدە هەنگاوێك مابوو بگاتە لام. من لە دەوری ((١٠)) دە ساڵان دەبووم لە جێگەی خۆم حەپەسام و دڵم ڕنگ و هۆڕی بەحوجەت. ئەویش وەك من چەقی. دەقیقەیەکی پتر نەبرد گورگە ماڵی ئاوابێت پشتی تێکردم و بە گورگە لۆقە تێیتەقاند. پاش دووسێ سانییە گوڕم هاتەوە بەرو پاشەو پاش گەڕامەوە.

لەو ساکەوە ببڕای ببڕ تخوونی دزی بێستانان نەکەوتمەوە.

***

**دیشلەمە:**

((دیشمەلە))شی پێ دەگوترێت.

لەبەر ئەوە ساڵانێك شەکر کەم بوو، چایە بەدیشلەمە دەخوراوە.

هەندە جار شەکر دەست نەدەکەوت بە قەسپ دەخوراوە.

من چەند جار چایەم بە قەسپ خواردووەتەوە.

لە ماڵی ئێمە ئەوکات، بەلای کەمیەوە ڕۆژی دووجار چایە لێدەندرا.

لەو ڕۆژەوە من فێر بوومە ئەگە رسبیانان و نیوڕانـان چـایەی نەخۆمـەوە پاش دووسێ سەعات سەرم دێشێت.

## موستە عیدەکان:

موستەعیدەکانی باوکم زۆربـەیان دانـی ئێـوارەی ڕۆژی دووشـەم و پێـنج شەممە، بۆ بەیانی دەرس و دەوریان نەبوو بۆ چایە خواردنەوە دەهاتنە ماڵی ئێمە و دایکم چایەی بۆ لێدەنان.

وا دیارە هەر ئەوانیش بوونە منیان فێرکردبوو: ((تەواو لەیادم نـەماوە))، لە چایە خواردنەوە ڕەزیلی بەشەکر بکەم. ئەو گرمتە شەکرەی دەمدرایێ تـا چـایەی پـێ بخۆمـەوە دەمکردەنیـوە. نیـوەی چـایەم پێـدەخواردەوە و نیوەکەی تریشم هەڵدەگرت. تا هەندە کلۆ شەکر هەبوو بەددانم دەشکاند لـە زۆربەیان جێگەی ددانم پێوەیان دیاربوو.

جۆرکێکی بچووکی کشتەك دارم هەبوو تێمدەکرد. هەرکـە دەبـوو بیسـت سی گرمتێك موستەعیدەکان دەهاتن لێیانـدەکڕیم. لـە بـیرم نـەماوە پارەکـە ((عانە))یـەك بـوو، یـان ((دەفلـوس)). دایکـم چـایەی بـۆ لێـدەنان و بەشەکرەکەی من دەیان خواردەوە.

لە تەماعی پارەکە ڕۆژی دوایی لەسەر کارەکەم مکوڕتر دەبووم.

***

## دێوەرە سەربڕین:

سـاڵێك لـە ئاقـاری گونـدی (سـولێمان بەخشـیان)ی ناوچـەی کەنـدێناوە (دێوەرە)یەك سەربڕا.

من ئەو ساتە تەمەنم پێنج شەش ساڵ دەبوو ڕووداوەکە لـە گوندەکـەمان دوور بوو. ئەو سێ دێیانە مەعبێن بوون: (عاللا، سێقوچان، لهێبـان). کەچـی بـەس بـە بیسـتنەکە، شـتی ئـاواش لـە ناوچـەکە ڕوویـنـەدا بـوو، شـەوان تـا هەفتەیـەك شـەبەکەکە بـەقوڕگی بـڕاوو لرخانـدن دەهاتـە خـەونم و لەترسـان دەمزیڕاندو بە خەبەر دەهاتم.

خوالێخۆشبوو: (عەلی قەمچی ڕەش) موفەوەز شورتەی شارۆچکەی (مەخموور) و خەڵکی شاری سولێمانی بوو.. و لە ئاست تاوانباران زۆر توند و تیژبوو. خەڵکی ناوچەی کەندێناوە و قەراج لێی دەترسان. خەڵکی گوندی ناوبراو و لهێبانی خڕ دەکاتەوە و سوێند دەخوات: تاوانباری پێنەڵێن هەموویان بێ قەیدوشەرت پاش دارکارییەکی زۆر حەپس دەکات.

خەڵکەکەش بەهۆی بەرەللابوونی بارگینەکەوە دەیانزانی، دوو سێ ڕدێن سپی و دیندار تاوانبار ئاشکرادەکەن.

سێ (٣) کەس بوون و بە بیست و چوار سەعات هەریەکەیان لە گوندێك دەگرێت وادەکات دانیش پێدا بنێن.

سوودیان دینار و روبعێك لە گیرفانیدا دەبێت و بەس.

کابرای سەربڕ لە سێدارە دەدرێت و دووەکەی دیش (٢٠) بیست ساڵ حوکم دەدرێن.

***

## زەرگەزەوی:

(زەرگەزەوی) ڕووەکێکی بەهارییە و پەلکی لەشێوە (تەڕە توولە) باریك و بچووکە. ژێرەوەی سەڵکی هەیە و دەخورێت و تۆزێك تفتە. هەر یەکێك لە منداڵان زەرگەزەوییەکی هەڵکەناندبووایە، بۆ سپی کردنی بنە زەرگەزەوییەکەی، لە پێشەقانەکەی دەستی دەداو پەڵکەکەی هەڵدەوەری. لەو کاتەدا ڕووی لەیەکێك، لەهاوڕێکانی دەکرد و دەیگوت:

زەرگەزەوی داکت بەبن بابت کەوی. زەرگەزەوی داکت بەبن بابت کەوی). ئەویش دەلحاز پێیدەداوە.

جارێك برادەرێکم کاتی سپی کردنی زەرگەزەوییەك، ڕووی لەمن کرد و گوتی:

(زەرگەزەوی مەلا ژن بەبن مەلای کەوی).

منیش لێی تووڕە بووم و یەکسەر چووم زەرگەزەوییەکم هەڵقەناند و جوونەکەم پێداوە.

## زڕێن حەجی زڕێن:

من منداڵ بووم. ڕۆژێك عەرەبی (بەدو) بەحوشتر قەسپیان بۆ فرۆشتن هێنا ئاوایی.

لەبەر دیتنی حوشترەکان خەڵکی ئاوایی بیلبتوون گەمارۆیان دان.

حاجییەکی ئاوایی (لە ژیاندا نەماوە و ناتوانم ناوی بهێنم) لەگەڵ یەك لەعەرەبەکان تێك گیرا و عەرەبیشی نەدەزانی و لای خۆی جوێنی بە عەرەبەکە دەدا، ناوە ناوە، بە دەنگی بەرزەوە دەیگوت:

- یابە وەللا ئانی چەلبی بنی چەلب. یابە وەللا ئانی چەلبی بنی چەلب.

عەرەبیش بە قاقایەکی حێلەوە دەیگوت:

- زڕێن حەجی زڕێن. زڕێن حەجی زڕێن.

***

## ژمارەی بە پەنجە: بەشی یەکەم

کاتی خۆی مەلایەکانی پێشوو زانست (عیلم)ێکیان دەخوێند پێیان دەگوت (علم العقد) = (زانستی گە). منیش ناوم ناوە (ژمارەی بە پەنجە) وەك (ئالە حاسیبە)ی ئەمڕۆ بە زووترین کات مەلایین ژمارەیان پێ شیدەکردەوە.

هەرە ئاسانەکەی لە (٦ × ٦) شەش جاران شەش تاکو دەگاتە (١٠ × ١٠) دە جاران دە، بەزار لە باوکم فێربوومە.

دوو وەرەقەی دەسخەتم چنگ کەوت کە هێمای حیسابەکانی تێدا نیشان کرابوو. بە زانینی دوو لاپەڕەکە وەك ئالەی حاسیبە دەتوانیت ژمارەی پێ حەلّ بکەیت. کەچی من چەندی خوێندمەوە تێنەگەیشتم. لە دواییدا بۆم دەرکەوت ئەو دوو لاپەڕە کتێبێکی گەورەی لەسەر داندراوە و بەجوانی و ڕێکی راڤەی هێماکانی کردووە. بەبێ ئەو کتێبە مەلایەکانی ئەمڕۆ نایزانن، مەلایەکانی پێشووش تاکو لۆکیان نەبێت.

بە وێنەش نەبێت خوێنەر تێناگات.

**با بێینە سەر بابەتەکە:**

**وێنەی یەك و دوو:** پەنجەکانیان شاش و قیتن و هەر یەکەیان ژمارەی تایبەتی خۆی لەسەرە و لە پەنجە گچکەوە بەم تەرحە لە هەردوو دەستان دەست پێدەکرێت:

١- پەنجە توتە ژمارە (٦) شەشی لەسەرە واتە بە شەش حسێب دەکرێت.

٢- پەنجە براتوتە ژمارە (٧)ی حەفتی لەسەرە. واتە بە حەفت حسێب دەکرێت.

٣- پەنجە ئەژنۆ رووتە بە (٨) هەشت حسێب دەکرێت.

٤- پەنجە شادەنوێژە بە (٩) نۆ حسێب دەکرێت.

٥- پەنجە ئەسپێ کوژە بە (١٠) حسێب دەکرێت.

***

وێنەی سێ و چوار: دەبێ بە یەکەوەبن. دیسان لە پەنجە گچکەوە دەست پێدەکرێت.

هەر پەنجەیەک نوشتاوە ئەوسا بە ژمارە (١٠) دەخوێندرێتەوە.

هەر پەنجەیەکیش بە قیتی ماوە بە ژمارە (١) دەژمێردرێت.

دەیەکان لەهەر دوو دەست کۆ دەکرێنەوە، کەچی یەکەکان لەهەردوو دەست لە یەک دەدرێن. واتە (جاران دەکرێن).

فەرموون سەیری بکەن:

(٧ × ٨ = ٥٦) پەنجا و شەش دەکات. بابزانین لە وێنەکانیش وا دەردەچێت.



- پەنجەی (توتە) و (براتوتە) لە وێنەی سێیەمدا نوشتاونەتەوە.

هەریەکەیان ژمارە (١٠) دەی لەسەرە. واتە بە (١٠) حسێب دەکرێت. ژمارەی هەردوو پەنجان (٢٠) بیست دەکات.

- پەنجەی ئەژنۆ رووتە و شادە نوێژ و ئەسپێ کوژن بەقیتی ماونەتەوە.

هەریەکەیان بە ژمارە (١) یەك حسێب دەکرێت. واتە بە هەر سێ پەنجە دەکاتە ژمارە (٣) سێ.

- پەنجە توتە و برا توتە و ئەژنۆ رووتەی وێنە چوار قوچاونەتەوە و هەریەکەیان بە (١٠) دە، دەخوێندرێتەوە. کە دەکاتە ژمارە (٣٠) سی.

پەنجە شادە نوێژە و ئەسپێ کوژە قیتن و هەریەکەیان بە ژمارە (١) یەك حسێب دەکرێت کە دەکاتە ژمارە (٢) دوو.

**حەل کردنەکەی بەم شێوەیە:**

(٢٠) بیستی وێنەی سێ (+) کۆ (٣٠) سیی وێنەی چوار = (٥٠) پەنجا.

(٣) سیی وێنەی سێ (×) جاران (٢) دووی وێنەی چوار = (٣ × ٢ = ٦) شەش. هەمووی (٥٦) پەنجا و شەش دەردەچێت.

***

- وێنەی پێنج و شەش دەبێ بە یەکەوەبن.

وێنەی (٥) چوار پەنجە قوچاونەتەوە = (٤٠) چل. یەك پەنجەی قیتە دەکاتە (١) یەك.

وێنەی (٦) یەك پەنجەی نوشتاوەتەوە = (١٠) دە. چوار پەنجەی قیتن = (٤) چوار.

(٤٠) چلی وێنەی (٥) کۆ (+) (١٠) دەی وێنەی (٦) = (٥٠).

(١) یەکی وێنەی (٥) جاران (×) (٤) چواری وێنەی (٦) = (٤) کەواتە بوو بە (٥٤). ئەمەش لە جیاتی: (٩ × ٦ = ٥٤) پەنجا و چوار.

***

وێنەی (٧) و (٨) بەیەکەوەن.

وێنـەی (٧) سـێ پەنجـەی قوچـاونەتەوە و دووانـی قـیتن = (٣٢) سـی و دوو.

وێنەی (٨) هەر (٥) پێنج پەنجە نوشتاونەتەوە = (٥٠) و تاکی نییە.

(٣٠) سـی وێنــەی (٧) و کـۆ (+) (٥٠) پـەنجای وێنــەی هەشـت = (٨٠) هەشتا.

(٢)ی وێنەی ٧) جاران (×) (٠) سفری وێنەی (٨) = (٠) سفر.

ئەنجامەکەی دەکاتە (٨٠). ئەمەش لە بریتی (٨ × ١٠ = ٨٠)یە.

***

## ژمارەی بە پە نجە : بەشی دووەم

دوای تایپ کردنی (ژمارە بەپەنجـە)ی پێشـوو (٦ × ٦) هـەتا (١٠ × ١٠) ئەمانـەی خـوارەوەش کـەوا لـە (١١ × ١١) هـەتا (٥٩ × ٦٠) دەکـات لێـرەدا دەخەمە ڕوو بۆ ئەمەش دەبێ لەبەرابیدا ئەمانە بزانێت:

یەکەم: هەردوو ناو لـەپت بەرامبـەر ڕووی خـۆت ڕادەگریـت و پەنجـەکان قیتن.

دووەم: باسکەکانت بەیەکەوە بنووسێنە.

سێیەم: ژمارەکە لـە پەنجـە گچـکەکانەوە بـۆ پەنجـە گەورەکانـەوە بـەم تەرزە دەست پێدەکرێت:

١- پەنجە تووتە ژمارە (١١)ەیە.

٢- براتووتە ژمارە (١٢)ەیە.

٣- دۆڵە درێژە ژمارە (١٣)ەیە.

٤- شادە نوێژە ژمارە (١٤)ەیە.

٥- ئەسپی کوژە ژمارە (١٥)ەیە.

٦- باسکەکان بەژمارە (١٠٠) دەژمێردرێن.

**تێبینی:**

ژمارە (٢٠ × ٢٠) و (٢٠ × ٣٠) و (٣٠ × ٣٠) و (٣٠ × ٤٠) و (٤٠ × ٤٠) و (٤٠ × ٥٠) و (٥٠ × ٥٠) و بەسەرەوە ماون. خوا عەمر بدات ئەوانیش لە دەرفەتێکیدیکەدا بڵاوی دەکەینەوە.

***

یەك: لە ژمارە (١١ × ١١) هەتا (١١ × ١٥)ەیە.

١- (١١ × ١١= ) بەم چەشنە ئەنجام دەدرێت:

أ- هەردوو پەنجە تووتەکە بەژمارە (١١) دەژمێردرێن. دەنووشتێنەوە و ئەوانی دی قیتن.

ب-پەنجە قوچاوە دوو ئەرکیان هەیە.

١- هەریەکەیان بەژمارە (١٠) دەژمێردرێت: (٢ × ١٠ = ٢٠).

٢- قوچاوەکان لەخانەی یەکانن و لەیەکتر دەدرێن .. (١ × ١ = ١).

پ- پەنجە قیتەکان هیچ حسێبێکیان نییە.

ت- باسکە نووساوەکان بە (١٠٠) دەخەملێندرێن.

کەواتە (٢٠ + ١ — ١٠٠ = ١٢١).

ئەنجامی (١١ × ١١ = ١٢١).

***

٢- (١١ × ١٢ = )

بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت:

أ- پەنجە تووتە لە هەردوو دەست و پەنجە برا تووتە لە دەستێکیان دەنووشتێنەوە و ئەوانی قیتن.

ب-پەنجە نووشتاوەکان وەك پێشتر دوو حسێبیان بۆ دەکرێت:

١- هەر یەکەیان بە ژمارە (١٠)دە دادەندرێت: (٣ × ١٠ = ٣٠).

٢- هەردوو ژمارەکە لە خانەی یەکانن و لەیەك دەدرێن:

(١ × ٢).

پ- پەنجە قیتەکان بەهیچ حسێب ناکرێن.

ت- باسکەکان ژمارە (١٠٠)ن.

کەواتە (٣٠ + ٢ = ١٠٠ = ١٣٢).

پ- ئەنجامی (١١ × ١٢ = ١٣٢).

***

(١١ × ١٣= ): ئەنجام:

أ- پەنجە تووتە لە هەردوو دەست و پەنجە برا تووتە و ئەژنۆ ڕووتە لە یەکێکیان دەقوچێنەوە و ئەوانی دی قیتن.

ب- پەنجە نووشتاوەکان چوارن وەك پێشوو دوو کاریان پێدەکرێت:

١- هەریەکەیان بە ژمارە (١٠) دەژمێردرێن (٤ × ١٠ = ٤٠) چل.

٢- هەردوو ژمارە لە خانەی یەکانن و لە یەکتر دەدرێن:

(١ × ٣ = ٣).

پ- پەنجە قیتەکان وەلادەدرێن.

ت- باسکەکان (١٠٠)ن.

کەواتە (٤٠ + ٣ — ١٠٠ = ١٤٣).

ئەنجامی (١١ × ١٣ = ١٤٣).

***

٤- (١١ × ١٤ = ) ئەنجام:

أ- پەنجە تووتە لە هەردوو دەست و پەنجە براتووتە و ئەژنۆ ڕووتە و شادە نوێژە لە یەکێکیان دەقوچێنەوە و ئەوانی دی قیتن.

ب- قوچاوەکان هەر پێنجیان بە دووکار هەڵدەستن:

١- هەریەکەیان بە ژمارە (١٠)دە لەقەڵەم دەدرێن.

(٥ × ١٠ = ٥٠).

٢- هەردووکیان لەیەك دەدرێن: (١ × ٤ = ٤).

پ- پەنجە قیتەکان حسێبیان بۆ ناکرێت.

ت- باسکەکان (١٠٠)ن.

کەواتە (٥٠ + ٤ + ١٠٠ = ١٥٤).

ئەنجامی (١١ × ١٤ = ١٥٤).

***

٥:- (١١ × ١٥ ): ئەنجام:

أ- پەنجە تووتە لە هەردوو دەست و پەنجە براتووتـە و ئـەژنۆ ڕووتـە و شادە نوێژە و ئەسپێ کوژە لە یـەکێکیان قوچانیەتەوە ئـەوانی دی قیتن.

ب-پەنجە نووشتاوەکان (٦) و وەك پێشوو دوو کاریان هەیە:

١- هەریەکەیان بە ژمارە (١٠) دەخەملێندرێن (٦ + ١٠ = ٦٠).

٢- هەردوو ژمارە لە خانـەی یـەکان و لـە یـەکتریش دەدرێـن (١ × ٥ = ٥).

پ- پەنجە قیتەکان کاریان نییە.

ت-باسکەکان (١٠٠).

کەواتە (٦٠ + ٥ + ١٠٠ = ١٦٥).

ئەنجامی (١١ × ١٥ = ١٦٥).

***

دوو:

لە (١٢ × ١٢ ) هەتا (١٢ × ١٥)ەیە

١- (١٢ × ١٢ ) ئەنجام:

أ- پەنجە تووتە و برا تووتە لە هەردوو دەست دەنوشتێننەوە و ئەوانی تر قیتن.

ب-هەر چوار پەنجە قوچاوەکان دوو حسێبیان هەیە:

١- هەر یەکەیان بە (١٠) دەژمێردرێن: (٤ × ١٠ = ٤٠).

٢- لە خانەی یەکانن و دەبێ لە یەکتریش بدرێن:

(٢ × ٢ = ٤).

پ- پەنجە قیتەکان زێدەنە.

ت- باسکەکان بە (١٠٠) دەخەملێندرێن.

کەواتە (٤٠ + ٤ - ١٠٠ = ١٤٤)

ئەنجامی (١٢ × ١٢ = ١٤٤).

***

٢- (١٢ × ١٣ ) ئەنجام:

أ- پەنجە تووتە و برا تووتە لە هەردوو دەست و ئەژنۆ ڕووتە لە دەستێك نووشتاونەتەوە و ئەوانی دی قیتن.

ب-پەنجە قوچاوەکان بە دوو ئەرك هەلدەستن:

١- هەریەکەیان بە (١٠) دەژمێردرێن: (٥ × ١٠ = ٥٠).

٢- لەیەك دەدرێن: (٢ × ٣ = ٦).

پ- پەنجە قیتەکان بێکارن.

ت-باسکەکان بە (١٠٠) حسێب دەکرێن.

کەواتە: (٥٠ + ٦ - ١٠٠ = ١٥٦).

ئەنجامی (١٢ × ١٣ = ١٥٦).

***

٣- (١٢ × ١٤ ): ئەنجام:

أ- پەنجە تووتە و برا تووتە لە هەردوو دەست و پەنجە دۆلە درێژە و شادەنوێژە لە دەستێك نووشتاینەوە.

ب-شەش ئەنگوستە قوچاوەکان دوو کاریان هەیە:

١- هەریەکەیان بە (١٠) دەژمێردرێن:

(٦ × ١٠ = ٦٠).

٢- هەر ژمارەیەك لە یەك دەدرێت.

(٢ × ٤ = ٨).

پ- قوچاوەکان دانیشتوون.

ت– باسکەکان (١٠٠).

کەواتە (٦٠ + ٨ + ١٠٠ = ١٦٨).

ئەنجامی (١٢ × ١٤ = ١٦٨).

***

٤– (١٢ × ١٥ ): ئەنجام:

أ– پەنجە قوچاوەکان تووتە و برا تووتە لە دەستێك و لە دەستەکەی دی هەر پێنج پەنجە.

ب– حەفت ئەنگوستە قوچاوەکان دوو ئەرکیان هەیە:

١– هەریەکەیان بە (١٠) دەژمێردرێن: (٧ × ١٠ = ٧٠).

٢– ژمارەکان هەردووك لەیەك دەدرێن: (٢ × ٥ = ١٠).

پ– پەنجە قیتەکان بێ حسێبن.

ت– باسکەکان بە (١٠٠) دەژمێردرێن.

کەواتە (٧٠ + ١٠ – ١٠٠ = ١٨٠).

ئەنجامی (١٢ × ١٥ = ١٨٠).

***

سێ:

لە (١٣ × ١٣) هەتا (١٣ × ١٥)ەیە

١– (١٣ × ١٣ ): ئەنجام:

أ– سێ پەنجەکانی هەوەل لە هەردوو دەست دەنووشتێنەوە و ئەوانی دی قیت.

ب– هەر شەش قوچاوەکان بە دوو ئیش هەڵدەستن:

١– هەر یەکەیان بە (١٠) دەژمێردرێن (٦ × ١٠ = ٦٠).

٢– دوو ژمارەکان لەیەك دەدرێن (٣ × ٣ = ٩).

پ– پەنجە قیتەکان دانیشتوون.

ت– باسکەکان بە (١٠٠) حسێب دەکرێن.

کەواتە (٦٠ + ٩ + ١٠٠ = ١٦٩).

ئەنجامی (١٣ × ١٣ = ١٦٩).

٢- (١٣ × ١٤        ):

ئەمەش ئەنجامەکەیتی:

أ- پەنجە تووتە و برا تووتە و ئەژنۆ ڕووتە لە هەردوو دەست و پەنجە شادە نوێژەش لە دەستێك دەنووشتێنەوە.

ب- پەنجە قوچاوەکان حەوتن و بەم دوو ئەرکە هەڵدەستن:

١- هەریەکەیان بە (١٠) حسێب دەکرێت: (٧ × ١٠ = ٧٠).

٢- هەریەکەیان لە یەکتر دەدرێن: (٣ × ٤ = ١٢).

پ- پەنجە قیتەکان دەوریان نییە.

ت- باسکەکان (١٠٠)ن.

کەواتە (٧٠ + ١٢ — ١٠٠ = ١٨٢).

ئەنجامی (١٢ × ١٤ = ١٨٢).

***

٣- (١٣ × ١٥        ): ئەنجام:

أ- پەنجە قوچاوەکان لە دەستێك (٣) سێ پەنجەنە و لە دەستەکەی دی (٥) پێنجن.

ب- پەنجە نوشتاوەکان دوو کاریان هەیە:

١- هەریەکەیان بە ژمارە (١٠) دەژمێردرێن.

(٨ × ١٠ = ٨٠).

٢- ژمارەکان لەیەك دەدرێن: (٣ × ٥ = ١٥).

پ- پەنجە قیتەکان بێ کارن.

ت- باسکەکان (١٠٠)ن.

کەواتە (٨٠ + ١٥ — ١٠٠ = ١٩٥).

ئەنجامی (١٣ × ١٥ = ١٩٥).

***

چوار:

لە (١٤ × ١٤) هەتا (١٤ × ١٥)ەیە

١- (١٤ × ١٤ ) ئەنجام:

أ- پەنجە قوچاوەكان هەشت (٨) پەنجەنە.

ب-ئەو پەنجە نووشتاوانە دوو ئەركیان لە سەر شانە:

١- هەر هەشتیان لە دە (١٠) دەدرێن (٨ × ١٠ = ٨٠).

٢- هەردوو ژمارە لە خانەی یەكانن و لە یەكیش دەدرێن:

(٤ × ٤ = ١٦).

پ- پەنجە قیتەكان دانیشتوونە.

ت-باسكەكان (١٠٠)ن.

كەواتە (٨٠ + ١٦ + ١٠٠ = ١٩٦).

ئەنجامی (١٤ × ١٤ = ١٩٦).

***

٢- (١٤ × ١٥ ): ئەنجام:

أ- پەنجە نووشتاوەكان (٩) نۆنە.

ب-ئەو پەنجە قوچاوانە دوو كاریان لەسەرە:

١- هەریەكەیان بە (١٠) دەژمێردرێن: (٩ × ١٠ = ٩٠).

٢- هەر ژمارەیەك لەیەك دەدرێت: (٤ × ٥ = ٢٠).

پ- قیتەكان بێكارن.

ت-باسكەكان (١٠٠) سەتن.

كەواتە (٩٠ + ٢٠ + ١٠٠ = ٢١٠).

ئەنجامی (١٤ × ١٥ = ٢١٠).

***

پێنج:

(١٥ × ١٥ ): ئەنجام:

أ- پەنجە قوچاوەكان (١٠) دەنە.

ب-ئەو دە (١٠) پەنجانە دوو كاریان هەیە:

١- هەر دەیان لە (١٠) دە دەدرێن (١٠ × ١٠ = ١٠٠).

٢- هەردوو ژمارە لە یەکتر دەدرێن (٥ × ٥ = ٢٥).

پ- پەنجەی قیت نییە.

ت- باسکەکان بە (١٠٠) حسێب دەکرێن.

کەواتە (١٠٠ + ٢٥ + ١٠٠ = ٢٢٥).

ئەنجامی (١٥ × ١٥ = ٢٢٥).

***

لە (١٦ × ١٦) هەتا (١٦ × ٢٠) ئەو شیکردنەوەی سەرەوە نامێنێت بگرە بەم جۆرەی خوارەوە دەگۆڕدرێت:

١- پەنجە تووتە ژمارە (١٦) شازدەیە.

٢- پەنجە برا تووتە ژمارە (١٧) حەڤدەیە.

٣- دۆلە درێژە ژمارە (١٨) هەژدەیە.

٤- شادە نوێژە ژمارە (١٩) نۆزدەیە.

٥- ئەسپێ کوژە ژمارە (٢٠) بیستە.

٦- پەنجە قوچاوەکان جارانی ژمارە (٢٠) دەکرێن و بەس.

٧- پەنجە قیتەکان جارانی یەکتر دەکرێن.

٨- باسکەکان بە ژمارە (٢٠٠) دووسەت حسێب دەکرێن.

***

شەش:

لە (١٦ × ١٦) هەتا (١٦ ×٢٠).

١- (١٦ × ١٦) ئەنجام:

أ- پەنجە تووتە لە هەردوو دەستان قوچاونەتەوە.

ب- ئەو دوو پەنجانە لە ژمارە (٢٠) دەدرێن = (٢ × ٢٠ = ٤٠).

پ- پەنجە قیتەکان لە هەردوو دەست هەشتن و جارانی یەکتر دەکرێن = (٤ × ٤ = ١٦).

ت- باسکەکان بە ژمارە (٢٠٠) دەخوێندرێنەوە.

کەواتە (٤٠ + ١٦ + ٢٠٠ = ٢٥٦).

ئەنجام (١٦ × ١٦ = ٢٥٦).

***

٢- (١٦ × ١٧)

بەم تەرزەیە ئەنجامەکەی:

أ- پەنجە نووشتاوەکان لە هەردوو دەست (٣) سێنە.

ب-نووشتاوەکان هەریەکەیان بە ژمارە (٢٠) حسێب دەکرێن (٣ × ٢٠ = ٦٠).

پ- پەنجە قیتەکان (٧) حەوتن لەیەك دەدرێن: (٤ × ٣ = ١٢).

ت-باسکەکان (٢٠٠).

کەواتە (٦٠ + ١٢ + ٢٠٠ = ٢٧٢).

ئەنجامی (١٦ × ١٧ = ٢٧٢).

***

٣- (١٦ × ١٨):

بەم جۆرەیە ئەنجامەکەی:

أ- پەنجە تووتە لە دەستێك و لە دەستەکەی تر (٣) پەنجە قوچاونەتەوە.

ب-نووشتاوەکان هەریەکەیان بە (٢٠) دەژمێردرێن.

(٤ × ٢٠ = ٨٠).

پ- پەنجە قیتەکان لەیەك دەدرێن (٤ × ٢ = ٨).

ت-باسکەکان بە (٢٠٠) حسێب دەکرێن.

کەواتە (٨٠ + ٨ + ٢٠٠ = ٢٨٨).

ئەنجامی (١٦ × ١٨ = ٢٨٨).

***

٤- (١٦ × ١٩ ): ئەنجام:

أ- لە دەستێك پەنجەیەك نووشتاوەتەوە و لە دەستەکەی دی (٤) چوار پەنجە.

ب–قوچاوەکان هەریەکەیان لە (٢٠) دەدرێن: (٥ × ٢٠ = ١٠٠).
پ– قیتەکان لە یەکتر دەدرێن (٤ × ١ = ٤).
ت–باسکەکان (٢٠٠)ن.
کەواتە (١٠٠ + ٤ + ٢٠٠ = ٣٠٤).
ئەنجامی (١٦ × ١٩ = ٣٠٤).

***

٥– (١٦ × ٢٠ ): ئەنجام:
أ– لە دەستێك پەنجەیەك و لە ئەویتر (٥) پێنج پەنجە نووشتاینەوە.
ب–قوچاوەکان هەریەکەیان بە (٢٠) لەقەڵەم دەدرێن.
(٦ × ٢٠ = ١٢٠).
پ– قیتەکان لەیەکدانیان نەماوە.
ت–باسکەکان بە (٢٠٠) دەژمێردرێن.
کەواتە (١٢٠ + ٢٠٠ = ٣٢٠).
ئەنجام (١٦ × ٢٠ = ٣٢٠).

***

حەوت:
لە (١٧ × ١٧) هەتا (١٧ × ٢٠).
١– (١٧ × ١٧ ): ئەنجام:
أ– پەنجە قوچاوەکان لە هەردوو دەست (٤) چوارن.
ب–نووشتاوەکان بە (٢٠) حسێب دەکرێن.
(٤ × ٢٠ = ٨٠).
پ– قیتەکان (٦) شەشن و لە یەکتر دەدرێن: (٣ × ٣ = ٩).
ت–باسکەکان (٢٠٠)ن.
کەواتە (٨٠ + ٩ + ٢٠٠ = ٢٨٩).
ئەنجامی (١٧ × ١٧ = ٢٨٩).

***

٢- (١٧ × ١٨      ): ئەنجام:

أ- پەنجە قوچاوەکان (٥) پێنجن لە هەردوو دەست.

ب-نووشتاوەکان لە ژمارە (٢٠) دەدرێن:

(٥ × ٢٠ = ١٠٠).

پ- پەنجە قیتەکان لەیەك دەدرێن (٣ × ٢ = ٦).

ت-باسکەکان بە (٢٠٠) دەخوێندرێنەوە.

کەواتە (١٠٠ + ٦ + ٢٠٠ = ٣٠٦).

ئەنجامی (١٧ × ١٨ = ٣٠٦).

***

٣- (١٧ × ١٩      ): ئەنجام:

أ- دوو پەنجە لەدەستێك و لە دەستەکەی دی (٤) قوچاونەتەوە.

ب-نووشتانەوەکان شەشن (٦) و لە ژمارە (٢٠) دەدرێن.

(٦ × ٢٠ = ١٢٠).

پ- قیتەکان چوارن و لەیەك دەدرێن (٣ × ١ = ٣).

ت-باسکەکان (٢٠٠)ن.

کەواتە (١٢٠ + ٣ + ٢٠٠ = ٣٢٣).

ئەنجامی (١٧ × ١٩ = ٣٢٣).

***

٤- (١٧ × ٢٠      ) ئەنجام:

أ- حەوت پەنجە نوشتاونەتەوە ئەوانی دی قیتن.

ب-قوچاوەکان لە ژمارە (٢٠) دەدرێن.

(٧ × ٢٠ = ١٤٠).

پ- پەنجە قیتەکان لە یەکدانیان نەماوە.

ت-باسکەکان بە (٢٠٠) دەژمێردرێن.

کەواتە (١٤٠ + ٢٠٠ = ٣٤٠).

ئەنجامی (١٧ × ٢٠ = ٣٤٠).

هەشت:

لە (١٨ × ١٨) هەتا (١٨ × ٢٠).

١- (١٨ × ١٨      ). ئەنجام:

أ- پەنجە قوچاوەکان (٦) شەشن.

ب-نووشتاوەکان هەریەکەیان بە (٢٠) حسێب دەکرێن.

(٦ × ٢٠ = ١٢٠).

پ- قیتەکان لەیەك دەدرێن (٢ × ٢ = ٤).

ت-باسکەکان بە (٢٠٠) دەخوێندرێنەوە.

کەواتە (١٢٠ + ٤ + ٢٠٠ = ٣٢٤).

ئەنجامی (١٨ × ١٨ = ٣٢٤).

***

٢- (١٨ × ١٩      ): ئەنجام:      :

أ- پەنجە قوچاوەکان لەهەردوو دەست (٧) حەوتن.

ب-نووشتاوەکان لە (٢٠) دەدرێن. (٧ × ٢٠ = ١٤٠).

پ- پەنجە قیتەکان لەیەك دەدرێن (٢ × ١ = ٢).

ت-باسکەکان (٢٠٠)ن.

کەواتە (١٤٠ + ٢ + ٢٠٠ = ٣٤٢).

ئەنجامی (١٨ × ١٩ = ٣٤٢).

***

٣- (١٨ × ٢٠ =      ) ئەنجام:

أ- پەنجە قوچاوەکان (٨) هەشتن.

ب-قوچاوەکان لە ژمارە (٢٠) دەدرێن:

(٨ × ٢٠ = ١٦٠).

پ- قیتەکان لە یەکدانیان نەماوە.

ت-باسکەکان (٢٠٠)تن.

کەواتە (١٦٠ + ٢٠٠ = ٣٦٠).

ئەنجامی (١٨ × ٢٠ = ٣٦٠).

***

**نۆ:**

**لە (١٩ × ١٩) هەتا (١٩ × ٢٠)ە**

١- (١٩ × ١٩ =        ): ئەنجام:

أ- پەنجە قوچاوەکان لە هەردوو دەستان (٨) هەشتن .

ب-هەشت پەنجە نوشتاوەکان لە ژمارە (٢٠) دەدرێن.

(٨ × ٢٠ = ١٦٠).

پ- قیتەکان دوو پەنجەنە و لەیەك دەدرێن (١ × ١ = ١).

ت-باسکەکان بە (٢٠٠) دەخوێندرێتەوە.

کەواتە (١٦٠ + ١ + ٢٠٠ = ٣٦١).

ئەنجامی (١٩ × ١٩ = ٣٦١).

***

٢- (١٩ × ٢٠        ) ئەنجام:

أ- پەنجە نوشتاوەکان (٩) نۆنە.

ب-هەر نۆ پەنجە لە ژمارە (٢٠) دەدرێن.

(٩ × ٢٠ = ١٨٠).

پ- پەنجە قیتەکان لە یەکدانیان ناکرێت.

ت-باسکەکان (٢٠٠) دوو سەتن.

کەواتە (١٨٠ + ٢٠٠ = ٣٨٠).

ئەنجامی (١٩ × ٢٠ = ٣٨٠).

***

**ئەنجامی (٢١ × ٢١) هەتا (٢١ × ٢٥) بەم تەرزەی خوارەوەیە:**

١- ژمارە (٢١) لە پەنجە تووتەوە دەست پێدەکات هەتا ژمارە (٢٥) دەگاتە پەنجە ئەسپێ کوژە.

٢- پەنجە قوچاوەکان دووکار ئەنجام دەدەن.

أ- هەریەکەیان لە ژمارە (٢٠) دەدرێت.

ب-ژمارەکان لە یەکتر دەدرێن.

٣- پەنجە قیتەکان دەوریان نییە.

٤- باسکەکان بە ژمارە (٤٠٠) چوارسەد حسێب دەکرێن.

٥- ***

دە:

لە (٢١ × ٢١) هەتا (٢١ × ٢٥)ە.

١- (٢١ × ٢١ ): ئەنجام:

أ- هەردوو پەنجە تووتەکان ژمارە (٢١)یان بۆ داندراوە، دەنوشتێننەوە.

ب-نووشتاوەکان دوو کاریان لە ملە:

١- هەریەکەیان بە (٢٠) لە قەڵەم دەدرێن و: (٢ × ٢٠ = ٤٠).

٢- هەردوو ژمارە لەیەك دەدرێن (١ × ١ = ١).

پ- پەنجە قیتەکان دەوریان لێرەدا نییە.

ت-باسکەکان بە ژمارە (٤٠٠) دەخەملێندرێن.

کەواتە (٤٠ + ١ + ٤٠٠ = ٤٤١).

ئەنجامی (٢١ × ٢١ = ٤٤١).

***

٢- (٢١ × ٢٢ ): ئەنجام:

أ- لە دەستێك پەنجەیەك نووشتاوەتەوە و لە دەستەکەی دی دوو پەنجە.

ب-نووشتاوەکان دوو ئەرکیان هەیە:

١- هەر یەکەیان بە ژمارە (٢٠) دادەندرێن.

(٣ × ٢٠ = ٦٠)

٢- ژمارەکان لەیەك دەدرێن (١ × ٢ = ٢).

پ- پەنجە قیتەکان بێدەورن.

ت–باسکەکان بە (٤٠٠) دەژمێردرێن.

کەواتە (٦٠ + ٢ + ٤٠٠ = ٤٦٢).

ئەنجامی (٢١ × ٢٢ = ٤٦٢).

***

١– (٢١ × ٢٣        ): ئەنجام:

أ– پەنجە نوشتاوەکان چوارن لە دەستێك یەکە و لە دەستەکەی دی سێنە.

ب–قوچاوەکان دوو ئیشیان پێ سپێردراوە:

١– هەر یەکەیان لە ژمارە (٢٠) بیست دەدرێن.

(٤ × ٢٠ = ٨٠).

٢– ژمارەکان لەیەك دەدرێن (١ × ٣ = ٣).

پ– پەنجە قیتەکان دانیشتوونە.

ت–باسکەکان بە (٤٠٠) دەژمێردرێن.

کەواتە (٨٠ + ٣ + ٤٠٠ = ٤٨٣).

ئەنجامی (٢١ × ٢٣ = ٤٨٣).

***

١– (٢١ × ٢٤        ): ئەنجام:

أ– لە دەستێك پەنجەیەك قوچاوەتەوە و لە دەستەکەی دی چوار.

ب–نووشتاوەکان دوو کار ئەنجام دەدەن:

١– هەر پێنج قوچاوەکان لە (٢٠) دەدرێن:

(٥ × ٢٠ = ١٠٠).

٢– ژمارەکان لە یەکتر دەدرێن (١ × ٤ = ٤).

پ– پەنجە قیتەکان بێکارن.

ت–باسکەکان (٤٠٠)ن.

کەواتە (١٠٠ + ٤ + ٤٠٠ = ٥٠٤).

ئەنجامی (٢١ × ٢٤ = ٥٠٤).

٥- (٢١ × ٢٥        ): ئەنجام:

أ- پەنجەیەك لە دەستێك و پێنج پەنجە لە دەستەکەی تر قوچاونەتەوە.

ب-نووشتاوەکان دوو کار جێ بە جێ دەکەن:

١- هەر یەکەیان لە ژمارە (٢٠) بیست دەدرێن:

(٦ × ٢٠ = ١٢٠).

٢- هەردوو ژمارە لە یەك دەدرێن (١ × ٥ = ٥).

پ- قیتەکان کاریان پێناکرێت.

ت-باسکەکان (٤٠٠)ن.

کەواتە (١٢٠ + ٥ + ٤٠٠ = ٥٢٥).

ئەنجامی (٢١ × ٢٥ = ٥٢٥).

***

یازدە:

لە (٢٢ × ٢٢) هەتا (٢٢ × ٢٥).

١- (٢٢ × ٢٢        ): ئەنجام:

أ- پەنجە نووشتاوەکان لە هەردوو دەست تووتە و برا تووتەنە. واتە (٤) پەنجەنە.

ب-نووشتاوەکان دوو ئەرکیان هەیە:

١- هەر یەکەیان بە بیست (٢٠) حسێب دەکرێن

(٤ × ٢٠ = ٨٠).

٢- هەردوو ژمارە لەیەك دەدرێن (٢ × ٢ = ٤).

پ- پەنجە قیتەکان پەیوەندییان نییە.

ت-(٤٠٠) باسکەکانن.

کەواتە (٨٠ + ٤ + ٤٠٠ = ٤٨٤).

ئەنجامی (٢٢ × ٢٢ = ٤٨٤).

***

٢- (٢٢ × ٢٣ ): ئەنجام:

أ- پەنجە نووشتاوەکان لە دەستێك دوو پەنجە و لە دەستەکەی دی سێ پەنجەنە.

ب-نووشتاوەکان کە (٥) پەنجەنە دوو کاریان هەیە:

١- هەریەکەیان بە (٢٠) حسێب دەکرێن:

(٥ × ٢٠ = ١٠٠).

٢- هەردووکیان لە یەك دەدرێن (٢ × ٣ = ٦).

پ- پەنجە قیتەکان خەوتوونە.

ت-(٤٠٠) باسکەکانن.

کەواتە (١٠٠ + ٦ + ٤٠٠ = ٥٠٦).

ئەنجامی (٢٢ × ٢٣ = ٥٠٦).

***

١- (٢٢ × ٢٤ ) ئەنجام:

أ- پەنجە نووشتاوەکان (٦)ن لە دەستێك دووانن و لە دەستەکەی دی چوارن.

ب-قوچاوەکان دوو ئیشیان پێ سپێردراوە:

١- هەریەکەیان بە (٢٠) دادەندرێت: (٦ × ٢٠ = ١٢٠).

٢- دوو ژمارەکە لەیەك دەدرێن (٢ × ٤ = ٨).

پ- پەنجە قیتەکان لاگر وەستاون.

ت-(٤٠٠) باسکەکانن.

کەواتە (١٢٠ + ٨ + ٤٠٠ = ٥٢٨).

ئەنجامی (٢٢ × ٢٤ = ٥٢٨).

***

٤- (٢٢ × ٢٥ ): ئەنجام:

أ- پەنجە قوچاوەکان (٧) حەوتن. دووان لە دەستێك و پێنجانیش لە دەستەکەی تر.

ب-حەوت پەنجە قوچاوەکان دوو کار بە جێدێنن:

١- لە ژمارە (٢٠) دەدرێن (٧ × ٢٠ = ١٤٠).

٢- خۆ بە خۆ لەیەك دەدرێن (٢ × ٥ = ١٠).

پ- پەنجە قیتەکان بێ دەنگن.

ت-باسکەکان بە (٤٠٠) دەخوێندرێنەوە.

کەواتە (١٤٠ + ١٠ + ٤٠٠ = ٥٥٠).

ئەنجامی (٢٢ × ٢٥ = ٥٥٠).

***

دوازدە:

لە (٢٣ × ٢٣) هەتا (٢٣ × ٢٥).

١- (٢٣ × ٢٣ ): ئەنجام:

أ- لە هەر دەستێك (٣) پەنجە نووشتاونەوە.

ب-ئەم نووشتاوانە دوو ئەرکیان لە ئەستۆدایە:

١- هەر یەکەیان بە (٢٠) دەژمێردرێت

(٦ × ٢٠ = ١٢٠).

٢- هەردوو ژمارە لەیەك دەدرێن (٣ × ٣ = ٩).

پ- پەنجە قیتەکان پەککەوتەن.

ت-(٤٠٠) باسکەکانن.

کەواتە (١٢٠ + ٩ — ٤٠٠ = ٥٢٩).

ئەنجامی (٢٣ × ٢٣ = ٥٢٩).

***

٢- (٢٣ × ٢٤ ): ئەنجام:

أ- سێ پەنجە لە دەستێك و چوار پەنجە لە دەستەکەی دی قوچاونەتەوە.

ب-ئەم حەوت پەنجە قوچاوانە دوو ئیش بەجێدەهێنن:

١- هەریەکەیان بە ٢٠) حسێب دەکرێت:

(٧ × ٢٠ = ١٤٠).

٢- ژمارەکان لەیەك دەدرێن (٣ × ٤ = ١٢).

پ- پەنجە قیتەکان هیچ دەوریان نییە.

ت-(٤٠٠) باسکەکانن.

کەواتە (١٤٠ + ١٢ — ٤٠٠ = ٥٥٢).

ئەنجامی (٢٣ × ٢٤ = ٥٥٢).

***

١- (٢٣ × ٢٥ ): ئەنجام:

أ- پەنجە نووشتاوەکان هەشتن لە دەستێك سێ و لە دەستەکەی دی (٥)ن.

ب-ئەو هەشت پەنجە بە دوو ئیش هەڵدەستن:

١- هەریەکەیان بە ژمارە (٢٠) دەخەملێندرێت:

(٨ × ٢٠ = ١٦٠).

٢- هەردوو ژمارەکان لەیەك دەدرێن: (٣ × ٥ = ١٥).

پ- پەنجە قیتەکان بێدەورن.

ت-باسکەکان (٤٠٠)ن.

کەواتە (١٦٠ + ١٥ — ٤٠٠ = ٥٧٥).

ئەنجامی (٢٣ × ٢٥ = ٥٧٥).

***

سێزدە:

لە (٢٤ × ٢٤) هەتا (٢٤ × ٢٥)

١- (٢٤ × ٢٤ ): بەم تەرزەی خوارەوە ئەنجام دەدرێت:

أ- پەنجە نووشتاوەکان لە هەر دەستێك چوارن.

ب-قوچاوەکان دوو کاریان پێدەکرێت:

١- هەریەکەیان بە (٢٠) دەژمێردرێت:

(٨ × ٢٠ = ١٦٠).

٢- هەردوو ژمارەکە لە یەك دەدرێن:

(٤ × ٤ = ١٦).

پ- پەنجە قیتەکان پاڵکەوتەنە.

ت-(٤٠٠) باسکەکانن.

کەواتە (١٦٠ + ١٦ - ٤٠٠ = ٥٧٦).

ئەنجامی (٢٤ × ٢٤ = ٥٧٦).

***

٢- (٢٤ × ٢٥ ): ئەنجام:

أ- پەنجە نووشتاوەکان (٩) نۆنە. چوار لە دەستێك و پێنجیش لە دەستەکەی تر.

ب-پەنجە قوچاوەکان دوو کاریان هەیە:

١- هەریەکەیان لە ژمارە (٢٠) دەدرێت:

(٩ × ٢٠ = ١٨٠).

٢- هەردوو ژمارە لەیەك دەدرێن.

(٤ × ٥ = ٢٠).

پ- پەنجە قیتەکان دەوریان نییە.

ت-باسکەکان بە ٤٠٠) دادەندرێن.

کەواتە (١٨٠ + ٢٠ - ٤٠٠ = ٦٠٠).

ئەنجامی (٢٤ × ٢٥ = ٦٠٠).

***

چواردە:

(٢٥ × ٢٥ ): ئەنجام:

أ- پەنجە نووشتاوەکان هەر پێنج پەنجەی دەستەکانن.

ب-ئەو دە ١٠) پەنجە دووکار بەجێ دەهێنن:

١- هەریەکەیان بە (٢٠) دەژمێردرێت

(١٠ × ٢٠ = ٢٠٠).

٢- (٥ × ٥ = ٢٥) هەردوو ژمارە ئاوا لەیەك دەدرێن.

پ- پەنجە قیتەكان نەماون.

ت-(٤٠٠) باسكەكانن.

كەواتە (٢٠٠ + ٢٥ - ٤٠٠ = ٦٢٥).

ئەنجامی (٢٥ × ٢٥ = ٦٢٥).

***

**ئەنجامی (٢٦ × ٢٦) هەتا (٢٦ × ٣٠) بەم چەشنەی خوارەوەیە.**

١- ژمارە (٢٦) بیست و شەش لە پەنجە توتـە دەست پێدەكات هـەتا ژمارە (٣٠) لەسەر پەنجە ئەسپێ كوژە دەوەستێت.

٢- پەنجە قوچاوەكان لە ژمارە (٣٠) دەدرێن.

٣- پەنجە قیتەكان لە یەكتر دەدرێن.

٤- باسكەكان بە ژمارە (٦٠٠) شەش سەد حسێب دەكرێن.

***

**پازدە:**

**لە (٢٦ × ٢٦) هەتا (٢٦ × ٣٠)**

١- (٢٦ × ٢٦ ): ئەنجام:

أ- نووشتاوەكان لە هەردوو دەست پەنجە تووتەنە.

ب-قوچاون بە ژمارە (٣٠) حسێب دەكرێن:

(٢ × ٣٠ = ٦٠).

پ- پەنجە قیتەكان لەهەر دەستێك چوار پەنجەنە و لەیـەك دەدرێـن (٤ × ٤ = ١٦).

ت-باسكەكان لێرەدا بە (٦٠٠) حسێب دەكرێن.

كەواتە (٦٠ + ١٦ + ٦٠٠ = ٦٧٦).

ئەنجامی (٢٦ × ٢٦ = ٦٧٦).

***

٢- (٢٦ × ٢٧ ): ئەنجام:

أ- لــه دەســتێك پەنجــە توتــە و لەدەســتەكەی دی دوو پەنجــە نووشتاونەتەوە واتە (٣) پەنجەنە.
ب-قوچاوەكان بە ژمارە (٣٠) دەژمێردێن:
(٣ × ٣٠ = ٩٠).
پ- قیتـەكان لـە دەسـتێك چـوار و لـە دەسـتەكەی دی (٣) پەنجەنـە و لەیەك دەدرێن: (٤ × ٣ = ١٢).
ت-(٦٠٠) باسكەكانن.
كەواتە (٩٠ + ١٢ + ٦٠٠ = ٧٠٢).
ئەنجامی (٢٦ × ٢٧ = ٧٠٢).

***

٣- (٢٦ × ٢٨ ): ئەنجام:
أ- لـە دەسـتێك پەنجەیـەك و لـە دەسـتەكەی دی (٣) سـێ پەنجـە قوچاونەتەوە واتە (٤) پەنجەنە.
ب-پەنجە نووشتاوەكان بە ژمارە (٣٠) دادەندرێن
(٤ × ٣٠ = ١٢٠).
پ- قیتەكان لە دەستێك چوار و لە دەستەكەی دوو پەنجەنە لـە یـەكتر دەدرێن (٤ × ٢ = ٨).
ت-باسكەكان بە (٦٠٠) دەژمێردرێن.
كەواتە (١٢٠ + ٨ + ٦٠٠ = ٧٢٨).
ئەنجامی (٢٦ × ٢٨ = ٧٢٨).

***

٤- (٢٦ × ٢٩ ): ئەنجام:
أ- لـە دەسـتێك پەنجەیـەك نووشـتاوەتەوە و لـە دەسـتەكەی دی (٤) پەنجە.
ب-نووشتاوەكان بە ژمارە (٣٠) دادەندرێن: (٥ × ٣٠ = ١٥٠).
پ- پەنجە قیتەكان لە هەردوو دەست پێنجن و لە یەكتر دەدرێن
(٤ × ١ = ٤).

ت-(٦٠٠) باسکەکانن.
کەواتە (١٥٠ + ٤ + ٦٠٠ = ٧٥٤).
ئەنجامی (٢٦ × ٢٩ = ٧٥٤).

***

٥- (٢٦ × ٣٠ ): ئەنجام:
أ- لە هەردوو دەست شەش پەنجە قوچاونەتەوە.
ب-نووشتاوەکان بە ژمارە (٣٠) حسێب دەکرێن
(٦ × ٣٠ = ١٨٠).
پ- پەنجە قیتەکان چوارن باری لە یەکدانیان نەماوە.
ت-باسکەکان (٦٠٠)ن.
کەواتە (١٨٠ + ٦٠٠ = ٧٨٠).
ئەنجامی (٢٦ × ٣٠ = ٧٨٠).

***

شازدە:
لە (٢٧ × ٢٧) هەتا (٢٧ × ٣٠)یە.
١- (٢٧ × ٢٧ ): ئەنجام:
أ- پەنجە قوچاوەکان (٤)ن و لە هەر دەستێك دووانن.
ب-قوچاوەکان بە (٣٠) دەژمێردرێن هەریەکەیان:
(٤ × ٣٠ = ١٢٠).
پ- پەنجە قیتەکان شەشن و لەیەکتر دەدرێن:
(٣ ×٣ = ٩).
ت-باسکەکان بە (٦٠٠) حسێب دەکرێن.
کەواتە (١٢٠ + ٩ + ٦٠٠ = ٧٢٩).
ئەنجامی (٢٧ × ٢٧ = ٧٢٩).
٢- (٢٧ × ٢٨ ): ئەنجام:
أ- پەنجە قوچاوەکان (٥) پێنجن.
ب-قوچاوەکان بە ژمارە (٣٠) دەژمێردرێن: (٥ × ٣٠ = ١٥٠)

پ– قیتەکان لە دەستێك (٣) پەنجەنە و لە دەستەکەی دی (٢)ە و لەیەك دەدرێن (٣ × ٢ = ٦).

ت–(٦٠٠) باسکەکانن.

کەواتە: (١٥٠ + ٦ + ٦٠٠ = ٧٥٦).

ئەنجامی: (٢٧ × ٢٨ = ٧٥٦)

***

٣– (٢٧ × ٢٩): ئەنجام:

أ– پەنجە نووشتاوەکان لەدەستێك دوو پەنجە و لە ئەویتر (٤) پەنجەنە بەهەر دوولا (٦) شەش پەنجە دەکەن.

ب–قوچاوەکان بە ژمارە (٣٠) دەخەملێندرێن: (٦ × ٣٠ = ١٨٠).

پ– قیتەکانی هەردوو دەست لەیەك دەدرێن:

(٣ × ١ = ٣).

ت–باسکەکان (٦٠٠) شەش سەتن.

کەواتە (١٨٠ + ٣ + ٦٠٠ = ٧٨٣).

ئەنجامی (٢٧ × ٢٩ = ٧٨٣).

***

٤– (٢٧ × ٣٠ ): ئەنجام:

أ– نووشتاوەکان لە هەردوو دەست (٧) حەوتن.

ب–قوچاوەکان بە ژمارە (٣٠) دەژمێردرێن

(٧ × ٣٠ = ٢١٠)

پ– پەنجە قیتەکان لە هەردوو دەست نەماون هەتا لە یەکتر بدرێن.

ت–(٦٠٠) باسکەکانن

کەواتە (٢١٠ + ٦٠٠ = ٨١٠)

ئەنجامی (٢٧ × ٣٠ = ٨١٠).

***

حەڤدە:

لە (٢٨ × ٢٨) هەتا (٢٨ × ٣٠):

١- (٢٨ × ٢٨      ): ئەنجام:
أ- پەنجە قوچاوەکان لە هەردوو دەست (٦) شەشن.
ب-نووشتاوەکان بە ژمارە (٣٠) حسێب دەکرێن.
(٦ × ٣٠ = ١٨٠).
پ- پەنجە قیتەکان لەیەکتر دەدرێن (٢ × ٢ = ٤)
ت-(٦٠٠) باسکەکانن.
کەواتە (١٨٠ + ٤ + ٦٠٠ = ٧٨٤).
ئەنجامی (٢٨ × ٢٨ = ٧٨٤).

***

٢- (٢٨ × ٢٩      ): ئەنجام :
أ- پەنجە نووشتاوەکان لە هەردوو دەست (٧) حەوتن.
ب-حەوت پەنجە قوچاوەکان لە ژمارە (٣٠) دەدرێن:
(٧ × ٣٠ = ٢١٠)
پ- قیتەکانی هەر دەستێك لە ئەویتر دەدرێن:
(٢ × ١ = ٢)
ت-باسکەکان (٦٠٠)ن.
کەواتە (٢١٠ + ٢ + ٦٠٠ = ٨١٢).
ئەنجامی ٢٨ × ٢٩ = ٨١٢).

***

٣- (٢٨ × ٣٠      ): ئەنجام:
أ- پەنجە نووشتاوەکان لە هەردوو دەست (٨) هەشتن.
ب-پەنجە قوچاوەکانی هەردوو دەست بە ژمارە (٣٠) دەژمێردرێن (٨ × ٣٠ = ٢٤٠)
پ- پەنجە قیت لە دەستێك نەماوە و لە یەکتر نادرێن.
ت-(٦٠٠) باسکەکانن.

کەواتە (٢٤٠ + ٦٠٠ = ٨٤٠)
ئەنجامی (٢٨ × ٣٠ = ٨٤٠).
***

هەژدە
لە (٢٩ × ٢٩) هەتا (٢٩ × ٣٠)
١- (٢٩ × ٢٩ ): ئەنجام:
أ- پەنجە قوچاوەکان لە هەردوو دەست (٨) هەشتن.
ب-هەشت پەنجە قوچاوەکان لە (٣٠) دەدرێن:
(٨ × ٣٠ = ٢٤٠).
پ- قیتەکان هەر پەنجەیەك لە ئەوی تر دەدرێن:
(١ × ١ =١)
ت-(٦٠٠) باسکەکانن.
کەواتە (٢٤٠ + ١ + ٦٠٠ = ٨٤١)
ئەنجامی (٢٩ × ٢٩ = ٨٤١)
***

٢- (٢٩ × ٣٠ ): ئەنجام:
أ- پەنجە قوچاوەکان لە هەردوو دەست (٩) پەنجەنە.
ب-نووشتاوەکان بە ژمارە (٣٠) دەژمێردرێن:
(٩ × ٣٠ = ٢٧٠)
پ- پەنجەی قیت لە یەك دەست ماوە و لێکدانی نەماوە.
ت-باسکەکان (٦٠٠)ن.
کەواتە (٢٧٠ + ٦٠٠ = ٨٧٠).
ئەنجامی (٢٩ × ٣٠ = ٨٧٠)
***

تێ بینی:
لەبەر درێژ دادڕی ئەلێرەدا وازمان لێهێنا داوای چاوپۆشین دەکەین.

## سالْ و وەرزەكانی و شتی دیكە:

**یەكەم: وەرزی هاوین:**

١- وەرزی هاوین (٩٢) نەوەت و دوو ڕۆژە.
٢- وەرزی هاوین ڕۆژی (١٤)ی مانگی حوزەیرانی سالْی زایینی دەست پێدەكات. ڕۆژ چیدی درێژ نابێت.
٣- ڕۆژی (٢٠) بیستی مانگی حوزەیران شەو دەست بە درێژبوون دەكات.
٤- ڕۆژی (٢٢) بیست و دووی هەمان مانگ گەرما بەتین دەبێت.
٥- ڕۆژی (١٠) دەی مانگی تەمموز یەكەم ڕۆژی چلەیە.
٦- ڕۆژی (٢٠) بیستی مانگی گۆرین، مەڕ لە دەشتی هەولێر بەبەران دێت.
٧- ڕۆژی (٢١)ی بیست و یەكی هەمان مانگ ئەستێرەی تەرازوو هەڵدێت.
٨- ڕۆژی (٣١) سی و یەكی مانگی گۆرین ئاوبەرەو كەمی دەچێت.
٩- ڕۆژی (٧) حەفتی مانگی ئاب ئەستێرەی گەلاوێژ هەڵدێت.
١٠- لەو ڕۆژەدا بێستانی دێمی لە دەشتی هەولێر ئەگەر وشك نەبووبێت و تەڕاتی بە ئاستەم مابێت سەر لە نوێ شین دەبێتەوە.
١١- ڕۆژی (٩) نوێ مانگی ئاب بەیانیان فێنك دەبێت.
١٢- ڕۆژی (١٨) هەژدەی ئەو مانگە چلە تەواو دەبێت.
١٣- ڕۆژی (١٣) سێزدەی مانگی ئەیلوول هاوین تەواو دەبێت.

**دووەم: وەرزی پایز:**

١- وەرزی پایز (٩١) نەوەت و یەك ڕۆژە.
٢- لە ڕۆژی (١٤) چواردەی مانگی ئەیلو،ل وەرزی پایزە.
٣- لەو ڕۆژەدا گوڵی زستان دەچیندرێت.
٤- ڕۆژی (١٩) نۆزدەی مانگی ئەیلول ئەستێرەی سیوەیل هەڵدێت.
٥- ڕۆژی (٢٢) بیست و دووی مانگی ناوبراو یەكەم ڕۆژی (كەپرە شینە)ی جولەكانە و (٩) نۆ ڕۆژە.
٦- ڕۆژی یەكی (١) مانگی تشرینی یەكەم شەو و ڕۆژ بەرامبەر دەبن.

٧- ڕۆژی (١١) یازدەی مانگی گۆرین شێ لە هەوای ئاسمان زیاد دەکات.

٨- ڕۆژی (٢٥) بیست و پێنجی هەمان مانگ دار بە ڕەگەوە بچێنە و گوڵ بە شەتڵ.

٩- ڕۆژی (٢٦) بیست و شەشی مانگی گۆرین هەوا سارد دەبێت.

١٠- ڕۆژی (١٣) سێزدەی مانگی کانوونی یەکەم سەرما بەتین دەبێت و زیندەوەر سڕدەبن.

١١- هەمان ڕۆژ وەرزی پایز تەواو دەبێت.

سێیەم: وەرزی زستان:

وەرزی زستان (٩٠) نۆهەت ڕۆژە.

١- ڕۆژی (١٤) چواردەی مانگی کانوونی یەکەم، ڕۆژی یەکەمی وەرزی زستانە.

٢- لەهەمان ڕۆژدا ئەستێرەی پێروو ئاوا دەبێت.

٣- ڕۆژی (٢٠) بیستی مانگی کانوونی یەکەم شەوی یەڵدایە و درێژترین شەوە.

٤- ڕۆژی (١) یەکی مانگی کانوونی دووەم سەرە ساڵی زایینییە.

٥- ڕۆژی (٧) حەفتی ئەم مانگە و بەولاوە شەوان ئەگەر ساماڵ بوو شەختە دەکات.

٦- ڕۆژی (٨) هەشتی مانگی کانوونی دووەم (٢٦) بیست و شەشەمین ڕۆژی وەرزی زستانە و یەکەم ڕۆژی چلەیە.

٧- لەهەمان ڕۆژدا سەرەتای ڕۆژ درێژبوونە.

٨- ڕۆژی (١٤) چواردەی مانگی هەمان مانگ حەفتەمین ڕۆژی چلەیە و یەکەم ڕۆژی (بەندە) و شەوی (برایمی مەلا زێندینان)ە.

٩- ڕۆژی (٢٠) بیستی مانگی کانوونی دووەم حەفتەی (بەند) تەواو.

١٠- لەو ڕۆژە و بە دواوە مەڕ و بزن لە دەشتی هەولێر دەست بە زان دەکەن.

١١- ڕۆژی (٢١) بیست و یەکی هەمان مانگ یەکەم ڕۆژی (بەندرخە)یە. لەو ڕۆژەدا لەبەر دنیا ساردی دەگوترێت: (کەری بردە سەرکانی کورتانی هێناوە بەشانی).

١٢- ڕۆژی (٢٧) بیست و حەفتی مانگی کانوونی دووەم حەفتەی (بەندرخە) تەواو.

١٣- ڕۆژی (٢٨) بیست و هەشتی مانگی ناوبراو یەکەم ڕۆژی (مێرەم)ە.

١٤- ڕۆژی (٣) سێی مانگی شوبات حەفتەی (مێرەم) تەواو.

١٥- ڕۆژی (٤) چواری هەمان مانگ یەکەم ڕۆژی ئۆغەن)ە.

١٦- ڕۆژی (١٠)ی مانگی گۆڕین حەفتەی (ئۆغەن) تەواو.

١٧- ڕۆژی (١١) یازدەی مانگی گۆڕین یەکەم ڕۆژی (پیت)ە.

١٨- لەو ڕۆژەدا ساردی دەشکێت و سەگ دەچێتە بەرسێبەر.

١٩- ڕۆژی (١٦) شازدەی مانگی شوبات چلەی زستان تەواو.

٢٠- ڕۆژی (١٧) حەڤدەی هەمان مانگ حەفتەی پیت تەواو.

٢١- ڕۆژی (١٨) هەژدەی ئەم مانگە یەکەم ڕۆژی (پارۆز)ە دنیا ئالۆزە.

٢٢- لەو ڕۆژەدا مەڕ لە هەواران هەڵدەقەنێت و بۆ قەراج دەچێت.

٢٣- ڕۆژی (١٩)ی مانگی شوبات دۆمبەڵان پەیدا دەبێت.

٢٤- ڕۆژی (٢١) بیست و یەکی مانگی شوبات پەنگری هەوا دەکەوێت.

٢٥- ڕۆژی (٢٤) بیست و چواری ئەم مانگە (قەرە شوبات)ی ناوەو حەفتەی پارۆز تەواو.

٢٦- ڕۆژی (٢٥) بیست و پێنجی مانگی شوبات یەکەم ڕۆژی (خدرە).

٢٧- ڕۆژی (٢٨) بیست و هەشتی هەمان مانگ ئاو گەرم دەبێت.

٢٨- ڕۆژی (٢)ی مانگی ئادار حەفتەی (خدر) تەواو.

٢٩- ڕۆژی (٣) سێی مانگی ئادار یەکەم ڕۆژی (ئیلیاس)ە ساڵ خلاس.

٣٠- ڕۆژی (٧) حەفتی ئەم مانگە زەوی گەرم دەبێت و دەغڵ و گیا ئینن دەدرێن. زوو زێدە دەکەن.

٣١- ڕۆژی (٩) نۆی مانگی ناوبراو حەفتەی ئیلیاس تەواو.

٣٢- ڕۆژی (١٠)ی هــەمان مــانگ یەکــەم ڕۆژی (ســەرمای پیرێژنــە - بــرد العجوز)ەیە.

٣٣- ڕۆژی (١٣) سێزدەی مانگی ئادار وەرزی زستان تەواو.

٣٤- لەو ڕۆژەدا مەڕ لە دەشتی هەولێر لە بێر دەدرێت.

چوارەم: وەرزی بەهار:

١- وەرزی بەهار (٩٢) نەوەت و دوو ڕۆژە.

٢- ڕۆژی (١٤) چواردەی مانگی ئادار یەکەم ڕۆژی بەهارە.

٣- لەو ڕۆژەدا شەو و ڕۆژ بەرامبەر دەبن.

٤- ڕۆژی (١٦) شازدەی هەمان مانگ سەرمای پیرێژن تەواو. (٤) چوار ڕۆژی لە وەرزی زستانە و (٣) ڕۆژیشی لە وەرزی بەهارە.

٥- ڕۆژی (٢١) بیست و یەکی مانگی گۆڕین (١) یەکی مانگی نەورۆزی سەرە ساڵی کوردییە.

- داوای چاوپۆشین لە خوێنەران دەکەم ئەگەر لە هێندە شوێنان سەرچیغ چووبم.

تێبینی: ئەمە بە حسێبی دەشتی هەولێرە.

***

**سەگ و ڕێوی:**

یەکێك لە ئاوایی بێستانی دێمی هەبوو (ناوەکەیم لەبیر نەماوە) تەڵەی لە نێو بێستانەکە دادەنێتەوە. کاتی ڕۆژئاوا ڕێوییەك پێوەدەبێت و دایەمن، پەتێکم لە مل کرد و هێنامەوە ئاوایی. بەدزی لە کلکی (سە)ی ماڵی ئاغام خست. سەگەکە زۆر فەقیر و ترسنۆك بوو. هەر کە ڕێوییەکەی دیت تۆقی و یەکسەر بە قوڕە قوڕ تێیتەقاند چ تێتەقانێك مەگەر هەر خوا بزانێت.

ڕێویەکە دوو سێ هەنگاو لەگەڵی ڕۆیشت و پاشدان سەگەکە بەهێزتر و پتر دەبەزی توانای نەماو بووە (کوچکوچە). چەند کۆلانی کرد. قوڕەشی هەر دەهات. لە هەوەلەوە هەتا هێزی هەبوو دەیگوت: (عەو، عەو، عەو) هەرکە ماندوو و هیلاك بوو دەیگوت (هە، هە، هە).

کاکی ئێوەش هەتا شل و کوتبووم هەر لە دوایان بووم. پاشان سەگەکە سەری بۆ ناو ئاقار هەڵگرت.

بۆ بەیانی وام دێتەوە خەیاڵ، تەواو لەبیرم نەماوە: سەگەکە لەبەر ترس و شەکەتی و ڕێوییەکەش ئەملا و ئەولای لەبەر خشینی سەر عەردی پێستە و گۆشتی پێوە نەمابوو فەراقی حنتەیان لەبەر بڕابوو.

***

**شایی حەسەن ئاغا:**

خوالێخۆشبوو (حەسەنی کانەبی ئاغا)ی گوندەکەمان ژنی هێنا. مێژووەکەیم لەیاد نەماوە. من باخۆشبووم و هێشتا شەیتانی نەبووبووم. حەفت شەو و حەفت ڕۆژ دەهۆل و زوڕنا و شایی ڕەشبەڵەك گێڕدرا و میوانێکی یەکجار زۆر هاتبوون. من لە کاتی شاییەکەدا لەلای پشتەوە، بێ ئەوەی هەست پێ بکەن سەرە کلکە ئەنگوچکی ئافرەت و پیاوانم لەیەك گرێ دەدا. ئەگەر پیاوەکە کلکە ئەنگوچکی نەبووایە، فەقێیانەی ئافرەتی ئەملا و ئەولای پیاوەکەم لەیەك دەبەستا و پیاوەکە دەکەوتە نێوان.. هەرکە شایی یەکە بەر دەبوو، شاییکەرەکان لێکڕا تێك دەقڕقڕان. هێندێکیان زۆریان پێ خۆشبوو.

هەندەشت بۆ یەکەمجار هاتنە ئاوایی. یەك (حەریج فرۆش)، دوو (یانەسیب).

تەقەی خۆشی زۆر دەکرا. جارێك (قەوان)ێکی کارخانەم هەڵگرتەوە و فرۆشتمە خوالێخۆشبوو: (مام سلێمان مەلۆك) بە عانەیەك. عانەکەشم خستە سەر یانەسیب پاکەتێکی غازیم لۆ دەرچوو.

بەو دواییە وێکەوتم شایی یە کە لە ساڵی ١٩٤٨ دابوو

***

**شەریفە کۆر:**

شەریفە کۆر پیاوێك بوو کاتی خۆی بە هۆی خوریکەوە هەردوو چاوی کۆر بوو. لەشاری هەولێر دادەنیشت. ناوە ناوە دەهاتە گوندەکەمان. بە (فیتە) و (کەسك و سۆر) شێت و هار دەبوو. هەرجارێ بهات بووایە من فیتەم بۆ لێدەدا. دەیگوت: (تۆ کێیت؟). منیش جارێك دەنگم وەك دەنگی خوالێخۆشبوو: (مەلا عەباس)ی (برایم کارەوان) لێدەکرد و دەمگوت: (عەباسی برایم کارەوانم). جاری دووەم دەنگم وەك دەنگی خوالێخۆشبوو (مەلا ئەمین)ی (حاجی تەها)م لێدەکرد و دەمگوت: (ئەمینی حاجی تەهام). هەردووکیان وەك من فەقێ بوون.

ئەویش تا دەنگی تێدا بوو دەیگوت: (هەی دایکی برایم و حاجی تەهای .............).

شەوێك لە گوندەکەمان ماوە و لێفێکیان دایە و لە مزگەوت پێ بنووێت. بەری لێفەکەی درابووێ زۆر لووس دەبێت و خۆی ڕووت دەکاتەوە و لایە لووسەکەی لە خۆی لوول دەدات و بەغار لەو سەری مزگەوت دەچێتە ئەو سەر و دەڵێت: (ئۆخەی ... ئۆخەی ... ئۆخەی...) ناوی کیژی ئەو ماڵە دەهێنێت کە لێفەکەیان دابووێ.

خەڵکەکە هەرکە زانیان بە پلووکە بەردان، بە ڕووتی دەری دەکەن.

پاشدان لە دەرەوەی ئـاوایی زۆر دەگرێـت، خوالێخۆشـبوو مـام حـاجی تەها جوامێرێکی ئاوایی بووشمەکەکانی بـۆ دەبـات. لـەو سـاکەوە بـبڕای بـبڕ تخوونی ئاوایی نەکەوتەوە.

***

شەوین و شیوە خوارو شەو بە کێو

فەرهەنگی هەمبانەبۆرینە دەڵێت:

یەکەم: شەوین، شەڤین.

أ- جەڕاندنی ئاژەڵە بە شەو.

ب-جێگەی پشوودانی ئاژەڵە، شەوانە لە دەشت.

دووەم: شیوەخوار: مەڕ لەوەڕاندنە پاش دۆشین.

سێیەم: شەوبەکێوی تێدانەبوو.

فەرهەنگی کوردستان دەڵێت:

یەکەم: شەوین: شەو ئـاژۆ، مـەڕ بـە شـەو لەوەڕانـدن. نۆبـەت بـە شـەو گرتن.

دووەم: شیوەخوار: باسی نەکراوە.

سێیەم: شەوبەکێو: ماڵاتێکە بە شەو لە کێو بمێنێتەوە.

فەرهەنگی خاڵ دەڵێت:

یەکەم: شەوین: شەوازۆ. شەوێکی خۆشە لە بەهاردا. کە بـاران بـاریبێی و خۆشی کردبێتەوە.

دووەم: شـیوەخوار: لەوەڕانـدنی ئـاژەڵ ئێـواران. لـە دوای تێبـەردان و جوێ کردنەوە.

سێیەم: شەوبەکێوی تێدانەبوو.

***

شەوین و شیوەخوار و شەوبەکێوی دەشتی هەولێر کە خۆم تێیدا ژیـاوم بەم چەشنە بووە:

**یەکەم: شەوین:**

لە کانگەی بەهاری تەڕدا، پێش گیا نێربوون تەڕ و ناسکە و بەرگەی هەرسی ورگی ئاژەڵ ناگرێت و زوو برسی دەبێت. بۆیە لە بەیانییەوە، تاکو ئێوارە پڕ بەدەو دەلەوەڕا بڕی تەواو پێدا نەدەکەوت. دوای شیوەخوار شوان سەرخەوێکی باشی دەکرد جا نزیکەی سەعات و نیوێك بۆ لەوەڕی دەبردن. هەرکە گیا نێر دەبوو ئاژەڵ، کە بە ڕۆژ یەکجار تێربووایە شەو برسی نەدەبوو، تاپێویستی بە شەو لەوەڕاندن بووایە، کەواتە (شەوین) شەو لەوەڕاندنی ئاژەڵە پێش گیا نێربوون.

**دووەم: شیوەخوار:**

هەرکە مەڕ ئێواران دەهاتنەوە و دەدۆشران بە هۆی مەبەستی تایەنەوە شوان دەیانباتە لەوەڕی سەرجۆخین و دەوروبەری ئاوایی، تانوێژی خەوتنان. کەچی مەڕی کەم و کوتە مێگەل بە زۆری لەنێو (قەرسیل) یان، کە تایبەت بۆ خواردنی ئاژەڵ دەچاندرا، دەلەوەڕاند. تۆباتیش زاك و ماك = (بە کار و بەرخەوە)ش بۆ لەوەڕی شیوەخوار دەبردران.

**سێیەم: شەوبەکێو:**

لەوەڕ دوای کۆتایی وەرزی دروونە، لە دەشتی هەولێر بە زۆری قەسەڵ و پووش و پەراشی ناو پەرێز بوو. قیچەکیش فریزەکێوی و پنچك و بڕە سۆرە و دڕك و کەبەری ناو وەرد و شۆ بوو. ئاواییەکی هەشتا، نۆهەت ماڵی، بەلای کەمیەوە نزیکەی (٢٠) بیست مێگەل و قوتە مێگەلە مەڕیان هەبووە. هەموو ڕۆژێ سبیانان بۆ دەرەوە دەرۆیشتن و چێشتان دەهاتنەوە. دانی ئێوارەش هەروا. لەوەڕی دەوروبەری ئاوایی شڕ دەبوو... ئەوەی دەشما لەبەر پێخۆستی مێگەلان تامی خواردنی نەدەماو شوان ناچار دەبوو بۆ دووری ئاوایی بڕوات. تائەو وەختەش ڕۆژگار زۆر کورت دەبوو نەدەتواندرا وەك وەرزی هاوین، بۆ ئاودانی دووجار بگەڕێتەوە. دنیاش سارد دەبوو بە بیست و چوار سەعات جارەك ئاودانی بەس بوو. مێگەلەکە شەو لە

جێگایەکی نەور رادەگیراوە. ئەگەر دەعبایەك بهات بووایە، بە هۆی ڕووناکی ئاسمانەوە لە بڵندایی سووگەکانی ئەملا و ئەولا دەبیندرا.

شوان لەنێو مێگەل دەنووست و پێخەفی (قاپووت) بوو. کشتەکە بەنێکی لە ملی بەرانێك دەکرد و لە باسکی خۆی دەبەستا. تا ئەگەر مێگەلەکە شەو ڕابدات، بەرانەکە ڕای بکێشێت و بەخەبەری بهێنێت. کشتەکەکە (دەست بێن)ی ناوبوو. لام وایە (شگێر)یشی پێدەگوترا، بەڵام تەواو دڵنیا نیم. هەرکە شەو سارد دەبوو شوانەکە قۆڵێکی قاپووتەکەی دەکردە بالیف و دەستێکی لە قوڵەکەی دی دەردەهێنا و کلکی کۆپاڵەکەی دەگرت و بە گۆمکەکەی لە دامێنی قاپووتەکەی دەدا. تاکو لێواری سەرەوە بنێشتە سەرلێواری خوارەوە و شەو (با) نەدات. هێندە شەوان ئەوەندە سارد دەبوو ژێرەوەی قاپووتەکە. (شەختە)ی دەبەستا و بە عەردییەوە دەنووساو بە زۆر هەڵدەتەکا. بە هۆی گەرمی قاپووتەکەوە (سەرتاپا خوری بوو) و هەڵمەدوکەی هەناسەی مەڕانیش شوانەکە لە ژێریدا ئارەقەی دەکرد.

ئەوەی باسکرا لە راستیدا (شەو بە هەردەوەیە)، نەك (شەوبەکێو). ڕەنگە زەمانی زوو مێگەل شەوان لە چیا و زوورگان ڕاگیرابێتەوە. بۆیە ئەم ناوەی بەسەردا سەپاوە. هەر چۆنێك بێت دەشتی هەولێر لۆ (کەژ) جگە لە (چیا) (کێو)یشی بەکارهێناوە.

کاتی خۆی سوتەمەنی دەشتی هەولێر (قشپل و پنچك و پەرۆشە و قەسەڵ و دڕك و کاوکۆت) بووە. سەرەکیەکەیان (قشپل) بووە لەنێو سۆبادا باش دەسووتا. ئەمەش لە هەوێزی ناو ئاوایی و شەو بە کێوان دەست دەکەوت. شوان هەوێزی دوو سێ شەوی (شەوبەکێو)ەکەی دەدا ئەو ماڵانەی کە خۆشی دەویستن. ئەمەش نۆبەتی بۆ دەگێراو بەرهەموو ماڵێك نەدەکەوت. (باسی ماڵینی هەوێزی شەو بە کێوم بە درێژی لە جێگەیەکی دی نووسیوە بۆیە پێویست ناکات دووبارە لێرە بینووسمەوە).

***

**شیعر شیعرانێ:**

شیعر شیعرانێ دوو کەس، یان کۆمەڵ بەرامبەر یەکتر یەکیان شیعرێك دەڵێت، ئاخیر پیتی شیعرەکە چ پیتێك بوو، دەبێ بەرامبەرەکە شیعرێك بڵێت سەرەکەی هەمان پیت بێت.

ڕۆژێك من و مەلا (عەبدولقادر رەمەزان) و (مەلا ڕەشید خدر مەلا) لە تەمەنی دە دوازدە ساڵ دەبووین، بۆ جومعانە چووینە گوندی (سێقوچان)ی کەندێناوە و نزیکەی سەعات و چوارێکێك لە گوندەکەمان دوور بوو.

ئەو دێیە حوجرەی نەبوو. بەس سێ کەسی ئاوایی لە تەمەنی ئێمەدا لای مەلای ئاواییان دەخوێند. یەکیان (مەلا جەوهەر) بوو .. و دووەم (مەلا عەبدولکەریم حوسێن) و سێیەمم لە یاد نەماوە. فارسییەکی زۆر باشیان دەزانن و دەیان شیعریان لەبەر بوو.

کەچی لە زەمانی ئێمەدا لەناو فەقێیان، نەك فارسی نەدەخوێندرا، بگرە خوێندنی عەرەبیش زۆر کەم ببووەوە.

گەنجانی ئاواییەکە، بەسەرکردایەتی کوڕی ئاغا هەر مەلا و فەقێیەك ڕووی لە گوندەکەیانی بکردبووایە، ئەو سێ فەقێیەیان بۆ شیعر شیعرانێ بانگ دەکردن. ماوەی دوو ساڵ زیاتر بە دەیان فەقێ و مەلایان بەزاندبوو.

هەرکە ئێمە چووین لەبەر سێبەری دیوەخان دانیشتین، یەکسەر بە دوای فەقێکانیان نارد. دەست کرا بە شیعر شیعرانێ. ئێمە چەند شیعرێکی کەمی عەرەبی و کوردیمان لەبەر بوو، بەڵام تۆزی ئەوانمان نەدەشکاند. هەر زوو لەسەر شیعرێك پیتی یەکەمی (ئەلف) بێت پەنچەر بووین. ئەوسا ڕووم لە برادەرەکانم کرد و گوتم:

- دەی لەو چاوەتانە.

ئەوانیش دەمیان بە پسکەپسك جووڵاند کەچی دەمزانی چییان لەباردانییە و من میر پەنجۆیان بووم. زۆرم لاگران بوو ببەزین. کاتێك ئەمەم بۆ هات: (ئەلفێکی ئەن وەلا ئەئەن ئەئلەم و ئەی و ئۆنە). گوراحی ئومێدم هاتەوە بەر. لە پیتی (ب) گوتم (بێیەکی بەن وەلا بەبەن بەبلەم و بەی و

بۆنه) پیتی ئاخری هەمووانیش (نون)ە. چەند جار بەم تەرزە وەڵامم دانەوە گەنجەکانی ئاوایی گوتیان:

شیعرەکان هەموویان لەسەریەك تیرەنە، بەس کەلیماتیان جوودایە.

یەکیان گوتی: (بەبابی خۆی دەچێت).

زۆرم هەوەست پێهات:

هەتا غەنیمەکانمان لە شیعرێکی پیتی (نون) زۆر دواکەوتن پاشان شیعرێکیان گوت دوا پیتی (ق) بوو.

منیش گوتم: (قافێکی قەن وەلا قەقەن قەقلەم و قەی و قۆنە).

بە ئەنقەست (٧)تەکەی (قۆنە)م نەگوت.

کوڕی ئاغا بە فەقێیەکانی خۆیانی گوت:

- وەللا کەلکتان بڕاو باسی چشتەکەشی کردن.

ئەمە یەکەمجاریان بوو ببەزن.

سێ چوار ساڵی پێچوو فەقێکان هەرسێکیان چوونە ناو فەقێیان و ڕاستیەکەیان بۆ واڵا بووەوە، ڕۆژێك تووشی من بوون گوتیان:

- هەی ساختەچی کەی ئەوانەی گوتت شیعر بوون!؟.

گوتم:

- شیعر بن و شیعر نەبن شەرتی بەزاندنەکەتان بوو، لەنێو خزم و کەسی خۆتانەوە.

***

**شیوی جەژنە:**

پیاوانی ئاوایی زۆربەیان دوای نوێژی جەژنە لە مزگەوت دادەنیشتن و شیویان بۆ دەچوو. ئەمەش لام وابوو لەبەر خاتری ئاغا بوو. جەژنان شیویان نەدەکرد. گوایا لێیان نەدەکەوت. کەچی خوالێخۆشبوو (عەلی مەحموود کاکەخان)ی ئاغای مورتکەی گەورە پیاوێکی تێگەیشتوو .. و ڕۆشنبیر بوو دەیگوت: (کاتی خۆی ئاغا خۆی لە خەڵکەکە بە گەورەتر دەگرت و نەشیبوو لە جەژنان شیوێکی باشتر بکات ئەو درۆیەیان هەڵبەستاوە).

لەبەر ئەوە برا گچکە بووم سوکەڵە و بارەبەر بووم. من شیوم بۆ بابم دەبرد. ئاغا لەگەڵ باوکم شیوی دەخوارد. شیوی زۆربەی خەڵکەکە ساوار بوو، کەچی هی ئێمە برنج بوو. سەری لەنگەرییەکە پڕ گۆشت و مەرەگەش لەپاڵ. ئەگەر جەژنەکە لەوەرزی بەهار بووایە گۆشتی بەرخ بوو .. و (جەرگ و دو)ش دەکرا.

***

**شیوە غەرییە:**

ئەگەر لە ئاواییدا کەسێك بمردبووایە ئێوارە پیاوانی گوندەکە لێکڕا دەچوونە ماڵە مردووەکە دادەنیشتن و شیویان لە ماڵەوە بۆ دەچوو .. و لەگەڵ پیاوانی خاوەن تازییەکە و ئەو میوانانەی بە هاوار هاتبوون دەخوارد.

من سینیەکم پڵاووترش بە گۆشت دەبرد و باوکم لەگەڵ گەورە پیاوی ماڵەکە دادەنیشت و شیوەکەیان دەخوارد.

ژنانیش هەر ئاوا بەس شیوەکەیان بە خۆیان دەبرد نەك منداڵ.

ئەمەش جۆرە یارمەتییەك بوو. خاوەن مردووەکە ئەو ڕۆژە لە خەفەتی مردووەکە و میوان بەسەر دارژان بۆی نەدەلوا چێشت لێ بنێت.

***

**عادەتی بووکان تێکنادەم:**

بێوەژنێك نۆمیردی کردبوو کاتێك دەور و دراوسێ دەبینن چەند کەسانێك هاتوونە بێوەژنی بە بووك ببەن.

بێوەژن لەکاتی بە ڕێ کردنیدا دەست بە گریان دەکات.

خەڵکەکە بە حەیرمانەوە پێی دەڵێن:

- ئەتوو ئەوە دەیەمین مێردتە پێمان ناڵێیت ئەو فنگە فنگەت لە چییە.

ئەویش دەڵێت:

- وەڵلا من قەت عادەتی بووکان تێکنادەم.

***

**فەقێنە فەقێ:**

چوار فەقێ لەوەرزی بەهاردا و ڕۆژێکی سامالّ و خۆشدا بە ڕێدا دەڕۆیشتن. لە کەندێك تووشی چوار پێنج ژنە کۆلکەری ڕووت و قووت دەبن.

فەقێکان لە شەرمان پشتیان تێدەکەن و بۆ ئەوەی ئافرەتەکان ئاگادارین و خۆیان داپۆشن دەست بە ئحم ئحم دەکەن.

یەك لە ئافرەتەکان زوو هەست دەکات و دەڵێت:

کچێ خۆتان داپۆشن پیاو هاتن:

یەکێکی تریان بە ڕووتی قیت دەبێتەوە و دەیان بینێت و دەڵێت:

کچێ پیاو نینە، فەقێنە فەقێ.

***

**فرۆشیاری گەڕۆك:**

پێشتر لە دێهاتەکاندا فرۆشیاری گەڕۆك هەبوو. دوو جۆر بوون.

یەکەم: لەناو گوندیان دەخست و نەدەگەڕان ئەمەش دوو چین بوو:

١- خۆشناو: میوەیان دەهێنا و لە مالّانیان دەخست و دەچوونە سەربانی مالّەکە و تا دەنگیان تێدابوو گازیان دەکرد: (دەوارنە ترێیان، دەوارنە سێوان، دەوارنە هەناران). خەڵکەکەش بە دەغلّ دەیان کڕی.

٢- عەرەبی (بەدو) بوون. خوێ و قەسپیان پێبوو. خەڵکەکە بۆ دیتنی حوشتر، کە لە دەشتی هەولێر نەبوو دەورەیان دەدان. خوێیان بە دەغلّ دەدا و قەسپیش بە پارە و کۆنە مەشکە و دۆدان. لە نێو دێیان دەخست.

دووەم: ئەمەیان لە نێو ئاوایی دەگەڕان سێ جۆر بوون:

١- عەتار: (پارە بە هێلکە) شخاتە و سابوون و قامیشە جگەرە و تۆپە (بەرماغ) و دەفتەر و بنێشت و دەزوو .. و دەرزی و زۆر شتی تریان بە پارە و هێلکە دەدا. هێلکەشیان بە پارە دەکڕی. بانگیان دەکرد:

(پارە بە هێلکە. سابوون بە هێلکە شخاتە بە هێلکە) بۆیە ئەم ناوەشیان بە دواکەوت.

٢- بەقار (بەقاڵ): شفتی و گندۆرە و تەرۆزی و ئارووپیان بە دەغل دەفرۆشت. واشدەبوو لە ئاخیر وەرزی هاوین و سەرەتای پایزدا شووتی و گندۆرەی چوار بێستانیان دەهێنا. لە نێو ڕەشکە، لەسەر پشتی گوێدرێژ هەر لایەك دوو شفتی، یان دوو گندۆرەی گەورەیان تێدابوو. بە دوو (ڕبە) جۆیان دەگۆڕییەوە.

٣- دێوەرە: ئەمەیان (شەبەك) بوون:

شخاتە و سابوون و نەینۆك و بازن و مێروو .. و تۆپە بەرماغ و حەلوا و زۆر شتی تریان پێبوو. بە (خوری)یان دەدا. لەبەر ئەوە ڕێیان دوور بوو، لەشاری موسل رادەهاتن بارگینیان پێبوو. نەك گوێدرێژ.

بانگیان دەکرد: (دێوەرە بازن، دێوەرە سابوون، دێوەرە شخاتە) بۆیە ئەم ناوەیان بە دواکەوتبوو.

***

**کابرای بێ لێو .. و ددان:**

دۆستی دڵسۆزم، خوالێخۆشبوو: کاك (سەعدوڵڵا)ی برای (مەلا نیعمەت) بۆی گێڕامەوە و گوتی:

لە ناو پردان بووم کابرایەکم دیت لێو .. و ددانی هیچ نەمابوون. منیش مەراق گرتمی و بزانم بۆ .. وای لێهاتووە. گێڕایەوە و گوتی:

لەنێو چیا و چۆلی ناوچەی خۆمان لە تەك (تاتە) بەردێکی زۆر گەورە دانیشتبووم دیتم کابرایەکی نەناسراوی دەڤەرەکە وادێت و تفەنگێکی برنەوی لەسەر شانە. یەکسەر تەماعیم چووە تفەنگەکەی و پەنجەم خستە سەر پەلەپیتکەی تفەنگ و خۆم دانووساند. هەتا هاتە بەرلوولەی تفەنگەکەم و گوتم: (کوڕە ئەو تفەنگەی دانێ دەنا دەتکوژم). کابرا بە هێدییەوە گوتی: (هەی لەمنت نەکەوێت هەر لەسەر تفەنگێك دەمکوژیت). ئەمەی گوت و دەستی دا لوولەکەی، نەك قۆنداخەکە، کە نیشانەی تەسلیم بوونە و گوتی: (فەرموو ئەوە تفەنگ).

هەر كە دەستم برد لێیوەرگرم هەتا قۆنداخە تفەنگ گرتی لە تەپلەی سەرمیدا و كاتێك بە خۆ هاتمەوە هەر دوو دەستمی لە پشتەوە شەتەكدا بوو. قیتی كردمەوە بە پێشە خۆیدام هەتا لە ناوچەكەی من دوور كەوتینەوە. هەردوو پێشمی بە پشتێنەكەی خۆمی بەست و لەسەر پشتی درێژكردم. تەقەی لە تفەنگییەوە هێنا و سوسكەیەكی كوشت و ئاگرێكی كردەوە و دارێكی لە قوونی سوسكەی ڕاكرد و لە دەمی دەرهات. خستیە سەر ئاگر و هەر بایدا و بایدا هەتا سوسكەكە بووە خەڵووز لە ناكاو لەناو دەممی پەستا. كاتێك ڕێبوار دێن و هەڵمدەگرنەوە و تفەنگەكەشمی لە تەنیشتم دانا بوو. ئیتر بەهۆی سوسكە سووتاوەكەوە ئەوهام سەر هاتووە.

***

**كراسە مار:**

هەركە لە دەشت (كراسە مار)ێكم دەدیت خەنی دەبووم. گوایا هەركەسێك (٧) حەفت (قەفە) كراسە مار بخوات چاوی زۆر تیژ دەبێت.

باوەڕ ناكەم كەس بە قەدەرە من كراسە ماری خواردبێت. ئەوجا .. چاویشم نەك تیژ نەبوو، بگرە تووشی نەخۆشی (ئاوی سپی) بووە و چاوێكم عەمەلیات كردووە و ئێستا لێی ڕازیمە، كەچی ئەوی دی دووراو دوور غەمری دەكات و شتان باش سەح ناكات.

***

**كشە دۆنگز:**

كوڕە دەوڵەمەندێك گەلێك بە خۆیەوە دەنازی و هەركە باوكی پێی گۆت:

- دەمەوێت ژنت بۆ بێنم.

ئەویش گوتی:

- بابە دوو ژن بە یەكەوە نەبێت نامەوێت.

باوكی هەرچەند هەوڵ و تەقەلا دەدات لەكەلی ملهوڕی دانەبەزی.

پاشان تكای زۆری لێكردو گوتی:

- کوڕم کەس ڕازی نابێت دوو ژنت بەیەکەوە بداتێ. بەس با نێوانیان (١٠) دە ڕۆژ بێت.

کوڕە ئەوسا نەرم لێدەکات.

باوکی هەڵدەستێت قەیرە کچێکی زۆر مەکرۆ .. و جاقی نێو بەند و باوانی بۆ دەخوازێت و .. واریقاتەکەشی خڕ لە مست بووکەکە دەنێت و ئەوسا پێی دەڵێت:

- لەو چاوەتە دەبێ بەو دە (١٠) ڕۆژەی وای لێ بکەیت نەتوانێت داوای ژنێکی تر بکات.

بووکەکەش لە ماوەکەدا نایەڵێت هەتا بەیانی سوکنات بدات و خەو میوانی چاوی ببێت. هەرکە خەوی بهات بووایە تیلکێکی بە پاشەڵیەوە دەکرد و دەیگوت:

- هەستە ئەدی ئەمنت لۆچی هێناوە.

هێشتا (١٠) دە ڕۆژە تەواو نەبووبوو کوڕە چێشتانێك لەبەر بەر.. ڕۆچکە دادەنیشێت. لەبەر کەم نووستن و پەڕینی لەحەد بەدەر .. زۆر لاواز و بێ گوڕە دەبێت. مێش و مەگەز دەورە لە دەموچاوی دەدەن و ئەویش بەکزییەوە لەگەڵ دەست بڵند کردن بۆ مێشەکان دەڵێت:

- کشە دۆنگزینە، وەللاهی ئەگەر لانەکەون بە بابم دەڵێم ژنێکی ئەوهاش لۆنگۆ بینێت.

***

**کورتانی جاحێلی:**

فەقێیەکی چەندی بڵێیت زیقۆ .. و قیت و خۆز و بە تەبیعات و کەشخەبووم. بەپت خۆم دادەوەشاند و لە هەموو دەراوێك ئاوم نەدەخواردەوە.

شەوێك بەناوی (جومعانە) بوومە میوانی بنەگەیەك. کیژێکی یەکجار جوان و کەحێلیان هەبوو.. (گوستان) گوستان بوو نەك گەمە.

دڵم دەلحاز بۆی بزواو گڕی گرت و بەخۆم نەوەستام و جار بە جارە، بێ پەردەی شەرمەوە بەتی چاوی حەزحەزۆکێوە دیقەتم لەسەرتاپای جەستەی دەگرت.

ئەویش ئەوسا ڕەنگی کەمێك دەپەڕی و سوور هەڵدەگەڕا و بەناز و بزەی لێوانەوە چاوە ڕەشە قەتێیەکانی دەبرییە دوڕ چاوم.

موچڕکەی خەنی خۆشی بەناو شادەمارەکانی لەشمدا مێرووڵەی دەکرد و هەر ئەوەتە جاشکانی لەخۆم هەڵنەدەدا.

لەکاتی نووستندا بەڕەیەکی نەخشینی نوێی لای پێینگانمی دانا. بۆ ئەوەی دڵی بەلای خۆمەوەی جەلب بکەم لەسەر گازەرەی پشت راکشام و کلکە ئەنگوچکی کراسە شەعادە سپییەکەم بەسەرچاوی خۆم دادا و بە فیزێکەوە گوتم:

- بەڕەم ناوێت.

ئەو بەشتێکی دیکە تێگەیشت و بەواق وڕمانەوە گوتی:

- ئەیرۆ لۆ..!؟.

بەلووت بەرزییەوە گوتم:

- کە بەهارداهات من جێی بەخۆمدا نادەم و کلکە ئەنگوچکی کراسەکەی خۆم بەسمە.

خۆی و دایك و باوکی لەبەرم مردن و سۆتن:

- (کاکە فەقێ بەهاران بن ڕەشماڵان زۆر ساردە و سەرمات دەبێت).

بێ فایدە بوو.

شەو ڕاشکاو هەڵیکردەبای (شەماڵ) و ناوە ناوە بە هۆی لەرینەوەی ڕەشماڵەکە خوناو بەسەرمدا دەباری و سەرما هورووژمی بۆ هێنام و لەرز گرتمی. چ لەرزێك؟. وەك مریشکی سەربڕاو هەڵدەپەڕیم و چۆقەچۆقی ددانم لە دوورەوە دەبیسترا. ئۆقرەم بە جارێك لێهەڵگیراو:

- (ئێ .. خۆ .. تازە بشمرم چاو و ڕووم نایەت گازیان بکەم. ئەوجا هەر ئەو قەباحەتە مابوو حەیام لەکن کیژە بڕژێت). سەرما کاری لێکردم

ناچار، بێ خوایشتی خۆم دەستم ماوەیەك بەملاو بەو لادا گێڕا. تا لە ڕاست سەرینگانم، لەپاڵ چێورمەی دیوی دەرەوەی چیغی ڕەشماڵەکە شتێکی گران لەگەڵ دەستم هات. ئەگەرچی نەمدەزانی چییە، بەڵام زۆر پێ شکور بووم. کاتێك لەشم لەژێریدا گەرم داهات یەکسەر خەو بردمیەوە. سبیانێ لە حریتە حریتی کیژەوە، وەئاگا هاتم و دیتم: ئەوەی بەخۆمداداوە کورتانە. لەشەرمان لەشم سەرتاپا بووە ئارەقە و چاوی مۆن و شەرمەزاریم بەخۆم دا شۆڕ کردەوە و بەهەلەداوانەوە، بێ ماڵئاوایی و نقە لەبەر وەهاتن هەیپەم لێکرد.

لە دواوە گوێم لێبوو پڕ بەزار دەیگوت:

- کاکە فەقێ بەهەندی هەڵمەگرە و عەیبی تێدا نییە و ئەوە کورتانی جاحێڵییە، جاحێڵی!.

***

**کوفرە یارمەتی بدەم:**

تازە ئۆتۆمۆمێل پەیدا بووبوو. ڕۆژێك قەمەرەیەك لەلای گوندی (عەوێنە) (ئەگەر لێم نەبێتە درۆ) لە قوڕی کەندێك دەچەقێت.

چەند کەسانی ئاوایی دەچن تاکو پاڵی پێوە بنێن و دەری بهێنن.

یەکێکیان کە چاوی بە شوفێرەکە دەکەوێت (سیدارە)ی لەسەرە، یەکسەر دەڵێت:

- ئەوە لۆیێ ئەو کڵاوە پانەی لەسەر خۆی ناوە تاکو خودا، لەسەرەوە نەیبینێت و لۆیی کوفرە ئەگەر یارمەتی بدەم.

ڕاست دەگەڕێتەوە.

***

**کورتە باسێکی خشل و جل و بەرگ و دوورمانی ژنان**

دەشتی هەولێر ناوچەی قەراج و کەندیناوە و شەمامك و سەنیە و مرکییە و پشتڕێ و بەڕێ و بەڕانەتی دەگرێتەوە.

شمەکی ئافرەتانی ئەو ناوچانە یەك تەرزبوو .. و جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو باس بکرێت. ئەویش بەم چەشنە بوو:

یەکەم: کراس: یەکجار گەورەبوو. لە (١٤) تا (١٦) گەز قوماشی دەویست.

(گەز: ئامێرێکی پێوانە بوو لە مەتر گچکەتر بوو).

کراسەکە نزیکەی مەتر و نێوێك لە باڵای ئافرەتەکە درێژتر بوو. لەلای درێژییەوە، لە قەدی دوو (تیرێژی) سێگۆشەیی هەڵدەبڕاو پاناییەکەی لەلای سنگی دەکرایەوە و لە دامێنی دەیەخرا. لای سنگ تەسك دەبووەوەو دامێنیش زۆر بەرین. پارچەیەکی خڕ و گچکە لەبن هەنگل دەدرا (گرِ وێر)ی ناوبوو.

ئافرەت بۆ ئەوەی پێی هەڵبگیرێت پشتێنێکی باریك (سەرکەلە)، یان پارچە قوماشێکی باریکی لەپشت دەبەستا و کراسەکەی ئەوەندە لەژێر پشتێنەکە هەڵدەکێشا تا دامێنەکە لەگەڵ پێی ڕێکدەکەوت، دوو قەدە کراسەکەش دەبووایە لە ئەژنۆ ڕەت بدات، کە پێیدەگوترا:

(باخەڵ: ئەم ئافرەتە باخەڵ و دامێنی یەکە). واتە باخەڵ شۆڕە. کە ئەو سەردەم زۆر پەسند بوو.

کلکە ئەنگوچك زۆر درێژبوو و سەرەکانیان بەیەکەوە گرێ دەدرا و لەسەر دەستۆك ئاوا دەکرا لە پشتەوە بەسەر چارۆگەی ملی شۆڕ دەبووەوە.

ئەمەی باسمان کرد کراسی ئافرەتی گەورە بوو. بۆ کیژی پارچەڵە بێ باخەڵ بوو. هەڵبڕینی کراسی دووەم یەك تیرێژی بوو کەپێیدەگوترا (شەیتان بڕ).

لە شەستەکان بەسەرەوە ئافرەتە گەنجەکان کراسی بەباخەڵیان فڕێدا. ئەمڕۆ تاك و لۆك لای ئەو ژنە بە تەمەنانەی کە خۆیان بە بنەماڵە لەقەڵەم دەدەن ماوە.

لەبەر ئەوە کراسەکە قوماشی زۆری دەویست، هەندە ئافرەتیش لەبەر نەبوونی بۆی نەدەلوا چواردە، پازدە گەز قوماش بکڕێت: پشت و قۆڵی کراسەکە، کە دەکەونە ژێر کورتەکەوە قوماشێکی کۆنی تێدەبردەوە.

ئەو قوماشەی دەکرایە کراس بە زۆری قوماشی (جورجێت و کودەری و چیت)ی تەنك بوون. ئەگەر ئەستوور بوایە هەڵگرتنی قورس دەبوو.

دووەم: بن کراس: کە لە بریتی فانیلەی ئەمڕۆ قوماشێکی تەنك و سپی دەکرایە بن کراس، هەندێ جار ڕەنگاو ڕەنگیش دەکرایە.

سێیەم: کەوێ، ئەوەندە شۆڕ بوو داوێنی دەگەیشتە پاشپانی ئەمەیان دوو جۆرە:

أ- کەوای سێ پارچەیی، قوماشەکە دەکرایە سێ پارچە. هەر پارچەیەك دەکرایە ئاتەکێك.

ب-کەوای نۆ پارچەیی (٦) پارچە دەکرایە هەردوو ئاتەکی پێشەوە و (٣) سێش ئاتەکی پاشەوە.

چوارەم: بن کەوێ: (کورتەك). لەبەر ئەوە لەژێر کەوا لەبر دەکرا بە زۆری پێیدەگوترا: بنکەوێ.

قوماشی بەرو پشتی کورتەك یەك بابەت بووە و لۆکەی تێدەکرا و بەتەقەڵی شاش دەدوورا. هەردوو ئاتەکی پێشەوە کە لە بەرکردندا بە دەرەوە بوون، لەگەڵ سەر قۆڵەکانی قوماشی جوان و ڕەنگاوڕەنگ و نایابی لێدەدراو لێوارەکەشی بە قەیتانی سیم و ئارمووش دەنەخشێندرا.

پێنجەم: سەرکەوێ: لەکورتەك درێژتر و لەکەوا کورتر بوو .. و دامێنی دەنەخشێندرا. ئەمەش بە زۆری ژنە ناودارەکان لەسەر کەوێ لە بەریان دەکرد.

شەشەم: دەسترۆك: بریتی بوو لە هیزار. (هیزار قوماشێکی تایبەت بۆ دەسترۆك درووست کرابوو. چوار قەد لە کلاوی سەر دەپێچرا).

هێندەجار هەوری سرکەییش دەکرایە دەسترۆک. کڵاوەکە لێوار ڕەق و توند و سەر پان. هەندێ جار سەری کڵاوەکە دراوی زێڕ، یان زیوی تێدەیەخرا. ئەگەرنا پارچە خامەکی بەسەردا هەڵدەکێشرا.

(لوتکە قیتەکەی ئەملا و ئەولای پێشەوەی دەسترۆک بە (قەزمە) ناودەبرا).

کلکە ئەنگوچکی هیزار بە ئارمووش و سیم چەشنی کەژی باریکتر درووست دەکرا و پێیدەگوترا (لفکە). سەرەکانیشی گولینگیان پێوە شۆڕ دەکراوە. گولینگی هەوری پێدەگوترا (سوارە و پیادە). گەورەکانی سوارەبوون و گچکەکانیش پیادە. هێندەجار بۆ جوانی لە بریتی سوارە و پیادە (قۆتاس)ی پێوە دەکرا قۆتاس خشلێکی زیو بوو.

حەفتەم: چارۆک: لەسەر شمەکان لەبەر دەکرا و جلوبەرگەکانی دیکەی لە پشتەوە دادەپۆشت.

هەشتەم: (دەرپێ). لەبەر باری ئەدەبی (ئاوەڵکراس)ی لە جیاتی بەکاردەهات. ئەمەش سێ جۆر بوو:

أ- ئاوەڵکراسەکە سەرتاپا لەیەك قوماشی ڕەنگاوڕەنگ درووست دەکرا.

ب-دەلینگەکانی تا ئەژنۆ قوماشێکی جوان و ڕەنگاوڕەنگ، ئەوی دی قوماشێکی سادە و عادی بوو.

دەمی دەلینگ بۆ ئەوەی فش ڕانەوەستێت نیفۆی لۆ کرابوو .. و بە کشتە دەزی دەبەسترا و بە بەلەکەوە دەنووسا.

ج- سەرتاپای چاوپان بوو، یان قوماشێکی سادەی لەخم دراو بوو.

هەندە ئافرەت بەتایبەتی ڕەوەندەکان مەترێك زیاتر لە بەژنی خۆیان درووست دەکرد. دەلینگەکانیان هەڵدەوێزنی و خڕدەکردەوە، تا لەسەرەوەی گۆزینگ وەك خڕخاڵ ڕادەوەستان دەلینگی (حاجی حوسێن)یانی ناو بوو.

نۆیەم: چەفیە و چەفتە:

چەفیە: پارچە قوماشێکی سێگۆشەیی بوو ئافرەت لەسەری دەبەستا.

چەفتە لەم دواییە پەیدا بووە درێژ و گولینگدارە و لە بریتی چەفیە لەسەر دەکرێت.

دەیەم: سوخمە و هێلەک: هەردووک شێوەیان یەک بوو. لەسەر کراس لەبەر دەکرا. تەنیا سوخمە پێشەوەی قوماشێکی باش و جوان بوو ئەوەی دیکەی ئایر، کەچی هێلەک یەک قوماش بوو.

***

**ئەنگوستیلە:**

ئەنگوستیلە: وەک ئەڵقە وایە، تەنیا لای سەرەوەی، کە دەکەوێتە پشتی ئەنگوستیلەوە شتێکی خڕ، یان کۆشەداری لەسەرەوە بوو لە مادەکەی خۆی، یاخۆ شتێکی ئایر.

ئەنگوستیلە لە ئەمانە درووست دەکرا:

١- زیو: ئەمەیان دوو تەرز بوو:

أ- سەرەکەی لەخۆی بوو.

ب-سەرەکەی قاشی ڕەنگدار بوو.

٢- زێڕ: ئەمەیانم لە زەمانی گەنجاتیم، تەنیا لە دەستی هەندە ئاغا ژنان دیوە و بەس. پلپلەشی هەبوو .

٣- شاخ: دۆم لە قۆچی (ئاژەڵ) یان درووست دەکرد. لەجیاتی قوتکە سەرەوەی قاشی زەرد و سۆر و کەسك و شینی تێگیرابوو.

٤- فافۆن: لە چەشنی ئەنگوستیلەی زیو دۆم درووستیان دەکرد.

***

تێبینی: لە جێگەیەکی دی باسی (ئەڵقە)م بەدرێژی کردووە، بۆیە پێویست ناکات دووبارەی بکەمەوە. نووسەر.

**بازن:**

بازن شتێکە لە شێوەی ئەڵقە و قەفیزە و ژن بۆ جوانی لە دەستیان دەکرد.

دوو جۆر بوو:

١- بازنی باسك:

ئەو بازنە بوو ئافرەت بۆ جوانی لە باسکی خۆیان دەکرد. ڕەنگ زەرد و سۆر و کەسك و شێن و ڕەش و مۆر.

٢- بازنی قۆل:

ئەمەیان لە ئەویان گەورەتر بوو بە زۆری ڕەنگ شین بوو. دوو لەم قۆڵ و دووش لەو قۆڵ.

ئەمەیان لە چاوان دیار نەبوو و لە شووشە درووست کرا بوو تەنیا بۆ ئەوە بوو: لەکاتی دەست جولاندا دەنگی لێوە بێت و دەوروبەری گوێی لێبێت.

بازن بە زۆری لە ئەمانە درووست دەکرا.

١- باغە: نایلۆن بوو. کەچی ئەوسا دەگوترا لە بنیشت درووست دەکرێت.

٢- زیو: هەندەجار بۆ جوانی قاشی بچووکی ڕەنگاو ڕەنگی تێدەگیرا.

٣- زێڕ: ئەمەیان بەو دوایی یە پەیدابوو. ئەگەر نا، لە زەمانی زوو نەبوو. من بەچاو نەمدیوە.

٤- شاخ: (قۆچ): قۆچی ئاژەڵ بوو. بە ڕەنگ دەنەخشێندرا.

٥- شووشە: هەمەڕەنگ بوو و شینی زۆر تر بوو.

٦- فافۆن: ئەمەیان دۆم درووستیان دەکرد. لە نوێتیدا جوان بوو. پاشدان ڕەنگی دەگۆڕا.

شێوەی بازن دوو چەشن بوو.

١- پانی: پان بوو.

٢- خڕۆکی: خڕ بوو.

ئەمەیان لەبەر ئەوە لە ڕۆیشتندا دەجوولاّ و بەیەکتر دەکەوتن و دەنگیان لێوە دەهات پەسندتر بوو.

***

**بەربازن**

بەربازن: چەند مێرووێکی یەك ڕەنگ، یان ڕەنگاو ڕەنگ بە ئەندازەی باسك بە داوەدەزی دەهۆنراوە و ئافرەت لەدوای بازن لە دەستی دەکرد. هەتا بازنەکان نێنە سەر پشتی دەست و ئازاری بدەن.

***

**بسکە:**

دوو خشلی زێڕبوون تەرزی گوارە: تۆزێك گەورەتر بەس ناوی بۆش نەبوو .. و قاشێکی بچووکی ڕەنگ سوّر، یان کەسك و شینی لەناوەڕاستی گیرا بوو. بە دەرزیلە لەملاولەولای دەسترۆك دەدراو یەك دوو پلپلەی لە خۆیەوە هەبوو.

***

**پشتەسەرە:**

پشتەسەرە: شەش نیولیرەی زیو، یان زێڕ بوو. ئافرەتان لە پشتەوەی دەسترۆکیان دەدا.

***

**حەمایل:**

حەمایلی زەمانی زوو زیو بوو. ئەمڕۆ بووەتە زێڕ و بەم چەشنەیە:

زنجرێکی درێژ و سەرەکانی لەیەك شەتەکدراون و ئاخیری لەگەڵ ئەملاو ئەولای ناوەڕاستی (لوولە)نە.

لەبەر قورسی زەنجیرەکە ڕاینەدەگرتن ناوەکەیان بۆشە و بۆ ئەوەی بەزەختی دەرەوە نەقپێنە باریەك شەمێیان تێدەکرد.

پێشتر ئەوەی ئاخیری دووعایان لەناو دەنا.

ئافرەت خەریتەیی لەمل دەکرد. واتە بە لایەکی باڵایدا شۆڕ دەبووەوە.

***

**حورییەت:**

پارچە زێڕێکی درێژو نەخشێندراوە و لەم داویی یەدا، پەیدا بووە و ئەمسەر و ئەوسەری بە دەرزیلە، لە پشت قەزمەکانی دەسترۆکەوە دەدراو پلپلەشی هەبوو لە لەملاو لەو لای دەسترۆکەکە شۆڕدەبووەوە.

***

**خەزێم:**

خەزێم: زێڕ بوو. سەری بە ئەندازەی نیو لیرە گەورە تر و نەخشێندرا بوو.. و ناوەڕاستی قوتکەیەکی بچووك، لە هەندە خەزێم قاشی سۆر، یان کەسك و شینی تێگیرابوو. بنکی وەك بزمار دەخرایە کونە کەپووەوە بۆ جوانی.

((لووتەوانە)شی پێدەگوترا. ئەو کوردانەی لەسەر سنووری عەرەبان بوون، نۆبات بە (عەڕانە)یان ناودەبرد.

***

**خەناوکە:**

خەناوکە (ملوانکە، گەردانە): چەند مێرووی ڕەنگاوڕەنگ دەهۆنرایەوە و بۆ جوانی ئافرەت بە ملی شۆڕ دەکردەوە.

خەناوکە هەبوو قەنەفڵ، لەگەڵ مێروو بەڕێز دەهۆنراوە. تەرزی قەرێتە بوو .. و بەئەستۆ .. وە دەنووسا.

بۆیە لەمقامێکدا دەگوترێت: (مامزی گەردەن بە قەرێتە). مەبەست ئەو جۆرە خەناوکە بوو.

هەندە خەناوکە لوولەیان بەدواوە دەخست.

***

**خڕخاڵ:**

خڕخاڵ: (پاوانە = پاموور، خەشخاش): وەك بازن خڕە و دووسەری گۆداری هەیە و نێوانیان بە ئەندازەی سێ چوار سەنتیمەرە و بە هۆی ئەو درزەوە ئافرەت لەپێی خۆی دەکرد. زەمانی زوو زیو بوو.

خڕخاڵی فافۆنم نەدیوە. بەس بیستوومە (نووسەر). لەو دواییجیەدا خڕخاڵی زێڕ پەیدا بوو.

زیو، یان زێڕی پتەوبوو. بەس باریکی بەقەد پەنجەی ئەژنۆ ڕووتە دەبوو.

هەشبوو ئەستوور و ناوی بۆش بوو. بۆ ئەوەی بەزەخت نەقەپێتە باریەکەوە شەمێان تێدەکرد. ئەگەر بۆش نەبووایە قورس دەبوو.. و لاقی ئەزیەتدەدا.

***

**دەستەوانە:**

دەستەوانە: دوو مانای هەیە:

١- چەند مێرووێکی قل گەورە و ڕەنگاوڕەنگ، یان یەك ڕەنگ بوو. ئەمەیان بە زۆری زەردی کارەبایی بوو. بە داوەدەزی دەهۆنراوە و تەرزی بازن لە دەست دەکرا. زەردەکەی پەسند بوو. بەربازنیش دەچێتە ژێرباری دەستەوانەوە.

٢- دەستپۆش: پەنجەوانە.

***

**دراو:**

دراو: دراو دوو جۆر بوو:

١- پارەی دەولەت.

٢- چەند پارەیەکی زیو بوو لەسەر کلاوی ئافرەت دەدرا. لەو دواییەدا بووە زێڕ.

***

**دوگمە:**

دوگمە: زیو بوو، یان زێڕ .. وەك قۆپچەیە، یەخەی سوخمە و شتی تری پێدادەخرا.

***

**زڕو پۆلیەی ڕواندزی:**

زڕو پۆلیەی ڕواندزی چەند خشلێك بوو سەرتاپای لە زیو دروست کرا بوون.

(من وام بیستووە و تەواویش دڵنیانیم — نووسەر).

***

**سنجاق:**

سنجاق: (دەرزیلە)شی ناوبوو. دەرزییەك بوو سەرە ئەستوورەکەی لەجیاتی کون مێرووێکی بچووکی خڕی ڕەنگ زەرد و سوور و شین و کەسك و ڕەش و قاوەیی هەبوو. بۆ جوانی لە پێشەوەی دەسترۆك دەدرا.

***

**قۆتاس:**

قۆتاس: گۆیەکی زیو بوو بەکلکی دەسرۆکی ئافرەتان شۆڕ دەکرایەوە.

***

**کەمەرە:**

کەمەرە: (کەمەربەست، کەمەر بەند):

کەمەر: (ناو قەدی بنیادەمە). بۆ وێنە (کەمەرە شل). گۆرانییەکە، مەبەست باڵاشلی ئافرەتە.

کەمەرە باریك: (ناوقەت باریك).

(کەمەرە) ئەلێرەدا کەمەر بەندە و بەڵام لەسەرزاران سواوەو کراوە بە (کەمەرە). زیو، یان زێڕە وەك قاییش ئافرەت بۆ جوانی لە کەمەری خۆی دەبەستا. کەچی ئەمڕۆ لە لێواری سوخمە دەدرێت: (کەمەربەس)یشی ناوە.

***

**کۆترۆکە:**

کۆترۆکە سنجاقە، بەڵام مێرووەکەی سەری خڕ نەبوو بگرە وێنەی کۆتر بوو. بۆ جوانی لە پێشەوەی دەسترۆك دەدرا.

***

**گوارە:**

گوارە: خشڵێك بوو تایبەت بۆ کونی چیلکەی گوێی ئافرەتان درووست کرابوو. دوو چەشن بوو:

یەکەم: گەورە و گۆدار: ئەمەیان سی تەرز بوو:

أ- گوارەی (٥) پێنج گۆ: پێنج شتی خڕی وەك قلە نۆك لەخۆیەوە درووست کرا بوون لەلای دەرەوە.

ب-گوارەی (٤) چوار گۆ: چواری بۆ درووست کرابوون.

پ- گوارەی (٣) سێ گۆ: سێی بۆ درووست کرابوون.

هەندێکیان وێڕای گۆیەکان لەلای ژوورەوە سەرەوەی گۆیەکان بەنەخش بەرز ببوەوە پێیدەگوترا: (گوارەی پێنج گۆ، چوار گۆ، یان سێ گۆی بە کاریتە).

کشتەکە دەزی لە هەردوولاوە ڕایدەگرت و نەیدەهێشت قورسایی گوارەکە چیلکەی گۆی بپچڕێنێت، یان ئازاری بدات. ناوەڕاستی کشتەکەکە دەخرایە بان سەری ئافرەتەکە و تەوازووی گوارەکەی ڕادەگرت.

دووەم: گچکە/ بێ گۆیە و .. وەك ئەڵقەیە و چەند پلپلەی بچووك پێوەیە. ئەمەیان ئەمڕۆ لە باودایە.

***

**گۆبەرۆك:**

گۆبەرۆك: خشڵێك بوو بۆ جوانی لە لێواری کەوێ دەدرا.

***

**لاچاوە:**

لاچاوە: خشـڵێكی زیـو، یـان زێـڕ بـوو لەلایـەكی هـەوری سـەری ئـافرەت دەدرا.

***

**لوولە:**

لوولـە = (بنكـەوش): خشـڵێكی زیـوی درێـژی نزیكـەی شـەش حـەوت سەنتیمەتر دەبوو .. و ئەستووریشی تۆزێك لە پەنجە گەورە ئەسـتوور بـوو. ناوی بۆشبوو. ئەملاو ئەولای قەباخی هەبوو. بە شەمێ پڕ دەكراوە. هەشبوو لە جیاتی شەمێ دوعای دەهاوێشتە نـاوی بـە ئـاخری خەناوكـەوە دەیـەخرا. هەشبوو بە لێوی كورتەیەكی شۆڕ دەكردەوە.

***

**دروومان:**

دروومان: پەیوەست كردنی دوولا قوماش، یاخۆ شتی تر بەتەقەڵە دەزی و بەن و قایش و چشتی دی.

ئەو چەشنە درووmanانە هەبوو.

١- بنـدروو: دروومانێكـە لـە بنـەوەی بابەتەكـە ئـەنجام دەدرێ نـەك لەسەرەوە.

٢- بنكێش: بن دروو.

٣- تەریب: دوو تەقەڵە درووmanی شاش و تیز و فیزی یەكتر هەڵكەوتە.

٤- تەقەڵ: یەك دانە درووmanی واتە جێگەتێنانی دەرزی بـە داوەوە، هـەتا دەگاتە جێگـەی دەرهێنـانی. ئەمـە بەدانـە درووmanی نـاو دەبردرێـت. تەقەڵ هەیە شاشە و هەشە وردە.

٥- تیك: بە دوومانا دێت:

أ- تیكەدرووmanی = تەقەڵ.

ب-تیكەنان = پارچەنان.

٦- سەردروو: تەرحی شیرازکردنە. لیواری ئەو چشتەی دەدووریت، کەمێك با دەدرێت. ئەوجا دەدوورێت. ئەمە (سەردروو)ی ناوە.
٧- قونەدرەز: درووماننێکی وردی یەك لە دوای یەکە و دەستی دروومانکەر هەڵقۆز هەڵقۆز دەکات هەتا چەند دانە دروومان ئەنجام نەدات دەستی ناوەستێت. ئەوسا قوماشەکە، بە هۆی دروومانەکەوە لۆچاوی دەبێت دوای ڕێکخستنی بە دەست، دووبارە دەست پێدەکرێتەوە.

***

**دەرزی و جۆرەکانی:**

دەرزی = ئاسنێکی بچووك و باریکی نووك تیژ و سەری کونی هەیە و داوە دەزیی بۆ دوورمان تێهەڵدەکێشرێت دەرزی سێ جۆری هەیە:

١- دەرزی باریکان: دەرزییەکی زۆر باریکە و قوماش و پەڕۆی تەنکی پێدەدوورێت.
٢- دەرزی ئەستووران: زۆر لە دەرزی باریکان ئەستوورترە و پەڕۆ .. و قوماشی ئەستوور و کورتەکی بە لۆکەی پێدەدوورێت.
٣- دەرزی لێفان: دوو سێ هەندی ئەستووران ئەستوورترە و بۆ دوورینی لێفی پڕ لۆکە بە کاردێت.

- دەرزی ئاژن: دەرزی کوت. نووکە دەرزی لە زۆر لە جێگایەك ڕابکرێت، یان دەرزی کردن یەك لەسەر یەك بە شتێکەوە.
- دەرزیدان: ئەو شتە بچووکەیە دەرزی لەناو هەڵدەگیرێت.

***

**کوو یەکە مجار هەولێرم دیت:**

ساڵی (١٩٤٧) تەمەنم (١١) یازدە ساڵ بوو. ماڵمان لە گوندی (چەغەمیرە) بوو. (سەلمانە جوو) ناوێك لۆرییەك خوری لە ئاوایی کڕی. باوکم پێی گوت: (عەزیزی کوڕم لەگەڵ خۆت ببە تەسلیمی منداڵی (کانەبی ئاغا) کە لە هەولێر دەیانخوێند بکە).

له دەورووبەری نوێژی عیشا گەیشتینە (سەیتەرە). ئەوسا لەسەر (جسری سەیداوە) = کۆنە بەنزینخانە) بوو.

پۆلیسەکانی سەیتەرە گوتیان:

- وەرنە خوارێ و نابێ بەسواری لۆری خوری بچنە ناوشار.

ئێمەش هەموومان دابەزین.

هەرکە لۆرییەکە گڕیدا سەلمان و هاوڕێکانی غاریانداو خۆیان بە لۆرییەکە هەڵواسی. تەنیا من مامەوە. ناچار بەدوای تەقەتەقی لۆرییەکە ملم بەرەو کەندی سەیداوە نا. ڕۆیشتم ئەوسا سەیداوە نەبوو .. و شوێنەکەی کێڵگە بوو. دنیا تاریك بوو. هەتا چۆکان کەوتمە نێو دڕك و داڵان و سەگیش لە دوو سێ لاوە پێم وەڕین. کەچی لەبەر ئەوە پەروەردەی دەشت بووم نەترسام. کەندو کەند ڕۆیشتم. تاکو ڕووناکی و قەرەباڵغییەکم لەبن دیواری قەڵات ڕاست بە ڕاستی تەکیەی ئێستای (شێخ عەبدولکەریم) کەوتنە بەرچاو. لەیادم نەماوە، ماوەی نێوان کەندەکە و قەڵات ئاوەدان بوو، یان چۆل.

هەرکە گەیشتمە لایان چایەخانە بوو .. و پرسیارم لێکردن: ((ماڵی منداڵی (کانەبی ئاغا) لەکێندرە؟)).

کوڕێك لە تەمەنی خۆم گوتی:

- (١٠) فلوس، یان (درهەم)ێکم بدێ لەگەڵت دێم.

گوتم:

- باشە.

ئەمنی بردە کۆڵانێکی تەسکی لە پشت مزگەوتی (شێخە ڕەشکە) و گەیشتینە دەرگایەك گوتی:

- ئەوە هەوە.

پارەکەم نەدایە و لەدەرگام دا خوالێخۆشبوو (عەباس موسا) خزمەتچییان بوو.. و گوتی:

- کێیە؟.

من دەنگم ناسی جا پارەکەم دایە.

زۆری نەبرد سەلمانە جوو بە هەلە داوان هات و گوتی:

- کوڕی مەلام لێ بزر بووە.

ئەوانیش لێکرا لە حریتەیاندا.

بۆ بەیانی هاتمە بازاڕ و بە پرسیار چوومە دووکانی خوالێخۆشبوو (عومەر سەلیم)ی مامی شەهید (محەمەد سەرسپی) و خەزووریشی بوو.

پیاوێکی زەریف و گران و حەق و ڕەق بوو. شەکر و چاو و جغارەی قەمیشی دەفرۆشت.

دووکانی لە جێگەی پارکی قەلات بە لای باکوورەوە بوو.

کاغەزی بابم، کە بۆی نووسبوو دایە و شەکر و چاو تۆپە قەمیشێکی لەنێو جاخێك ناو سواری (پەستی)ی دیبەگەی کردم و گەڕامەوە.

***

**گەردەلوولە:**

هەر جارێك گەردەلوولە پەیدابووایە من خۆم تێوەردەدا، یان ئێمەی مندالّ دەمانگوت:

(گەردەلوولە هەڕوە مالّی گەوادی، گەردەلوولە هەڕوە مالّە گەوادی).

جارێك گەردەلوولەیەکی زۆر گەورە هات. منیش لە پێش مالّی خۆمان خۆم فجور کردێ. جگەلە کەندەکەی پێش مالّمان چەند قوّرت و کۆسپەی گەورەم کەوتە بەر پێ و گوێیم پێنەدا. لەدوا جاردا پێم کەوتە سەر کۆسپەیەکی گچکە و هەلّوەستەم کرد. پاش ڕەوینەوەی گەردەلوولەکە دیتم پێم وا لەسەر .. ڕۆخی بیری (کەندێ)یە. بیرەکە هەر جارێك کەندەکەی ڕۆخی بهاتبووایە پڕ ئاو دەبوو. ژێرەوەی ببووە گەوەڕێکی کاکی بە کاکی. دەلّێن: ئەوەی ئەجەلی نێت نامرێت. زۆر .. ڕاستە. ئەوە من بووم. خوا بە عەمەلی خۆمی لەگەلّ نەکردم ئەگەر هەنگاوێکی دیکەم بهاوێشتبووایە ئێشم تەواو دەبوو.

***

**مەرمەڕۆکانی:**

لە ڕۆژانی وەرزی زستاندا، لەگەڵ دەرکەوتنی تیشکی خۆری بەیانیدا دەچوومە بەر بەڕۆچکەی خانووی خوالێخۆشبوو (خدری مام ڕەسووڵ)ی دراوسێمان. شوێنەکەی ڕووەو ڕۆژ تۆزێک بەرز و زاوییە بوو..و (با)ی نەدەگرتەوە.

پێش ئەوەی هاوڕێکانم بێن بنە بنانی زاوییەکەیم بۆ خۆم گرەدا و بە ناولەپ پاکم دەکردەوە و چوار بەردی پڕ چنگ و لەگەڵ هەشت نۆیەکی وردی وەك قلەقشەپلم خڕدەکردنەوە. چوار بەردە هەراشەکانم وەك سێکوچکەی ئاگردان دادەمەزراندن. ئەوسا یەك تاو دەچوومە کەندەکەی خوار گوڤەکی خوالێخۆشبوو: (مام حەمەدەمین کارەوان) زستانان لەبەر قووڵی باراناوی لێنە دەبڕا. (تەڵخە) شەختەیەکی گەورەم دەشکاند و ماوەکە نزیکەی سەت مەتر دەبوو، نابوایە لەڕێگادا دایبنێم. پێس دەبوو .. و کەلکی گەمەکەی نەدەما. هەتا دەمگەیاندە جێ هەردوو دەستە لاوازەکانم، نەخەسە لەناو لەپەکانم تەواو سڕ دەبوون. هەرکە لەسەر بەردەکانم دادەنا لەتاو سڕی دەست و پێیەکانم ماوەیەك جۆنیانی هەڵدەپەڕیم و هەردوو ناولەپم وێك دەهێنانەوە و پفم بە قاییم لێدەکردن. هەتا تۆزێك سڕیەکە هێور دەبووەوە.

ئێستا پێ زۆر سەرسامم چۆن بە تاکە کراسێك، بەبێ دەرپێ و سەری کوت و پێخواسییەوە بەرگەی ساردییەکەم دەگرت.

بەردە وردەکانم بە نەخش لەسەر تەختە شەختەکە دانان و بە دیاریەوە پشتم بە قوڕنەی خانووەکە داو ڕووەو ڕۆژ لەسەر چینچکان هەڵتوتکام. ئەم جێیە گەرمە و ئەو شەختە گەورەیەم لە پێش ئەوەندە بەختەوەر بووم لاموابوو پاشای سەر تەختیمە.

چاوە چاو بووم بەردەکان سەهۆڵەکە بسمن. هەتا ئەو ساتە دوو سێ هاوڕێشم پەیدا بوون و ڕوویان تێکردم و گوتیان:

- عەزە تەڵخەکەی تۆو زۆر گەورۆنەیە.

شادی دایگرتم و بە شانازییەوە گوتم:

- ئاخر هی .. ناوەندێیە.
- کوو .. وێرای بەو ساردییەی بچییە ناوی؟.

بە خەندەیەکی ڕا لەخۆوە:

- لۆ لەبەر چی؟.

یەکیان گوتی:

- دەنا من نەوێرام پەنجەی پێشم باوێمە ناوی.

بە لووت بەرزییەوە:

- ئاخر ئەتوو ترسنۆکی و دەشزانم لەڕۆخەکانت هێنایە.

لەگەڵ هێما کردن بە پەنجە شادە نوێژەوە:

- لۆییێی ئەوها .. گجیلۆکەیە.

بۆ ئەوەی خۆم بە سەریاندا هەڵکێشم و ئازاتی خۆمیان پێ بسەلمێنم، لنگە باریك و ڕەق و تەقەکانی خۆم هەتا چۆکان، شوێنی تەڕایی پێوە دیار بوو، هەڵکردو گوتم:

- بڕۆننێ، بڕۆننێ!.

لەو ساتەدا بەردێك شەختەکەی سمی و کەوتە خوارەوە و شادی دایگرتم و بە هەڵپەڕین و چەپڵە لێدانەوە گوتم:

- لەخۆم خەنی مەڕێکم زا. لەخۆم خەنی مەڕێکم زا.

(کاتی خۆی ئەمە یەك لە گەمەکانی سەردەمی ئێمە بوو).

***

**مەولوود خوێندنەوە:**

خوالێخۆشبوو (مام سمایل خەزاڵ) پیاوێکی بەدینی ئاوایی و لە عەشیرەتی شێروانی بوو. هەموو ساڵێ لە مانگی مەولووددا بەم شێوەیە مەولوودی دەکرد. مەلا و فەقێ و چەند پیاوی ئاوایی دەعوەت دەکردن. شێوەکە پڵاو (کەشکەك، گەنمەکوتا)ی بەگۆشت بوو.

دوای نوێژی خەوتنان لە دوای هەرچی پیاوی ئاوایی دەنارد. موستەعیدێك لە باتی باوکم مەولوودەکەی دەخوێندەوە. لە جیاتی شەربەتی ئێستا (شەکراو) دەکرا و بە جامی گچکە بەسەر خەڵکەکە دابەش دەکرا.

لەبەر ئەوە کەم بوو شەکراوەکە لەزار ئەوەندە خۆشبوو بە حەقی خوا جار وابووە سێ جامم دەخواردەوە ئەوجا برم پێنەدەشکاو دەم ویست پتر بخۆمەوە. هەر ئەوەندەش وەبەر منداڵان دەکەوت.

***

**مەهاجەی کەران:**

لە ساڵی (١٩٦٣)دا گۆڕ بە گۆڕ چوو (بەدرەدین عەلی)ی موتەسەڕیفی ئەوسای شاری هەولێر بوو، شەکر و چاو زۆر شتی تری قەدەغە کرد بۆ گوندەکان بچن. یەك کیلۆ شەکر لە سەیتەرەکان دەرباز نەدەبوو.

خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری شار ناچار بە سواری گوێدرێژ، تەفتیش نەدەکرا دەچوون پێویستی ڕۆژانەیان دەکڕی.

بەدرەدین عەلی هەرکە زانی هەر سوار گوێدرێژێك دەهاتە شار کەرەکەی دەگرت و کابرای بەڕللا دەکرد. کەرێکی یەکجار زۆر گیران. بۆیە ئەو ساڵە، لەلایەن خەڵکەکەوە بە ساڵی (کەرگیران) ناو دەبردرا.

کەری بەستەزمان بەبێ ئالیك و ئاو لەلای (قەزا)وە، نزیك نەخۆشخانەی کۆماری ئەوسا چۆل بوو، لە نێو سیمێك بەندکرا بوون. خاوەنەکانیان ناچار .. ڕۆژێ بە ڕۆژێ دەچوون ئاو و ئالیکیان بۆ دەبردن.

هەرکە لە خەڵکەکە پرسیار دەکرا: (کێوە دەچن؟).

دەیانگوت:

- دەچینە مەهاجەی کەران.

***

**منداڵ تڕێنە:**

مام ساڵح ناوێك هەبوو، لە شاری هەولێر دادەنیشت. فڕفڕۆك و ڕەو ڕەوەی دەفرۆشت. ساڵێ کەڕەتێك دووان دەهاتە گوندەکەمان.

فرفرۆکەکانی لە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ و ڕەو ڕەوەش لەداری سپی و بە ڕەنگ نەخشێندراو لە دوورەوە سەرنج و حەزکێشی ئێمەی منداڵی نەدیتکە بوو، بەدەنگی بەرزەوە گازی دەکرد:

(منداڵ ترێنە، منداڵ ترێنە، منداڵ ترێنە).

ئێمەی منداڵ لە هەر لاوە گەمارۆمان دەدا. بە دیتنی بابەتەکان سوقمان دەبووەوە و حەزمان گڕی دەگرت.

هەوەل جار هات من بۆ هەر دووکیان شێت و هاربووم و هەر زوو دەستم بە گریان کرد و پڕ بەزار هاوارم کرد و: (دایە منداڵ ترێنەم دەوێت، دایە منداڵ ترێنەم دەوێت).

ئەگەر بۆی نەکڕیبوومایە لە تاوان بە زگم دەدا.

***

**من لە ئێستاوە هیچم:**

پیاوێك لە شاری هەولێر بوو (ساڵحە شێت)ی پێدەگوترا. هێندەجار بە (ساڵحە ئاغا) بانگ دەکرا. لە هێندە قسان شێت بوو .. و لە هێندە قسانیش عاقڵێکی تەواو. ڕۆژێك عەریف شورتەیەك دەچێتە لای ساڵحە شێت پێیدەڵێت:

- تۆ ئێستا چیت؟.
- عەریف.
- پاشدان دەبێتە چی؟.
- ڕەئیس عورەفا.
- پاشدان.
- موفەوەز.
- دوای موفەوەزی.
- ملازم.
- دوای ملازمی.
- معاونی مەرکەزێك.

- پاشدان؟.
- موردیر شورتە.
- پاشدان؟.
- وەزیر.
- پاش وەزیراتی؟.

عەریف شورتە دەڵێت:

- هیچ.

ساڵحە شێت پێی پێدەکەنێت و دەڵێت:

تۆ ئەوەندە پلەیت بڕی ئەوجا بوویتە هیچ، من هەر لە ئێستاوە هیچم.

***

**یەکمجار لۆری هاتە ئاوایی:**

من منداڵ بووم. نازانم تەمەنم چەند بووە. بەس هێشتا نەمدەخوێند ڕۆژێك گوتیان: (ئەها .. لۆری هات!).

ئێمەی خەڵکی ئاوایی گەورە و بچووك، نێر و مێ، لەبەر ئەوە یەکەمجار بوو لۆری بێتە ئاوایی گەمارۆماندا و لە چواردەوری دەسووڕاین و سەیری دیمەنەکەیمان دەکرد.

کات نیوەڕۆ بوو سوختەیەك ڕاتبەی چەند ماڵێکی خڕ کردبووەوە، هەرکە بیستی لۆری هاتووە نانەکانی بن هەنگڵی لەسەر دیواری حەوشەی ماڵێك دادەنێت و پرتاو بۆ لای لۆرییەکە دەچێت. هەرکە گەڕایەوە سەگ نانەکانی خوارد بوو.

فەقێکانی هاوڕێی پێیدەڵێن:

- ئەی ڕاتبە؟.

ئەویش بە پێکەنینەوە دەڵێت:

- بووە ئالیکی لۆرییەکە.

***

**هێگرە لنگانێ:**

من لە زۆرانێدا بە زۆربەی مندالّەکانی ئاوزەی خۆم نەدەوەستام. کەچی لەبەر ئەوە لە ژیاندا زۆر بە بزێو بووم و بە پێیان زۆر دەڕۆیشتم لە گەمەی (هێگرە لنگانێ)دا کەم کەس دەرەقەتم دەهات.

(هێگرە لنگ): دوو کەس لەسەر پشت دژی یەکتر درێژ دەبن و بە لێنگ یەکتریان قیت دەکردەوە.

***

## فەقێیاتی لە دەشتی هەولێر:

**پێشەکی:**

ئەو بابەتەی پێشکەشتانی دەکەم، بارێکە و خۆم تێیدا ژیاوم و بە چاوی خۆم دیومە، بەو هۆیەوە دەرگایەکی زۆر بچووکم لەو شارە گەورەیەدا کردەوە، بەڵکو دوای من یەکێك بە تەواوی بتوانێت بخزێتە ناو کووچە و کۆڵانەکانی و هەموو لایەنێکی ڕوون بکاتەوە.

ئەگەرچی مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم بە شێوەیەکی زۆر کورت لە گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢)، ساڵی ١٩٧٢ و ژمارە (٨)ی ساڵی ١٩٧٣دا باسی فەقێیاتی کردووە، بە زۆری ناوچەی سلێمانی دەگرێتەوە، لەگەڵ ناوچەی هەولێر جیاوازێکی زۆری هەیە.

من لێرەدا تەنیا فەقێیاتی لە دەشتی هەولێر لە ماوەی (٢٠) بیست ساڵ دا دەخەمە ڕوو.

### بەشی یەکەم

**فەقێ:**

فەقێ بەو قوتابییانە دەگوترا کاتی خۆی لە حوجرەی مزگەوتان دەیان خوێند.

وشەی (فەقێ) لە وشەی (فَقِه)ی عەرەبی بە واتای (زانا) وەرگیراوە.

فەقێ بە گشتی دوو جۆر بوون:

یەکەم: ئەو فەقێیانەی لە سەرەتای خوێندن دا بوون پێیان دەگوترا (سوختە).

سوختە وشەیەکی فارسییە بە واتای (سووتان)ە. گوایە ئەم جۆرە فەقێیانەش لە دەور کردنەوەو خزمەت و بەردەستی (موستەعید)ان دەسووتان.

دووەم: ئەوانەی لە ناوەڕاست، (واتە پلەی سوختاتیان بڕی بوو) یا لە دوا پلەی خوێندن دا، بوون (موستەعید)یان ناو بوو.

ئەم وشەیەش عەرەبییە و بە واتای (ئامادە)یە. گوایە فەقێ لەم پلەیەدا لە خوێندن پێشکەوتنێکی بە خۆیەوە دەبینێت، مێشکی ئامادە دەبوو بۆ دەرس تێگەیشتن و شت وەرگرتن.

موستەعید دوو جۆر بوون:

جۆری یەکەم: ئەوانەی لە ئاخر و ئۆخر و دوا پلەی خوێندن دا بوون موستەعیدی تەواو بوون، کە بەرامبەر بە قوتابی کۆلێژی ئێستایە.

جۆری دووەم: (نیمچە موستەعید)یان پێدەگوترا. ئەمانەش بەرامبەر بە ئەعدادی ئێستایە.

ئەم چینەیان لەو شوێنانەی کە مەلای بەرزی هەبوو دەبوونە سوختە و لای موستەعیدەکانیان دەخوێند. لەلای مەلاکانی تر دەبوونە موستەعید و سوختەشیان ڕادەگرت.

مەلا بە موستەعیدی دەگوت: مەلاو بە سوختەش فەقێ.

موستەعیدیش بە سوختەی وا دەگوت. بە مەلای: مامۆستا، یان قوربان بوو.

شمەکی سوختە دەستووری کوردەواری بوو. لەگەڵ کڵاو و جەمەدانی، موستەعید کەواو سەڵتە و کڵاو و جەمەدانی بوو، کە ئیجازەی وەردەگرت دەبووە مەندیل و جوبە.

لەو دواییەدا موستەعید وەك فەقێی ناوچەی کەرکووك چاکەت و کەوای لەبەر دەکرد.

ئەوەی من دەیزانم و لە یادمە لە ساڵی ١٩٤٠ ڕا تا ساڵی ١٩٦٠ واتە بیست ساڵی ڕەبەق جگە لە شارەکان، لە زۆربەی گوندە قەوغەکانی ناوچەی (کەندێناوە) و (شەمامك) و (سەنیە) و (موڵکییە) و (پشت ڕێ) و (بەڕانەتی)دا، فەقێ هەبوو. ژمارەیان، لە هەر گوندێك بە گوێرەی پلەی زانیاری مەلای گوندەکە بووە. لە دێی نیمچە مەلاکان دا لە چوار پێنج فەقێ زیاتر نەبوون، کەچی لە دێی مەلا باشەکان پاڵیان بە بیست سی دەدا.

گوندەکان بۆ فەقێیان گەلێك لە (داخیلییە)ی ئێستا باشتر بوون، بۆ وێنە:

دێی (چەغەمیرە) کە ئەو کاتە (١٠٠) سەد ماڵێك دەبوو، نزیکەی (٧٠) ماڵی جوتیار و گوزەران باش بوون. ئەوانی تر هەژار و ئاوخۆرەوە بوون، خۆیان بە جرە جڕ بەڕێوە دەبرد نەیاندەتوانی یارمەتی کەسی تر بدەن، ماوەی (٢٢، ٢٣) ساڵ هیچ ڕۆژێك لە (٢٠) فەقێی کەمتر نەبووە.

ئەو (٧٠) ماڵە جوتیارە بە خوایشتی خۆیان بەبێ هیچ جۆرە زۆر لێکردنێك لەلایەن میری، یا دەرەبەگەوە نان و شیو و شەکر و چاو سپیاتی و بابەتی سووتەمەنی و جل شوشتن و بگرە جێگەی نووستن، واتە (حوجرە) و هەندێ جاریش پارەی کتێب و بەرگی ئەو (٢٠) فەقێیانەیان دەدا. ئاغای گوندیش بە خۆی، بە هیچ جۆرێك درێغی نەدەکرد. بارتەقای پێنج شەش ماڵەجوتیار خواردن و مەسرەفی دەدا.

نان و شیوەکە، کە پێی دەگوترا (ڕاتبە) ڕۆژێ دوو کەڕەت بوو: سبیانان و ئێواران، یا نیوەڕۆیان و ئێواران بوو.

سوختەکان بە خۆیان ڕاتبەیان خڕدەکردەوە، بەیانیان لەگەڵ ڕۆژهەڵات بۆ نان دەچوونە نزیکەی (٣٠) ماڵێك، نیوەڕۆیان (٤٠) ماڵەکەی تر. ئێوارانیش بۆ نان و شیو هەر (٧٠) ماڵەکانیان دەکرد.

فەقێکان کە بۆ ڕاتبە دەگەیشتنە بەر دەرگای حەوشەی هەر ماڵێك، بۆ ئەوەی خاوەن ماڵەکە ئاگادار بکەن، بەدەنگێکی بەرز و درێژکردنەوە، بەبێ شەرم کردن ئەمەیان دەگوت:

((ڕاتبە ڕەحمەت و)) یان

(ڕەحمەتتان) لێ ... بێت)).

من وام بیستووە: ئەو ڕاتبەیە لە زەمانی پاشای کوڕەی ڕواندز پەیدابووە.

گوایە: ئەو کاتە هیچ بەرهەمێکی ئەوتۆ نەبووە کە فەقێی پێ بەخێو بکرێت، پاشای کۆرە ناچار بووە فەرمان بە خەڵکەکە بدات: کە هەر کەس

ڕۆژێ بە ڕۆژێ لە ماڵی خۆی چ خواردنێك دەخوات ئەو خواردنەش بۆ حوجرەی فەقێیان ببات.

ئیتر ئەوەی گوزەران باش بووە بەم جۆرە، لە ماڵی خۆی ڕاتبەی بۆ فەقێیان بڕییەوە، بەڵام وابووە خاوەن ماڵێك كە بە سەفەر دەچوو كەسی ئەوتۆی نەبووە ڕاتبەكە بۆ حوجرە ببات، پێش ڕۆیشتن فەقێكانی تێدەگەیاند كە تا دەگەڕێتەوە بە خۆیان بچن ڕاتبەكە بێنن. ماڵێكی تروا، دووانی تر وا، تا بەم جۆرە فەقێكان فێربوون بەخۆیان ڕاتبە بێننەوە و دەقی پێوە بگرن. ئیتر لەو ڕۆژەوە ڕاتبەی فەقێیان بەم شێوەیە لە كوردستان بووە دەستوور. ئەگەرچی ئەمە هەر گوتەیە هیچ بەڵگەیەكمان بە دەستەوەنییە، بەڵام زۆریش وێدەچێت.

لە هەولێر لە حوجرەی ئەفەندی نانی فەقێیان لەسەر ماڵی ئەفەندی بووە. سبیانان یەك تێركە نانی گەنم لە باداوان دەناردرایە قەڵات. نانەكان نیوەی بۆ فەقێیان، نیوەكەی تری بۆ ماڵە دەست و پێوەند و فەقیرەكانی قەڵات بووە. پێخۆری سبیانان لە زستان دا، نۆك و لۆبیا بووە و بەهاران ماست بووە. نیوەڕۆیانیش هاوینان تەڕەو شتی تر بووە. ئێواران شیوبووە. تەنیا ڕۆژی (هەینی = جومعان) مەڕێك سەر دەبڕا و دەكرا بە چێشت بۆ فەقێیان.

مەسرەفی فەقێیان تەنیا لە كوردستان لەسەر شانی چینی جوتیاران بووە.

لەناو نەتەوە موسڵمانەكانی تر وەكو بیستوومە بە ڕێگەی وەقف و ڕێكخراوی خێری و دەستگای میرییەوە بووە.

لەو چەند دێرەی سەرەوە ئەمەی خوارەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە: كورد هەندە دەوڵەمەند نەبووە تاكو وەك نەتەوەكانی تر بیتوانیبووایە ڕێكخراوی خێری دامەزرێنێت و خزمەتی فەقێیانی پێ بكردابووایە. ئەوەندەش ئاشق و تینووی خوێندن و زانست بووە، هەرگیز نەیتوانیوە دەست بەرداری فەقێیان

بێت. چونکە خوێندن ئەو کاتە هەر بەو ڕێگایە بووە. بۆیە ناچار بووە بەو جۆرەی کە باسمان کرد خزمەتی فەقێیان بکات و پێیان بگەیەنێت.

خزمەتێکی وا باوەڕناکەم هیچ نەتەوەیەك لە نەتەوە موسولمانەکان ئەو خزمەتەی کردبێت. بۆ وێنە:

یەکەم: ئەگەر فەقێکان لە هەر ماڵێك تووڕەبوونایە ڕاتبەی ئەو ماڵەیان نەدەهێناوە. خاوەن ماڵەکە شێت و هار دەبوو .. و کێچی دەکەوتە کەوڵی و بە ناچاری خۆی دەخیل دەکردن و دەیگوت: تەنیا ئەو نانەم بەخێر و پیاوەتی لە ماڵ دەردەچێت ئێوەش دەتانەوێت ماڵم کوێرکەنەوە و بیبرن...!.

دووەم: فەقێ جلی دژوونیان بۆ شوشتن، بۆ هەر ماڵێك بناردبووایە مەگەر ماڵەکە کابانی لە ماڵ نەبووایە ئەگینا زمان نەبوو بڵێت پێمان ناکرێت.

ئەوە ئەگەر ئاشقی عیلم و زانست نەبووایە چ خێزانێك بە ختوخۆڕایی جلکی زەلامێکی زگورتی بێگانە دەشوات..!!.

ڕاستە ئاین لەم ڕووەوە دەستێکی باڵای هەبووە، بەڵام ئەم بەڵگەیەی خوارەوە قسەکەی من دەچەسپێنێت:

فەقێ هاوینان لە دەرەوە دەنووستن، هەندێکیان نوێژی سبەینانیان نەدەکرد، تا ڕۆژ و بان بە پشتیان نەکەوتبووایە لە خەو هەڵنەدستان. خەڵکەکەش هەموو دەیان دیتن. نەك هەر دەنگیان نەدەکرد و بەس، بەڵکو پینەشیان دەکرد و دەیانگوت: فەقێنە و حەرەجیان لێناگیرێت. ئێواران بە سەعی و دەورکردنەوە ماندوو دەبن.

واتە سەعی و دەورکردنەوەی ئێوارانیان پێ باشتر بووە لە نوێژی سبیانان. کە ئەمەش دژی پەیرەوی ئاین بووە.

خۆ ئەگەر بهاتبووایە مەلا نوێژی سبیانانی نەکردبووایە بە چەپڵەی دەستان ڕایاندەپەڕاند.

***

لە ماوەی ئەو بیست ساڵەی کە بابەتەکەم دەگرێتەوە دەشتی هەولێر بۆ فەقێ و مەلایان ئەوەندە بە باش ناوبانگی دەرکردبوو تا لە هەموو ناوچەکانی تری کوردستانی عێراق، بگرە تورکیا و ئێرانیش فەقێ و مەلا ڕوویان تێکردووە.

گوند نەبووە، گەورە و بچووک (تەنیا دوو ماڵی و سێ ماڵی نەبێت) مەلای نەبووبێت. گوندی گچکەی چوار پێنج ماڵ مەلایان ڕادەگرت و ساڵی نزیکەی (٢٠) عەڵبە مزاش و چوار پێنج بەردیلە زەکاتیان دەدایێ.

مەلاکە ئەگەر هەشت نۆ سەرخێزانیش بووایە گوزەرانی وەك تۆپ دەسووڕا.

فەقێش ئەوەندە زۆر بوو باوەڕ ناکەم ئەو کاتە هیچ ناوچەیێك لە کوردستانی گەورەدا ئەوەندە فەقێیەی بووبێت.

ئەمەش بە هۆی خاکە بەپیت و فەڕەکەی دەشتی هەولێر بووە، کە جوتیارەکانی توانیویانە بە هۆی بەرهەمە زۆرەکەیەوە خۆیان بژێنن و مەسرەفی فەقێیانیش بکێشن.

***

## بەشی دووەم

چۆنیەتی ژیانی فەقێ لە ژووری حوجرەدا:

حوجرە ئەو ژوورە بوو کە فەقێ لێی دەنووست. خەڵکی هەر گوندێك بیان ویستایە فەقێ ڕابگرن پێشتر حوجرە و هەیوانیان لەتەك مزگەوت درووست دەکرد. جا لە حوجرە و هەیوانێك، تا دوو حوجرە و هەیوانێك، یا سێ حوجرە و هەیوانێك، یا چوار حوجرە و دوو هەیوان لە گوندەکان هەبوو.

حوجرە لاکێشی بوو. دەلاقەی زۆر تێدا بوو. هەر حوجرەیێك بۆ ڕووناکی دوو جام، سێ جامی بەبێ چوارچێوە. تێگیرابوو.

حوجرە بە زۆری جێگەی شەش کەسان بوو. سێ لەم بەر دەنووستن سێیەکەی تر لەو بەر. نێوان جێگاکان لەم سەر بۆ ئەو سەر بە بەرینی

مەترێك نزم و چۆڵ بوو. جێگەی سۆپا و مەقەڵە و چا تێ کردن و چێشت خواردن بوو. پشت دەرگاکەش شوێنی پێڵاوان بوو.

هەر فەقێیەك نوین (یەتاغ)ی تایبەتی خۆی هەبوو. کە بریتی بوو لەمانە:

١- لبادێکی یەك نەفەری، لەسەر حەسیر ڕادەخرا، یا بەبێ حەسیر. شەو و ڕۆژ هەڵنەدەگیرا. مەگەر لە هاوینان کە شەوان لە دەرەوە دەنووستن.

٢- بالیفێکی تووك (پەڕ).

٣- جاجمێکی دوو لاو یەکێکی یەك لا.

هەندێك دەستیان کورت بوو لە جاجمێکی دوولا بەو لاوە زیاتریان نەبوو. هەش بوو دووگورد = (بەرماڵ)ی نوێژیان هەبوو. ئەوانە بە زۆری موستەعید بوون. بە ڕۆژ جاجمەکانیان دەق دەکرد، لەسەر لبادەکە، پەنا دیواری لای سەرینگانیان دادەنا. بەو دواییە مافوور و لێفە پەیدا بوون.

هەر فەقێیەك بۆ کتێب و جلك و بەرگ و کەل و پەل تێکردن باولێکی گچکە و دەست بوغچەییێکی هەبوو. باولەکە، لەگەڵ کتێبەکان لە دەلاقەکان دادەندران. بۆغچەکانیش بە سنگ هەڵدەواسران.

جێگەی موستەعیدەکان لەلای سەرەوە بوو، سوختەکانیش لەلای پێینگان بوو. هەر کەس لەسەر جێگەی خۆی دادەنیشت. تەنیا لە کاتی نان خواردن دەچوونە پاڵ یەکتر.

هەیوانەکە دوو قوژبنی بنەبانێی (سەرشۆرك = مغسل) و (کوپ لغ) بوون. قوژبنەکانی لای دەرەوە، یەکیان شوێنی تەنەکە و شوشەنەوت و سۆپاو مەقەڵە بوو. ئەوی تر شوێنی قشپل و کاوکۆت و دار و دووی سوتاندن بوو.

**ئیش کردن لە ژووری حوجرەدا:**

موستەعید هیچ ئیشی نەدەکرد. تەنیا دەرسی لا مەلای دەخوێند و دەرسیشی بە سوختەکان دەگوت. هەر ئیشێکی حوجرە هەبوو لەسەر شانی سوختەکان بوو.

هەندە موستەعید بە فەخفەخە بوون سەرەڕای ئیشی حوجرە ئیشی تایبەتی خۆشیان بە سوختەکان دەکرد. ئەم جۆرە موستەعیدانە ڕەزاگران بوون، سوختەکان خۆشیان نەدەویستن.

ئیشە سەرەکییەکان بە زۆری ئەمانە بوون:

أ- ڕاتبە هێنانەوە.

ب-چای لێنان و تێکردن.

ج- حوجرە ماڵین.

د- قشپل و دارودو .. و نەوت پەیدا کردن لە ئاوایی.

هـ- ئاوهێنان.

ڕاتبە هێنانەوە:

ئەگەر سوختەکان (١٠) بوونایە ئەو ماڵانەی کە ڕاتبەیان لێدەهێناوە دەکردە (١٠) بەش. هەریەك لە سوختەکان بەشێکی بەردەکەوت، یا دوو، دووپێکڕا دەگەڕان.

سبیانان دوای ڕۆژهەڵات چوارانیان دەچوون ڕاتبەی ماڵەکانی خۆیانیان دەهێناوە، نیوەڕۆیان شەشەکەی تر.

نانی ناوچەی دەشتی هەولێر ئێستاش لەگەڵ دابێت مەزرەقە نییە نەرمە و ڕۆژێ بە ڕۆژێ دەکرا، کە بۆ فەقێیانیان دەبرد، دەیان کردە قەزمەنووشتی. ماڵ هەبوو نانێکی دەدا، هەش بوو دووان، نانی ماڵی ئاغاش لە چوار پێنج کەمتر نەبوو. نانەکە هەر چەندە بووایە سوختەکە لە ژێر هەنگڵی چەپەی دەنا. لەبەر ئەوە ئەو کات ئێواران چێشت دەکرا سوختەکان هەر (١٠)یان دەچوون. ڕاتبەی هەموو ماڵەکانیان دەهێناوە.

لە هەندە گوندان سبیانانیش چێشت دەکرا بۆ ڕەنجبەران دەدرا فەقێیانیش. شیوی سبیانان بە زۆری ئەمانە بوون:

(بروێش، نیسك، دۆینە، پیرخەنی).

سوختە هەبوو وا لێڕاهاتبوو هەر جارێ پێنج لەگەنە شیوی بە تەنێ هەڵدەگرت. لە هەوەلەوە نانێکی لەسەر ناولەپی چەپەی دادەنا و لەگەنە

شـيوێکی دەهاوێشـتە سـەر، دووەم لەگـەن لەسـەر باسـکی بـوو. نـانێکی دەخستەسەر قاپە شیوەکەی سەر ناو لەپی و سێیەم لەگەنی لەسەر دادەنا. چـوارەمی دەهاوێشـتە سـەر سـەری. جـا لەگەنـە شـیوی پێنجـەمی لەسـەر دەستی ڕاستە و ئەوجا داری بەبن هەنگڵی ڕاستە دەگرت و سەگی پـێ لـەخۆ پاس دەکرد. وادەبوو چەندماڵێك ئەو ئێـوارە شـیویان نـەدەبوو هـەر نانیـان دەدا، سـوختەکەش دەسـتی گیرابـوو ناچـار قـۆڵی ڕاسـتەی بڵنـد دەکـرد و خاوەن ماڵەکەش نانەکەی دەنایە بن هەنگڵی.

دوای پێنج لەگەنە شیوەکە ئەگەر ڕاتبەی دوو سێ، مـاڵی تـر بمابووایـە سوختەکە ناچار بۆ حوجرە دەگەڕاوە و کاروانی دووەمی دەکرد. خـۆ ئەگـەر ماڵێك بووایە. جێی دەهێشت.

زۆر جار وادەبوو لەو کاتـەدا سـەگی بـۆ دەهـات ئەگـەر لـەلای پشـتەوە بووایە لە ڕۆیشتن دا خۆی بەملاو بەولادا بـادەدا تـاکو دارەکـەی لـە پشـتەوە بجووڵێـت و سـەگەکە نـەیگرێت، خـۆ ئەگـەر لـەلای پێشـەوە بووایـە بـە کەوشەکانی بەرگری لە خۆی دەکرد.

بەم جـۆرە ڕاتبـەی ئێوارانیـان دەهێنـاوە، چـەند قاپـە شـیو دەکەوتنـە گۆڕێ. شیوەکان بە زۆری ئەمانە بوون:

١- پلاو ساوار.
٢- شلە ساواری ڕووت.
٣- شلە ساوار بە تەماتە.
٤- شلە ساوار بە سلق.
٥- شلە ساوار بە تۆرکە.
٦- شلە ساوار بە کەنگر.
٧- شلە ساوار بە گۆشت.
٨- بڕوێش.
٩- بڕوێش بە شیر.
١٠- گەنم بە شیر.

١١- نیسك.

١٢- پیرخەنی.

١٣- داندۆك.

١٤- ترش.

١٥- کاردی بە ترش.

١٦- دۆ بە کەشك.

١٧- کەشکەك = گەنمەکوتاو.

١٨- دۆینە.

١٩- دۆغەوا.

٢٠- مەرەگە.

٢١- کفتە بە ترش و گۆشت.

٢٢- کفتە بە درۆ.

٢٣- یاپراغ.

با بلێین قاپە شیوەکان (٢٠) بوون، فەقێکانیش (١٦) کەس بوون. لەبەر ئەوە شیو هەبوو زۆر باش و خۆش بوو، شیویش هەبوو ناخۆش بوو، نەدەکرا هەر یەکە قاپێك بۆ خۆی ڕاکێشێت. جێگەش نەدەبۆوە هەر شانزەیان پێکەوە لەسەر قاپێك دامەزرێن، (دە)یان لێدەکرد. (دە) لێکردن جۆرە یانسیبێك بوو لە یانسیبەکانی دابەش کردن. وەك (تیروپشك) و (هەڵاویرتکەی تەڕ و وشکانێ). بەم چەشنە بوو: چوار سوختە چێشتەکانیان بۆ چوار بەش دابەش دەکرد. فەقێکانیش دەبوونە چوار چین، هەر سوختەیێك لە چوار سوختەکان سەرۆکی چینێك بوو. یەك لە چوار سوختەکان ڕووی لە سوختەیەك دەکرد و دەیگوت: (دە لە تۆ = توو).

ئەویش دەیگوت: (دە لە من). جا هەر دووکیان دەستیان بە توندی و قوچاوی بۆ یەکتر درێژ دەکرد. لە کاتی دەست درێژ کردنەکەدا هەریەکەیان چەند پەنجەیەکی هەڵدەهێناوە. پەنجەکان چەند بوونایە ئەوەندە ژمارە پەیدا دەبوو. بۆ وێنە: با بلێین سوختەی یەکەم (٥) پەنجە و دووەم (٣)

پەنجەی هەڵێنا بۆوە. (٥ + ٣ = ٨). ژمارە (٨) پەیدادەبوو. ئەو سوختەیەش کە (دە)ی لێکرابوو بە ژمارە (١٠) دادەندرا. کەواتە (٨ + ١٠ = ١٨) پەیدا دەبوو. لەو سوختەیەی کە دەی لێکرابوو ژمارەکە واتە: ژمارە (١) دەستی پێدەکرد بەلای ڕاستەوە دەسووڕا تا ژمارە (١٨)ە کە لەسەر یەکێك لە چوار سوختەکان ڕادەوەستا. ئەو دەبووە (مەلا)و بە کەیفی خۆی بەشێکی لە چێشتەکان هەڵدەگرت و دەچوو لەگەڵ چینەکەی خۆی دادەمەزراندنێ.

دووەم، واتە ئەو سوختەیەی دوای مەلا کە پێی دەگوترا (پاش مەلا) بەشێکی هەڵدەگرت.

سێیەم (سێ دنکە) بوو، بەشی سێیەمی دەبرد.

چوارەم دوو ناوی لێبوو: (چوار دنکە) و (قڕە) بوو، بەشەکەی دوایی بۆ ئەو دەماوە.

ئەم جۆرە دابەش کردنە کەم و کوڕیشی ببووایە، لەبەر ئەوە بە شێوەیێکی ڕاست و دادپەروەرانە بوو هیچ کەس گازاندەی نەدەما.

وا دەبوو لەناو چەند ڕۆژێك لەنگەرییە برنجێك دەهات، دوای ئەوە فەقێکان (لە نان خواردن) دەبوونەوە هەر یەکەیان پارە نانێکی بە دەستەوە دەگرت و فەقێیەکیش بە مڵاك = (کەوچك) برنجەکەی بۆ لە ناو نانەکە دەکردن و دەیانخوارد.

سوختەکان بەرماوەی نان و شیوەکەیان هەموو ڕۆژێ بۆ ماڵێکی دەست کورتی ئاوایی دەبرد. کە پێی دەگوترا (داپیرەی فەقێیان).

ماڵەکەش لە تۆڵە قاپەکان و جلکی دڕوونی فەقێکانی دەشوشت.

ئەوە ئەگەر فەقێکان کەم بوونایە، ئەگینا داپیرە دەرەقەتی جلك شوشتنی هەموویان نەدهات. فەقێکان ناچار دەبوون جلکەکانیان بنێرنە ئاوایی.

لە هەندە شوێنان ماڵی داپیرەی فەقێیان لە حوجرە نزیك بوو، کاتی دنیا ساردی سبیانان بۆ دەست نوێژ و چاوشۆرین ئاوی گەرم دەکرد.

نانی سبیانان و نیوەڕۆیـان لەگـەڵ ئێـواران جیـابوو. سـبیانان بـە زۆری فەقیّ نان و کەرتێکی بەردەکەوت نیوەڕۆیان دوو نان.

(١٦) فەقیّ کە هەر یەکە دوو نانی بەر بکەوێت دەکاتـە (٣٢) نـان. ئـەو سی و دوو نانانەیان دوو، دوو لەسەر یەك دادەنا.

نانەکان گەنم و جۆ و مزراش بوون. نانێکی گەنم یەکیّ جـۆ بەیەکـەوە و دووانانی مزاشیش بەیەکەوە، تا بەم جۆرە دەبوو (١٦) جیّ و لە ڕیز یـەکیان دادەنان. جا (دە) لێکردنەکە لە نێوان هـەر (١٦) شـانزە فـەقێکان بـوو. کـیّ مەلا بووایـە دوو نـانی پێشـەوەی هەڵـدەگرت. وەك چێشـتەکە نـەبوو، بـەناو بکەوێت و هەڵبژێرێت، ئیتر ئەوانی تریش بەم جۆرە.

لـە وەرزی پـاییز و زسـتان سـبیانان و نیوەڕۆیـان هـەر نـان و چا بـوو. وادەبـوو هەفتـەی جـاریّ، یـا دوو جـار فـەقێکان بـە پـارەی خۆیـان تـەنیا نیوەڕۆیان هێلکەیان دەکڕی و بە نانیان دەخوارد. کەچی لـە وەرزی بـەهاردا سبیانان خەڵکەکە لەگەڵ ڕاتبە ماستیان دەدانیّ، نـان و ماسـتیان دەخـوارد. هاوینان سـوختەکان نیوڕانـان دەچـوونە ماڵـە مـەڕدارەکان دۆیـان دەهێنـا و نانیان پێدەخوارد.

***

**چای لێنان:**

چایە لێنان بە نۆرە بوو: هەر ڕۆژێك سوختەیەك لێی دەنا و تێی دەکـرد و حوجرەشـی گەسـك دەدا. بـە قشـپل لێدەنـدرا، ئەگـەر قشـپل نەبووایـە کاوکۆتیان لە سۆپا دەکرد. لەم دواییەدا پرێمس پەیدا بووبوو، چایەیان پـیّ لێدەنا.

ئەگەر پیاڵە کـەم بوونایـە پێشـان ڕیزێـك بـۆ موسـتەعیدەکان تێـدەکرا، دوایی سوختەکان. کە ڕیزەکە تـەواو دەبـوو، دیسـان لـە موسـتەعیدەکانەوە ڕیزەکە دەستی پێدەکردەوە. چایەکە دیشـلەمە بـوو. تـەنیا بـۆ نـان نـەبێت شیرین بوو.

هەروەها پەیداکردنی نەفت و قشپل و دار و دو .. و بەرچاوگەی ئاگریش بە نۆرە بوو.

***

**ئاوهێنان:**

ئاوهێنان: سوختەکان هەموویان بە یەکەوە ئاویان دەهێنا. ئەگەر ئاوی ئەو بیرەی لە حوجرە نزیك بوو، تاڵ بووایە بۆ ڕێژە و پێژە بەکاریان دەهێنا، بۆ چایە و خواردنەوە دەچوون لە بیری شیرناویان دەهێنا.

ئاو لە حوجرە لەمانە دەکرا (کوپە، تەنەکە، جەڕە، مەسینە، کۆسکە).

***

**ڕابواردنی شەو و ڕۆژی جومعە و سێ شەممان:**

ئەو ڕۆژەی کە باران دەباری و دنیا سارد دەبوو فەقێکان لە دوای نانی نیوەڕۆیانی ڕۆژی پێنج شەم و دووشەممان لەگەڵ گەنجەکانی ئاوایی تا ڕۆژئاوا تۆپانێی دەستیان دەکرد. دوای نوێژی مەغریبیش دەیان کردە شایی و چەپڵەڕێزان و شیعر خوێندنەوە تا بەترەکی شەوێ.

شاییەکە بە زۆری (سێ پێیی) و (ئایشۆکێ) و (سوسکەیی) بوو. هەندەجار (تەمبۆڵێ و پێدا)ش بوو.

بە هۆی ئەو بەستە و مقامە فۆلکلۆرانەی کە ئاوازیان لە سەر نزمی هەڵپەڕکێیە شایی یەکانیان دەگێڕا.

هەندەجاریش بۆ عەنتیکەیی لە شایی سوسکەیی ئەمەیان دەگوت:

- ئەلفێکی ئەن، وەلا ئەئەن ئەئلەم و ئەیو ئۆنە.
- بێیەکی بەن، وەلا بەبەن بەبلەم و بەیو بۆنە.
- جیمێکی جەن، وەلا جەجەن جەجلەم و جەیو جۆنە.
- میمێکی مەن، وەلا مەمەن مەملەم و مەیۆ مۆنە.

بەم جۆرە تا هەموو پیتە هیجاییەکانیان تەواو دەکرد.

شیعرەکان بە زۆری شیعری دڵداری بوون و شیعری مەلاکانی پێشوو، یان سەردەمی خۆیان بوون. وەك شیعری: (نالی و مەحوی و وەفایی و سافی و جزیری و دەشتی و موخلیس و حەزین ... هتد.

ئاوازی شیعر. هەندێك لەناو فەقێیانی ناوچەی سلێمانی ڕادەهات. هەندێکیش لە ناوچەکە دادەندرا.

ئاوازەکە بەبێ مۆسیقا بوو. تەنیا یەکێك دەیگوت، یاخۆ یەکێك دەیگوت چەند کەس دەیانگێڕاوە.

زۆربەی شەوی جومعان قەسیدەی (بوردییە)یان دەخوێندەوە.

کە کژی بەهار دادەهات و سەرما و سۆل نەدەما، نانی نیوەڕۆیان دەبردە ئاقاری و هەتا ئێوارە بە سێ بازی و یەك بازی و کێلە بەردانێیان ڕادەبوارد.

شەوانیش بە دەستووری پێشوو. تەنیا لەکاتی دنیا گەرمیدا بە ڕۆژ چییان پێنەدەکرا.

لەکاتی شەو درێژبووندا، دوای شایی و هەڵپەڕکێ شەویان بە چەند یارییەك بەسەر دەبرد. کە ئەمە یەکێکیانە و خۆم تێیدا بەژدار بوومە:

**کاری خودەش باری خودەش:**

(بن پیاڵە)یەکم پڕ ئاو کرد و درهەمێکیشم لەناو دانا و دامە دەست فەقێیەکی هاوڕێم و خەڵکی ئاوایی ئاگاداری گەمەکە نەبوو: (لە ژیاندا نەماوە و ناتوانم ناوی بهێنم).

خۆشم بن پیاڵەیەکی ترم بە دەستەوە گرت و نێوانمان مەتر و نیوێك دەبوو، پێمگوت: (من دەتوانم درهەمەکەی ناو ژێر پیاڵەکەی دەستت بدزم و تۆش هەست پێنەکەیت).

باوەڕی نەهات و گوتی:

درۆ .. دەکەیت.

گوتم: (من چم گوت و چم کرد تۆش وا بکە. ئەگەر لێم نەدزیت ڕووم ڕەش بکە).

گوتی: (باشه).

من لەگەڵ گوتنی (کاری خودەش، باری خودەش – ۱ –)دا پەنجەی شادەم لەنێو ئاوی بن پیاڵەکەی دەستم دەناو هەرکە تەڕ دەبوو بە ژێر بن پیاڵەکەم دا دەخشاند و پاشدان بەنێو چەوان و ڕوومەتی خۆم دادەهێنا. ئەویش بەجوانی لاسایی دەکردمەوە. دوای چەندین جار دووبارە کردنەوە بن پیاڵەکەی خۆم دانا عەردی و ئەویش چاوی لێکردم.

من ئەوسا لەگەڵ فەقێیەکاندا لێکڕا بە چەپڵە لێداندا ئەمەمان دەگوت:

هەیکەر هەیکەر لۆ پیاوی کەر.

هەیکەر هەیکەر لۆ پیاوی کەر.

ئەویش لەبەر ئەوە چاوی بەس بڕیبووە درهەمەکە و تالێینەدزرێت حەرام ئاگای لەبەزمەکەی ئێمە نەبوو.

هەرکە زانی لێینەدزراو گوتی:

- کەری وەك توو کوو دەتوانی درهەم لە من بدزی.

منیش گوتم:

- کەر ئەو کەسەیە کە نازانێت ڕووی ڕەش کراوە.

پێشتر من ژێر بن پیاڵەکەی ئەوم بەتەنی ڕەش کردبوو، هەرکە دیتی ڕووی لەتەنی هەڵگەڕاوە چەند جوێن و قسەی قۆڕی پێگوتم و ئەوجا تفێکی زار جوانەی لە دوڕ چاومی کرد. لەو ڕۆژەوە هەتا حەیامێکی زۆر لێم لالووت و دڕ دۆنگ بوو. هەتا ڕۆژێك چوومەماڵیان ماچم کرد ئەوجا چاك بووەوە .

## بەشی سێیەم:

### ڕمددە و جومعانە:

وادەبوو فەقێ شەکر و چایەیان نەدەما و دەیانناردە دوای سێ چوار .. ڕدێن سپی و دەم ڕاستی ئاوایی و پێیان دەگوتن: ئەوانیش بە ناو ئاوایی

---

(1) مانای: هەر کەس خەریکی کاری خۆی بێت.

دەکەوتن و بە قەدەر توانا پارەیان لە خەڵکەکە خڕ دەکردەوە و بەشەکر و چایەیان دەدا. ئەمە پێیدەگوترا (ڕەددە).

بیست فەقێ ڕۆژی سێ جار چایەیان لێدەنا. ئەمەش شەکر و چای زۆر دەویست. وادەبوو ڕددەکە ئەوەندە کۆ نەدەبووەوە تا سەر بەشی شەکر و چایەکەیانی بکردبوایە، ناچار هەندێك لە فەقێ، (موستەعیدەکان) ڕۆژی جومعەدا دەچوونە گوندێك لە گوندە نزیکەکان کە (فەقێی) نەبووایە. لەکاتی نوێژی جومعە خەڵکەکەیان تێدەگەیاند. ئەوانیش هەرگیز نائومێدیان ڕەوان نەدەکردنەوە و بارو بوویان بە قەدەر توانا دەکردن.

ئەمەش لەبەر ئەوە بە زۆری لە ڕۆژی جومعە و کاتی نوێژدا بوو (جومعانە)ی بەسەر داسەپا.

هەندەجار فەقێیەکان لە کاتی جۆخینان گەنم و جۆیان لە ئاوایی خڕ دەکردەوە هەندێکیان بە تەڕە و میوە دەدا و ئەوی تریشیان بۆ شەکر و چا دەفرۆشتن.

جومعانە دوو جۆر بوو:

جۆری یەکەم، گشتی بوو. یانی بۆ مەسرەفی ژووری حوجرە بووە. ئەوە بوو کە پێشتر باسم کرد.

جۆری دووەم کەسی بوو: فەقێ هەبوو ماڵی باوکی دەستیان زۆر کورت بووە بە هیچ جۆرێك نەیاندەتوانی جل و بەرگ و کتێبی بۆبکڕن و مەسرەفی تری بکێشن. ئەو فەقێیە ناچار پەنای دەبردە بەر جومعانە. ئەویش بەم جۆرە بوو: لەکاتی جۆخینان یا لە دوای جۆخین هەلگرتن بەخەڵکەکەی ڕادەگەیاند، کە فەقێیە و بۆ جومعانە هاتووە.

خەڵکەکەش چەندی دڵیان لێ بەر ببووایە زەکاتی گەنم و جۆیان دەدایە و بۆیان لە مزگەوت خڕ دەکردەوە.

تەراحی ئاواییش لێدەکڕی و جا پارەکەی دەهاوێشتە بەرکی و بۆ گوندێکی تر هەیپەی لێدەکرد. تا بەم جۆرە پارەی جل و بەرگ و کتێبی پەیدا دەکرد.

لەمە زیاتر بووایە بە حەرامی دەزانی و نەیدەکرد.

یا بەهاران کاتی پەنیر فرۆشتن دەچووە هۆبە ڕەشماڵان پارەیان دەدایە، نەك وەك فەقێی ناوچەی سلێمانی داوای کەرەڕۆنی بکردایە.

ئەگەر فەقێکە جگەرەکێش بووایە لە وەرزی توتن دا دەچووە ناوچەی خۆشناوەتی تووتنی خڕدەکردەوە و دەیهێناوە و بای خۆی دەگێڕاوە و ئەویتری دەفرۆشت.

ئەو سێ جۆرە جومعانەیە واتە: جومعانە کەسی لەناو فەقێیان پەسند نەبوو. هەموو فەقێیەك نەیدەکرد. مەگەر هەر وەکو گوتم: پەلی لە عەرد و ئاسمان بېڕابووایە.

ئەم جۆرە فەقێیە تا جومعانە نەکات، لەو گوندە گچکانەی کەنەیان دەتوانی مەلا ڕابگرن هەولێدەدا ببێتە مەلای ڕەمەزان. کە ئەو کات ئەمە باوبوو.مانگی ڕەمەزان دەچوو دەبووە مەلای گوندێك تا ڕۆژی جەژن پێش نوێژی دەکرد جا جێی دەهێشتن. لە جەژنی قوربانیش دەچووە لایان پێش نوێژی بۆ دەکردن. خەڵکەکەش سەرفترە و بەردیلە — زەکاتیان دەدایە. ئەگەر لەکاتی جۆخینان بووایە زەکاتی گەنم و جۆشیان دەدایە.

لەم دواییەدا مەلایەتی ڕەمەزان بووبووە مۆدێل نەك فەقێ دەست کورتەکان بەڵکو گوزەران خۆشەکانیش بە دوای دەگەڕان.

چەند کەسانێکی نەفس نزم و سووك و تەمبەڵ کە هەرگیز لە ڕۆژی بوونیانەوە نەیاندەزانی ئارەق ڕشتن و نرخی ژیان چییە، دەستووری جومعانەیان تێك دابوو، لە هەر چوار وەرزی ساڵدا دەرۆزە: (سواڵ)یان دەکرد، دەیانگوت: فەقێینە و لە جومعانە دەگەڕێین. ماڵ بە ماڵ دەگەڕان، کە دەگەیشتنە بەر دەرگای هەر ماڵێك دەیانگوت: جومعانەی فەقێیان بچنە بەهشتێ.

ئەوانە نەك هەر فەقێ نەبوون و بەس بەڵکو هەندێکیان نەیاندەزانی خوێندەواری چییە. تەنیا کەواو سەڵتەیان لەبەر دابوو. سەرەڕای ئەمەش خەڵکەکە بە نائومێد ڕەوانەیان نەدەکردنەوە.

فەقێ بە چاوێکی زۆر سووکەوە سەیری ئەو جۆرە کەسانەیان دەکرد.

## بەشی چوارەم

**سەردان:**

ئەو ڕۆژەی کە بەهار دادەهات و سەرما و سۆڵ نەدەماو ڕۆژ درێژ دەبوو (فەقێ)ی گوندەکان سەردانی یەکتریان دەکرد. چێنێك دەبوونە میوانی چینێکی دی، ئەمەش لە بەیانی ڕۆژی جومعە، یا سێشەم دەبوو، یان شەوەکەی ئەو دووژە دەمانەوە.

خانە خۆییەکان نێوەڕۆ نانیان ئامادە دەکرد. نانەکەش بە زۆری نان و ماست و هێلکە بوو.

تا نوێژی نیوەڕۆ دەبوو لەتەك حوجرە تۆپانێی دەستیان دەکرد. جانانیان دەخوارد، لەسەر چا خواردنەوە پرسیاریان لە یەکتر دەکرد. کە پێی دەگوترا (مباحثە)ە.

ئەمە بەزۆری لە موستەعیدەکان دەوەشایەوە و پرسیارەکانیش عیبادەت و حاشیە (پەراوێز)ی کتێبەکانیان بەیەکتر نیشان دەدا و دەیانگوت. ئەم عیبارەتە یا ئەم حاشیە مانای چییە.

وشە هەبوو لە عیبارەتی هەندە کتێبەکان واتاکەی تەواو ئاشکرا نەبوو یەکێك لە مەلاکانی پێشوو نووکە قەڵەمێکی گەیاندبوویێ و لە ژێرەوەی نووسی بوو (فیە مافیە)، یا (تأمل)، یا (فافهم). جا بە زۆری ئەم جۆرە ڕستانەیان بەیەکتر نیشان دەدا. ئەگەرچی هەندێکیان واتایان بە ئاسانی نەدەزاندرا بەڵام لە ئەنجام دا (فەقێ)ی زیرەك، سەرکەوتوو دەبوو.

لە ڕاستیدا ئەم جۆرە ڕستانە وەکو ڕەمزێك وابوو، هەموو کەس نەیدەزانی، سەرەڕای زیرەکی و ئاگاداری بیرکردنەوەی دەویست.

مەلایەك هەبوو ڕکی زۆر لەم جۆرە ڕستانە دەبۆوە و هەموو جارێ لەکاتی دەرس گوتنەوە دەیگوت: نووسەر دەستی خۆی چوقاندووە و دەڵێت: (چیم لە دەست دایە) من چوزانم. دارە، بەردە، گووە ... چییە؟.

سـوختەکانیش پرسـیاری زاریـان لەیـەکتر دەکـرد. کـە بـە زۆری ئـەم پرسیارانە بوو: یەك ڕستەیێکی دەهێنا و دەیگوت: ئەم ڕستەیە واتـای چییە ..؟ یا (ئێعرابی) چییە؟.

چ (ئیستیعارە)یەکە؟. یا فلان وشە لە چ (بابێکـە)، یـا (فاعیـل) چییە، (صفە) چییە؟ .. هتد.

دیسان لێرەدا (فەقێ)ی زیرەك و ئاگادار دەردەکەوت.

(فەقێ)ی مەفتووق هەبوو بە ئەنقەست چەند ڕستەیەکی مانـا و ئیعـراب ناخۆش لەملا و لەولا فێـر دەبـوو، بگەیشـتبووایە هـەر کەسـێك لێـی پرسـیار دەکرد. زۆر جار وادەبوو فەقێی زیرەکیش نەیدەزانی.

دوای نیـوەڕۆ خانەخوێیـەکان میوانـەکانیان بـە چـەپڵەڕێزانێ و گـۆرانی گوتن تا نیوەی ڕێگا بەڕێیان دەکردن. لەوێندەریش هەر دوو چـین دەسـتیان بە یاری سێ بازی و یەك بازی و کێلە — بەردانێ دەکرد. تا نزیك ڕۆژئاوا. ئەو کاتـە میوانـەکان دەڕۆیشـتن و خانـە خوێیـەکانیش دەگەڕانـەوە. ئـەو جـۆرە سەردانە سێ سوودی بە فەقێکان دەبەخشی.

أ– وەکـو گەشـتێك بـوو ئـەو ڕۆژە گـوڕی بـە لەشـی فـەقێکان دەدا و ماندووبوونی خوێندنیان لە مێشك دەردەچوو.

ب– خۆشەویستی لەنێوان هەر دوو چین پەیدادەبوو.

ج– گۆڕینەوە و لەیەکتری فێربوونی ئەو زانیارییانەی هەیان بوو.

جگە لەو (مباحثە)ی کە باسم کرد شیعر شیعرانێش هەبوو. ئەویش بـەم جۆرە بوو: دوو فەقێ، یـا دوو چـین بەرامبـەر یـەکتر ڕادەوەسـتان و یـەکیان شـیعرێکی دەگـوت دوا پیتـی شـیعرەکە چ بووایـە، بـابلێین پیتـی (ن) بـوو فەقێیەکەی تر دەبووایە شیعرێك بلێت یەکەم پیتی (ن) بێت. بەم چەشنە، تا یەکیان دەبەزی. ئەمەش هاندەرێکی باش بوو بۆ ئـەوەی فـەقێکان خۆڵقیـان بکەوێتە سەر شیعر و ئەزبەری بکەن.

شیعرەکان بە زۆری شیعرە کوردییە ئاوازدارەکان بوون. تـاك و لـۆکیش ئەو شیعرە عەرەبییانە بوون کە لە ناو کتێبەکانیان دا هەبوو.

له شێوەی شیعر شیعرانیٚ گوند گوندانێش لەو دواییەدا پەیدابوو بوو. بۆ وێنـە: فـەقێیێك نـاوی گونـدێکی دەهێنـا و دەیگـوت، چـیغلۆك. ئـەوی تـر دەیگوت: کەنداڵەقەل. ئەم وەڵامی دەداوە: لاوەر.

## بەشی پێنجەم

**جیٚ گرتن:**

هەر فەقێیێك پێویستبووایە لە شوێنێك دامەزرێت پێشتر دەچوو دەبووە میوانی فەقێکان. سوختە بووایە داوای لە موستەعیدەکان دەکرد جێی بکەن. واتە دەرسی پیٚ بڵێن، موسـتەعیدیش بووایـە داوای لـە مـەلا دەکـرد، ئەگـەر دامەزرابووایە سوختەکان گویٚ درێژ، یا وڵاخێکیان لە ئاوایی بۆ پەیدادەکرد و دەچوو نوین و کەل و پەلەکەی خۆی دەهێنا. خۆ ئەگەر جێی نەبووایە بە دڵ ساردی دەگەڕاوە.

هۆی جیٚ نەبوونی بە زۆری ئەم خاڵانە بوو:

١- بەش نەکردنی ڕاتبە. واتە نان و شیو.

٢- نەمانی جێگەی نووستن/ (حوجرە).

٣- مەلاکە موستەعیدی تەواو بوون. لە توانای نەبوو چی تر موستەعید ڕابگرێت.

لەبـەر ئـەوە دەرسـی هـەر موسـتەعیدێك لـە سـەعات و نیـویٚ، تـا دوو سەعات و نیو، هەندە جار سیٚ سـەعاتی دەبـرد، لـە توانـای مەلاکـەدا نـەبوو زیاتر لە چوار ئەو پەڕی پێنج موستەعید ڕابگرێت.

مەلای باش بەرنەدەکەوت. واتە ساڵیٚ دوانـزە مـانگ لای چـۆڵیٚ نـەدەبوو. موستەعید دەبووایە پێشتر نۆرە بگرێـت جـا دوای سـاڵێك، دوو سـاڵیٚ نـۆرەی بەردەکەوت و دەهات لای دادەمەزرا.

موستەعیدی باشیش هـەر وابـوو. هـەردەم سیٚچـوار سـوختەی هـەبوو، موستەعیدی خراپیش بە عەزرەت سوختەیێك بوو.

زۆر جـار وادەبـوو بـاوکم هەنـدە وەختـان شـەش حـەوت موسـتەعیدی هەبووە.

تەمەنی لە دەوری شەست سالّی دا بوو، سبیانان زوو لەگەلّ ڕۆژهـەلاّت بـە جـۆرێ وا ئـەو موسـتەعیدەی کـە یەکـەم جـار نـۆرە دەرسـی بووایـە پێڕانەدەگەیشت نانی بەیانی بخوات.

جا بەو یەختیارییە لەسەر دوو گورد و پارچە حەسیرێك چۆکی دەداوە و دەنگی دەهات تا نیوەڕۆ. ئەو کاتە بە پەلەپەل نوێژی دەکرد و دەچۆوە مالّ نانی دەخوارد و دەگەڕاوە، تا نوێژی عەسر. لـەدوای نوێـژکردن تـا ڕۆژئـاوا. کاتی پشوودانی تەنیا نوێژکردن و نان خواردنی نیوەڕۆبـوو، ئـەگینا بـە هـیچ جۆرێك ڕاوەستانی نەبوو.

مەگەر موستەعیدێك لە دەرس دەبۆوە تا موستەعیدێکی تر دەهات. زۆر جـار وابـووە مـەلای مـەغریب بـانگی دەدا و دەرسـەکە تـەواو نـەدەبوو. موستەعیدەکە ڕازی نەدەبوو دەرسەکەی نیوەچلّ بـەجێ بهێلّێـت، ناچـار بـە موستەعێدێکی تری دەگوت پێش نوێژەکە بکات.

سـەرەڕای ئەمـەش بـۆ ئـەوەی دەرسـی فـەقێیان نەچـێت سـەفەری نەدەکرد. وەکو خەلّك بچێتە شار کەل و پـەلی پێویسـتی مالّـەوە بکڕێـت، یـا سەردانی خەلّك بکات. تەنیا بۆ ئیجازەدانی فەقێیان دەچوو، یا موستەعیدێك خوێندنی تەواو بکردایە لەگەلّی دەچووە گوندێك دای دەمەزراند بـە مـەلا، یـا تازیەکی (فاتیحا)یەکی زۆر پێویسـت بووایـە ئـەوەش ڕێـك کـەوت بـوو، سـالّ وادەبوو ڕۆژێك لە گوند دوور نەدەکەوەتـەوە سـالّیش وادەبـوو ڕۆژێـك یـا دوو ڕۆژ بووە.

بەم جۆرە ماوەی (٢٢) سالّ لە کوێرە گوندێکی دوورە شار بیری ئاوایی لە (٣٠م) زیاتر قوولّ، ئاوی تالّ، لە قرچەی گەرمای هـاوین بـەبێ پانکـە، لـە سـاردی زسـتان بـەبێ ئـاگر، لەسـەر حەسـیرە ڕەقـی مزگـەوت دەرسـی گوتووتەوە بەبێ هیچ پاداشتێك، یاخۆ مـەعاش. تـاکو مـردیش دینـارێکی لـە بەرگی خۆی شك نەبرد.

بژێوی تەنیا زەکات و سەرفترە بووە. کە دەهاتە باسی ئەو نانە سەد قسە و جوێنی ناشیرنی پێدەدا. بەڵام بۆ ئەوەی ئێمە دڵمان لەسەر خوێندن سارد نەبێت دەیگوت: ئێوە بخوێنن، تێگەیشتن پەیدا بکەن ئەو کات مەلایەتی مەکەن، بڕۆن گاوانی بکەن.

لەبەر ئەوە خۆم پەروەردەی نانی مەلایەتیم نەم توانی نووکی قەڵەمم بۆ قسەکانی باوکم درێژ بکەم، ئەگینا باوەڕ بکەن ئێوەی خوێنەر بێزتان لێ دەکردەوە.

خوێنەرانی ئازیز: مەلاکان ئەگەر لەبەر خوایان بووبێت، یا لەبەر ناو و دەنگ، یالەبەر هەرشتێکی تربەم جۆرە ژیانە عیلم و زانست و زانیارییان لە کوردستان بڵاوکردۆتەوە و بە هەزاران کەڵە پیاوی وەك بابەتاهیری هەمەدانی و مەولەوی و ئەحمەدی خانی و مەلای جەزیری و حاجی قادر و نالی ... یان لێ هەڵکەوتووە.

ڕاستە زانیارییەکەیان بە زمانە زگ ماکەکەی خۆیان نەبووە کە ئەو کاتە ئەو بیروباوەڕە لە گۆڕێ نەبووە، بەڵام هەر بەدەستی ئەوانەوە یەکەم بەردی بناغەی نووسین بە زمانی کوردی چەسپ کراوە: بە سەدان شیعر و داستان و چیرۆك و بەسەرهاتیان پێ نووسیوە کە پێشتر نەبوو، بە هەزارانیش بەرهەمیان لەناو چووە. لەجیاتی ئەوە ئێمەی خوێندەوار وەك میللەتانی ترهەموو ڕۆژێ لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان پەنجەی شانازییان بۆ درێژ بکەین و حەقی خۆیان بدەینێ لە لاپەڕەی مێژوو بە پێشڕەو جڵەوداری کاروانی ڕۆشنبیری کوردستانیان تۆمار بکەین. قسەی ناهەمواریان دەقە بەل دەکەین. ئەمەش بە هەموو بیر و مەزەبێك ڕەوا نییە. نووسەر.

***

(فەقێ)ی توو خۆرە:

هەندێ لە فەقێکانی دەشتی هەولێر فێربوون کە دنیا گەرم دادەهات دەچوونە ناوچەی خۆشناوەتی دەیانخوێند. لەبەر ئەوە ڕێگاکە دوور بوو،

مەسرەفیشی دەویست هەر لە هەوەڵەوە کەل و پەلەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبرد. تا دنیا سارد دەبوو ئەوجا دەگەڕانەوە.

خەڵکی خۆشناوەتی بەم جۆرە فەقێیانەیان دەگوت: فەقێی توو خۆرە. واتە هەر بۆ توووخواردن هاتوونە. نەك بۆ خوێندن.

***

مانەوەی فەقێ لە هەر شوێنێك بە خوایشتی خۆیان بوو. فەقێ هەبوو ئەقڵی شوێنێکی نەدەگرد، مانگێکی پێنەدەچوو دەڕۆیشت. هەش بوو چوار پێنج ساڵ لە شوێنێك دەماوە.

***

## بەشی شەشەم

**شێوەی خوێندن و ئەو کتێبانەی کە دەخوێندران بەم تەرزە بوو:**

خوێندنی فەقێیان ئەگەرچی بە شێوەیەکی زۆر وشك و زەحمەت بوو، لە کاغەز بەو لاوە هۆی ڕوون کردنەوە نەبوو. لە هەوەڵەوە هەر لەسەر ڕێبازێك بوو و هەرگیز نوێ بوونەوەیەکی بەخۆوە نەدیت، مامۆستا تا دەرسێکی فێری منداڵێك، یا فەقێیێك دەکرد زۆر ماندوو دەبوو، منداڵەکەش بە هۆی زۆر دووبارەکردنەوە ڕەوانی دەکرد، بەڵام لە ڕووی وردەکاری و بەلاغەت و زاخاوی مێشکەوە پلەیەکی یەکجار زۆر بەرزی بەخۆوە گرتبوو. بە جۆرێکی وا ئەگەر فەقێیەك سێ چوار کتێبی بە باشی و تێگەیشتن بخوێندبووایە مێشکی دەبووەوە و شتی زوو وەردەگرت و تێگەیشتنی پێ پەیدادەکرد: واتە شتی هەڵە نەدەچووە مێشکی.

***

منداڵ کە دەناردرایە بەر خوێندن ئەگەر گوندەکە (فەقێ)ی هەبووایە فەقێ دەرسی پێ دەگوت. ئەگینا مەلا ... منداڵەکە تەمەنی چەند گەورە بووایە حەرەجی نەبوو، ئەگەر گچکە بووایە، دەبووایە لە ژمارە (١)ەوە تا

ژماره (٢٠)ی بزانیبووایه، ئەگینا مامۆستاکە دەرسی پێنەدەگوت و دەیگوت: گچکەیە و فێرنابێت.

مامۆستا لە وەرقەیەك، بە خەتێکی خۆش و گەورە (سیپارە)یەکی بۆ دەنووسییەوە کە بەم شێوە بوو:

یافتاح          یارزاق          یاالله

ا، ب، ت، ث، ج، ح، خ، د، ذ، ر، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ع، غ، ف، ق، ك، ل، م، ن، و، هـ، لا، ی.

***

أعوذ بالله مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم

بسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم

الحَمدُ لله رَب العالَمينِ الرَّحمن الرَّحيم. مالكِ يَوم الدّين. إياك نَعبُدُ وإِياكَ نَستَعينُ. إهْدِنا الصّراط المُستقيم صِراط اللّذين أنعمتَ عَلَيهمْ غَيرِ المَغْضوبِ عَلَيهِم ولاالضالّين آمين.

التّحياتُ لله السّلامُ عَلَيكَ أُيها النبيُّ وَرَحمَةَ الله وَبَركاتهُ.

السّلامُ عَلَينا وَعَلى عِبادِ الله الصّالحين. أشهَدُ أنْ لاإلـه الا الله وَأشهَدُ أنَّ محمداً رسولُ الله. اللّهُم صَلِ عَلى سيدنا مُحمدٍ وَعَلى آلِ سيدنا مُحمدٍ كما صَلَّيتَ عَلى إبراهيمَ وَعَلى آلِ إبراهيمَ في العالَمين إنَّكَ حَميدٌ مَجيد. اللهُمَّ حاسِبني حَساباً يَسيرا.

لەکاتی خوێندندا منداڵەکە سیپارەکەی لەسەر کۆشی خۆی دادەنا. مامۆستاکە لە هەوەڵەوە وشەی (یافتاح) و (یارزاق) و (یاالله)ی فێر دەکرد. بە پووشکەیەك هێمای بۆ وشەکان دەکرد و دەیگوت: یافتاح فەتحم بدە، یارزاق رزقم بدە، یاالله تۆفیقم بدە.

منداڵەکەش لە چاوی دەکردەوە. ئیتر جارێك دووان، سێیان، دەیان جار تا منداڵەکە ڕەوانی دەکرد. جا دەستیان بە خوێندنی (ئەلفبا)کە دەکرد.

مامۆستاکە لەگەڵ پیشان دانی پیتەکان بە پووشکەیەك دەیگوت: ئەوە (ئەلف)ە وەك چیلکەدار درێژووکانییە. (بێ) ئاوایە و نوختەیەکی لە ژێرە. (تێ) ئاوایە و دوو نوختەی لەسەر.

جا دەیگوت: ئەلف، بێ، تێ، منداڵەکەش لێی وەردەگرتەوە، بەم شێوەیە تا پیتەکان تەواو فێر دەبوو. جا دەست بە خوێندنی حینجەیی سوورەتی (فاتیحا) دەکرا بەم شێوەیە:

| حینجەیی بە کوردی | حینجەیی بە عەرەبی | وشەکە بە عەرەبی |
|---|---|---|
| ئەلف سەر = ئە | ا + ...َ = أ | |
| عەین واو = عوو | ع + و = عو | |
| ذال بەر = ذو | ذ + ....ُ ... ذُ | أعوذُ |
| | | |
| بێ ژێر = بی | ب + .........ِ= بِ | |
| لام ئەلف = لآ | لَ + ا = لا | |
| یان (لامەل فەلا) | | |
| هی ژێر = هی | هـ + ....ِ ... = هـِ | باللهِ |
| | | |
| میم ژێر = می | م + ...ِ ... = مِ | |
| نوون سەر = نە | ن + ...َ ... = نَ | مِنَ |
| | | |
| ئەلف سەر = ئە + | ا + ...َ = أ | |
| لام زەنە = ئەل | = ألْ | |
| شین سەر = شە + | ش + ...َ = شَ + | |
| یێ زەنە = شەی | ی + ...ْ = شَیْـ | |
| طی ئەلف = طا | ط + ا = طا | |
| نوون ژێر = نی | ن + ....ِ =نِ | ألشیطانِ |

ئەلف سەر = ئە +    آ + ....َ= آ

لام زەنە = ئەل    ل + ....ْ= آل

ڕێ سەر = ڕە    ر + .....َ = رَ

جیم ێ = جی    ج + ی = جیـ

میم ژێر = می    م + .....ِ= مِ    الرَّجیم

لە دوای ئەم حینجەیی یە بە (ڕەوانی) پێدا دەچوونەوە .

أعوذُ مِنَ الشیطانِ الرَّجیمِ.

بەم جۆرە تا سیپارەکە تەواو دەبوو.

جا دەستی بە (جزءعم) دەکرد. پێنج شەش سوورەتیش بە حینجەیی دەخوێند. ئەو کاتە منداڵەکە فێرە حینجەیی دەبوو، پێویستی پێ نەدەما. بەڕەوانی لەدوای مامۆستای دەگوتەوە. سێ چوار (جزء)یش بەم جۆرە بە ڕەوانی دەخوێند. ئیتر بەبێ گوتنی مامۆستا بە خۆی دەچووە دوێ.

مامۆستاکە ئەو کاتە هەر گوێی بۆ ڕادەگرت. ئەگەر هەڵەی بکردبووایە پێی دەگوتەوە. ئەگەر زمانی نەچووبووایە سەر وشەیەك پێی دەگوت: حینجەیی بکە.

بەم شێوەیە قورئانی تەواو دەکرد.

نووسین و خەت واجب نەبوو. مامۆستاکە یا هەرگوێی پێنەدەدا، تا منداڵەکە بە خۆی هەستی دەکرد و دەستی دەدا قەڵەم و کاغەز و شتی دەنووسی، یا مامۆستاکە لە هەوەڵەوە پیتەکان، یا چەند وشەیێك بە خەتێکی خۆش لەسەر خەتی پەڕەکاغەزێك بۆ دەنووسی و داوای لە قوتابییەکە = (منداڵەکە) دەکرد بینووسێتەوە.

وشەکانیش بە زۆری لە دەرسی خۆیدا نەبوون، لەلا ڕابوون. لەبەر ئەوە بوو دەرسەکە قورئان بوو، بە پەسند نەدەزاندرا وشەی قورئان بکرێتە سەرمەشق و فڕێ بدرێتە سەر زەوی.

لەوەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بۆچی خەتی زۆربەی مەلاکان مام ناوەندی نەبووە. یا زۆر ناخۆش بووە، یا زۆر خۆش بووە. ئەوەی خەتی ناخۆش بووە لە هەوەڵەوە مامۆستاکەی هەوڵی لەگەڵ نەداوە، کە گەورەش بووە پێڕانەگەیشتووە، یا زەوقی لەسەر نەبووە. ئەوەی خەتی خۆش بووە سەرەڕای ئەوە مامۆستاکە هەوڵی لەگەڵ داوە نووسینەکەی لەسەر سەر مەشقێکی خەت خۆش بووە و لە چاوی کردۆتەوە و ڕاهێنانی زۆر لەسەر کردووە، تا فێر بووە.

***

نووسین ئەو کاتە بە زۆری بە قەڵەم قامیش و پەڕەسیخوڕ بوو. لەو دواییەدا نووکە قەڵەم پەیدابوو، کە وەك نووکی قەڵەم پەندان وابوو، لە قامیش، یا لە دار دەگیرا.

مورەکەب (حبر) فەقێکان بە خۆیان درووستیان دەکرد، یا لە شار دەیانکڕی. مورەکەبەکە بە زۆری ڕەش بوو. سوور کەسکیش هەبوو بۆ خۆش کردنی عیبارەتی کتێبەکان بە کاریان دەهێنا.

***

سەرەڕای ئەوەی مامۆستا زۆر ماندوو دەبوو، ماندووبوونەکەش بۆ یەك تاکە کەس بوو، چونکە ئەو کات خوێندن وەك ئێستا بە کۆمەڵ نەبوو، لەسەرەتای خوێندنی حینجەییدا بەو ڕێگایە دوو گیروگرفتی گرنگ دەهاتە پێش:

یەکەم: قوتابییەکە پێشتر (......َ) سەر و ژێر (......ِ) بۆر (......ُ) و زەنە (......ْ)ی نەدەخوێند دەبووایە مامۆستاکە لە کاتی حینجەیی دا فێری بکات. ئەمە سەری لەقوتابییەکە دەشێواند. ئەگەر چی لە پێش ئێمەدا سەر و ژێر و بۆر و زەنە لەگەڵ ئەلفبا دەخوێندرا بەڵام لە زەمانی ئێمە لە کاتی حینجەیی دا دەخوێندرا.

دووەم: سیپارەکە وەرەقەیێك بوو، تامنداڵەکە لێدەبۆوە بەلای کەمی دوو سێ جار دەدرا، سەر لە نوێ بۆی دەنووسراوە. کە شوێن و شێوە و قەبارەی پیت و وشەکان لە مەیان هەرچۆنێك بووایە جیاوازییان هەردەبوو لەگەڵ ئەوی تر. ئەمەش تا چەند ڕۆژێك دەبووە سەر لێ شێواند نێك بۆ قوتابییەکە.

مامۆستا ئەو هەموو ماندووبوونە و ئەزیەتەی لەگەڵ قوتابییەکە دەکێشا بە ختوخۆڕایی بوو. بەبێ هیچ جۆرە کرێیەك، تەنیا ئەگەر مامۆستاکە فەقێ بووایە، ماڵی لە گوندەکە نەبووایە ماڵی باوکی قوتابییەکە بە خوایشتی خۆیان ئەم جۆرە یارمەتییان دەدا: جلی دڕوونیان بۆ دەشوشت و ناوەناوە دەعوەتیان دەکرد و ماست و بەرە مەشکە و هێلکەیان دەدایە، جارجارەش وادەبوو کراس و دەرپێیان بۆ دەدووری، یا بۆیان دەکڕی.

ئەگەر مەلاش بوایە هێلکە و مریشك و ماست و بەرە مەشکە و دەعوەت بوو. واش دەبوو مامۆستاکە بە خۆی داوای شتی بەم شێوەی خوارەوە لە قوتابییەکە دەکرد: کە قوتابی دەگەیشتە (لای)یە مامۆستاکە دەیگوت:

لامە لفەلاێی،
سەرت بەکۆشی داێی،
بینە تەبەقەی مامۆستایێ.

یا کە دەگەیشتە (اهدنا) دەیگوت:
إهدنا،
سێ چوار هێلکە بۆ مامۆستات بێنە،
جوانیان ببرژێنە،
ئەگەر نەیخوارد هەر دوو چاوی دەربێنە.

(ويمنعونَ الماعونَ)،
بینە قالبێك سابوونە،
جلکی مامۆستاکەت دڕوونە.

(انّه کانَ توّابا)،
مریشکه ڕەشه سەوابا،
بۆ مامۆستاکەت کەبابه.

قوتابییەکـه ناچـار بـۆ بـەیانی بـۆی دەهێنـا، یـا کـه قوتابییەکـه لـه (سیپاره)، یاله (جزو) دەبۆوه مامۆستاکه داوای سـەرەقەڵەمانەی لێدەکرد. سەرقەڵەمانەش به زۆری خواردن بوو. پاره به هیچ جۆرێك له گۆڕێ نەبوو.

هـەر کاتێـك منداڵەکـه قورئـانی خـتم بکردبووایـه ماڵـه بـاوکی خێریـان دەکـرد: ئاژەڵێـك یـا دووانیـان دەکوشـتەوه و گۆشـتەکەیان بەسـەر ئاواییـدا دابەش دەکرد، یا دەیان کرده شیوو فـەقێ و مـەلا و خـەڵکی ئاواییـان بـانگ دەکرد و مەولوودیشیان لەسەر دەخوێندەوه.

شـیوەکەش شلەسـاوار بـه گۆشـت، یـا تـرش و پڵاوسـاوار، یـا تـرش و کەشکەك بوو.

کـه قوتابییەکـه دەسـتی بـه کتێـب دەکـرد دەچـووه نـاو فـەقێیان لـه گوندەکانی تر. ئەوه ئەگەر گوندەکەی خـۆی (فـەقێ)ی نەبووایـه ئـەگینا بـه زۆری هەر له گوندەکەی خۆی دەیخوێند.

فەقێ که دەرسـی دەخوێنـد زۆر بـه ئـەدەب لەسـەر چـۆك دادەنیشـت. مامۆستاکه دەرسەکەی شەرح دەکرد، قوتابییەکه ئەگـەر موسـتەعید بووایـه کوێی خۆی بۆ ڕادەگرت و دەیگوت:

- بـەڵێ، یـان قوربـان. تـەنیا ئەگـەر تـێ نەگیشـتبووایه پرسـیاری لێدەکرد،.

ئەگەر سوختەش بووایه قسەکانی مامۆستاکەی دووبـاره دەکـردەوه تـا تێدەگەیشت. که مامۆستاکه هەڵدەستا فەقێکه، کەوشەکانی بۆ دادەنا.

**ئەو کتێبانەی کە پێش چینی ئێمە دەخوێندران بە زۆری ئەمانە بوون:**

ڕیزنووسی (لیستە)ی ئەو کتێبانەی کە کاتی خۆی لەناو فەقێیان دەخوێندران پێش چینی ئێمە، لە دەشتی هەولێر. جگە لە فارسی. ئەمانە بوون:

| ژمێرە | ناوی کتێب | بابەت |
| --- | --- | --- |
| ١- | عەقیدە – کوردی | علم العقائد |
| ٢- | احمدیە | فەرهەنگ = عەرەبی – کوردی |
| ٣- | عوامل الجرجانی | علم النحو |
| ٤- | تصریف زنجانی – کوردی | علم الصرف |
| ٥- | بناء | علم الصرف |
| ٦- | سعدالله الصغیر | علم النحو |
| ٧- | عوامل پاش إظهار | علم النحو |
| ٨- | فتح القریب | علم الفقه |
| ٩- | الزبد | علم الفقه |
| ١٠- | أجرمیە | علم النحو |
| ١١- | أنموذج | علم النحو |
| ١٢- | مراح الأرواح | علم الصرف |
| ١٣- | سعدینی | علم الصرف |
| ١٤- | عزی | علم الصرف |
| ١٥- | مقصود | علم الصرف |
| ١٦- | شرح المغنی | علم النحو |
| ١٧- | أظهار البركوی | علم النحو |
| ١٨- | سعدالله الكبیر | علم النحو |
| ١٩- | تصریف ملا علی | علم الصرف |
| ٢٠- | الصمدیة | علم النحو |

| | | |
|---|---|---|
| ٢١- | الاستعارة | علم البيان |
| ٢٢- | الوضع | علم فقه اللغة |
| ٢٣- | جامى على الكافية | علم النحو |
| ٢٤- | ايساغوّجى | علم المنطق |
| ٢٥- | مغنى الطلاب | علم المنطق |
| ٢٦- | فنارى | علم المنطق |
| ٢٧- | محمد امين الجهة الوحدة | حاشية على الفنارى |
| ٢٨- | قول احمد | حاشية على الفنارى |
| ٢٩- | عبدالله يزدى | علم المنطق |
| ٣٠- | فتح المعين | علم الفقه |
| ٣١- | اعانه الطالبين | علم الفقه |
| ٣٢- | سيوطى | علم النحو |
| ٣٣- | ابو طالب | علم النحو |
| ٣٤- | كلنبوى آداب | علم الآداب |
| ٣٥- | عصام الدين الاستعارة | علم البيان |
| ٣٦- | كمال على الشافية | علم الصرف |
| ٣٧- | عصام الدين الوضع | علم فقه اللغة |
| ٣٨- | سيد عبدالله على الشافية | علم الصرف |
| ٣٩- | شرح الشمسية | علم المنطق |
| ٤٠- | شرح العقائد النسفى | علم الكلام |
| ٤١- | شرح العقائد ملا جلال | علم الكلام |
| ٤٢- | مغنى المحتاج على المنهاج | علم الفقه |
| ٤٣- | كلنبوى برهان | علم المنطق |
| ٤٤- | مختصر على التلخيص | علم البلاغة |
| ٤٥- | مطول على التلخيص | علم البلاغة |
| ٤٦- | تحفة المحتاج على المنهاج | علم الفقة |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٧- | لب الأصول | علم اصول الفقه |
| ٤٨- | جمع الجوامع | علم اصول الفقه |
| ٤٩- | مختصر المنتهى | علم اصول الفقه |
| ٥٠- | تهذيب الكلام | علم الكلام |
| ٥١- | شرح المواقف | علم الكلام |
| ٥٢- | شرح المقاصد | علم الكلام |
| ٥٣- | شرح المطالع | علم الكلام |
| ٥٤- | مغنى اللبيب | علم النحو |
| ٥٥- | قاضى اللارى | علم الفلسفة |
| ٥٦- | شرح چخمينى | علم الفلسفة |
| ٥٧- | تشريح الافلاك | علم الهيئة والفلك |
| ٥٨- | الرسالة في الحساب | علم الرياضيات |
| ٥٩- | اشكال التأسيس | علم الهندسة والرياضيات |
| ٦٠- | كشاف | علم تفسير القرآن |
| ٦١- | مدارك | علم تفسير القرآن |
| ٦٢- | ابن العابدين | علم الفقة |

جگه لەو کتێبانە گەلێ کتێبی تریش ماون بەڵام زۆربەیان شەرحی ئەو کتێبانەی سەرەوەن و کەمیان دەخوێندران بۆیە بە پێویستم نەزانی ناویان بهێنم.

لە زەمانی ئێمەدا جگە لەوەی کە فارسی نەدەخوێندرا کتێبەکانیش کەم کرابوونەوە. کە بە زۆری ئەمانە بوون بە تەسەلسول:

| ژمارە | ناوی کتێب |
|---|---|
| ١- | عەقیدە |
| ٢- | احمدیة |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٧- | لب الأصول | علم اصول الفقه |
| ٤٨- | جمع الجوامع | علم اصول الفقه |
| ٤٩- | مختصر المنتهى | علم اصول الفقه |
| ٥٠- | تهذيب الكلام | علم الكلام |
| ٥١- | شرح المواقف | علم الكلام |
| ٥٢- | شرح المقاصد | علم الكلام |
| ٥٣- | شرح المطالع | علم الكلام |
| ٥٤- | مغنى اللبيب | علم النحو |
| ٥٥- | قاضى اللارى | علم الفلسفة |
| ٥٦- | شرح چخمينى | علم الفلسفة |
| ٥٧- | تشريح الافلاك | علم الهيئة والفلك |
| ٥٨- | الرسالة في الحساب | علم الرياضيات |
| ٥٩- | اشكال التأسيس | علم الهندسة والرياضيات |
| ٦٠- | كشاف | علم تفسير القرآن |
| ٦١- | مدارك | علم تفسير القرآن |
| ٦٢- | ابن العابدين | علم الفقة |

جگە لەو کتێبانە گەلێ کتێبی تریش ماون بەلام زۆربەیان شەرحی ئەو کتێبانەی سەرەوەن و کەمیان دەخوێندران بۆیە بە پێویستم نەزانی ناویان بهێنم.

لە زەمانی ئێمەدا جگە لەوەی کە فارسی نەدەخوێندرا کتێبەکانیش کەم کرابوونەوە. کە بە زۆری ئەمانە بوون بە تەسەلسول:

| ژمارە | ناوی کتێب |
|---|---|
| ١- | عەقیدە |
| ٢- | احمدية |

٣- عوامل الجرجانى
٤- بناء
٥- عوامل پاش إظهار
٦- فتح القريب
٧- أجرمية
٨- انموزج
٩- مراح الأرواح
١٠- اظهار البركوى
١١- فعل سعدالله
١٢- تصريف ملا على
١٣- الاستعارة
١٤- وضع. تا ئێره فەقێ لە هەموو شوێنێك سوختە بوو
١٥- جامى
١٦- ایساغۆجی
١٧- مغنى الطلاب
١٨- فنارى
١٩- عبدالله يزدى
٢٠- فتح المعين
٢١- سيوطى
٢٢- اعانة الطالبين
٢٣- كلنبوى آداب
٢٤- عصام الدين الاستعارة. ئەلێرە پلەی نیمچە موستەعیداتی بوو.
٢٥- كمال على الشافية
٢٦- شرح الشمسية
٢٧- شرح العقائد

٢٨- مغني محتاج

٢٩- مختصر على التلخيص

٣٠- جمع الجوامع

٣١- كلنبوي برهان

٣٢- تهذيب الكلام

٣٣- تحفة المحتاج

٣٤- قاض اللاري

٣٥- شرح چخميني

٣٦- تشريح

٣٧- بيضاوي

٣٨- مدارك

لەو بەشەیدا چەند تێبینییەك دێتە پێش بە پێویستم زانی لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا بۆتانی دەربخەم:

أ- لە حەفتە (٥) ڕۆژ دەرس دەخوێندراو (٢) ڕۆژ، جومعە و سێشەم نەدەخوێندرا عوتلەبوون.

بابزانین بۆچی ڕۆژی سێشەممان عوتلە بوو: گوایە ئیمامی عومەر جارێك لە ڕۆژی سێشەممە ڕێی دەكەوێتە شارێك فەقێكانی شارەكە ئەو ڕۆژە دەرسی خۆیان دەچوێنن بە پیرییەوە دەچن.

ئیمامی عومەریش لەبەر خاتری ئەوان بڕیار دەدا كە ڕۆژی سێ شەممانیش وەك ڕۆژی جومعە دەبێ عوتلە بێت.

ئەمە بەڵگەیەكی باوەڕ پێكراو نییە، لەبەر ئەوە ئەو كاتە فەقێ نەبوونە. بەڵام بیری مرۆڤ بۆ بەڵگەیەكی لەگێن تر دەچێت كە ئەمەیە:

خوێندنی فەقێیان سەرەڕای ئەمە كە زۆر ناخۆش بووە لەبەر كردنیشی ویستووە لە توانای فەقێكاندا نەبووە هەفتەی (٦) ڕۆژ لەسەریەك دەرس

بخوێنن و لەبەریشی بکەن. بۆ ئەوەی مێشکیان لە خوێندن بحەسێتەوە ڕۆژی سێشەممەیان کە لە ناوەڕاستی ڕۆژەکانە کردۆتە عوتلە.

ب-لەو ڕۆژەی کە منداڵ دەستی بە سیپارە دەکرد، تا لە قورئان دەبۆوە ڕۆژێ دوو دەرسی دەخوێند. دانی سبیانێ دەرسێك، دانی ئێوارەش دەرسێك. بەڵام کە دەستی بە کتێب دەکرد واتە کە دەبووە سوختە ڕۆژێ دەرسێك بوو.

مانای عیبارەتی کتێبەکان بە گوێرەی منداڵەکە زۆر قورس و ناخۆش بوو. بە هەزار ناڵی عەلی تا ڕەوانی دەکرد.

سەرەڕای ئەمەش هەروەکو گوتم ڕۆژێ بە ڕۆژێ چی بخوێندبووایە دەبووایە (ئەزبەری) بکردبووایە. بۆیە نەیدەتوانی لە دەرسێك زیاتر بخوێنێت.

موستەعیدیش هەروا، نەیدەتوانی لە دەرسێك زیاتر بخوێنێت ئەگەرچی ئەزبەری نەدەکرد، بەڵام ئەو دەرسەی کە ڕۆژێ بە ڕۆژێ دەیخوێند ئێوارەی پێشتر دەبووایە نزیکەی دوو سێ سەعات سەیری بکردبووایە، کە پێیدەگوترا: (مطالعة = تەحزیر) بۆ بەیانی زیاتر لە دوو سەعات قڕەقڕی لەگەڵ مەلا دەکرد تا تێدەگەیشت. سەرەڕای ئەمەش کە دەرسی بە سوختان دەگوت ئەویش چاو پێ خشاندنێکی دەویست. دەرسەکەش نزیکەی سەعاتێك، یا سەعات و نیوێکی دەبرد.

ئەوە ئەگەر موستەعیدەکە یەك سوختەی هەبووایە ئەگینا زیاتر کاتی دەویست، ئەگەر سێ چوار سوختەی هەبووایە.

بەڵێ وادەبوو لە (١٠٪) چ سوختە، چ موستەعید زرووفی بۆ دەرخسا ڕۆژێ دوو دەرسی دەخوێند.

دەرسی دووەم کە پێی دەگوترا (فائز) شەرع و تەفسیر بوو. یاخۆ فەقێ هەبوو ڕۆژی سێشەممان دەرسە فائیزەکەی دەخوێند.

جـ- دەرس گوتن بە سوختە و موستەعیدان جودا بوو. سوختە لە سەرەتادا بوو. مامۆستاکە دەبووایە عیبارەتەکە و واتاکەی پێکەوە

فێربکردبووایە، کەچی موستەعید پێویستی تەنیا بە واتاکە هەبوو. ئەویش بە خۆی بە هۆی تەحزیر = (مطالعة)ەوە نزیکەی نیوەی زیاترساغ دەکردەوە.

تەنیا هەر گوێی بۆ مامۆستاکە ڕادەگرت و دەیگوت:

بەڵێ، یا بەڵێ قوربان.

ئەگەر تێ نەگەیشتبووایە پرسیاری لێدەکرد.

د- فەقێ لە (١٢)ساڵ، تا (١٦، ١٧) ساڵی دە خوێند.

هـ- دەرسەکان لە هەموو پلەیەك بە کوردی شەرح دەکران.

بەڵام وشەی عەرەبییان زۆر بەکار دەهێنا.

و- شەوان لەبەر (مطالعة)ی موستەعیدەکان ژووری حوجرە بێدەنگ بوو. واتدەزانی چۆڵە و کەسی تێدا نییە. کەچی ژووری مزگەوت، یا دەرەوەی لەبەر دەورکردنەوەی سوختەکان دەبووە هەڵلا.

ز- فەقێ گوێیان زۆر بە خوێندنی شەرع نەدەدا، گوایە ئەوەی عیلمەکان بزانێت بە خۆی، بەبێ مامۆستا شەرع دەزانێت.

ح- مەلای باش و خراپ بە موستەعیدی باش و زیرەك دەردەکەوت. ئەگەر مەلاکە بە هەڵە دەرسەکەی بگوتبووایە و موستەعیدەکە بۆی نەدەسەلماند و یەکسەر دەچووە دوڕچاوی. موستەعیدەکە جارێك، دووان لە مەلاکەی دەبووری کە دەبووە سێیەم کەڕەت بڕوبزگۆڕی تێك دەنا و دەچووە لای مەلاییێکی تر.

کەچی مەلای باش وەك دەریا وابوو موستەعیدەکە هەرچەند پرسیاری لێ بکردبووایە حەیر نەدەما و قەناعەتی پێدەهێنا.

جاریش وادەبوو دەکەوتنە قرەقرِ، بەتایبەتی ئەگەر موستەعیدەکە لەدوا پلەدا بووایە. ئەو کاتە ئەویش مەلا بوو. وادەبوو لەو قرەقرە مەلاکە توورە دەبوو، قسەی بە موستەعیدەکە دەگوت.

موستەعیدەکە ئەگەر لەبەر دڵی بووایە، یەکسەر دەڕۆیشت.

ط- سەعی کردن:

سەعی کردنی فەقێیان سێ جۆر بوو:

یەکەم: موتالەعە (مطالعة) کە پێشتر لێی دووام و گوتم: موستەعید پێیهەڵدەستا.

دووەم: لەبەرکردن: کاتێ فەقێکە دەرسەکەی ڕەوان دەکرد لای مامۆستاکە هەڵدەستاو دەچوو ئەزبەری دەکرد. ئەمەش بە زۆری سوختە پێهەڵدەستا. چونکە ئەو کتێبانەی کە سوختە دەیخوێندن سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەیان گچکە و مەتن بوون و شەرح نەبوون، دەستوور و قاعیدەی عیلمەکانیان تێدابوو، نەك هەر سوختە بەڵکو موستەعیدیش نەیدەتوانی بە یەك جاری دەست بەرداریان بێت. بۆیە ئەو موستەعیدانەی کە لە ئاخر و ئۆخری خوێندندا بوون هەرگیز نەیان دەهێشت کتێبە گرینگەکانی کاتی سوختاتی خوێند بوویان لەبیر بچێتەوە.

سێیەم: دەورکردنەوە: واتە پێداچوونەوەی عیبارەتی ئەو کتێبانەی کە لەبەری بوون. دەوریش بە زۆری لە شەوان لە دوای چا خواردنەوەی ئێواران بووە. ڕۆژێ لەبەر ئیشی حوجرە و دەرس خوێندن و لەبەرکردن سوختەکە بۆی نەدەلوا.

فەقێ لە کاتی دەورکردنەوەدا، لەشوێنێکدا، دەهات دەچوو. هەر عیبارەت جووینەوە نەبوو، بەڵکو لەگەڵ خوێندنەوە واتاکەشی دەهێنایەوە یادی خۆی. بەڵام ئەگەر واتاکەی یا عیبارەتەکەی لەبیر بچووبایەوە، ئەمەی بە درێژکردنەوە دەگوت: (ئارێ .. بابە ...). تا واتاکەی عیبارەتەکەی دەهاتەوە یاد.

مەبەست لە وشەی (بابا) دەرگا بووە. کە ئیمامی عەلی دەکات. ئەمەش لەم وتەیەی پێغەمبەر (د . خ). وەرگیراوە: (أنا مدينة العلم وعلي بابها).

ی- لەبەر ئەوەی لە خوێندنی فەقێیان تاقی کردنەوە لە گۆڕێ نەبوو، خوێندنی کتێبەکان جەبری بە خۆوە نەگرتبوو. فەقێ بە کەیفی خۆی بوو، سەربەست بوو، مامۆستا لەم بارەیەوە هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو. مەگەر لە ڕێگەی ئامۆژگارییەوە بیگوتبووایە: فلان کتێب سوودی زۆرە و پێویستە بخوێندرێت.

فەقێ هەبوو هەموو کتێبەکانی دەخوێند، هەش بوو هەندێکی بازدەدان یا بە نیوەچلی بە جێی دەهێشتن، یا بە سەماع کردن (٢) ڕایدەبواردن.

ك- مەلای دوانزە عیلم: لەناو کوردەواریدا ئەگەر مەلایەك ناوبانگی باشی دەربکردبووایە دەیانگووت: مەلاییێکی تەواوە و دوانزە عیلمە.

مەبەست ئەم دوانزە عیلمە بووە:

١- النحو

٢- الصرف

٣- البلاغة: بە هەر سێ بەشەوە.

٤- الفقه

٥- أصول الفقه

٦- المنطق

٧- الآداب

٨- الکلام

٩- الفلسفة

١٠- الهیئة والفلك

١١- الریاضیات والهندسة

١٢- فقة اللغة

***

## بەشی حەوتەم

**ئیجازە:**

ئیجازەی مەلایەتی لە شێوەی تەریقەتی شێخانە: لە پێغەمبەرەوە (د. خ) پشت بە پشت هاتۆتە خوارەوە، تا دەگاتە ئەو مەلایەی کە ئیجازەکەی دەدات.

مەلا هەرچەندە پلەی زانیاری بەرزبێت و تەدریس بکات ناتوانێت ئیجازە بدات، تا ئیجازە لە یەکێکی تری موجاز وەرنەگرتبێت.

هـەر فـەقێیێك ئیجـازەی درایــێ واتــە مامۆسـتاكەی كردییــە مـوفتی و دەتوانێت لەناو موسلمانان فتوا بدات.

كە ئیجـازە دەدرا چـەند ڕۆژێـك پێشـتر وەك زەماوەنـد لـە دواى فـەقێ و مـەلای گونـدەكانی دەوروپشـت دەگێـڕدراوە. موسـتەعیدێك تـا چـوار پێـنج موستەعید دەیانتوانی پێكەوە ئیجازە وەربگرن.

ئیجازەییێـك لـە ڕێكـەوتی ٣ / ١١ / ١١٤٩دا لـە گونـدی چـەغەمیرە درا، موستەعیدێك كە ناوی (مەلا عومەر شێروانی) بوو.

لـە دوای فـەقێ و مـەلای ئـەو گوندانـە گێـڕدراوە (لهێبـان، قـەپڵان، سەرگەڕان، پەلكانە، قووچ، سەربەشاخ، جاستان — كەنداڵەقەل — كەنداڵ — لاوەر — كۆزەپانكـە — خورمەڵـە — چـل هـەوێزە — مـەخموور — دیبەگـە — پـیرداود — دووگوردكـان — عەوێنـە. دووسـەرە — عـاڵڵا — شـێخ شـەروان، سووریژە — تەلەل خێم). جگە لە مەلای ئەو گوندانـەی كـە فـەقێیان نـەبوو، چەند كەسی دیاری ناوچەكە.

دوو شەو و دوو ڕۆژ، یا دوو ڕۆژ و شەوێك دەمانەوە.

جگە لە مەسرەفی خواردنی ئەوەندە كەسە، جوبە و مەندیل (عەمامـە)ی موستەعیدە موجازەكەش لەسەر ئاغای گوندەكە بوو، كە ناوی (كانبی ئاغـا) بوو.

پێشتر كانبی ئاغا دەستی كورت بوو حـاجی جوكـل و فتـاح ئاغـای بـرای یارمەتی ئیجازە دانیان دەدا.

ئێوارەی یەكەم شلەساوار بە گۆشت بوو، بەیانی نان و ماست، یـا هێلكـە بوو. نیوەڕۆش پڵاوبرنج و ترش و گۆشت بوو.

هیچ جۆرە ئەركێك لەسەر شانی جوتیارەكان نەبوو. تەنیا نوین و قـاپ و قاچاغ لە ئاوایی خڕدەكرانەوە، یـاخۆ دنیـا كـە سـارد بووایـە لـە دیوەخـان و مزگەوت و حوجرەكان جێگا نـەدەبۆوە چـەند كەسـانێك بـۆ نووسـتن بەسـەر ئاواییدا دابەش دەكران.

ڕۆژی ٢ / ١١ ساڵی ١٩٤٩ دانی ئێوارە خەڵکەکە هاتن، فەقێ میوانەکان کە دەگەیشتنە بەر ئاوایی دەستیان بە بەستە و چەپڵەلێدان دەکرد. فەقێ خانەخوێیەکانیش بە بەستە و چەپڵەلێدان پێشوازیان دەکردن.

ئەو ڕۆژە دوای نوێژی عەسر یەکیان کردە پاشا، کڵاوێکی درێژی ڕەنگاو ڕەنگیان لەسەر نا. کڵاوەکە لای سەرەوەی وێنەی دەستێکی لێکرا بوو. لێی نووسرابوو: (يد الله فوق أيديهم). یەکێکیش بەردەستی دەکردن و سەرپەرشتی ئاهەنگەکەی دەکرد. واتە (عەریف حەفل) بوو.

ئەو کەسەی لە ئیجازەکەدا بووە (پاشا) خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا خدری شەمامەڵی) بوو.

وەزیرەکانیش یەکیان خولێخۆشبوو مامۆستا (مەلا محەمەدی شێروانی) بوو، ئەوی تر خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا شەریفی عاڵلا) بوو. ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی دەکرد خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا محەمەدی عەلیاوە) بوو.

هەرچی لە ئاهەنگەکەدا بوو بە لاییدە و خۆیی و خەڵکی ئاوایی بوونە پێنج شەش ڕیز، لە ڕیزی پێشەوە پاشا و وەزیرەکان بوون. دوو فەقێ خەنجەری ڕووتیان بەدەستەوە گرتبوو. لە پشت پاشا ڕایان گرتبوو. فەقێیەکیش بۆڕییێکی سەماوەری لەدەست بوو، لەجیاتی مەدفەعی لەدوای خەنجەر لە دەستەکانەوە دەڕۆیشت.

چەند فەقێیێکی بەوەج کورتەکیان لەجیاتی بەنتلۆن لەپێ کرد بوو. بەبێ جەمەدانی کڵاویان بە وەرگەڕایی و لاتیوی لەسەر نابوو. هەریەکەیان پشتێنێکیان بە توندی بادا بۆوە، وەك قامچییان لێکردبوو. ئەوانە زەفتییە (شورتە) بوون. بەرپرسیاری ڕێك و پێكی ڕیزەکان بوون. نەیاندەهێشت بە هیچ جۆرێك کەس بەملا و بەولادا بچێت، یاخۆ بەپێش ڕیزی پاشا بکەوێت. هەر یەکێك بە پێچەوانە پەیڕەوی بکردبووایە، جا هەر کەس بووایە بە قامچییان دەیان بردەوە ڕیزەکان.

قامچیشیان بە هەر کەسێك بکەوتابووایە جێگاکەی شووی دەبەستا. بۆیە کەس نەیدەوێرا ڕیز تێك بدات.

دوو (فەقێ)ی تر هەر یەکەیان لە جیاتی ڕەشاش بۆڕی سەماوەریان لە دەست گرتبوو. پڕی ناویان بەردە وردە کردبوو. هەر کەسێك، یا منداڵێك بە پێش بکەوتایە دەکەوتنە دوای و بە بۆڕییەکان بەردەکانیان تێدەگرتن و وەك ڕەشاش خڕەخڕیان لێوە دەهێنان.

دکتۆرێك فەڕاشێکی لەگەڵ دا بوو. فەڕاشەکە سینییەکی لەسەر سەری دانابوو کەل و پەلی دکتۆری و دەرمانی تێدابوو. کە بریتی بوون لەمانە: (ئارد، هەویر، ڕەژوو = (خەڵوون)، قشپل، مەسینەیەکی پڕ ئاو، بۆڕییەکی سەماوەر).

ڕیزی پێشەوە چەپڵەیان لێدەدا و بەستەیان لەگەڵ دەگوت و دەشیانگێڕاوە، لە ڕیزەکانی تر هەر چەپڵە لێدان بوو.

بەم جۆرە فیتە بە دەورەییێکی هەر چوار لای ئاوایی یان کرد. تا گەیشتنەوە ساکە گۆڕێکی نزیك حوجرە. ئەو کاتە بە فەرمانی زەفتییەکان لێکرا بە خری و یەك ڕیز دانیشتن.

لەبەر زەفتییەکان کە سەر پەرشتیان دەکرد کەس نەیدەوێرا لە جێگەی خۆی هەستێتەوە، یا ڕیزەکە تێك بدات. سێ کورسیان لە ڕیزی یەکتر دانا. کورسی ناوەڕاست پاشا لەسەری دانیشت، کورسی ئەملا و ئەولا وەزیرەکان بوون. دوو خەنجەر لە دەستەکە و لەگەڵ مەدفەع چییەکە لە پشتەوەی پاشا ڕاوەستا بوون. دوو ڕەشاش لە دەستەکانیش لەملا و لەولا بوون.

دکتۆریش کەل و پەلی خۆی لە نزیك ئەوان دانابوو، لەسەر کورسییێك دانیشتبوو.

زەفتیەکانیش هەر چاوێکیان کردبووە چوار چاو، نەبادا یەکێك بێتە ناوەڕاستی یارییەکە، یا هەستێتەوە.

به فەرمانی پاشا جگەرە پێشکەش بە پیاوە ڕدێن سپی و مەلا گەورەکان کرا. جگەرەکە بریتی بوو لە چیلکەدارێکی باریك، کەرتە قەرسەقولی پێوە کرابوو. دەبووایە قومیش لێ بدەن.

تا یەك لە کاتی قوم لێداندا گوتی: پەح پەح، چ تووتنێکی بۆندار و زۆر خۆشە ..!؟.

عەریف حەفلەکە لە ناوەندی خەڵکەکە ڕاوەستا و پڕ بە زاری هاواری کرد و گوتی:

مژدە، مژدە ئەی خەڵکینە، مزگێنییەکی زۆر خۆش: لەوەتی دنیا دنیایە حکومەتی وەك ئەو حکومەتەی ئێمە دادپەروەر و عادیل نەهاتووتە سەر ڕووی زەوی. بەڵام بەداخەوە (قەوان)ی یەکجار زۆرە و (گولله)شی نییە. بۆیە پێویستی زۆر بە پارە هەیە. جا ئەو کەسانەی دەوڵەمەند و پارەدارن و دەیانەوێت حەقێك بکەن بە ناحەق، یا بە پێچەوانەوە با بێنە پێشەوە و دەرگەی حکومەت بۆ ئەم جۆرە کەسانە هەر دەم لەسەر پشتە. ئێمە زۆر بە شانازییەوە پێشوازیان دەکەین و بە زووترین کات کاروباریان بۆ ڕادەپەڕێنین. بەڵام ئەو کەسانەی کە ڕەش و ڕووت و بێنەواو پارەنە و زوڵمیان لێکراوە ڕەزایان لای دەسەڵات داران قورس و گرانە. پێویست بە هاتنیان ناکات و داواکانیان پشت گوێ دەخرێت.

***

**شکایەت:**

پیاوێك چووە لای پاشا و شکایەتی لە (کانەبی)ی ئاغای گوندی کرد و گوتی:

- کانەبی ئاغا کەری منی فەساد کردووە.

زەفتییەکان چوون (کەرەکە) بریتی لە کابرایەك و لەگەڵ کانەبی ئاغایان هێنا.

دختۆر لە هەوەلەوە کابرای ببووە کەر لەسەر پشتی ڕاکشاند و بە بۆڕی سەماوەر ناولنگانی فەحس کرد و گوتی:

- بەڵێ ڕاستە و هەر دوو شتەکەی کردووەتە یەك. بەسەزمانە و دەبێ تیمار بکرێت.

دختۆر دەمی خۆی پڕ ئارد و ئاو کرد و سەری بۆرییەکەی بەنێو دەلینگی شەڵواری بردە نزیك عەورەتی و ئەوەی نێو دەمی پرژاندە نێو گەلانی و چەند قلە قشپلی دایە و گوتی:

- دەبێ ئەو حەبانە ڕۆژی سێ جاری بدرێتێ.

کانەبی ئاغایان هێنا و لەسەر گازەرەی پشتیان درێژ کرد.

دختۆر بۆڕی سەماوەری بۆ نێو گەلانی شۆڕ کردەوە و گوتی:

- بەڵی ڕاستە کەرەکەی دەعەمەل هێناوە.

پاشا بڕیاریدا خاوەن کەربچێت، لە تۆڵەدا کەری کانەبی ئاغای فەساد بکات.

کابرا سەری بادا و ناچار گوتی:

- بە خوا بابە حوکمێکی عەدالەتە لۆێی ئەوا من لە حەقی خۆم خۆشبووم و کەری ئەو فەساد ناکەم.

***

**بۆ شەوێ دوای نوێژی عیشا ئەم دوو یارییە کران:**

یەکەم: ورچ و مەیموونانێ. ئەمەش بەم جۆرە بوو: دوو فەقێ وەك گیاندار داوەرانەوە و یەکیان تەنگەی ئەوی تری گرت و جاجمێکیان بەسەردا دابوون گوایە ورچە .. پەتێکیان لە ملی ئەوەی پێشەوە کردبوو، یەك سەری پەتەکەی بە دەستەوە گرتبوو، شوولە دارێکیشی بە دەستەوە.

یەکی تریان دەموچاویان بە تەنی ڕەش ڕەش کردبوو. گوایە مەیموونە، پەتێکی لەمل کرابوو، ئەویش سەری بەدەست یەکێکەوە بوو، ئەوەی ورچەکەی لەدەست بوو بە شوولکەکە لە ورچەی دەدا و مەقامێکی لەگەڵ دەگوت.

ورچەکە و مەیموونەکەش هەر دوو جوان لە نزمی مقامەکە هەڵدەپەڕین. بەڵام هەڵپەڕینی ورچەکە بە زۆری بۆ ئەم مەبەستە بوو:

پێلەقەی لەو کەسانە دەدا کە لە ریزەکانەوە چوارچمکی دانیشتبوون، یا لاقییان درێژ کردبوو، یا جێگەیان زۆر گرتبوو. جا کەس لەو کاتەدا نەیدەوێرا لەسەر چۆك بترازێت بە جۆرێکی تـر دابنیشـێت. دوا جـار مەیموونەکـە خـۆی هەڵدا سەر پشتی ورچەکە و چوونە دەرەوە.

***

**دووەم: ئاشەوانانێ:**

کە ریزەکان بـە جـوانی دانیشـتن ئاشـەوانانێ دەسـتی پـێ کـرد. کـابرای ئاشەوان بالیفێکی لەسەر زگی خۆی دانابوو تا ورگن ببێت. هات لـە ناوەنـدی خەڵکەکە لەسەر گازەرەی پشت لێی نووست. کورێکی مێردمنداڵی هـەبوو لـە دیار ئاشەکە، کە دوو سێ تەنەکە بـوو، لەسـەر یـەکیان دانـابوون، دانیشـت. باوکیشی پرخە پرخی لە دوورڕا دەبیسترا.

یەکێك هاتە لای کوڕەکە و گوتی: (من باراشهێڕم و هاتوومە باراشم بـۆ لێ بکەن).

کوڕەکە بە داران وەرگەڕا زگی باوکی و هـەر جـارێ لێیـدەدا و دەیگـوت: بابە، بابە.

تا باوکی بەخەبەر هێنا و گوتی:

- هەستە باراش هاتووە.

ئاشەوان ڕووی لە باراشهێڕ کرد و گوتی:

- باراشەکەت چییە و لە چیت بار کردووە؟.

باراشهێڕ گوتی:

- بارەکەم نیسکە، وڵاخەکەم گیسکە.

ئاشەوان ڕوو گرژ کرد و گوتی:

- ئاشەکەم بەردەکانی کول بوونە و بیرازیان دەوێت ئەمڕۆ پێمناکرێت.

باراشهێڕێکی تر هات و گوتی:

- باراشەکەم مزاشە و وڵاخەکەم جاشە.

ئەویشی ڕەوان کردەوە.

یەکێکی تر هات و گوتی:

- کەرم پێیە و باراشەکەم جۆیە.

باراشهێڕ بە هەشتاوییەوە گوتی:

- ماکەرە، یان نێرەکەرە؟.
- نێرەکەرە.

ئەویشی بە نائومێدی ڕەوان کردەوە.

دواجار بارشهێڕێك هات و گوتی:

- بارەکەم گەنمە و کەرەکەشم ماکەرە.

ئاشەوان یەکسەر قیت بووەوە و باراشەکەی بە گوراح خۆشییەوە لەگەڵ هێنا خوارەوە و کوڕەکەی و باراشهێڕەکەی بە باراش لێکردن خەریك کردن و بە خۆشی چووە گژ ماکەرەکە. (بریتی بوو لە پێاوێك). هەرکە باراشهێڕەکە دێتە دەرەوە دەیبینێت و دەڵێت: کوڕە ئەوە چدەکەیت!؟.

ئاشەوانەکە یەکسەر بەرەو قیبلە دادەنیشێت و دەڵێت: التحیات و المبارکات و.....

***

ڕۆژی دوایی چێشتانێکی قایم خەڵکەکە لێکرا لەسەر سەکۆی دیوەخان دانیشتن. موستەعیدە موجازەکە: خوالێخۆشبوو: (مامۆستا مەلا عومەری شێروانی) بوو. پاش خۆشوشتن و سەر و ڕیش تاشین بۆ یەکەمجار جوبەی لەبەر کرد و مەندیل و کڵاوێکی سپی لەسەر ناو لەناوەڕاستی خەڵکەکە، لەسەر رایەخێك، بەرامبەر بە مەلا موجیزەکە، مەلای ڕەش بوو، دانیشت.

یەکێکی دەنگ خۆش نەختێك قورئانی پیرۆزی خوێند. پاش قورئانەکە مەلای ڕەش لەسەر چۆك ئیجازەنامەکەی بە دەنگێکی بەرز و ڕەوان، دوای ئیمزاکردنی خوێندەوە بەعەرەبی.

ئەمەش ئیجازە نامەکەیە بەزمانی عەرەبی. دوای مۆرکردنی لەلایەن سێ مەلای موجیز کە ئەمانە بوون: (مامۆستا مەلا ئەبووبەکری دووگردکان و مامۆستا مەلا ئیسماعیلی دیبەگە و مامۆستا مەلا محەمەدی شێروانی). ئەمەش لە ڕۆژی (١٩٤٩/١١/٣)دا بووە:

(... أما فيقول خادم تراب أقدام العلماء والفضلاء أفقر العباد الى الله الغنيّ احمد بن عبدالرحيم الموسوم بالباني. العلم لواء قدره موضوع لايوضع. وإن ممن أهتدىبنور الله الى الصعود في نماذج هذه المرتبة دون أقرانه ونجلّى عليه انجم السعود من رصد النظر الى هذه المنقبة دون أخوانه نائل هذه النميقة وحاصل هذه الوثيقة العالم العامل والفاضل الكامل قد بذل شطر أيام دهره وصرف معظم ريعان عمره نحو اقتناء شوارد الرسوم العقلية واجتناب العلوم النقلية وطوى رداء شبابه لأحراز الفنون وجاب مفاوز الشدائد للوصول الى السر المكنون. ثم صاحبنا مدة من الأزمان وبرهة من الأول. واشتعل فيها عندنا بقراءة كتب معتبرة مطولة ومختصرة حتى تحقق لدينا انه عرج معارج التحقيق واعتلى على سنام مدارج التدقيق. وقد التمس من الفقير المعترف بالذنوب والحقير المقترف للخطايا والعيوب ان يجيزه بتدريس العلوم ونشر الرسوم وذلك منه حسن ظن وان كنت لست أهلا لأن الحق بالعلماء في علم من العلوم وفن فسارعت لسؤاله وبادرت الى تحقيق أماله برجاء الأنتظام سلك العلماء الأكابر فأنجزنا له تدريس فوائد من الفروع والأصول وبسط موائد الرسوم من المنقول والمعقول. وشهدنا له بالفضل التام. وأنه حقيق لأن يعد من الأعلام كما أجازني رديف المتقدمين وامام المتأخرين وحيد أوانه وفريد زمانه العالم العامل والحبر الكامل الجامع بين علمي المنقول والمعقول. السائر ذكره الجميل في كل قطر سير المثل السائر قدوة الأنام وعمدة الاسلام أستاذي ومولاي ومن تشبث بأذيال أفادته يداي المرحوم ربّه الخفى الجليّ ابوبكر كچك الملا الأربلي ...)

مدرس چەغەميره

أحمد عبدالرحيم – ئيمزا

أصادق على توقيع المدرس

مدرس قبلان – ئيمزا

لقد حضرت الأجازة وصادقت عليها – مدرس ديبەگە اسماعيل محمد – ئيمزا أنا شاهدت بما حواه ولم يتفوه به أحد عن هواه – الكويسنجق أبوبكر – ئيمزا لە ٣/١١/١٩٤٩.

***

**تێبینی:**

ئەمەی خوارەوەش بەشێکە لە خیتابی عەریف حەفلەکە (ڕێزداری خوالێخۆشبوو. مامۆستا مەلا محەمەدی عەلیاوە، بوو من لە یادم چوو بووەوە و بە هۆی نووسنێکی دۆستی دڵسۆزم مامۆستا (مەلا عەبدوللا حەمەد کوردە)م هاتەوە بیر و بە پێویستم زانی لێرەدا بڵاوی بکەمەوە:

((خیتابەکە:

ئەی جەماعەتی دانیشتووانی حازر تکایە ئاگاداربن ئەوە حەزرەتی جەنابی پاشایە لەسەر تەختی عەدالەت دانیشتووە و خەلیفەی عەزازیلە ئەمیرە لمونافیقینە حیلمی حیماری هەیە.

ناهیقە و ناتیق نییە. متووی درۆیە و دوژمنی ڕاستییە. زمانی هەردەم بە ناحەق دەگەڕێت. حەق قەت تخوونی زاری ناکەوێت. دوژمنی چینی فەقیر و هەژارە. دۆستی موخلیسی دەوڵەمەند و زۆردارە.

تاحەرام هەبێ حەڵاڵ تام ناکات. دەرگەی بۆ دەوڵەمەند و زالمان کراوەیە. لە فەقیر و مەزلوومان هەردەم داخراوە.

تێربوونی نییە عەزیایە. بەرتیلی لاڕەوایە. هەرکەس دەیەوێت غەدر بکات، بابێ شکایەت بکات لەو پاشایەی باشترنییە پشتی لە قورئانە و لە دینیش بەرییە.

نێر لە نێر مارە دەکات. مارە بەجاش پەیڕەو دەکات ماین لە کەر چاك دەکات)).

***

خوێنەرانی هێژا:

ئەو بابەتانەی پێشوو لەبەر هەر هۆیەك بێت هەرەمەیی نووسراونەتەوە و داوای چاپۆشیتان لێدەکەم، کەچی لە ئەمانەی دواوە ڕێچکەی پیتی (ئەلف و بێ) یان گرتووە.

نووسەر

***

**ئامرازی پێوان و کێشان:**

ئامرازی پێوان و کێشان: ئامرازێکە چۆنیەتی شت لە ڕووی قورسی و سووکی و زۆری و کەمی و درێژی و کورتی پێدەر دەخرێت.

ئەمەش سێ جۆرە:

یەك: ئامرازی دەرخستنی ئەندازەی قورسی و سووکی شت بە (کیلۆ .. و حۆقە و باتمان لە تای تەرازوو .. و قەپاندا).

زۆرتر کێشان بۆ ئەمەیان بەکار دێت نەك پێوان.

دوو: ئامرازی دەرخستنی ئەندازەی کەمی و زۆری شت بە (ڕبە و قەزناخ و عەلبە و تەغاردا). پێوان بەسەر ئەمەیاندا زاڵە.

سێ: ئامرازی دەرخستنی ئەندازەی درێژی و کورتی شت بە (گەز و یارد و مەتر و .. شتی تر).

بۆ ئەمەیان هەر پێوان بەکاردێت.

***

یەك: ئامرازی دەرخستنی ئەندازەی قورسی و سووکی: سەیری ئەمانە بکەن:

کێشانەی تەرازوو: (کێشانی تەرازوو .. و کێشان بە تەرازوو)شم بەر گوێ کەوتوونە.

لە بەراییدا، پێش ئەوەی بچینە ناو بابەتەکەوە پێویستە ئەمانە بزانین:

١- کێشان: ئەمانە دەگرتەوە:

آ- ڕاکێشانی شت لەسەر زەوی وەك عارەبانەکە و کەل و پەل و شتی تر.
ب-هەڵێنجانی ئاو لە بیر و شتی تر، یان ئاو بە کۆلکێشان.
پ- لۆقرشە و (کا) گواستنەوەش بە کاردێت.
ت-قومدان لە جگەرە و سەبیل و قەننە و نەرگەلە.
ج- ددان کێشان: (ددان دەرهێنان و دەرکێشان)یش دەگوترێت.
چ- پلاوبرنج دەم بدات و لەسەر ئاگر بپەنمێت: دەم کێشانی برنج لەسەر ئاگری کز دەبێت).
ح- ئەندازەگرتنی شت بە سەنگ و تەرازوو.
٢- کێشانە: خاڵی دوایی دەگرتەوە.
***
کێشانە بە تەرازوو .. و قەپان. ئێمە لێرەدا ئەوەمان مەرامە.
تەرازوو .. و قەپان هەموو ڕۆژ لە بەرچاو بە کاردێن و ناتوانین دەست بەرداریشیان ببین بۆیە پێویست ناکات لێرەدا تاریفیان بکەین. کێشانە بە تەرازوو دوو تەرزە:
**یەکەم: کێشانەی کۆن:**
لە زەمانی زوودا هێشتا ناوی (کیلۆ .. و غرام) بەر گوێی کەسانی ناوچەکە نەکەوتبوون بەس ئەمانە هەبوون:
(باتمان. حۆقە. نیوحۆقە. ئێزرەم. پاکەت). ئەمانە سەنگێك بوون شتی قورس و سووکی سەردەمیان بە تەرازوو پێدەکێشرا.
پێویستە ئێمە لە سەنگە سووکەکانڕا دەست پێ بکەین.
١- **پاکەت:** مەبەست لە پاکەت (٥) پێنج فیشەکە تفەنگە بەسەرەکەیەوە بوو. فیشەکی گوللە سۆری کارخانە بوو نەك عادی و دەسکرد. پاکەت ئێستا دەکاتە (١٢٥) سەت و بیست و پێنج غرام و (١/٨) یەك لەسەر هەشتی کیلۆیە.

٢- **ئیزرەم:** ئەو ناوە تەنیا لە دێهاتەکاندا بە کاردەهات کەچی لەنێو شاری هەولێردا لە جیاتی - ئیزرەم (عورب) بوو. (ئەگەر لێمنەبێتە درۆ - تەواو دڵنیانیم - نووسەر). ئیزرەم (٤/١) حۆقە = (٨/٥) کیلۆ .. = پێنج پاکەت = (٦٢٥) شەش سەت و بیست و پێنج غرام.

٣- **نیو حۆقە:** کیلۆیەك دوو پاکەت = (٢) دوو ئیزرەم = (١٠) دە پاکەت = (١٢٥٠) هەزار و دوو سەت و پەنجا غرام بوو.

٤- **حۆقە:** دوو کیلۆ و نیوو = (٢) دوو نیو حۆقە = (٤) چوار ئیزرەم = (٢٠) بیست پاکەت = (٢٥٠٠) دوو هەزار و پێنج سەت غرام بوو.

ئەوسا دەگوترا حۆقەی (٢٠) بیست پاکەت. ئەگەر سەنگەکە چنگ نەکەوتبووایە حۆقە دەلحاز لەسەر پاکەتە فیشەك دەگیراوە.

٥- **باتمان** (٦) شەش حۆقە بوو = (١٥) پازدە کیلۆ.

٦- **وەقیلە:** وەقیلە = (یەك ئیزرەم) = (٨/٥)ی حۆقە بوو (ئەگەر لێمنەبێتە درۆ. چونکە لە ئەمەیان تەواو دڵنیانیمە - نووسەر):

***

**دووەم: کێشانەی نوێ:**

ئەمڕۆ حۆقە و نیو حۆقە و باتمان نەماون. تەنیا سەنگی کێشانە بەکیلۆ .. و نیو کیلۆ و چوارەگە کیلۆ .. و غرام ماوە و بەس.

ئەمانەش هەموو ڕۆژ بە کاردێن پێویست بە تاریف کردنیان نییە.

***

**دوو:**

ئامرازی دەرخستنی ئەندازەی کەمی و زۆری بە (ڕبە و قەسناخ) و عەڵبە و تەغار)دا. سەیری ئەمانە بکەن:

١- ڕبە: دەفرێك بوو دانەوێڵەی پێدەپێورا. لە دار تایبەت دروست کراوو .. و شیشەیەکی بە قەد پەنجە درێژە ئەستوور لە ناوەڕاست درابوو.. و بڵندی لەگەڵ بڵندی لێواری ڕبەکەوە یەکسان بوو. هەرکە پڕ دانەوێڵە دەکرا بە (دار ڕبە)، خڕی تایبەت درووست کراو .. و نزیکەی نیومەتر

درێژ تەراح بەسەر دەغڵەکەی ناو ڕبەکەدا دەخشاند. دەبووایە ئاسنەکە و لێواری ڕبەکە دەرکەوتبووانایە. ئەوە (ڕبە)یەك بوو. ئەوسا دەگوترا: (دوازدە ١٢) مستی، بەهەردوو دەست و پەنجە شاش (ڕبە)یەك بوو. نیو تەنەکەی نەفتی ئەوسا بوو.

٢- قەزناخ: (قەسناخ) چوار (٤) ڕبە بوو کە دەیکردە دوو تەنەکە.

٣- نیو عەڵبە: چوار (٤) قەسناخ = هەشت تەنەکە = (١٦) شازدە ڕبە.

٤- عەڵبە: (٨) هەشت قەسناخ = (١٦) شازدە تەنەکە = (٣٢) سی و دوو ڕبە.

٥- تەغار: (٣) سێ عەڵبە و نیو بوو: (ئەگەر لێمنەبێتە درۆ چونکە باشم لە یادنەماوە – نووسەر)

٦- داریە: ئەگەر کابرایەك دە دوازدە عەڵبە دەغلی بفرۆشتبووایە بە ڕبە دەور دەکراوە، ژمارەکە هەتا سی و دوو ڕبە کە عەڵبەیەکی دەکرد، ناخۆش بوو. لە جیاتی تەڕاحەکە هەرجارێ کە دەگەیشتە ژمارە (٢٠) بە دەنگێکی بەرزەوە دەیگوت (داریە). واتە ژمارەکە تەواو. (٢٠) ڕبەکە (داریە)ی ناو بوو. ئەوسا کەسێکی کوتەدار و قەڵەمبڕ بە دەست دەلحاز لە لەیەکی لە دارەکە دەکرد.

ئیتر هەر ئەوها .. هەر جارێ کە دەگوترا (داریە) لەلەیەکی دەکرد کە پێوانەکە تەواو بوو .. با بڵێین ژمارەی (داریە)کان گەیشتە (١٦) شازدە داریە. ئەوجا بەم تەرزەلێك دەدراوە. (١٦) داریە (× ٢٠ = ٣٢٠) ڕبە (÷ ٣٢ = ١٠) عەڵبە.

***

لە دوای دەرکەوتنی تەرەکتەر و دەڕاسە، یەکەم (تەرەکتەر ساڵی ١٩٤٩، گەیشتە گوندی (عاللا)ی ناوچەی کەندێناوە. ساڵی دواییش (دەڕاسە) پەیدا بوو). ئاغاکان مەجبوور نەبوون جوتیار بە خرتە خرتی نووکی گاسن زەوییەکانی بکێڵێن و ئەوجا (بیستی چواریان بدەنێ). هێدی هێدی زەویی

یان لە جوتیاران دەستاندەوە و بە خۆیان دەیانکێلا. دەغڵیان ئەوەندە زۆر بوو تەرحی (کا) لە (لەودە)یان دەکرد.

بۆ وێنە ئاغایەك دەیویست سی چل عەڵبە دەغڵ بفرۆشێت ئەمەش بە دەورکردنەوەی ڕبە تەواو نەدەبوو، ناچار تەراح = کڕیارەکە) دەغڵەکەی بە (حەماڵ)ان، (ئێمە پێمانگدەگوتن: (حەمبار) بە پەستانی زۆرەوە لە فەردانیان دەکرد.

فەردە ئەوسا دوو چۆر بوو: (داخ سۆر و داخ شین). ئەویان پەسند تربوو .. و هەژدە (١٨) ڕبەی دەگرت.

دوای دوورینی دەرکی فەردە پڕ دەغڵەکان خاوەن دەغڵەکە فەردەیەکی بە کەیفی خۆی هەڵدەپژارد و دەیگوت: (ئەو فەردەی بپیون).

ئەوسا فەردەکە چەند .. دەرچووبووایە فەردەکانی تریشیان بە گوێرەی ئەو دەقرساند.

***

سێ:

ئامرازی دەرخستنی ئەندازەی درێژی و کورتی.

فەرموون سەیری ئەمانە بکەن:

گەز:

بەبیرم دێت لە زەمانی زوو لۆ پێوانی قوماش لە دێهاتەکاندا تەنیا گەز هەبوو. ئەوسا لە دارێکی تایبەت درووست کرابوو.

دوای گەز (یارد) دەرکەوت. بەس لە یادم نەماوە کەینێ لە ناوچەکەمان پەیدابووە.

ئەویش داربوو.

پاشدان بوونە ئاسن.

هەرکە دەچوومە شاری هەولێر هەردووکیان ئاسنی بە قەدەر سەری پەنجە گەورە، پان و تەنك و خەت خەتی هەبوو.

(له یادم نەماوە خەتەکان لە جیاتی (ئینج) بوون، یان سەنتیمەتر. نووسەر).

زانینی درێژی گەز و یاردە ئەوسا بەم تەرزە بوو:

١- گەز لەسەرە پەنجە درێژەی پیاوەوە هەتا هێسکە قیتەکەی شان بوو.

٢- یارد: لەسەری پەنجە درێژەی گۆرینەوە، هەتا قۆرتی مل بوو.

٣- مەتر: ئەمەیان لەم دواییەدا پەیدا بوو.

ئەندازەی درێژی مەتر هەموو خوێندەواری ئەمڕۆ دەزانن، بۆیە پێویست ناکات من لێرەدا چیرەی بدەمێ.

***

پیاوێکی گوندەکەمان (ناو هێنانی هەموار نییە – نووسەر) هەرکە کیلۆ جێگەی حۆقە و مەتر جێگەی گەزی گرتەوە گوتی:

- مادام حۆقە بووە کیلۆ .. و گەز بووە مەتر عەلامەتی دنیا خرابوونە.

***

**ئاو و ئاگر لەکەس نەبن حازر:**

(واتە: ئاقیبەتی: لافاو هەستان و ئاگر کەوتنەوە کارەساتن و یاخوا تووشی کەس نەبن).

لێرەدا وشەی (ئاو) لە پێش وشەی (ئاگر)ە منیش پەیڕەوی دەکەم.لەلایەکی دیکەوە دەگوترێت: (ئاو و ئاوەدانی). واتە: (هەر شوێنێك ئاوی هەبوو ئاوەدانیش هەیە).

***

**ئاو:**

ئاو: (مادەیەکی بێبۆن و ڕەنگ و شلە و هۆی سەرەکی ژیانە). ئەمانەی خوارەوەش دەچنە بن عەبای ئاوەوە:

١- ئارەقە: (لەشم لە ئاو هەڵگەڕایە).

٢- تۆی نێر و مێی ئادەمیزاد و ئەو گیانلەبەرانەی بێچوویان دەبێت: (ئازاد چاوی بە پرشنگ بکەوێت ئاوی دێتەوە).

٣- چڵم: (سەرمام بووە و ئاو لە کەپووم گیرنابێت).

٤- ڕەونـــەق (بریقـــە و درەوشـــانەوەی تیـــغ و خەنجـــەر و شـــتی تـــر: خەنجەرەکەم سەقا دراوە). واتە ئاودراوە: (پاش سوور کردنـەوەی بـە ئاگر لە نێو ئاودا هەڵکێشراوە).

٥- فرمێسك: (دەمێکە ئاو لە چاوم دێت).

٦- کوشراوی هێندە میوە: (ئاوی تەماتە ئاوی ترێ. ئاوی پرتەقاڵ).

٧- لیکاو: (هەر کەس لە ئاستمدا شتی ترش بخوات دەوم پر ئاو دەبێت).

***

**ئاگر**

ئـاگر: (ڕوونـاکی و گـڕ و گەرماییـەکی سـووتێنەر و ڕەنگێکـی گـەش و ئاشکرای هەیە.

وشەی ئاگر ئەوانەی خوارەوەی لێدەکەوتەوە:

١- ئاگراو: ١- نەوعی ئاگر لە گەرمیدا.

٢- ئاوی زۆر گەرم.

٢- ئاگراوی: ئاگراو.

٣- ئاگرە: أ- ئافەت. نەگبەت.

ب- شەرا: نەخۆشییەکە بـە هـۆی گـەرمی بـای (هـوڕە)ەوە لـە شینایی دەدات و زەردی هەڵدەگێڕێت.

پ- ئاگرەکە.

ت- سوزەنك.

٤- ئاگرە خۆشە: ئاگرێکی بڵێسە دارە.

ئێمەی منداڵ ئاگرمان دەکردەوە و بە چەپڵە لێدان لە دەورەی دەسووڕاین و دەمانگوت: (ئاگرە خۆشەی خۆمانە - گوو بەڕیشی دۆمانە).

٥- ئاگرە خۆشکەر: ئاگر خۆشکەر.

٦- ئاگره سۆره: ئاگرێکە ڕەنگی سۆربێت. واتە پۆلیە بێت. لەوەرز ساردیدا خاوەن مەڕ و ماڵات بە ئالیکدان و داکردنی مەڕەزاو فرچکدانی بێچووی تازەزا، زۆر ماندوو دەبوون. چینە فەقیرەکەش حەساوەی ماڵەوە بوون و دەیانگوت:

- (دادەنیشم لە کن پۆلیە سۆرێ

گیرم بە قوونی مەڕ زۆرێ).

هەرکە بەهار دادەهات خاوەن مەڕوماڵات سپیاتیان لە مشەبوو .. و فەقیریش نانە وشکیان زیاتر نەبوو دەیانگوت:

- (دەخۆم نان و پەنیری

گیرم بە قوونی فەقیر).

٧- ئاگرەکە: أ- زیپکەیەکە لە دەموچاوی منداڵ دیت و زۆر زووش وەبەروەدەچێت. هەر لۆیەشە ئەو ناوەی بەسەردا سەپاوە.

ب- شەرا.

٨- ئاگرەگڕە: ئاگرێکە بڵێسەی هەبێت.

(منداڵ بووین لە دیار ئاگری خۆشدا دەمانگوت:

(ئاگرە گڕە - گووم هەڵدڕە).

٩- ئاگر ئاگرانێ: گەمەیەکی منداڵان بوو بە ئاگر دەکرا.

(ئەوەم تەواو لە یاد نەماوە - نووسەر).

١٠- ئاگر باران: أ- گەرمایەکی زۆر بەتێن.

ب- شەڕە تفەنگێکی زۆر گەرم.

پ- قوماشێکی ئافرەتان بوو.

١١- ئاگر بارانە: أ- ئاگر باران.

ب- مقامێکە.

١٢- ئاگر بارین: أ- گەرمای زۆر بەهێز.

ب- شەڕە تفەنگێکی زۆر.

١٣- ئاگر باز: أ- کەسێکە بەئاگر گەمە بکات.

ب- کەسێکە تفەنگ زۆر باوێت.

١٤- ئاگر بەربوون: ئاگر هەڵگیرسان.

١٥- ئاگر بەربوونەوە: پەیدابوونی ئاگر لە شوێنێکدا.

١٦- ئاگر بەردان: ئاگر نان بە شتێکەوە.

١٧- ئاگر بەس: ئاگر بەست.

١٨- ئاگر بەست: شەڕ وەستان.

١٩- ئاگر بڕ: أ- کوژانەوەی ئاگر.

ب- بەرهەڵستی ئاگر کەوتنەوە هەتاکو دەسەلات بەسەریدا بشکێت بڕ دەگرێت. واتە دەکرێتە دوو بەشەوە.

٢٠- ئاگر بڕ بوون: ئاگر بەشبوون.

٢١- ئاگر پەرس: ئاگر پەرست.

٢٢- ئاگر پەرست: کەسێکە لە جیاتی خوا ئاگر بپەرستێت و عیبادەتی بکات.

٢٣- ئاگر پژان: ئاگر پژین.

٢٤- ئاگر پژین: أ- بورکان.

ب- چیای سەر بە ئاگر.

٢٥- ئاگر پێبوون: ئاگر هەڵبوون.

٢٦- ئاگر پێکردن: ئاگرکردنەوە.

٢٧- ئاگر پێوەنان: أ- ئاگر تێبەردان.

ب- داخ کردنی شتێك بەئاگر.

٢٨- ئاگر تێبەربوون: أ- شتێك ئاگر لە خۆیەوە بگرێت.

ب- ڕق هەستان و تووڕە بوون.

پ- ورووژانی بەزەیی لە شروی ڕووداوێکەوە:

(ئاگر تێبەربوونی زگسووتان وەکی چ ئاگرێك نییە).

٢٩- ئاگر تێبەردان: ئاگر بە شتێکەوە بنرێت.

٣٠- ئاگر خۆشکەر: ئاگر خۆشکەرە.

٣١- ئاگر خۆشکەرە: أ- ئاگر گەشکەر.

ب- کەسێکە ئاژاوە و شەڕ و شۆڕ بنێتەوە.

٣٢- ئاگر خۆشکردن: أ- هەستان بە ئاگر هەڵگیرسان.

ب- شەڕ و ئاژاوە نانەوە.

٣٣- ئاگردار: خاوەن ئاگر.

٣٤- ئاگر داگیرسان: أ- ئاگر هەڵبوون. ئاگر پێبوون.

ب- سەرهەڵدانی شەڕ و شۆڕ و ئاژاوە.

٣٥- ئاگر داگیرساندن: ئاگر داگیرسان.

٣٦- ئاگر دامرکان: ئاگر کپ بوون.

٣٧- ئاگر دامرکانەوە: ئاگر کوژانەوە.

٣٨- ئاگر دامرکاندن: گڕ نەهێشتنی ئاگر.

٣٩- ئاگردان: أ- قوناگر. قوناگردان. جێی ئاگر کردنەوەی بەردەوام.

ب- تەقەکردن. تفەنگ هاوێشتن.

٤٠- ئاگردانی قەت دیوار: ئاگردانێك بوو لە قەدیواری ژووریماڵەوە.

٤١- ئاگردو: ئاگرو دو.

٤٢- ئاگر دۆست: کەسێکە لە وەرزی سارديدا خۆی لە ئاگر زۆر ڕەپێش بکات.

٤٣- ئاگر زمان: کەسێکە زمانی بە باش نەگەڕێت.

٤٤- ئاگر کەرەوە: أ- کەسێکە بە ئاگرکردنەوە هەڵبستێ.

ب- ئاژاوەچی. فیتنە بازی.

٤٥- ئاگر کزبوون: ئاگرێکە بەرەو کوژانەوە بچێت.

٤٦- ئاگر کزکردن: ئاگر دامرکاندنەوە.

٤٧- ئاگر کوژانەوە: ئاگر بەرەو نەمان بچێت.

٤٨- ئاگر کوژاندنەوە: ئاگر کوژانەوە.

٤٩- ئاگر کێش: أ- ماشەی ئاگر.

ب- چەمچەی ئاگر هەڵگێڕ و وەرگێڕ کردن.

٥٠- ئاگر گەش: ئاگرێکە بڵێسەی بەرز بێت. ئاگر خۆش.

٥١- ئاگر گەشانەوە: ئاگر گەشاندنەوە.

٥٢- ئاگر گەشاندنەوە: ئاگرخۆش کردن: باوەشینەکردنی ئاگر.

٥٣- ئاگر گەشکەر: ئاگر گەشکەرەوە.

٥٤- ئاگر گەشکەرەوە: کەسێکە ئاگر خۆش بکات.

٥٥- ئاگر گەشکردن: ئاگر خۆش کردن.

٥٦- ئاگر گر: أ- ماشە.

ب- شتێکە ئاگری زۆر بگرێت.

٥٧- ئاگرگرتن: أ- ئاگر تێبەربوون.

ب- کەسی توورە و هەڵچوو.

٥٨- ئاگرگرتی: أ- سووتەمەنییەکە، یان شتێکە ئاگری گرتبێت.

ب- هەڵچوون و دەغەزی یەکجار زۆر.

پ- شەهوەتباز.

٥٩- ئاگرگیرە: ئاگرگر.

٦٠- ئاگر لەدەودا: (ئاگر لەدەمدا): کەسی قسەی هەراش و بە تانە و تەشەرەوە.

٦١- ئاگر نانەوە: أ- ئاگر کردنەوە.

ب- ئاژاوە و پەشێوی پەیداکردن.

٦٢- ئاگر و با: دوو کەسی دژی یەکتر.

٦٣- ئاگر و دوو: سوتەمەنی. (هەژار فەرموویەتی: ئاگرودوو بریتیە لە بوونی ماڵ و حاڵ).

٦٤- ئاگر و دووبڕان: نەمانی هیچ شتێك، ئاگری لە ماڵەوە پێ بکرێتەوە.

٦٥- ئاگرۆچکە: ئاگرۆکە.

٦٦- ئاگرۆك: أ- ئاگرەکە.

ب- مرۆڤی شەڕاوی و ئاژاوە گێڕ.

پ- بای گەرم کەشینایی تووشی (شەرا) و هەڵپرووکان دەکات.

٦٧- ئاگرۆکانێ: هەڵکردنی ئاگر لەلایەن منداڵانەوە و گەمەکردن بە دیاریەوە.

٦٨- ئاگرۆکە: ئاگری گچکە. ئاگری منداڵان. ئاگری دزان.

٦٩- ئاگر هەڵکەر: کەسێکە ئاگر داگیرسێنێت.

٧٠- ئاگر هەڵکردن: ئاگر پێکردن.

٧١- ئاگری: أ- چیایەکە لە باکووری کوردستانی داگیرکراودا.

ب- چەمێکە لە باکووری کوردستانی داگیرکراو.

پ- خروشتی حەزی گەل و گوان.

٧٢- ئاگری بەردەسێڵ: ئاگری لەسەرخۆ: (پارچە تەنەگەیەکی لاکێش دەخرایە سەر دوو کوچاگر و ئاگری کاوکۆتی لەبن دەکرایەوە).

٧٣- ئاگری برەسۆرە: ئاگرێکی گڕو فرێکە و زووش دامرکێتەوە.

٧٤- ئاگری بن کا: (ئاگری ژێر کا). کەسێکە هەردەم هەوڵ وتەقەلای بۆ سەرهەڵدانی شەڕ و ئاژاوە و ناکۆکیبێت.

٧٥- ئاگری بێ ئامان: بەڵاو کارەساتی بێ چارە.

٧٦- ئاگری جەرگ سووتان: منداڵ مردن.

٧٧- ئاگری خودا: (ئاگری خوا): بەڵای ئاسمان و کارەساتی دیکەی خوا.

٧٨- ئاگری غەزەب: أ- تووشی بەڵاو نەگبەتی خوا هاتن.

ب- جوێنێکە: (یاخوا ڕۆڵە تووشی ئاگری غەزەبی خوا بیت).

٧٩- ئاگری قودرەت: بەڵای لا بەڵاو قەزاو قەدەر.

***

**ئەڵقە:**

ئەڵقە: چەماوەیەکی خڕی وێکهاتووەتەوە و لە ئاسن و زێڕ و زیو .. و زۆر شتی تر دروست دەکرێت. ئەڵقە ئامانەی خوارەوە دەگرتەوە:

١- ئەڵقەی پەنجە: ئەو ئەڵقەیەیە لە پەنجە دەکرا. ئەمانەن:

أ- ئەڵقەی زەنگیانە: (نمنۆك):

(زەنگیانە مێرووێکی یەکجار ورد و هەمە ڕەنگە). بە ئەندازەی پەنجەی دەست زەنگیانە لە داوە دەزوو دەهۆنراوە و کیژان لەدەستیان دەکرد بۆ جوانی. (نزیکەی (٦٠) شەست ساڵ بەر لە ئێستا من ئەمەم لە پەنجەی کچان دیوە - نووسەر).

ب- ئەڵقەی فافۆن:

لە چەشنی ئەڵقەی زێڕ و زیو دۆم دروستیان دەکرد و ئافرەتان بۆ جوانی لە دەستیان دەکرد.

(من ئەمەم بە چاو دیوە، بەڵام لە یادم نەماوە کەینێ بووە).

پ- ئەڵقەی زیو: ئەمەش کۆنە و بۆ جوانی لە دەست دەکرا.

ت- ئەڵقەی زێڕ: ئەمەیان لەم دواییەدا پەیدابووە و کراوەتە نیشانەی ژن هێنان و مێرکردنی ئەو سەردەمە.

٢- خەزێمۆك:

ئەڵقەیەکی ئاسنە و بە ئاسن، یان بەرمیلێکی چەشنی گومەتی چەسپ کراوە و ئەگەر لە پشت دەرگاوە بووبێت بۆ داخستن و قایم کردنی دەرگا کە بوو. ئەگەر لە دیوی دەرەوە بووایە تەرحی جەرەس بە کاردەهات.

٣- قەفە زنجیر: هەر شتێك خڕی بازنەیی بێت. وەك ئەڵقەی شەتەکدانی بنکی مژانە، بەکلکی ئامۆرەوە. ئەمەیان گەورە و لە ئاسن و بەرمیل دروست کراوو (بازنە)شی پێدەگوترا.

***

- ئەڵقە بەستن: کۆ بوونەوەی بە خڕی. ئەمە بە زۆری بۆ زیکری دەروێشان بە کاردێت.
- ئەڵقە بەگێ: ئەڵقە بەگوێ. ئەڵقە بەگۆ. ئەڵقە لەگێ.
- ئەڵقە پێکان: پەپکەکردنی مار.
- ئەڵقەدار: شتێکە ئەڵقە ئەڵقە بێت. وەك زنجیر.
- ئەڵقەدان: مەبەستە ئەو دوومانایەیە:

١- گەمارۆدان.

٢- زنجیری قاییم کردنی دەرگا و شتی تر.

- ئەڵقە ڕێز: ١- خەزیمۆك.

٢- زنجیرەی قاییم کردنی دەرگە و شتی تر.

- ئەڵقە ڕێزکراو: دەرکە داخراو پێوەدراو بە زنجیر.
- ئەڵقە ڕێزکردن. دەرکە داخستن بە زنجیر.
- ئەڵقە ڕێزی دوولایی: ئاسنێکی پشت دەرگە بوو: لە دوو شوێن دەرکەی پێ قاییم دەکرا.
- ئەڵقە لە گێ: بەم دوو مانایە دێت.

١- کەسێکە ئەڵقەی بە گوێچکەیەوە بێت.

٢- نۆکەر. حزمەتکار.

- ئەڵقە وێز: ئەمەش بە دوو مانا دێت:

١- لە قنارەدان، لە سێدارەدان. ئیعدام.

٢- خەزێمۆك.

- ئەڵقەی چادر: ئەڵقەی خیوەت.
- ئەڵقەی خیوەت: قولفەی قاییمی کردنی خێوەت و ڕاگرتن.
- ئەڵقەی ڕەشماڵ: قولفەی قاییم و ڕاگرتی ڕەشماڵ.
- ئەڵقەی زنجیر. قولفی زنجیر.
- ئەڵقەیی: شتێکی خڕی بازنەیی بێت.

**باران و هەور:**

- باران: ئاوێکە دڵۆپ دڵۆپ لە هەوران دێتە خوارەوە.
- باراناو: ئاوی باران.
- بارانە: ١- هەنووکە بارانە.
  ٢- گۆرانییەکە.
- بارانە وێران: باران بڕان.
- باران بارین: هاتنە خوارەوەی ئاو لە حەواوە بەپشکە پشك، یان بە لێژمە و ڕێژنەوە.
- باران بڕان: ئاخر و ئۆخری باران بارین: (مانگی حوزەیران).
- بارانپێو: شتێکە ئەندازەی باران بارین نیشان دەدات.
- باراندادان: باران بارین.
- باران داکردن: باراندادان.
- باران ڕووکردن: بارانی زۆری بە گوڕ.
- باران کڕکردنەوە: وەستانی باران. نەمانی باران.
- باران لێکردنەوە: باران کڕکردنەوە.
- بارانی بەگوڕ: بارانێکە بە توندی بێتە خوارەوە.
- بارانی سەر بە کڵاوە: بارانێکە پشکی گەورەیە و هەرکە دەکەوتە عەردی پۆقژە دەکات.
- بارانی کوندەی سەربەخوار: بارانێکە ئەوەندە زۆر بە تەوژم دێتە خوارەوە تەرحی کوندە ئاوی سەر بەرەو خوار بکرێتەوە.
- بارانی لەسەرخۆ: بارانێکە هێدی هێدی بێتە خوارەوە.
- پڕووشە باران: پشکە باران.
- پڕووشە بڕووشی باران: بارانی پشکە پشکی گچکە.
- پڕووشکە باران: پڕووشە باران.
- پڕووشکە پڕووشکی باران: پڕووشە پڕووش باران.
- پشکە باران: دەنکە باران. قلە باران.

- پشکە پشکی باران: دەنکە دەنکی باران بارین.
- تاوە باران: بارانێکی توند و زۆر نەخایان.
- ڕەهێلە باران: ڕێژنە باران (بارانە ڕەهێل)یش هاتووە = تاوەباران.
- ڕێژنە: (ڕەژنە) باران: بارانە ڕێژنە = بارانێکی توند و بەگوڕ.
- نمە باران = بارانی دەنك ورد وردی لەسەرخۆ.
- نمنمە باران = (بارانی نمنم)یش هاتووە: بارانی پشك وردی لەسەرخۆ.

**تێبینی:**

من وای بۆ دەچم (پشك) لە (پڕووشك) گەورە تر بێت.

***

**هەور:**

هەور: تەمێکە و لە ئاوی دەریا و ڕووبار و زەویی تەڕ پەیدا دەبێت و بارانی لێدێتە خوارەوە.

هەور جۆری هەیە:

١- هەورە برووسکە: ئەو هەورەیە برووسکی لەگەڵدا بێت.

٢- هەورە تریشقە: ئەو هەورەیە جگە لە برووسکی دەنگیشی لێوە بێت.

٣- هەوری پتك پتك: هەورێکە چەند پارچەی لە یەکدی جوودا = (پچڕ پچڕ) بێت.

٤- هەوری تەنك: هەورێکە پڕ نەبێت و شینایی ئاسمانی لێوە دیاربێت. دوو تەرز.

أ- ئەگەر سپی بوو ڕۆژەکە بە (سپییە ڕۆژ) ناو دەبردرێت.

ب-ئەگەر بۆر بوو (کەوە ڕۆژی) ناوە.

٥- هەوری پڕ وتاریك: ئەو هەورە وا دەچێتە پاڵ یەکتر ئاسمانی بە ئاستەمیش لێدیارنابێت.

دوو تەرحە:

أ- ئەگەر حەوای ناوچەکەی تەواو داگرێت (عامیە)ی پێدەگوترێت.

ب-ئەگەر نا (گەواڵە)ی ناوە.

**هەوری پڕ:**

ئەگەر زۆر نەوی بێت دەگوترێت: (هەور زگی گەیاندیتە عەردی) واتە زۆر نابات دەیکاتە باران.

هەوری پڕ ئەو ڕەنگانەی هەیە.

١- بۆر: کەوی.

٢- ڕەش.

٣- سپیی ئاماڵ بۆر.

٤- سۆری ئامال ڕەش.

***

منداڵ بووم بارتەقای دوازدە ساڵیم کرد بوو ڕۆژێك وەرزی بەهار، بە سواری گوێدرێژ، لە گوندی (عاللا) دەگەڕامەوە گوندەکەی خۆمان. لەنیوەی ڕێدا گەواڵەیەکی سۆری تاریکی لەلای قیبلەوە هێناو دایکردە باران، چ بارانێك وەك لوولەی مەسینە دەهاتە خوارەوە و لەش و جلکەکانم سەتاپا سۆر هەلگەڕا و دەتگوت لە قوڕاوێ وەردراوم.

***

**هەور ڕۆیی:**

سەیری ئەم دوو بابەتە بکەن:

یەکەم: (هەور ڕۆیی لۆ بادینان

خۆت هەڵکوتە ناو کادینان.

واتە زوو دەکاتە باران و خۆت مەگنخێنە و بڕۆ شوێنێکی باران نەگر.

دووەم: (هەور .. ڕۆیی لۆ شارەزوور

خۆت هەکوتە لۆ ڕێگەی دوور.

واتە: باران نابارێت بڕۆ ئیشی خۆت بکە.

***

**زەرەرو زیانی هەوری بەردەوام:**

**(گەر دەتەوێت فەلاح ببێ بەقڕ**

**بەشەو سامالّ بە ڕۆژیش هەوری پڕ).**

ڕاستە باران هۆی پەیدابوونی سەوزاتی سەر زەوییە، بەلاّم تیشکی ڕۆژیش لە پێگەیاندنی سەوزاتی دەورێکی کاریگەری هەیە.

گریمان سەوزاتی تیشکی خۆری پێنەکەوێت تەواو ناپسکێت و بەرهەم باش وەدەست ناهێنێت.

ئەمەش دەیسەلمێنێت:

(هەور بردە = هەور بردی = هەور بردوو).

لە زەمانی زوو سالّ وابووە: دەغلّ لە دەشتی هەولێر زۆر باش ڕسکاوە و بە کەیفی خاوەنەکەی بووە. کەچی لەکاتی دان گرتندا زۆربەی ڕۆژ هەور و هێر بووە و لە ئەنجامدا سەری گولّە دەغلّەکانی سپی دەکرد و دانی لاواز و پووچەلّ بووە.

ئەوسا دەگوترا: (هەور بردیتی).

هەورزیان بە بەری ڕەزوباخ و داریش دەدات.

***

**بەردەقانی دزین:**

باوکم لە ئاست پەروەردە کردنمان بێ موبالاّت بوو. لەبەر دەرس گوتنەوەی (هەر لە بەیانی زووەوە هەتا بانگی ئێوارە خەریك بوو.. و نەدەپرژایە سەر پەروەردە کردنمان. کەچی دایکم زۆر و شت و چاو دێرێکی بە حەزەر بوو. ئەگەر زەختی ئەو نەبووایە، بەلای چاکەوە، ڕەنگە پیاوێکی دز و قەلّپ و مزیر دەرچوو بوومایە.

ڕۆژێك چوومە، مالّی خوالێخۆشبوو مام: (حاجی ئاشەوان)ی دراوسێمان بەردەقانییەکیان لەحەوشە کەوتبوو. کەس دیار نەبوو، منیش دەستم دایە و بردمەوە مالّ.

هەرکە دایکم دیتی یەکسەر گوتی:

- ئەو بەردەقانییەت لە کوێ بوو؟.

وای حەملاندبووم نەمدەتوانی درۆی لە ئاست بکەم و گوتم:

- لە حەوشەی ماڵی مام حاجی ئاشەوان کەوتبوو.

دەستی گرتم و لەگەڵم هات، بەردەقانییەکەم لە کێندەر دزیبوو پێی ئەلەوێندەر دانامەوە و گوتی:

- جارێکی دی دزی بکەیت هەردووچاوت بەو پەنجانە دەردێنم.

هەر ئەو ڕۆژە فێرە درووست کردنی بەردەقانی کردم.

لەبەر ئەوە لە ماڵەوە تەونکەر بووین بەنمان هەردەم زۆر بوو. فێربووم بەردەقانی چاك بهونمەوە.

**بەردەقانی:**

(قۆچەقانی)یشی پێ دەڵێن: چنراوێکە سەرەکەی بە قەد ناولەپە و کەمێك قوڵە و دوو لسکی هەیە و بەردی پێدەهاوێشترێت.

**درووست کردنی بەردەقانی:**

ڕایەڵەکەی نزیکەی (١٠) دەداوە بەنە و (دەزوو)ش دەبێت. درێژی دوو مەترە.

ڕایەڵەکە بەنی کشت و قاییمە، ئەگەر نا بەرگەی بەرد هاوێشتن ناگرێت.

ناوەڕاستی داوە ڕایەڵەکان بە (قولفانکە) لە دارێکی درێژ نیومەتر و ئەستووری بە ئەندازەی پەنجە شادە نوێژە دەیەخران.

ڕایەڵەکە بە هۆی دارەکەوە بووە دووبەش.

بەردەقانیکەرەکە، سەرێکی دارەکەی ڕایەڵ تێگیراو دەخستە نێوان پەنجە گەورە و درێژەکەی پێیەکی و ئەویتر پێییەکەی تر. ڕایەڵەکەی ئەودیو لە شتێك شەتەکدەدا و ئەویتر بستێك دوور لە دارەکەوە بە قولفانە گرێیدەدا سەرەکەی لە دۆخینی خۆی دەبەستا، هەتا لە کاتی چنیندا، بە هۆی دۆخینەکەوە ڕایەڵەکەی ڕاکێشێت و توند ببێت.

(٣) سێ داوە بەنی (تێوەرێخ)ی درێژی وا هەتا بەردەقانییەکە تەواو دەبێت بەش بکەن.

یەکیان ناوەڕاستی لەلای ڕاستی گرێیەکەوە، بە قولفانگە گرێ دەدات.

دووەم: لەلای چەپی گرێیەکە و سێیەم لەلای ڕاستەوە. هەریەکەشیان، دوای گرێدانە دەبێتە دوو داو. ئەو تێورێخەی یەکەمجار، لەلای راستەوە گرێدرا یەکەم داوی بەسەر یەکەم داوە (ڕایەڵ) دادەچێت و داوەکەی دی بە بنەوە بە جۆرێك داوە ڕایەڵەکە دەکەوێتە نێوانیان. کە لەیەك داوە ڕایەڵ ڕەتبوون لە دووەم ڕایەڵدا تێوەرێخی سەرەوە دەچێتە ژێرەوە و ئەوی بنەوەش بەسەر دەکەوێت.

بەم شێوەیە هەتا دووداوە تێوەرێخەکە دەگەنە لای چەپەوە. ئەوسا کاریان نامێنێت و جارێ ڕادەوەستن.

دووداوە تێوەرێخەکەی لای چەپەوە بە پێچەوانەوە بۆ لای ڕاستەوە دەچن. ئەوانیش لەلای راستەوەدەوەستن و دوو تێوەرێخی سێیەمی لای ڕاستەوە بە کاردێن و هەتا دێنەوە لای چەپەوە و ڕادەوەستن. ئەوانەی پێشتر وەستابوون بە گڕدەکەونەوە. بەم شێوەیە لایەکی سەری بەردەقانییەکە تەواو دەبێت و لایەکەی دیش بەم تەرزە.

هەرکە چنینی سەرەکە تەواو بوو دارەکە دەردەکێشرێت و رایەڵی نێوان هەر دوولای سەرەکان نزیکەی بستێك دەمێنێت و داوەکانی لایەکی یەکەیەکە ڕادەکێشرێت هەتانیو بست دەمێنێت بگەنە ئەوانی دی لایەکەی دیش بەم تەرحە دەچێتە پێش و لا سەرەکان دەگەنە یەکتر و بەیەکەوە دەنووسێن. ئەوسا لچکەکان دەهۆنرێنەوە.

ئەگەر وەکی گوریس بەخڕی هۆنراو بووایەوە بە (خڕۆکی) ناو دەبردرا. ئەگەر بەپانی بووایە (کەزیانی) پێدەگوترا.

هەرکە لچکەکان تەواو بوون سەری یەکێکیان بە بەن دەپێچرێت، یان لەیەکتری گرێدەدرێن (نێرە)ی پێدەگوترا. ئەویتر دەکرا قولفە و (مێیە) بوو.

ئـەو بەنـە زیادانـەی لـەملاو لـەو لای سـەرەکە مابوونـەوە بەبـەنی باریـك دەپێچران و سەرە زیادەکانیان بەمەقەس قوت دەکرا وەك گولینگێکی گچکە یان لێدەهات.

***

من هەر چارێ بەردەقانییەکم درووست بکردبووایە، بۆ ئەوەی مکوم بێت و بەردی لێنەکەوێت و لەبەردە هاوێشتندا شەقەی بێت ئەوانەم لێدەکرد:

یەکەم نزیکەی (٥) پێنج سەنتیمەتر بنی لچکەکانی پالّ سەرکەیم بەبەنی باریك کشت و ڕەنگاو ڕەنگ دەپێچا. هـەتا بـەرد کـاری لێنـەکات پێیـدەگوترا (بەردبڕ).

دووەم: لێـواری هـەر چـوار لای سەرەکەیشـم بەهـەمان بـەن دەدووری (شیران)ی پێدەگوترا.

بـەو شـیرازە بەردەقانییەکـە وەك جامیلکـەی لێـدەهات. گریمـان ئەگـەر بەردی لەناو بێت و سەعاتێك بابدرا بووایە هەتا لچکە نێرەکە بەر نەدرابووایە، بەردەکە هەرگیز نەدەکەوت. هەرکە بەردیشی پێدەهاوێشـترا لەبـەر تونـدی و شیرازەکە شەقەی وا دەهات و لە دوورەوە دەبیسترا.

***

**بەردەقانی هاوێشتن:**

قولّفەکە لە پەنجە گچکەی دەسـتە ڕاسـتە هەلّدەکێشـراو بـەردێك بەقـەد (کەللا) بەردێکی گەورە لەناو سـەلکەکە دەنـراو لچـکە نێرەکـەش بـە هـەمان دەست دەگیراو دوو سێ جار بە توندی دەسـووڕێندراو ئـەوجا لچـکە نێرەکـە بەردەدراو بەردەکە دەڕۆیشت.

بەردەقانی هاوێژ هەبوو نیشانەی ڕاست بـوو .. و بـە زۆری لـە نیشـانەی دەدا.

***

**به مەرزان و بە بندیانان**

**هەڵیان کردەوە وشکەنانان:**

ساڵێك وەرزی زستان ساردی کەم دەبێت و بارانیش زۆر، گیا و گوڵ زوو ڕوواو زەوی سەوز هەڵگەڕاو مەڕو ماڵات ئەوەندەیان بەردان دەکەوت بدۆشرێت. سپیاتی لە هەوار و هۆبە ڕەشماڵان پەیدابوو.

ئەو دوو عەشیرەتە (بندیان و مەرزان) شیر و بەرهەمی شیرنیان لەمشە دەبێت.

کاتێك ناوەرۆکی ئەم وتەیە (لە سوار هەوێك + لە زستان شەوێك): واتە کژی زستان هەر چەند خۆش بێت شەوێکی هەر دەکاتە سەرما و سۆڵێکی تووش. سەرما لەم وەرزە بایداوە و بووە بەفر و بوورانێك ماڵ بە ماڵ نەکەوێت و گیا و سەوزایی زەویی هەڵپرووکاند و مەڕ و ماڵات لەبرسان وشکیان کرد و سپیاتییەکە بڕا و ئەو دوو عەشیرەتەی گۆرێن بایانداوە سەر نانە وشك:

به مەرزان و بە بندیانان

هەڵیان کردەوە هیشکە نانان.

***

**پەلەور:**

(پەلەوەر)یشی هاتووە. ئەو گیانلەبەرانە نە (پەڕوباڵ)یان هەیە.

**پەلەور دوو جۆرە:**

یەکەم: پەلەوەری ماڵی ئەوانەنە لە ماڵ ڕادەگیرێن من تەنیا لەو سێیانە بەڵەدم: (قاز و کۆتر و مریشك). بۆیە ناتوانم خۆم لە قەرەی (چینماچین و عەلەشیش و مراوی بدەم. نووسەر)

١- قاز: پەلەورێکە لە مریشك زۆر گەورە ترە و لە عەلەشیش گچکەترە ڕەنگی بە زۆری سپیە و ڕەش و بۆر و بەڵەکیشی هەیە. هێلکەی گەلێك گەورەیە. بۆیە گوتراوە (مریشك لە هێلکە کردندا چاو لە قاز بکات

قـوونی دەدرێـت)، دنـدووکی پانـە و دەنگـی تیـژە و ئاوییـە و کەچـی ناوچەکەمان رووباری نەبوو. لە هیشکاتی دەژیا.

***

سەردەمایەك مـالّی ئێمـە قازمـان ڕادەگـرت. زۆر هوشـیار بـوون. شـەوان کەسـێکی لاییـدە، یـان سـەگ و پشـیلەیەك بهـات بووایـە حەوشـەمان لێکـرا دەیانقیڕاند.

سالّێك جوجکەیان تـازە هـەلّێنا بـوو (توکیـان زەرد بـوو)، کەنـدی پـێش مالّمان زۆر هاتبوو. لەگینە بلّندی ئاوەکـەی خـۆی لەقـەرەی (٥) پێـنج مـەتر دەدا، قازەکان بە جوجکەکانیانەوە چوونە ناو کەندەکە.

مـن ئەوسـا لـە دەوری شـەش سـالاّن دەبـووم لـە خەفـەتی جوجکـەکان ئاودەیبردن گریام. لە دواییدا نازانم کێبوو پێیگوتم: (مەترسێ قاز مەلەوانـە و ناخنکێن و بەخۆیان دێنە دەرەوە).

هەتا نزیك بلووغ بوونم قازمان هـەبوو. تـاکو ڕۆژێـك سـەگێکی ئـاوایی هـا ربووبوو دوو سێ قازی بریندار کردن (لە جێیەکی تر باسـم کـردووە پێویسـت ناکات دووبارەی بکەمەوە نووسەر).

بـاوکم هـەموومانی سـەر بـڕین و کـە لەشەکانیشـی لـەبن عـەردی نـان. لەوساکەوە قازمان نەما.

***

قازی کێویش هەیە. هەروەك لەو بەیتە فۆلکلۆرییەدا دەردەکەوێت:

((قاز و قولّینگ و مراوی

هەرسێکیان تەیری ئاوی

گۆشتیان دەخوری بە خاوی)).

بە ئاسمانی ناوچەکەدا کۆمـەلّ کۆمـەلّ ڕەتـدەبوون و دەنگیشـیان لێـوە دەهات.

***

٢- **کۆتر:** باڵندەیەکە، کەمێك لەکەو بچووکترە. گەلێك ڕەنگی هەیە و لە دواییدا باسی دەکەین.

کۆتر دوو جۆری هەیە:

أ- **کۆتری کێوی:** (کۆترە کێویلکە)شی هاتووە: لە شوێنێکی دی باس کراوە.

ب-**کۆتری ماڵی:** ئەمەیان هەروەکو گوتم زۆر .. ڕەنگی هەبوو: (سپی، ڕەش، شینی ئاسمانی، سۆر، زەردی ئامال سپی، بۆری ئامال سۆر و جنجڕ و بەلەڵەکی دوو سێ ڕەنگ).

هەندێك سەری قەباخی هەبوو پێمان دەگوت (سەر بە کڵاوە). من نزیکەی هەشت نۆ ساڵ لەسەر یەك کۆترم ڕاگرتووە. جار وابووە سێ چوار جۆت بە یەکەوە لەسەر هێلکان بوونە. بێچووەکانیان باڵی نەدەگرت، سەر لە نوێ هێلکەیان دەکردەوە.

دوو هێلانەیان لە کولانکەی بن سواندەی خانووی ماڵەوە بوون. هەشت و نۆ (لیس)یشم لە ژوورێکی تایبەت لۆیان درووست کردبوون. نێرەیەکیان ئەوەندە کەمۆ بوو بوو هەرکە من لە هێلانەکەیان نزیك دەبوومەوە یەکسەر دەهاتە سەر تۆقەڵەی سەرم و بە بوغاندن دەسووڕا.

ئەو جۆرە کۆترانەی ئەمڕۆ هەنە، ئەوسا نەبوون.

ئەو سا دەگوترا: (کۆتر بەدیۆمە و هەر ماڵێك هەیبێت مەلائیکە تخوونی ناکەوێت).

***

نێرە و مێیە بەم تەرزە: ئاشقی یەکتر دەبن (نێرەکە بە بوغاندن و پەرگڤ کردنەوە لە هەر چوار دەورەی مێیەکەی دەسووڕا. ئەگەر مێیەکە حەزی لێنە بێت لەبەری هەڵدێت. ئەگەر نا بەسەر بڵندو نەوی کردن و گمەگمەوە لێی دەچێتە پێش. تا دەگاتە حەز لێکردنێکی تەواو. ئەوسا نێرەکە دەمی خۆی بەبەش کردنەوە لۆی دەباتە پێش و مێیەکە دەلحاز دندووکی لە نێو دەندووکی دەنێت و دانی خواردنی لێوەردەگرێت. هەرکە

لێبوونــەوە مێیەکــە خــۆی دەلحــاز فــس دەکاتــەوە. واتــە خــۆی بــەعاردی وەدەنووســێنێت و کلکــی بڵنــد .. دەکــات و نێرەکــەش بەســەریدا دەفســێت. ئەوسا بە داکانە و بابانە ناو دەبردرێن و بە هیچ شێوەیەك لە یەکتر دانابڕێت.
مێیەکە قەت بۆ نێرەیەکی دیکە داناوەڕێتەوە. کەچی نێرەکە ئەگەر بۆی گونجا بەسەر مێیەی دیکەشدا دەفسێت.

***

- کۆتر باز = کەسێکە کۆتر رابگرێت.
- کۆتربازی = راگرتن و بەخێوکردنی کۆتر.
- کۆترخان: حەسارێکە کۆتری زۆر بێت.

***

٣- **مریشك:** مریشــك = (مــامر): باڵندەیــەکیماڵییــە و لــە هــەموو پەلــەوری دیکە هێلکەی زۆرتر دەکات و مرۆڤ سوودی لە ڕووی گۆشت و هێلکــەوە زۆر لێوەر دەگرێت.
پێشتر پەڕەکەی بۆ ناوەخنی بالیف بەرنەدەکەوت. بالیفی کــورك زۆر لــە (سەرین)ی لۆکە، لەبن سەردانەرمتربوو. کەچی لە ڕوانگەی تەندرووســتییەوە پشت لەو کراو ئەم جێگەی گرتەوە.

***

**تێبینی:**
((مریشك ئەو مێیەیە کە بگاتە حەدی هێلکە کردن و بەسەرەوە.
کەواتە کەڵەباب و جوجکە و باڕ و باڕۆکەش ناگرتەوە. بەس لەسەر زاری میللەتەوە وا ڕۆیشتووە)).

***

**کورك:**
کورك: بە سێ مانا دێت:
١- تووکێکی ورد و نەرمە لەبن مووی بزن و خوری مەڕ دێت. بــە تــووکی سەگ و پشیلە و وڵاخیش دەگوترێت.

٢- پەڕە پەلەوەر: (بالیفەکەم کورکە مریشکە).
٣- کورک: کڕر: مریشکێکە ئارەزووی کەوتنی سەر هێلکانی، بۆ جوجکە هەڵێنانی ببێت. مەبەستی ئێمەش ئەمەیانە:

لە زەمانی زوو تاکو مریشکی دیکە، هێلکە لەسەر هێلکەکانی نەکات، لە ژووری ماڵەوە، دادەندراوە.رمش دمکران وبە زۆری لە بن خەلانکەی زەخیران بوو.

هەرکە مریشك کاتی کورك بوونی بهات بووایە، دەنگێکی تایبەتی کورك بوونی لێوە دەهات. بەمە دەزاندرا کورکە.

ئەگەر خاوەنەکەی مەبەستی دانانەوەی نەبووایە و هێلکە کردنی پێ باشتر بووایە، لەبەر ئاوێی هەڵدەهێنا، یاخۆ پەڕە مووچەیەکی لە کونی کەپوویەوەی هەڵدەکێشرا. تاکو لە کورك بچێتەوە. (بە داخەوە لە یادم نەماوە بەم دوو کارە مریشك لە کورك دەچووەوە، یاخۆ .. نا — نووسەر).

لەچلەی هاوین و زستان دانەدەندراوە. ئەگەر مریشکە کورکەکە بارکەی ساڵێ بووایە (١٥) پازدە هێلکە، تاکو (١٦) شازدەی لەبن دەندرا، خۆ ئەگەر سەرەمر بووایە لە (١٧) حەڤدە هێلکە هەتا (١٨) هەژدە هێلکە بوو.

مریشکەکە (٢١) بیست و یەك ڕۆژ لەسەر هێلکەکان دەکەوت. ناوە ناوە، بە جەستە و پێ و دەندووك هێلکەکانی هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکرد.

هێلکە هەبوو .. لەبەر ئەوە کاتی خۆی کەڵەباب بە سەر مریشکەکەدا نەفسی بوو پیسی دەکرد و فرێدەدرا.

کە جوجکەکە لەناو هێلکەکە پێدەگەیشت بە دندووك قەپێلکە هێلکەکەی کون دەکرد ئەمە تروکانی ناوبوو .. و بەرەبەرەی گەورە دەکرد تا دەیتوانی بێتە دەرەوە.

زۆر جار وابووە جوجەڵەکە بۆی نەکراوە بێتە دەرەوە دایکەکە بۆشایی یەکەی گەورەتر دەکرد. هەتا دەیتوانی بێتە دەرەوە.

مریشکەکە ماوەی (٢٤) سەعات، یان (٤٨) چل و هەشت سەعات (ئەگەر لێم نەبێتە درۆ بۆ ئاوودان و جیقنەکردن هەڵدەستا).

کە هەڵیدەهێنا پرپۆڵە بۆ جوجکەکان دەکرا. واتە ئاردی بۆ دەکرا هەوێرێکی پەیتی پتك پتك. جوجکە باشیان دەخوارد.
مریشکەکە زۆر بە موشتاق و سۆزەوە بە خێوی دەکردن. کەسێك دەستی لە جوجکەکانی بدابووایە، بە قیڕە قیڕ تاوی دەدایە.
زۆر جار جوجکەکانی دەبردە، دەرووەی حەوشە و (کۆلارە) باڵندەیەکە وەك داڵ وایە و جوجکە خۆرە لە ئاسمانەوە دەسووڕا و هەتا هەڵی بۆ هەڵدەکەوت جوجکەیەکی دەفڕاند. کەچی مریشك هەبوو زۆر دڕو وریا بوو. هەرکە کۆلارەکەی دەدیت لە ئاسمانەوە بۆ جوجکەکانی دێتە خوارەوە، بە توندییەوە بەرانگڕی دەبوو .. و نەیدەهێشت جوجکەی ببات و لەگەڵی بەشەڕ دەهات و جار وا دەبوو هەردوو لا پەڕیان لە یەکتر دەکردەوە.
***

کە فەراقە دەبوون (مێیە)کان (باڕۆکە)یان ناو بوو، نێرەکە کەڵەباب. هێندەجار (فەڕوج)یش بە هەردوولا دەگوترا. کە مێیەکە گەورەتر دەبوو (باڕکە)ی پێ دەگوترا، تا دەبووە مریشك. پێش ئەوەی بە هێلکە بێت کەلەشێر بە سەریدا دەفسێت.
مریشك ساڵێك بەسەر هێلکە کردن وەسووڕا بووایەوە (سەرەمڕ)ی نابوو.
هێلکە هەرکە ببڕژێت جێگەی فسی کەلەشێر قووڵە لە سپیلکەکەدا.
باڕکە لەسەروبەری هێلکە کردندا پاشەڵی گەورە و شۆڕ دەبێت. ئەگەر نەرم بوو ئەوە حەدوسەدی بە هێلکە هاتنێتی. ئەگەر نەرم نەبوو هێشتا ماوێتی بە هێلکە بێت.
ئەو ڕۆژەی بێ هێلکە بکات دەست بە (قارە قاڕ) دەکات. هەموو مریشك پێش هێلکە کردنی ئەو دەنگەی لێوەدێت، بەڵام باڕکە زیاترە.
شوێنێکی تایبەت بەخۆی دەبینێتەوە هێلکەی لێ بکات، یان ماڵەکە بۆی تەرخان دەکرد.
***

**ڕاوکە:**

ڕاوکە ئەو هێلکەیە بوو مریشك هێلکەی لەسەر دەکرد.

مریشك هەبوو، ئەگەر ڕاوکەی نەبووایە، تابۆی بلوابووایە هێلکەی نەدەکرد. کە تەنگاو دەبوو لە شوێنێکی نادیاری دەکرد. ئەوسا دەگوترا: (هێلکەی دۆڕاندییە).

هەندە جار لە جیاتی ڕاوکە سەلکە پیازێکی سپیی خڕیان بۆ دادەنا و هێلکەی لەسەر دەکرد.

هەر کە هێلکەی کرد بووایە، لەگەڵ هەستانی لەسەری قایم و لە سەریەك قەپە قەپی دەکرد.

مریشك هەبوو ڕۆژ نا ڕۆژێك هێلکەی دەکرد، هەبوو دوو ڕۆژی لەسەریەکی دەکرد و هەشبوو سێ ڕۆژ، چوارەم نەیدەکرد. واتە هەموو ڕۆژ هێلکەی نەدەکرد.

***

**مریشکی دەشتی هەولێر:**

مریشك لە زەمانی زوو سێ جۆر بوون.

١- ئاسایی مریشکی کوردی ناوچەکە بوو: (خۆماڵی).

٢- شامی لە جەستەدا وەك مریشکی ناوچەکە بوو تەنیا پەلەکانی زۆر درێژ بوون.

٣- کرماشانی: بەلەش و شاقەڵ زۆر لە مریشکی ناوچەکە گەورە تر بوو.

لەم دواییەدا، واتە لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی رابردوودا مریشکێکی ڕەنگ سۆر و باڵا کورت پەیدا بوو بوو .. و هێلکەکەشی سۆر بوو پێیدەگوترا: (مریشکی ئەمەریکی). کە ئەمڕۆ لە دەواجین باوی هەیە.

لە دوای ئەمە مریشکێکی بەڵەك نیوە سپی و ڕەش پەیدا بوو پێیدە گوترا (بۆتانی).

مریشك لەم ڕەنگانە بەدەر نەبوون:

١- بەڵەك: دوو ڕەنگ لە یەكتر جودا و قان قانی گەورە. بۆ وێنە: سنگی تەواو سپی و پشتی و هێندێك لە پەڕەكانی كلكی ڕەش و سەربال، هەندێك لە پەڕەكانی كلكی سپی. ڕەنگی تریش هەرئاوا.

٢- بۆر = كەوی:

٣- جنجڕ: دوو ڕەنگی تێكەڵاوی پنتك پنتك.

٤- ڕەش: هەموو جەستە ڕەش.

٥- زەرد: زەردێكی ئاماڵ سپی.

٦- سپی: جەستە سەرتاپا سپی.

٧- سۆر: سۆرێكی كراوەی ئاماڵ زەرد.

***

**ناوی مریشك بەهۆی پەڕەوە:**

١- پێ بە كورك: مریشكێكە پێیەكانی كوركی هەبێت نەك ڕووت.

٢- سەر بە كڵاوە: مریشكێكە هێندە پەڕی لە تۆقی سەری تەرحی كڵاو هەبێت.

٣- قوندە: مریشكێكە كلكی نەبێت.

٤- كلك فس: مریشكێك بوو كلكی تەنیا یەك دوو پەڕی هەبوو ڕوویان لە زەوی بوو، نەك قیت.

٥- گڤە: هێندە مریشك هەبوون ڕووی پەڕەكانیان بۆ سەرەوە قیت ببونەوە.

٦- گوپن: مریشكێك بوو ئەملاو لەولای ڕووی كورك بەرز بووبووەوە.

٧- مل ڕووت = مریشكێك بوو ملی تووكی لێنەهاتبوو. پێشتر (عەلمۆدە)ی ناوبوو.

***

**پۆپیتە:**

پۆپیتە: (پۆپنە) گوشتێكی ڕەنگ سووری كراوەیە، بەسەری مریشك و كەڵەشێر و عەلەشیشەوەیە = قوتكە. دوو تەرزە:

١- پۆپیتەی ڕەحمانی: پۆپیتەیەکی پان و ئەستوورە و بە بەرز نییە.
٢- پۆپیتەی شەیتانی: پۆپیتەیەکە قیت و تەنك.
ئەم پۆپیتەیە پەسندنەبوو.

***

**کەڵەباب: کەلەشێر**: هەموو شەوان، سێ جار لەیەك وەخت مانگی دەدا:
١- سەر لە ئێوارە و کاتی نووستن.
٢- نیوەشەو.
٣- کاتی بەیانی.
ئەگەر کەڵەبابێك لە کاتی دیکە بانگی بدابووایە دەگوترا: (کەڵەبابی ناوەخت).

***

**بانگدانی مریشک**:
جار وابووە مریشك وەك کەلەشێر بانگی داوە دەیانگوت:
- ئەوە سەری ساحێبی دەخوات.
یەکسەر دەکوژراوە.

***

**جێگەی هەڵنیشتن و هێلکەکردنی باڵندە.**
ئەمانە بە خۆیەوە دەگرێت:
١- **کۆریت**: ئەمە دوو جۆرە:
أ- کۆریتە سە:
شوێنێکی تایبەت بوو .. و نزیکەی مەتر و نیو بەرین و بڵند و لەشێوەی خانوو سەرگیراو لە وەرزی سارديدا سەگ تێیدا وەردەکەوت.
بەخانووێکی بچووك و تەنگە بەر دەگوترێت: (دەڵێت کوریتە سەیە).
ب-کولانە: لە تەرزی کۆریتە سەگ بوو قیچێك نەوی و دەرگە گچکەکە تر زستانان مریشك لێی هەڵدەنیشتن و هەندە جار هێلکەشیان تێدادەکرد.

٢- هێلانە:

ماڵی پەڕندە. ئەو شوێنەی کە باڵندە بۆ هێلکەکردن و بێچوو هەڵێنانی درووست دەکات.

ئەمەش دوو چەشنە:

أ- هەیە لەسەر زەوی، بەپووش و پەلاش ڕێکی دەخات.

ب-هەشە لە قەد .. دار و کونەشاخ و کەنداڵ و بیر. ئەمە هێلانەی ئەو کێشکانەش دەگرتەوە، کە لە کون و دەلاقەی بن ساپیتەی خانووان دەکەن.

٣- شانەی مێشهەنگوێن و زەنگە زۆرە و زەرگەتە و ... یەکەمیان زۆربەی خەڵك دروستی دەکات، ئەوانی دی بەخۆیان.

٤- لیس: دوو تەرز بوو:

أ- شوێنێکی تایبەت بوو بە شەپکەدار، یان بەرمیل و تەنەکە، لەقەد .. دیواری ژووری خانوو دروست دەکراو کۆتر هێلکەی لەسەر دەکرد.

ب-دارێکی تەژە، یان کورتە کاریتە، تایبەت داندراو مریشك لەکژی گەرمادا لەسەری هەڵدەنیشتن.

***

**ئەمانە بیستراون:**

١- هێلانە تێکچوون: کەسێکە ماڵ و حاڵی لێ تێکچوو بێت.

٢- هێلانە شێواو: هێلانە تێکچوون.

٣- هێلانە واز: گیاندارێکە هێلانەی خۆی لێ شێوا بێت.

٤- هێلکەدان: شتێکە وەك توورەگە لە نێوزگی باڵندەیە و هێلکەی تێدا دروست دەبێت.

***

**هێلکە شکانێ:**

لە زەمانی زوو ئێمەی منداڵ هێلکە شکانێمان دەکرد. یەکێك هێلکەیەکی لە نێو هەردوو لەپی خۆی دەنا و تەنیا قیچێکی لایە تیژی هێلکەکەی

وەدەردەخست. لایە پانەکەی بەرگەی هێلکە شکانێی نەدەگرت. یەکێکی دی تیژایی هێلکەکەی خۆی لێدەدا. ئەوسا یەکیان دەقنجا و مانا دۆڕاندی و هێلکە قنجاوەکە دەبوو ماڵی براوەکە.

ئەوسا ماڵی ئاغای گوندی (چینماچین)یان هەبوو. هێلکەیان لە دەرەوەی حەوشەیان لەنێو قانە تۆڵکان دەکرد.

هێندە منداڵ پێیاندەزانی و هەڵیاندەگرتەوە. هێلکەکە خاڵخاڵ بوو .. و پەلکی زۆر قایم بوو .. و بە هێلکە مریشک هەرگیز نەدەشکا. کەس هێلکە شکانێی لەگەڵ نەدەکرد.

هێندە منداڵ ئێستاش نازانم کوو خاڵخاڵەکەیان لەسەر لادەبرد و هێلکە شکانێیان پێدەکرد. هەرکە لە دوای چەند گەمەکە و نەشکانی ئەوجا دەزاندرا هێلکەی چینماچینە.

***

**مەکینەی جوجکان:**

من لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابردوودا مەکینەی (جوجکە هەڵینان)م هەبوو. چەند جارم داناوەتەوە. دەمنارد هێلکەی مریشکی خۆمانیم بۆ دەهات.

جارێك دوو سەت مریشك هەتا گەیشتنە هێلکەکردن هەر مریشکی بە (٦٠٠) شەش سەت فلووس لەسەرم وەستا. ئەوساش ئەو پارەیەزۆر بوو.

هەرکە بە هێلکە هاتن بەماوە (٢٠) بیست ڕۆژ پارەی خۆیان بە هێلکە فرۆشتن پڕکردەوە. جگە لە ئەوەی گۆشت و هێلکەمان لە مشەبوو.

بە هەندێ باش دەوروبەری حەوشەمان لە گەڕەکی ڕۆناکی ئەوسا چۆل بوو .. و زۆرجار بەرمدەدانە دەرەوەی حەوەشە.

دەرمانیشم بە ڕێکی دەدانێ. جارێك یەکێکیان تووشی نەخۆشی (نیوکاسل) بوو .. و سەر و ملی خوار بوونەوە. بردمە نەخۆشخانەی (بەیتەرە) ئەوسا لەسەر ڕێگەی (موسل) بوو گوتیان:

- ئەوانی دیکە دەرمانی نیوکاسل کاری لێکردوون ئەگەر نا مریشکێکت نەدەما.

***

**دووەم: پەلەوەری کێوی:**

من قیچێك شارەزاییم تەنیا لەو باڵندانەی خوارەوە هەیە، بۆیە ناتوانم شەلم کوێرم باسی باڵندەی دی بکەم:

١- **بارانبڕە:** من ئەوەم هەر لە ئاسمانەوە دیوە. تۆزێك لە ڕەشۆڵە گەورەترە و لە فڕیندا زۆر تیژە. ڕەشی ئاماڵ بۆرە:

شەست ساڵێك بەر لە ئێستا ئێواران (وەرزەکەیم لە یاد نەماوە) بە کۆمەڵ لەنێو گوندەکەمان دەردەکەوتن و ئامەشۆیان تەنا وەربەردەم دیوەخانی گوندەکەمانەوە بوو. بەدەیان جار لەسەر یەك دەسووڕانەوە و جۆرە دەنگێکیشیان لێوە دەهات. لاموابوو لەبەر بڵندی دیواری دیوەخانەکە بوو. لە جێگەی دیم نەدەدیتن ئاوا بە یەکەوە بسووڕێنەوە.

(بە بۆچوونی من (تەیرە ئەبابیل)ە بوون.

٢- **بوغاز.** کێشکەیەکی بۆرو پنتك پنتکی ئامال ڕەشی هەبوو. جەستەی قیچێك لە چۆلەکەکانی دەروروبەری گەورەتر بوو. لەوەرزی ساردیدا لە گوندەکەمان پەیدا دەبوو.

٣- **پەڕەسێلکە:** باڵندەیەکی کۆچەرییە و سەرەتای بەهاردەهات. ئەمڕۆ لەبەر وشکاتی ناوچەکە ئەویش پێی بڕیوە. ڕەنگ ڕەش و بن زگ سپی و کلك دوو فلیقان و لە سواندووکە گچکەترە.

ئەوەندە زۆر بوون، نەك لە هەموو گوندەکانی ناوچەکە، بگرە لە زۆربەی ماڵان هێلانەیان لەبن ساپیتەی خانووان درووست دەکرد.

لە ژووری ماڵی ئێمە لە قەد کاریتەی ناوەڕاستی ساپیتەدا هێلانەیان کردبوو.

جیقەنـەیان زۆر و پـیس بـوو. ئێمـە هـەرجارێ لـە ئاسـت هێلانەکـە جۆلانەیەکی پەڕۆمان هەڵدەواسی و جیقنەیانی دەگێڕاوە.

ئێمـەی منـداڵ زۆرمـان خۆشدەویسـتن. بەپیرۆزمانـدا دەنـا و هـەرگیز ئازارمان نەدەدان.

هەمووجارێ بۆ ئەوەی ماندوو بوونیان بسێتەوە، بە جووتە لەسەر تێلی (ڕسـتە)ی حەوشـەمان هەڵدەنیشـتن و دەنگیـان خۆشـبوو. ئەوسـا واحەملاندرابووم دەڵێن: (عَنِ اليمينِ وعَنِ الشِمّالِ قَعيد)

***

٤- جـوڕە پووتـە: کێشـکەیەکی بـۆر و پنتـك پنتکـی ئامـاڵ ڕەشـە و لـە چۆلەکەکانی دەوروبەری کەمێك بچووك و باریکترە. لـەوەرزی ساردیدا دەهاتە دێیەکەمان.

٥- **جوقجوقە:** جوقجوقە شینکەشی پێدەگوترا: لە سواندووکە بچووکترە و ڕەنگی شین و سپی و زۆر بەبزێو و ڕۆیینی قوتکە قوتکە بوو.

٦- **جۆخۆرکـە:** (لاموایـە: (جـۆرە پووتە)یـە و ئـەو ناوەشـی هەیـە. تـەواو دڵنیانیم — نووسەر)

٧- **ڕەشـۆڵە:** ڕەشـی پنتـك پنتکـی ئامـاڵ سـپیە و کـەمێك لـە کێشـکە گەورەترە و لەوەرزی سارێداد دەچێتە ئاوەدانی.

٨- **سواندووکە** = (پاساری): کێشکەیەکە متووی ناوئاوییی یە و ڕەنگ بـۆر و خـاڵ خـاڵ ئامـاڵ ڕەشـە و نێرەکـەی لـە دوور .. ڕا جیـاوازی لەگـەڵ مێیەکەی بە هۆی هێلی ڕەش لەسەر و بن چەنەیەوە.

لە چاوکێشکەکانی باسم کردن جەسـتە خڕتـرە و بـە بزێـو .. و جوولـە و ڕۆیینی هەڵقۆز هەڵقۆزانەیە.

لەناوچەکەماندا پێشـتر هێلانـەیان بـە زۆری لـەبن سـواندان دەکـرد. هـەر بۆیەش (سواندوکە)ی بە دوا کەوتووە.

ئەگەر چاویان بە زیندەوەرێکی نامۆی وەك مار بکەوتبووایە لێکرا بە تێك قژقژراوی و جریوە جریوەوە لە حەواوەی ئاستیدا دەسووڕانەوە.

٩- **سۆفە قیتـە:** کێشـکەیەکە لـە وەرزی سـاردیدا دەهاتـە نـاو ئـاوایی. لـە شێوەی جورە پووتەیە قیچێك سپی و لاق و ملی درێژترن و ڕۆیینـی لـە کێشکەی وەرزی ساردیدا خێراترە. سەری پۆپلەیەکی قیتـی بچووکە و بۆیە ئەو ناوەی ((سۆفە قیتە)ی بە دوا کەوتووە.

(بە منداڵی واحەملاندرا بوم لە کێشکەکانی دی کێل و هوڕترە و زوو بـە (فاقیێ) وەدەبێت. نووسەر).

١٠- **قەتیێ:** قەتیێ: باڵندەیەکە بە قەد کۆترە و تـەنیا قیچێك بـە تەنگـە و کورتترە چاوی زۆر جوانە و دەمنی کلی تێکراوە.

(لە زەمانی زوو بە ئافرەتی چاوڕەش و جوان دەگوترا: (چاوی دەڵێیـت: چاوی ((قەتێیە)) لامواییە بەیتێکی فولکلۆر لەم رووەوە هەیە و بەڵام لە یـادم نەماوە. نووسەر).

ڕەنگی بۆری پنتك پنتکـی جـوان و سـەر و مـل زەردو بـن چـەنەی نێـرە ڕەشــە و مێیــەش سـپی. کۆچـەرییە و سـاڵانە لـەکاتی دروونــە دەهاتــە ناوچـەکەمان. ئەوەنـدە زۆر دەهـاتن هـیچ ماڵێـك لـە گونـدەکانی قـەراج و کەندێناوە نەبوو قەتیێ و فەرەقەتێی ڕانەگرتبێت.

(من خۆم چەندین ساڵ قەتیێ و فەرەقەتێم ڕاگرتوونە نەخەسـەلە ئـەمیان جار وابووە ژمارەیان دەگەیشتە بیست سی).

ساڵێك ئەوەندە زۆر بوون هێلکەیان بە کۆشی دەهێناوە. (ئێمـەی منـداڵ هێلکەکانمان دەشکاند و لەگـەڵ ئاردمـان تێکـەڵ دەکـردن و لەسـەر سـێڵمان دەبرژاند. زۆر بەتام و خۆش بوو. پێماندەگوت: (هێلـە پەپـە) واتـە هێلکـە و پەپۆکە - نووسەر).

لە قرچەی گەرمای وەرزی دروونەی گەنمی ناوچەکە هێلانـەیان دەکـرد و لەسەری دەکەوتن.

(ئەوسا وا باو بوو نێرەکە لەسەر هێلانە ڕووە و ڕۆژ هەڵدەنیشـێت. بۆیـە ئێسـتاش لەگــەڵ بێـت ئەگـەر یـەکێك بـەرەو ڕۆژ ڕوو نیشـێت پێیـدەڵێن: (دەڵێیت: قەتێی نێرەی ڕووە و ڕۆژ دانیشیت - نووسەر).

ساڵ وابووە تـەبارە گـەنمی ناوچـەکانی گۆڕین وا دەهـات گوڵـەکانی بـە توندی تێکدەڕین و بێژینگت لەسەر یان دابنا بووایە نەدەکەوت بنیشی بـۆش بوو.

قەتێ لە ناو ئەو نەوعە تەبارەیـەی بـن بـۆش و سـەرگیراوەدا بـە دەسـت دەگـیرا. کـەرخی هێلانەکـەی، لەبـەر لاسـکە تەبارەکـەدا مـاوەی نـەدەدا ڕاستەوخۆ لەسەر هێلانەکە هەڵفڕێت.

دوو سێ بست بە پێڕەو کە دەڕۆیشت هەتا تووشی بۆشایی یەك دەبوو.. ئەوسا دەفڕی. تا ئەو ساتەش خەڵك دەیگرت.

١١- **کۆتره شینکه (کۆتره کێویلکه)شی ناوه:**

ڕەنگی سەرپشت و باڵی شینێکی سـپیپاتە و سـەرومل و سـینگی شـینی تۆخە و لەگەڵ خیتێکی هەمان ڕەنگ لە ئاخری باڵ و کلکی هەیـە. بۆیـە، بـە (کۆترە شینکە)ناو دەبرێت.

لە کەلێنی قەد کەنداڵ و کونی ناو کۆنە بـیران هێلانـە دەکـات. لـە درز و کەلێنی شاخانیش دەکات، بەس گوندەکەمان چیاو زورکی لێنەبوو.

کۆترە شینکە دوو نەوعی هەیە:

أ- کـۆترە شـینکەی ئاسـایی: نێرەکـەی لـە نێـرەی کـۆتری خۆمـاڵی ئەستوور و بە تەنگەترە.

ب-کۆترە شینکە باریکە: بە (کۆترە باریکـە)ش نـاو دەبردرێـت. هـەمان ڕەنگە. تەنیا لە بەدەندا ئەستوور نییە باریـك و درێـژە و لـە ئـەوەی تایەن گچکە تر دیارە. بۆیە بە (باریکە) ناو دەبرێت.

١٢- **لەقلەق:** باڵندەیەکی کۆچـەرییە و سـەرەتای بـەهاران دەهـات. ڕەنگـی سپی و سەر باڵەکانی ڕەش و دندووك و لۆقەکانی درێژ. لەگەڵ نیشتنی هەر جارێ لەسەر هێلانەکە دەستی بە تەقەتـەق دەکـرد. متـووی مـارو زندەوەری گچکەی بەهاران بوو. هەرکە ئەو بەهارە تەڕەی جـاران نـەما ئەویش پێی لە ناوچەکە بڕی.

لەقلـەق یـەکجار زۆر بـوون. گونـد نـەبوو لەناوچـەکەدا دوو سـێ هێلانـەی لەقلەقی لێنەبووبێت. هەتا لە ڕێگەی نێوان دیبەگە و هەولێر هێلانەیان لەسەر عاموودی تەلەفۆنان کرد بوو.

گوندەکەی ئێمە سێ چوار هێلانەی لێبوو. لەسەر خـانووی ئێمـە هـەبوو. من دەچووم سەیری هێلکەکانم دەکردن. دڵم نەدەهات دەستیان لێ بـدەم. لـە هەوەڵــەوە پــووش و چــیلکە و .. وردەدارو پــەڕۆی ســەر گوفــەکانیان خـڕ دەکردەوە و دەیانکردە هێلانە.

جـار وابـووە پارچـە قوماشـی هەڵیـەخراوی سـەر (ڕسـتە)ی ماڵانیـان بـۆ هێلانە بردووە.

هـەموو سـاڵێش دەهاتنـەوە سـەر هێلانـە کەونەکـەی خۆیـان و پێـوەی ماندوو نەدەبوون. تەنیا هێنـدە پـووش و پـەڕۆی نوویـان بـۆ شـوێنی هێلکـە دەکێشاوە. بۆیە هێلانەکەیان ساڵ بە ساڵ بڵند تر دەبوو.

من چەند جارم لە حـەواوە لەقلـەقم دیـوە بەشـەڕ دەهـاتن و پـەڕیان لـە یەکتر دەکردەوە.

***

گوایا: نێرەکە هاروهاج دەبوو ئەگەر هێلکـەکانیان ڕەش بکرابووانـە. مـن بە چاو نەمدیوە، بـەس منـداڵبووم ئەمـەم بـەرگوێ کـەوتووە: (گوایـا جارێك هێلکەی لەقلەقێك ڕەش دەکـرێن و نێرەکـە دەچـێت چـەند لەقلـەقی دیکـەی دەوروبـەر دەهێنێـت و دوای سـەیرکردنی هێلکـە ڕەشـەکان، هـەموویان لـە لەقلەقە مێیەکەی وەردێن و پارچە پارچەی دەکەن – نووسەر).

***

**لەقلەق هاتن:**

دوو پیاوی حسێبگری گوندی (خەزنە)ی سەر بـە حـاجی ئۆمـەران گـرەو دەکەن. یەکێکیان دەڵێت:

- ئەو شەو لەقلەق لەبەر ساردی ناگاتـە ئـاوایی و لەسـەر ئـەو دارانـەی فلان شوێن دەنیشێت.

ئەویتر دەڵێت:

- دەگاتە ئاوایی:

هەرکە شەو دادێت حسێبگری دووەم دەزانێت خۆی هەڵەیە و بە کوڕەکەی دەڵێت:

- کوڕم بۆچوونی ئەو ڕاستە، بۆ ئەوەی قسەی من سەرکەوێت بڕۆ لەسەر یەك لەو دارانەی فلان شوێن نیشتووە و بە دزی بیگرە و بیهێنە.

کوڕەش دەچێت لەقلەقەکەی دەهێنێت و لە ژوورێکی دادەنێن، بۆ بەیانی بە ئاگر گەرمی دەکەنەوە و بەرەڵلای دەکەن.

حسێبگری یەکەم هەرکە بەیانی زوو لەقلەقەکەی دەبینێت، یەکسەر لە گوڕو جم و جوولی لەقلەقەکە ڕادەزانێت بە ئاگر گەرم کرایەتەوە. سێبەردەی لە دەست دووەم دەنێت و دەڵێت:

- تەلاقم بۆ بخۆ ئەو لەقلەقە بە ئاگر گەرم نەکرایەتەوە ئەمن دۆڕاندم.

***

**پێڵاو و پینەدۆز:**

پێراو = (پێڵاو = پێڵاڤ):

شتێکی تایبەت بە ئەندازەی پێی بنیادەم درووست کراو لە ڕۆییندا لە پێی دەکات.

پێڵاوی زەمانی زوو ئەمانە بوون:

١- سۆل:

وەك نەعل وابوو، بەڵام ئاست پەنجەکانی گیرابوو .. و لە قایشی سۆر درووست دەکرا و پیاو لە پێی دەکرد. کەچی ئەمڕۆ لە تەرزی سۆل، بەشێوەیەکی شارستانێتی تر درووست کراوە و بە زۆری ژن لە پێی دەکەن و پێیدەگوترێت (بابۆجی بن نەوی) بابۆجی ژێر بڵندیش هەیە.

وشەی (سۆل) ئێستاش لە سەرزاران ماوە بۆ وێنە:

دەگوترێت: (ئازاد قۆندەرەکەی سۆلانی لەپێ کرد).

***

٢- قاپقاپە:

قاپقاپە پێڵاوێکی سەرپێیی بوو. سەری قاییش، یان لاستێکی ئەستوور بوو. بنکی شەپکە دار بوو .. و ئاست سینگی پێ و قونپانی لە ناوەڕاستی بڵندتر بوون. لە جیاتی نەعلی ئێستا، بە زۆری لە مزگەفتان بۆ دەستنوێژ بە کاردەهات. لە ڕۆییندا تەقەی دەهات.

***

٣- کلاش:

کراش = (کلاش) سەری بەبەن، یان دەزی چنراوو بنکی قاییش، یان لاستیك و پەڕۆ بوو. سەیر ئەمانە بکەن:

أ- کلاشی بن قاییش = (چەرم):

بنەکەی قایشێکی ئەستوور و سەرەکەی دەزی چن بوو .. و بە کلاشی قالتاخ ناو دەبردرا.

لە کژی بەهاردا بنەکەیمان بەگیا و گوڵ دادەخشاند هەتا دەبغ ببێت و زوو نەدڕێت.

بیلادی و خۆکردی هەبوو. زۆر جار بیلادییەکە بنکی لە ڕۆیشتندا جیڕەی دەهات.

ب- کلاشی بن لاستێك. دوو جۆر بوو:

یەکەم: لاستیکی ئەستووری ناو ڕێڕێی بیلادی بوو.

دووەم: دەسکرد بەم تەرزەم دیوە:

(پینەدۆز لاستیکی تایەی (ئۆتۆمۆبێل)ی دەتاشی هەتا بارستایی یەکە ئەندازەی پەنجەیەك دەماوە و ئەوجا بە قەدەر پێی بنیادەمی لێدەبڕی و هەر چوار دەوری بنە کلاشەکەی بە قاییش، یان بە پەڕۆی ئەستوور بە ئەندازەی پەنجە درێژە، بە بزمار لێیدەدا و ئەوسا بە (بن پەرك) ناو دەبردرا.

ئەوجا لەسەر ئەو بن پەرگە، بە پەرگی بەن، یاخۆ دەزی سەرەکەی دەچنرا.

هەبوو لێواری هەرچواردەورەی کڵاشەکەی، بۆ ئەوەی لەکاتی باراندا ئاو نەدات و هەم بۆ قاییمی قاییشی سۆری لای پینە دۆز لێدەدا.

پ- کڵاشی پەڕۆیین لەم دواییەدا پەیدا بوو. بە کڵاشی هەورامانی ناودەبردرا.

بەبیرم دێت منداڵ بووم هەورامی دەهاتن کەونە پەڕۆکیان بە بنیشت دەکڕی. ئەوسا من نەمدەزانی پەڕۆکەکەیان لۆچییە. لەو دواییەدا زانیم دەیکەنە بنەکڵاش.

**٤- کەوش:**

لە زەمانی زوو (کەوش) لە جیاتی (قۆندەرە) دەگوترا. ئەمەیان بەو دوایی یە پەیدا بوو.

کەوش جۆری هەبوو:

أ- کلکدار: ئەمەیان لە شاری کەرکووک درووست دەکرا.

بنی قالتاخ بوو .. و سەرەکەشی قاییش. بە زۆری ڕەنگ سۆر بوو. تاکەتاکەشی ڕەش بوو .. و بزمار ڕێژ لە بنەکەی وەك قۆندرە دەکوترا.

پاشپانییەکەی کلکێکی پێنج شەش سەنتیمەری بن پان و سەر باریکی هەبوو.

من ڕەنگە شەش حەوتێکم لەو کلکدارانە دڕاندبێت. سەرەکەی دەدڕا بنەکە، مەگەر کوو دەنا تەنکیش نەدەبوو.

ب-مەلایانە: جۆرە کەوشێك بوو، بەبێ قەیتان و سەر پشتە پێی زۆر درێژ نەبوو .. و هەتا بەرزایی پشتە پێدەهات. ڕەنگی بە زۆری ڕەش بوو. ئەوسا هەر مەلا لە پێیان دەکرد. لۆێی ئەو ناوەی بە دواکەوت. لەو دوایی یەدا ژنیش لە پێیان دەکرد.

پ- یەمەنی: لە تەرحی کڵاش بوو، بەڵام بنکی قالتاخ و سەری قاییش بوو. بە زۆری پیاوە پیرەکان لە پێیان دەکرد. ڕەنگی بە زۆری ڕەش بوو سۆریشی هەبوو.

***

**سەیری ئەو .. وشانە بکەن:**

١- کڵاش چن: کەسێکە سەری کڵاش، بەبەن، یان بە دەزوو بچنێت.

٢- کڵاش دروو: ئەو کەسەیە کڵاش چاك دەکاتەوە، یان درووستی دەکات.

٣- کڵاشە کردن: قوڕ هەڵقەنان و نووسانی بەبنی پێڵاوەوە و لە نێو زەویدا، دوای باران باریندا.

***

**پێڵاوی نوێ ئەمانەن:**

**١: قۆندەرە:**

ناوی (کەوش) نەماو (قۆندەرە) جێگەی گرتەوە. ئەمەیان دوو جۆرە:

یەکەم: قۆندەرەی قایشی = (چەرم):

پێڵاوێکی سەروبنی قاییشی بزمار .. ڕێژ و بەناو کەف و قەیتانداره ئەمانە دەگرتەوە:

أ- قۆندەرەی ئاسایی (جەلەبی).

ب- قۆندەرەی (باتا) ناوی مارکە کەیەتی.

پ- قۆندەرەی بنعانە: ئەمەیان تایبەت بە ئافرەتان بوو. هەنووکە بە (کەعبولعالی) ناو دەبردرێت. ئەوسا بە قەیتان بوو.

ت- قۆندەرەی پۆتین: لاسکی کەمێك درێژی تا باریکانی بەلەك و قەیتاندار = (لاپچین).

ج- قۆندەرەی چەکمە: (جزمە و جەزمە)شی ناوە. بۆ پێڵاوێکی چەرم = (قاییش)ی لاسك درێژە هەتا دەگاتە ئەستوورایی بەلەك و لەکاتی فوڕو باراندا لەپێ دەکرێت.

چ- قۆندەرەی عەسکەری: قایشی سەروبنی ئەستوور و پتەو بوو. لاسکی قیچێك درێژ بوو .. و دەگەیشتە باریکایی بەلەك و بە قەیتان دەبەسترا. بە (پۆتینی عەسکەری)یش ناودەبردرا.

ح- کامێچی: ناوی مارکەکەیەتی. ئەمەیان لەباتای جوان و نەخشاو تربوو.

***

تازە بلووغم بوو بوو کاکم قۆندەرەیەکی (کامێچی)ی ڕەنگ سۆری بە نەخش کڕی و بەپێی تەنگ بوو .. و دایە من. یەك ساڵی ڕەبەقم لە گوندی لاوەر دەمخوێند، بەردەلانێکی چڕ بوو، لەپێ کرد، ئەوجا دڕا.

لە ڕۆییندا قاییشەکەی جیڕەی دەهات. زۆرم لەدڵ خۆش بوو. ئەوسا جێرەی پێڵاو بە پەسند دەخەملاندرا.

***

**دووەم: قۆندەرەی لاستێك.** پێڵاوێکی سەرتاپای بێ بزمار لە لاستیك دارێژراو بوو. ئەمانە بوون:

أ- بە قەیتان تەرحی قۆندەرەی قاییشی جەلەبی ڕەنگی ڕەش و سۆر بوو. سپی و ڕەساسی لەو دوایی یەدا دەرکەوتن.

ب- بێ قەیتان: ئەمەیان بە زۆری ژن لە پێیان دەکرد.

پ- بن عانە = بێ قەیتان بوو (ئەگەر لێمنەبێتە درۆ چونکە تەواوم لەیاد نەماوە - نووسەر). پاشپانی خڕو قیچێك بڵند بوو. ئافرەتی گەنج لە پێیان دەکرد.

جـ - بە پەنجەرە: ڕەنگی زۆربەی سۆر و سپی بوو. لەو دوایی یەدا، ڕەساسی و ڕەش دەرچوون. بە زۆر گەنج لە پێیان دەکرد.

چـ- پێبە جانی: پێڵاوی بە پەنجەرەی منداڵی گچکە بوو.

د- پۆتین: ئەمە دژی پۆتینەکەی پێشووە. لاستێك و لاسکی بڵندترە و دەگاتە نزیك ئەژنۆ. ئەگەر بنی ئاسایی بێت بۆ پیاوانە و دوو جۆتم لەم تەرحەدا دڕاندووە. ئەمڕۆش کرێکاری (سەببە) و (چەمەنتۆ) بە زۆری ئەو پۆتینەی لەپێ دەکەن.

خۆ ئەگەر بنەکەی تەسك و تۆزێك بڵند بووایە بۆ ئافرەتان بوو.

***

٢- کاڵە:

پێڵاوێکە سەرجانگ و بنی لاستێك و بە قەیتان. پێشتر هەر ڕەنگی سپیی هەبوو. کەچی ئێستاکە ڕەنگی ترو بەڵەکیش هەیە.

**٢- نەعل:**

ئەمەیان دوو نەوعە:

یەکەم: قاییشە و پاش نەعلی لاستیك دەرکەوت، بنکی قاییشە و سەریشی لە ئاست پشتە پێ قاییشێکی چوار پێنج پەنجە پانە.

ئەوەی لەم زووانە دەرچووە سەری پانترە، یا خۆ دوو ڕیزە و قولفێکیشی بۆ تێخزانی پەنجە گەورە هەیە.

دووەم: لاستیکە. شێوەکەی یەك تەرزە ئەویش سەرەکەی چوار پێنج پەنجە، پانە و ئەملاو ئەولا کونە و بێ بزمار. ئەمە ئەمڕۆ لە مزگەفتان جێگەی قایقاپەی گرتوەتەوە.

***

**تێبینی:**

ئەم بابەتە زۆری ماندوو کردم لە هەندێکیان دڵم تەواو ئاو ناخواتەوە تکایە: ئەگەر لە شوێنێك سەرچیغ چووبم، یاخۆ ناوی پێڵاوێکم لەیاد پەڕیبێت حەرەجم لێ مەگرن ئەوەش بزانن تەنیا تایبەتە، بە دەشتی هەولێر و بەس.

***

**پینە دۆز:**

پینەدۆزی: (پینەچی، پینەساز، مشەقە): کەسێکە پینە (جورغ) لە پێڵاوان بدات.

پینە دۆز ساڵی دوو کەڕەت، بەسواری گوێدرێژ دەهاتە گوندەکەمان و هەگبەیەکی پڕ کەل و پەلی پینەدۆزی و دروست کردنی پێڵاوی پێبوو. جاریش وابووە بە ئۆتۆمۆبێل دەهات.

کەڕەتێك لە وەرزی پایز دەهات پێڵاوی لۆکڵی زستان دروست و پینە دەکرد.

دووەم: لە وەرزی بەهاردا پێڵاوی لۆ کڵی هاوین دروست و پینە دەکرد.

بە زۆری لە پەنا دیواری مزگەوت، یان پەنا دیوەخانی دەخست.

***

پینەدۆز ئەمانەی پێبوو:

١- بزماری وردود رشت.

٢- بزماری سێگۆشەیی سەر ئەستوور.

٣- بنەپێڵاوی قاییش و لاستێکی بیلادی و دەستکرد.

٤- درێشە بۆ کون کردنی قاییشی ئەستوور کاتی دوورینی.

٥- چەقۆی دەم ڕاستی زۆر تیژ، بۆ بڕینی قاییش و لاستێکی ئەستوور.

٦- چەقۆی دەم کەوانی بۆ ڕێکخستنی بنەپێڵاو.

٧- سندان: بە دوو مانا دێت:

یەکەم: ئاسنێکی قاشۆ ئاسا چەماوە و نزیکەی نیو مەتر بڵندو لای سەرەوەی قیچێك پانێکی وابوو بە نێو پێڵاواندا دەچوو. بنەکەی بە ئەندازەی هەشت تۆ سەنتیمەتر تیژ و سەرەوەی تیژایی یەکە گرێیەکی ئەستووری هەبوو. هەتا لە کاتی چەقاندن و چەکوچ لێداندا لە تیژایی یەکەی زیاتر نەچێتە خوارەوە. کەچی ئەمڕۆ لە جیاتی تیژایی یەکە بنکی پانێکی وایە سندانەکەی ڕادەگرێت.

دووەم: پەنمانی ڕێخۆڵە کوێرەیە: (فلان سندانی لێهات و کوشتی) واتە ڕیخۆڵە کوێرە کوشتی. کەچی لەبەر ناپەسندی وشەی (سندان) نەدەگوترا و بگرە: ((لێهات و کوشتی) دەگوترا.

٨- قالتاخ و قایشی ئاسایی و لاستێکی بیلادی و تایەی ئۆتۆمۆبێل بۆ بنە پێڵاو بە کاری دەهێنان.

٩- گاز: بۆ دەرکێشانی بزماری کوتراو.

١٠- مەقەس: بۆ هەڵپاچینی قاییش و لاستیك.

١١- ناڵچە = (ناڵی قۆندەرە).

١٢- دەرزییەکی ئەستوورو داوێکی تایبەت.

***

**کاری پینەدۆزی ئەمانە بوون:**

١- قۆندەرەیەك بنی کون، یاخود تەنك دەبوو پینەدۆز بنێکی نوێی، لە لاستیك یان (قایش)ی بیلادی لێدەدا. پێڵاوەکە ئەگەرچی قاییم دەبوو، بەڵام لە پێکردنی قورستر دەبوو.

هەندەجار قایشەکە بیلادی نەبوو، خۆی قالتاخی پێبوودرووستی دەکرد.

٢- پاشپانی لێنان: پارچە قایشێکی تۆزێك ئەستوور، لە ئاست لاسکی پاشپانی لەلای ژوورەوەی بەم تەرزەی چەسپ دەکرد: بنی بە بزمار لە ژێر قۆندەرەکەی گیر دەکرد و لای سەرەوەشی بەلای دەرەوەی دەنووشتاندەوە و بە درێشە کونی دەکرد و بەخێتێکی تایبەت درووست کراو لەم سەر و بۆ ئەو سەری دەدووری. ئەمە لاسکی قۆندەرەکەی ڕەق دەکرد و لەکاتی لەپێ کردندا نەدەچەماوە و درەنگیش دەدڕا. ئەمە (پاشپانی لێنان)ی ناوبوو.

٣- پینەکردن: پینە بە (جورغ)یش ناودەبردرا.

قۆندەرەیەك جێیەکی کون ببووایە پینە دۆز جورغێکی لێدەدا.

٤- جۆتباقی: پێڵاو هەبوو شوێنی بەیەك گەیشتنی لاسکی سەری و لێواری زوو دەپچڕا، پینەدۆز لە هەر لینگێك دوو پینەی یەك لەملاو ئەویتری لەولا دەدا. ئەمە (جۆتباقی) ناوبوو.

٥- درووست کردنی بن کڵاش و لێدانی بن پەرگ پێشتر باس کراون.

٦- درووست کردنی کەوشی (یەمەنی) ئەمەش باس کراوە.

٧- ناڵچە لێدان: نارچە: (ناڵچە) ناڵی کەوشان بوو. پارچە ئاسنێکی تەنکی کەوانەیی بوو .. و سێ چوارکونی جێی بزمار لێدانی تێدابوو. لە بنی قۆندەرەی کەرخی سەری پەنجە و دواوەی بنی قۆندەرە دەدرا. تاکو بنی قۆندەرەکە زوو نەدڕێت.

هەشبوو لەملاو لەولای تەنیشتەکانیشی دەدا. من چەند جارم لێداوە و هەندەجار ئاسنەکە دەخورا و یەکێکی ترم لێدەداوە.

لەو دواییەدا بزماری سێ کۆشەیی سەر ئەستوور لە جیاتی ناڵچە بەکار دەهات.

٨- ناو کەف لێنان: زۆر کەس قۆندەرەی دەبردە کن پینەدۆز ناو کەفێکی قایشی لە ناوەکەی دەدا. ئێستا ناوکەفی تایبەت درووست کراوی قاییش و لاستیك زۆر بوونە.

***

**جل و بەرگی پیاوان:**

**یەکەم: کورتەك و شەرواڵ:**

(شەرواڵی زەمانی زوو .. و ئێستا هەر وەك یەکن بۆیە ئێمە لێرەدا هەر باسی کورتەك، کە گۆڕانی بەسەردا هاتووە دەکەین نووسەر).

کورتەکی زەمانی زوو ئەمانە بوون:

١- کورتەکی سەلیم بەگی = (مامەشی)یشی پێ دەگوترا: ئاتەك درێژو وەك کەوا دەخرایە سەر یەك. لەشێوەی ساقۆدا بوو .. و بێ قۆپچە هەندجار لۆکەی تێدەکرا. بەرکی لەلای ژوورەوە هەبوو. بە زۆری پیاوی پیر لەبەری دەکرد.

٢- ستارخانی: قۆڵی وەك قۆڵی چاکەت بوو .. و هەڵنەدەدراوە. یەك ڕیزە قۆپچەی هەبوو. هەر دوولا بەرکی هەبوو گۆییەکانی نزیك مل کورت بوون و قیت نەبوون. (من ئەو تەرحە کورتەکەم لەکاتی جاحێلی دیوە، جانازانم پێشتر هەبووە، یاخۆ نا — نووسەر).

٣- مورادخانی: ئێستا ئەمە بەرەو کزی دەچێت. هەردوولای بەرك و قوپچەی هەیە. گوێی ئاست مل لە ستارخانی قیت و بڵند ترن.

(من چەند کورتەك و شەرواڵم لەو تەرزەدا دڕاندووە — نووسەر).

سەر دەمایەك لێواری کورتەك قەیتانی بۆ جوانی لێدەدرا. تایبەت بە گەنجان بوو.

(من دوو کورتەکی بە قەیتانم دڕاندووە. یەکێکم لەسەرەتای شەستەکانی سەدەی رابردوو بردە لای ماڵی مامم لە گوندەکانی ناوچەی

سیوەیل و شاربازێڕی قەزای چوارتا بوو). زۆریان لا عەنتیکە بوو — نووسەر).

ئەو سێیانەی باسکران بەریان هەبوو.

کورتەکی زەمانی ئەمڕۆ ئەمانەن:

٤– ساکار (دیموکراتی)یش پێدەڵێن. پێشەوەی دوو بەرکی هەیەو .. و بەبێ بەرو قۆپچەیە.

٥– کراسی = وەك کراس و چۆغەیە و بێ قوپچەیە و بەرکیشی لە ناوەوەیە.

***

**قوماشی ئەوسا تەنیا ئەمانەم لە یادماوە:**

١– فەتاح پاشا: دەگوترا (سوفە). واتە خوریبوو.

٢– قوماشی سوفی ئینگلیزی ئەمەیان گران بوو .. و بە هەموو کەس نەدەکرا.

٣– لە زەمانی گەنجاتیم قوماشێکی ڕەشی سادەی بریقەدار پەیدابوو پێیدەگوترا: (قەمەندۆری ڕەش).

(من کورتەك و شەرواڵێکم لێ دراندووە — نووسەر).

زۆر ناسك بوو. کوڕێك تازە کورتەك و شەرواڵێکی لێکرد بوو پیاوێك بۆ جەرباند قوماشەکەی بە دوو قەدی خستە نێوان هەردوو دەستییەوە و تەرحی قرچانەوەی لێکرد و دەلحاز درا.

قوماشی تریش هەبوون بەس ناویانم لە یاد کردووە.

***

**دووەم: ڕانك و چۆغە:**

(من زوو لە ناوچەکەماندا ڕانك و چۆغەم نەدیوە خەڵکەکە لەبەریان کردبێت، یاخۆ لە یادم نەماوە. بەس خۆشناو دەهاتن لەبەریان بوو. لە وەرزی سارديدا چۆغەیان لەسەر کورتەك لەبەردا بوو. ئێستا ڕانك و چۆغە زۆر بوونە ئەگەرچی بە خۆم دوو سێ ڕانك و چۆغەی مەرەزی ئەسلیم

دڕاندووه، له گوندەکانی ناوچەی سیوەیل و شارباژێڕم لۆ دەهات، بەڵام درووست کردنی تێدا نەژیاوم، نەبادا تێیدا سەرچیغ بچم خۆم لە قەرەی نەداوە.

رانك و چۆغەیەکی عادیم کڕی. دەیانگوت: (بە مەکینە دروست دەکرێت). ڕەنگی مۆرێکی ئاماڵ سوور و زۆر جوان بوو. لە دەورەی مامۆستایەتیدا ساڵی ١٩٥٩ – ١٩٦٠ لەبەرم بوو – نووسەر).

***

**سێیەم: کراس**

(ئەوەی لە یادم مابێت هەر ئەو جۆرە کراسانە هەبوو بیرم بۆ هیدیکە ناچێت – نووسەر).

(خامی) سپی بوو: (چاوپان)، یان (شەعادە) بوو .. و یەخەی کراوە و لاسکەکانی وەك کەوا دەخرانەوە سەریەك. هەندێکیان ئەنگوچکی درێژیان هەبوو .. و پیاو لە قۆڵی خۆیان دەئاڵاند. تەنیا لەکاتی ئیش کردندا سەرەکانیان لە یەکتر دەبەستاو دەخرانە پشت ملەوە.

کەچی ئافرەت بە پشتە خۆیدا شۆڕ دەکردەوە.

ئەنگوچك، ئەنگوچکە بە (سۆرانی و فەقێیانە)ش ناودەبردرا. ئەنگوچك چەند درێژبووایە پەسندبوو. واد ەبوو سوار لەسەر پشتی وڵاخ بە ئەنقەست ئەنگوچکەکانی دەکردەوە و سەرەکانی ئەوەندە شۆڕ دەبوو دەگەیشتە نزیك عەردی. ئەوسا بە مەقبوول دەخەملێندرا.

کراسی گەنج و منداڵان یەخەی وەك فانیلە وابوو. تەنیا سەری پێوە دەچوو.. و بەیەك قۆپچە دادەخرا.

کراسی منداڵی گچکە لە جیاتی قۆپچە بە دوو کشتەکە پەڕۆی بە کراسەوە بوو لە یەك دەبەسترا. قوماشی ئەمەیان هەر سپی نەبوو .. و ڕەنگدار و گوڵ گوڵیشی هەبوو.

***

**چوارەم: دەرپێ**

زوو دەرپێی خامی سپی بوو. بە زۆر چاوپان بوون. بە بۆچوونی خۆم ئەگەر لێمنەبێتە درۆ خامێکی ((یابان))ی بوو. ئەوسا ناوی یابانیان بە ((جاپان)) دەبرد و کوردیش کردوویە بە ((چاوپان)).

چاوپان لە شەعادە ئەستوور و شاشتر و سپیەکی ئامالْ بۆر بوو. هەر ئەو خامەبوو دەکرا ((کفن))ی مردووان، دەرپێیان لێدرووست دەکرد.

لە کاتی دروونە و گێرەدا جوتیاران دڵیان نەدەهات شەروالی لەپی بکەن. دەرپێی ئەو خامەیان لەپێ دەکرد.

ئەوسا خامەکە تۆزێك قاییم بوو.

شتی سپی لە کاتی ئیش و کارکردندا زوو پیس دەبێت. نەخەسەلە، لە ئیشی فەلاحەتی، بۆیە لە ((چویت))یان دەنا.

چویت دەرمانێکی شین و پەیتی چوار گۆشەیی بوو. لە ئاوی گەرم دەکراو دەتاوا وەودەرپێیەکەیان دەخستە ناوی.

هەندە گەنج پێش ئەوەی لە چوێتی بنێن ئەملاو ئەولای دەرپێیەکەیان لە سێ چوار جێ، بەبەنی باریك توند دەپێچاو دوای شین کردنی هەرکە وشك دەبووەوە بە نەکەیان لێدەکردەوە و شوێنەکانیان ڕەنگی نەدەگرت و ئەڵقە ئەڵقەی سپی و دەماوە و دیمەنی دەرپێیەکەی جوان دەکرد.

***

**پێنجەم: پشتێن: ئەمانەشی هاتووە: ((پشتێند. پژێن. پشدێن)).**

پشدێن: هەروەك پشدێنی ئەمڕۆ. قوماشی سادەو هەمە ڕەنگ بوو. هەندێك لە گەنجەکان ڕەنگی پشدێنەکەیان لە ڕەنگی کورتەك و شەروالی بەریان دەکرد. ئەمە لەو دواییەدا بووەتە مۆدیل. لایە درێژکانی بەیەکەوە دەدووراو.. وەك جۆرکی لێدەهات. کەچی ((بەخۆم دیومە هەندێ کەس لەناوچەی سلێمانی لەبەر ئەوە پشتێنەکەیان کورت و لە پشتدا پۆزی

نەدەبوو پارچە قوماشی کەونیان لەناو دەنا. بەس لە دەشتی هەولێرم نەدیوە. جا نازانم هەبووە، یان بەرەواژی: نووسەر)).

پشدێن ئەوسا درێژبوو.. و لە ئاست ناوکدا، لە یەکتریان دەپێچا و قەفەکانی لە دوورەوە دیاربوون. ئەم تەرزە بەستنە سێ سوودی هەبوو:

١- بەرۆکی خاوە نەکەی توند دەکرد.
٢- لە کاتی ئیش و کاردا نەدەبووەوە.
٣- ئەو شتەی لەبەر.. ڕادەکرا، وەك کیسەتووتن و خەنجەر نەدەکەوت.

***

**شەشەم: دۆخین:**

دۆخین چنراوێکی ((کەژی))یانەیە و باریکێکی وایە بەکونی نیفۆی دەرپێ)) و شەرواڵەوە دەچێت.

من تەواو ئاگاداری مێژووی سەرهەڵدانی دۆخینی چنراو نیمە.

بەس داکم لە سییەکانی سەدەی رابردوودا ((تەونکەر)) بووە و جگە لە درووست کردنی مافوور و بەڕەو تێر و تورو ملاکدان و جەواڵ و خراردا، گوریس و کەژی و دۆخینیشی هۆنیوەتەوە.

من لە دەوری ((١١)) یازدەساڵیدا شەرواڵم بۆ کراوە و دۆخینم بەنی هۆنراوەی گوریسی بووە. واتە خرپوو..، نەك پان، دۆخینی بەن و موشم بەیەکەوە دیوە.

باشم بەبیرم دێت ئەو تەرزە دۆخینەم: واتە خرۆکیم دەعەمەل هێناوە و سەرەکەیان بە بەنی باریکی ڕەنگاو ڕەنگ پێچراو ئەویدی لەو زەماناوە، بە پانی و کەژینانە چنراو و سەرەکەی دەکرا چواربەش و بەبەنی باریك و ڕەنگاو ڕەنگ پێچراو.. و سەری بەشەکان کرابووە گوڵینگ، هەتاناوە ڕاستی سەدەی رابردوو.

دۆخینی من هەر بەن بوو. لەوساکەوە بوو بە دەزی. جا لەیادم نەماوە دایکم دەزییەکەی لە کوێ و کووی پەیدا دەکرد.

دۆخینم هەندە جار بەن و دەزی بووە.

دۆخینی دەزی ڕەش و سوور و پەمبە و شینیشم هەبووە.

***

((مامم حەمە شەریف))ی خوالێخۆشبو لە هەشتا ساڵی ڕەتدابوو. لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی رابردوودا سەردانی کردین. دۆخینی بەنی لوولدرابوو. هەتا دۆخینی زۆربەی خەڵکی شاری سلێمانی و دەوروبەری پلیتە چرابوو. دایکم چوار دۆخینی بە دڵ و داوی بۆ درووست کرد لە دەزی سپی. سەرەکانیانی بە ئارمووشی ڕەنگاو ڕەنگ پێچاو لۆ هەر سەرە دۆخێنێك چوار گوڵینکیشی لە خۆوەی درووست کردن.

مامم هەرکە دۆخێنێکی لە شەرواڵی هەڵکێشا، ((لە ژیاندا زۆر قسە خۆش و نوکتە باز و سوحبەتچی بوو)) سەرە دۆخینەکەی بە ئەنقەست لە بن پشتێن بە دەرخست و گوتی:

بچمەوە ئەمەی بە ئاغاو پیاوە گەورەکانی ناوچەکەم نیشان دەدەم و پێیاندەڵێم: ((ئەو سەرە دۆخینە گوڵینگدارە جوانانە لە ((......)) کامتان....

***

**حەفتەم: پۆشاکی سەر: ((سەروپۆتەلاتەك)).**

پۆشاکی سەر ئەمانە بوون:

١- **جەمەدانی:** لە زەمانی زوودا کەم بوو.. و بەزۆریش فەقێ لە سەریان دەنا. ڕیشی بەگوڵینگ لۆدەکرا و بنەوەی جەلەی هەر لەخۆیەوە بوو. ئەمڕۆ ئەو کەسانەی سەریان کۆت نییە زۆربەیان جەمەدانیان لەسەرە.

((جەلە)) بەو مانایانە دێت:

أ- چەند ئاژەڵێك بەیەكەوە لە ملەوە ببەسترێنەوە تاكو لەكاتی قەتاركێشیاندا بە سانایی ڕاكێشرێن.

ب-پیفۆك و شمریشاق دوای هەڵقەنانیان دەهۆنرانەوە و وەك دەستەوانەی لێدەهات. هەندە جار زۆر گەورە دەهۆنراوە ئێمەی منداڵ وەك خەناو كە لە ملی خۆمان دەكرد و لۆماڵەوەمان دەهێناوە: ئەمە ((جەلە)ی ناوبوو.

پ- بۆ ئەوەی بنی ڕیشی جەمەدانی و چەفیە و هەوری و شتی تر بەیەكەوە ببەسترێنەوە و ئەملاو ئەولای ڕیشەكان زوو نەدرێن لە بنەوە جەلە دەكران جۆرە هۆنرانەوەیەك بوو.

٢- **چەفیە:** چەفیەی قوماش ئەمڕۆ لە ناوچەكە، مەگەر بەدەگمەن دەنا نەماوە.

پێشتر زۆر بوو. زۆربەی گەنجەكان لە سەریان دەنا.

قوماشی چیت و كودەریی ڕەنگاو ڕەنگی گوڵ گوڵی بوو.

پاش ڕیش بادانەوە لەسەر دەنرا.

((من چەند چەفیەی چیت و كودەریم دڕاندووە. نووسەر))

٣- **هەوری:** ئەمەیان بە زۆری پیاوی جوامێر و ماقوولەكان لە سەریاندەنا.

هەوری ڕەش و هێڵ ئاماڵ سپی و سۆری ئاماڵ ڕەش هەبوو.

ڕیشی هەوری زۆر لە ڕیشی جەمەدانی و چەفیەی درێژتر بوو. جەلەكەی بۆ جوانی ئار مووشی كەسك و سۆر و شین دەكرا. ئێستاش تاك تاك ماوە.

٤- **كڵاو = ((كراو)):** كڵاو شتێكی درووست كراوی خڕو ناو قوڵی وەك جام و فراوانیشی بە ئەندازەی سەری مرۆڤە و سەرپێچی لەسەر دەبەسترێت. ئەمڕۆ بە تەنیاش لەسەر دەنرێت.

كڵاوی زەمانی زوو.. و ئێستا:

أ- **كڵاوی كۆن:** لە ئەمانە درووسست دەكرا: ((پەڕۆ، دەزی، خوری)).

یەك: كڵاوی پەڕۆ: زەمانی زوو هەر ئەوەتە بەبیرم دێت لە پەڕۆی سادە و گوڵ گوڵی درووست دەكرا.

((شێوەی دوورینەكەی ئەمەیانم نایەتەوە یاد. بەس بەدەگمەن هەبوو.. و من بەچاو دیومە. نووسەر)).

سادەكەی زۆربوو. پەڕۆی سپی و خامەك بوو. سپییەكەی بە دەزی سپی دووراو و بەزۆری مەلاو پیاوی بەدین و ناودار لەسەریان دەدا.

هەبوو سپییەكەی سەری بۆ جوانی بە سامتینی سپیی ئاماڵ زەرد، یاخۆ.. كەسك و شین نەخشێندرابوو.

خامەكە كە بەزۆری ڕەنگ شین و مۆر و سۆر و كەسك بوو.. و سەرەكەی بە ئارمووشی ڕەنگاو ڕەنگ نەخشیندرا بوو. قەدەكەشی بە زۆری بە دەزی ڕەش، یان لە ڕەنگی خۆی دوورابوو. نێوان هەر... دوو ڕێزە دوورمانی قەدی، پلیتێكی باریكی پەڕۆی لەژێرەوە بوو. بۆ ئەوە بوو تاكو قەدی كڵاوە توند و ڕەق بێت.

***

خوالێخۆشبوو: ((مام سمایل))ی (كڵاو فرۆش)) خەڵكی گوندی ((گەزۆر))ی ناوچەی قەراج بوو. كوڕی ناوی ((محەمەد)) بوو. تۆزێك لە من بەتەمەنتر بوو، بەیەكەوە، لە حوجرەی گوندی ((مەحمەر ئۆمەران)) مان دەخوێند ـ نووسەر)). كڵاوی دەگێڕا. كڵاوەكانی گشت خامەك بوون و سەریان بە ئارمووشی هەمە ڕەنگ نەخشێند رابوون. هەندێكیشیان بە سامتین.

لێواری كڵاوەكانی ڕەق و توند بوو. ڕەقییەكەی لام وابوو بەهۆی ((چریش = ئەسترێلكەوە)) و لە ناوەوەی درابوو:

كڵاوەكانی مام سمایل پێشكەوتنیان پێوە دیار بوو. لەچاو كڵاوی پێشتر.

لاموابوو ئەگەر لێمنەبێتە درۆ، تەواوم لەیاد نەماوە هەرە گرانییەکەی بەنیو دینار، یان دوازدەدرهەم بوو.

ئەوساش ئەوپارەیە زۆر بوو.. نووسەر))

***

**دوو: کڵاوی خوری:**

کڵاوی خوری سێ جور بوو:

جۆری یەکەم: من هەرئەوەتە بەبیردێت کڵاو هەبوو ساف لە خوری درووست کرابوو. لێواری قەیتانێك پەڕۆی لێدرابوو.. تاکو هەڵنەوەشێتەوە..

ناویشی ((ئەگەر لێمنە بێتە درۆ.. نووسەر)) پەڕۆی تێگیرابوو.. و بە ((ئارەقچین)) ناو دەبردرا.

جۆری دووەم: لوای بەرخ بوو. پەرەچی لەگەڵ قاپووتی دروسست دەکرد. تەرحی هەندە ساقۆ کڵاوی هەیە. شوان لە ئاقاردا، لەکاتی باران باریندا قاپووتی لەسەر شانی دادەنا و کڵاوەکەشی لەسەر دەکرد.

جۆری سێیەم: کڵاوی سەپان و پاڵان بوو: ئێمە پێمان دەگوت: ((سەر کڵاو)).

سەرکڵاو پێنج شەش سەنتیمەتر لێواری زێدە هەبوو. بۆ سێبەری دەموچاو.. و سەر و مل. سەریشی تەرحی گومەت قیت بوو. ناوەوەشی پەڕۆی تێگیرابوو. ئارەقچنی ناوبوو. سەپان لەکاتی دروونەو ئیشی پەرێز و گێرەدا لە سەری خۆی دەنا.

***

**سێ: کڵاوی دەزی:**

((ئەوەیانم تەواو لەبیر نەماوە. لاموابوو بە دەزی و سامتین دروست دەکرا _ نووسەر)).

وەك کڵاو ئەمڕۆ چنینەکەی توند نەبوو.. و شل و خاو بوو.

***

**چوار: کڵاوی کورکە حوشتر:**

کڵاو هەبوو تەنیا لە کورکە = ((توکە)) حوشتر درووست کرابوو.. و لێواری قەیتانە پەڕۆی لێدرابوو.

من یەك لەو تەرزە کڵاوەم چاك بەبیر دێت: بە توندی دوو سێ جارم لەبان سەری خۆمەوە سووڕاند و قرچە قرچی ئاگر لە کورکەکەوە هات. ئێستاش نازانم کڵاوەکە هی خۆم بوو، یان هی یەکێکی تر.

***

**ب- کڵاوی نوێ:**

مەرام ئەو کڵاوانەیە، کە لە نیوەی پەنجاکانی سەدەی رابردوو دا و.. وێروە درووست کراون و پێشکەوتنیان تەواو پێوە دیاربوو. ئەمانەن:

١- **کڵاوی پوولەکەدار:** قوماشەکەی خامەك بوو.. و سەری بە ئارمووشی هەمەڕەنگ نەخشاو.. و ئەوجا پوولەکەی بریقەداری ناوەناوە لێدرابوو. ئەمە تەنیا گەنجەکان لەسەریان دەنا.

((خامەك)) قوماشێکی نایاب و چنراوێکی مەیلەو ئارمووشی تەنك بوو و نرخی گران و بەرەغبەت بوو. تایبەت بوو بە ئافرەتانەوە.

٢- **کڵاوی خامەکی** ڕەنگ سۆر و زەرد و کەسك و شین و مۆر هەبوو. قەدی زۆر بەوردی و دەزیی ڕەنگی خۆی و بەبێ پلیت دوو رابوو. سەریشی بە ئارمووشی رەنگاو ڕەنگ و ((سیم))ی زەرد و سۆر بە نەخشی ورد ورد نەخشێنراو. دیواریشی بەهۆی ((ئەسترێلکەوە)) ڕەق و توند.

٣- **کڵاوی سپی:** پەڕۆکەی سپی و دوورمانی ورد و ڕێك و قەدی لەچاو کڵاوی سپیی پێشان زۆر توند و ڕیکتر بوو.

٤- **کڵاوی دەزی** = **((دەزوو)):** هەمە چەشن و ڕەنگ و چنینی جوان و پوخت و قەدی توند و ڕەق بوو.

٥- **کڵاوی کۆیی:** تازەترین و نایابترین کڵاوی سەردەم بوو. کەچی من نازام مێژووی سەرهەڵدانی لۆکەینێ دەگەڕێتەوە. **لێوار و سەری پەڕۆی ((ئاسایی)) و خامەك بوو.** سەرتاپای سەروقەدی بەسیم و ئارمووشی هەمە تەرز و.. وردە نەخشی جوان و قەشەنگ نەخشێندرابوو. دیوارەکەی دیارنەبوو. لێواریشی بە ئارمووش شیراز کرابوو.
نرخی چوار هەندەی نرخی کڵاوە باشەکانی سەردەم بوو. هەموو کەس بۆی نەدەکرا.

من سێ چوارێکم لەو چەشنە کڵاوانە دڕاندووە و یەکێکشم بەدیاری لۆ کوڕە مامم نارد لە ناوچەی سیوەیل و شارباژێڕدا. لەبەر نەخشی زۆرەوە قەدی نەدەنووشتاوە سەر یەکتر. لۆیی بە کەلك گەمەی ((کەڵەمستانێ)) نەدەهات.

***

٦- **کلێتە:**

کلێتە کڵاوێکی چنراوی خۆماڵی بەنەو لە ناوەڕاستی تەپڵە سەردا گوڵینگێکی گەورەی هەیە و ئەملاو ئەولای لسکی هۆنراوەی گوڵینگداری لەخۆیە و لەبن گەردەن تێکدە پەڕن و بەلای پشتەوە شۆڕدەکرێتەوە.

یەك ڕەنگ بوو: ((سپی و سوور و زەرد، یان قاوەیی و ڕەش)) بەزۆری گەنج و مێردمنداڵ و منداڵ لەسەر یان دەنا. هەتا ئەمڕۆی حازریش ماوە و باوی هەیە.

***

سەیری ئەم وشانە بکەن:

١- کڵاوچن: ئەو کەسەیە کڵاو دەچنێت.
٢- کڵاودار: باڵندەی سەربەکڵاوە. واتە تۆقەڵەی سەری گودڵەی پەڕی هەبێت. ئەمە کێشکەی ((سۆفەقیتە)) و پەپوولە سلێمانە و مریشکی

سەبەکڵاوەش دەگرێتەوە. ((لاموایە جۆرە بازێکیش کڵاوداره)).
٣- کڵادرو: ئەو کەسەیە کڵاو درووست دەکات.
٤- کڵاو کوڕ: ناوی چیایەکە.
٥- کڵاوکوڕە: سۆفەقیتەیە ((ئەگەر لێمنەبێتە درۆ)).
٦- کڵاو ڕۆژنە: کونی سەربان. دووکەڵکێش.
٧- کـڵاوی ئافرەتـان: ئەمــە لێـواری لەبــەر پاڵەپەســتۆی دەســترۆکەوە ئەسترێلکی زۆر لێدەدرا، لە کـڵاوی پیـاوان ئەسـتور و ڕەق تربـوو. لەبـەر گەرمی پێچانی دەسترۆك بە دەوریدا سەر لەژێریدا ئارەقەی دەکرد، هەتا ئەسترێلکەکە نەتاوێتەوە و بەسـەری ئافرەتـەوە نەنووسـێت پەڕۆیـەکیان لەناو کڵاوکە دەدووری ((ئارەقچن))ی پێدەگوترا.

***

**گوریبە و چەلین:**

سەردەمایەکی زوو گۆریـە لـە بـەنی باریك دەچـنرا = دەهـۆنراوە. ئەگـەر بەنەکە سپی بووایە، بە بەنی ڕەنگاوڕەنگ دەیاننەخشاند. خـۆ ئەگـەر سـۆرو ڕەشبووایە، بە بەنی سپی دەنەخشێندرا. گۆریە هەبوو قاییشـی لـەبن دەدرا، یان لە قونپانی و سەرە پەنجەکانی. ئەمە تەنیا بۆ پیاوی بە ساڵاچوو بوو.

گۆرییە و چەلین چەند بڵێیت گەرم بوو. بە زۆری شوان و گاوان بۆ گەرمی لە وەرزی سادیدا لە پێیان دەکرد. پیاوی بە تەمەنیش تاك تاکە.

من جووتێکم لەو تەرزە گۆرییە دڕاندووە.

لە ئاخر و ئۆخری پەنجاکان و سـەرەتای شەسـتەکانی سـەدەی رابـردوودا لەجیاتی بەن بەدەزوویان دەهۆناندەوە من گۆریـەی ڕەش ڕەشـم سەرپشـتە پێ گوڵی سپی و سۆر و کەسکی لێکرابوو دیوە.

***

**چەلین**

وشـەی ((چـەلین)) تـەنیا لـە فەرهـەنگی ((کوردسـتان))م بەرچـاوکەوت و دەڵێت: ((چەلین گۆریەی ڕەنگاو ڕەنگ))ە.

بەلۆچۆنی من ((چەلین)) بەنێکی چنراوی لەشێوەی دۆخین بوو، بەڵام، تەنک و خاوتر بوو.. و سەری گۆرییەی پێ لە بەلەك دەستا. واتە لەشێوەی بەلە پێچ دابوو بۆ گۆریەکە بەس ئەوەندە پان و درێژ نەبوو.

***

**بەلە پێچ = ((بەلەك پێچ)):**

لە زەمانی زوو ((بەلەپێچ)) لەبەن لەشێوەی کەژی درووست دەکرا. تەنیا قیچێك تەنك و شل و تەسکتربوو. شوان و گاوان بەزۆری لە وەرزی ساردیدا لە بەلەکیان دەپێچاو لەکاتی بەڕێوە بردنی کارەکەیان.

***

**جلك و خشلی منداڵان:**

ئەمانەی خوارەوە بوون:

١- بەروانکە: خامێکی تایبەت درووست کراو سینگ و بەرۆکی منداڵی دادەپۆشت و نەیدەهێشت بەهۆی لیکاو.. و خواردن و شتی تر کالەکەی پیس بێت.

٢- پێبەجانی: پێڵاوی بە پەنجەرەی منداڵان بوو. لەم دواییەدا پەیدابوو بوو.

٣- چەناغە: جۆرە خشڵێکی منداڵان بوو لە کۆچك دەدرا.

٤- ددانە ڕێوی: ناوەندی ددانی ڕێوی لە زێڕ، یان لە زیو دەگیراو بۆ جوانی بە کۆچکی منداڵانەوە دەیەخرا.

٥- قانقاورە: خڕخاڵی منداڵان بوو. زیو بوو..و چوار پێنج زەنگولۆکەی لاوژۆکەدار و پلپلەی پێوە بوو. لەکاتی ڕۆیشتنی منداڵەکە دەنگی دەهات.

٦- کراس: خامێك بوو لە شێوەی دیشداشەی ئەمڕۆ بوو.

٧- کورتەك: خامی پڕ لۆکە بوو. تەرحی ساقۆی ئەمڕۆ ئەستوور بوو.. و لە وەرزی زستان لەبەر دەکرا.

٨- کۆچك: خامێك بوو.. وەك جۆرێك لەسەری منداڵان دەكراو تەنیا ڕووی نەدەگرت و داوێنیشی هەبوو بە پشتەوەی شۆڕ دەبووەوە.

***

**چەكە خاڵانە:**

وادەبوو پیاوێك كیژی خۆی بە ماڵ = ((شیربایی)) دەدا، لەكاتی بووك بەڕێ كردندا خاڵی كچە ڕازی نەدەبوو.. ببیەن، هەتا ماڵی زاوا هێندە پارەیان دەدایێ و ئەوجا ڕازی دەبوو، یان لەكاتی مارەكردن وەریدەگرت. ئەمە چەكە خاڵانەی ناو بوو.

***

**خزم:**

خزم: كەس و كار و قەوم و خوێشی مرۆڤ.

خزمایەتی: نزیكی و كەسایەتی یەكێك لەگەڵ یەكێكی تردا.

خزم دۆست: كەسێكە نرخی خزمایەتی بزانێت و ڕێزیان بگرێت.

فەرموون سەیری ئەمانە بكەن:

١- ئامۆزا = منداڵە مام.

٢- ئامۆزازا = نەوەی منداڵە مام.

٣- ئامۆزازازا = بن عام.

٤- باب = ((باڤ، باوك)) = نێرینەیەكە منداڵی لێ بكەوتەوە.

٥- بابان = باوان: ماڵەباب.

٦- بابانە = نێرینەی باڵندە.

٧- بابە = باوكە: وشەیەكە بابی پێ گاز دەكرێت.

٨- بابە گەورە = باپیر.

٩- بابرا = ئامۆزا.

١٠- باب و باپیر = باب و پیران.

١١- باب و باپیران = ئەژداد.

١٢- با بۆ = بابە.

١٣- بابی باب = باوکی باوك = باپیر.

١٤- بابی باپیر = باوکی باپیر = باپیره گەوره.

١٥- بابی داك = باوکی دایك = باپیر.

١٦- باپیر = بابی باب، یان بابی داك.

١٧- باپیران = ئەژداد له باب بەسەرەوه.

١٨- باپیره = وتەیەکە لەکاتی گازکردنی باپیر بەکار دێت.

١٩- باپیره گەوره. بابی باپیر.

٢٠- باپیری باب = باپیری باوك = باپیره گەوره لەلایەن بابەوه.

٢١- باپیری داك = باپیری دایك = باپیره گەوره لەلایەن داکەوه.

٢٢- باجوا = دوو ئافرەتن ژن بەژنیان پێکرابێت.

٢٣- برا = نێرینەیەکن لەداك و بابێك بن، یان لەیەکێکیان.

٢٤- برازا = نەوەی برا. منداڵی برا.

٢٥- برازازا = نەوەی منداڵی برا.

٢٦- برای باب = برای باوك = مام.

٢٧- برای بابی = بۆ دوو کەس دەگوترێت له بابێك بن.

٢٨- برای باب و داکی = دوو کەس له پیاوێك و ژنێك بوو بن.

٢٩- برای داك = برای دایك = خاڵ.

٣٠- برای داکی = برای دایکی = دوو کەس لەداکێك بوو بن.

٣١- برای داك و بابی = برای باب و داکی.

٣٢- برایەتی = ١- پەیوەندی بەهێزی برایەتی لەنێوان دوو برا.

٢- دۆستایەتی دوو پیاو بەیەکەوه.

٣٣- پلك = ((پوور)): خوشکی باب، یان خوشکی داك.

٣٤- پلکزا: منداڵی خوشکی باب، یان منداڵی خوشکی داك.

٣٥- پلکی باب = خوشکی با پیرت لەبابەوه.

٣٦- پلکی داك = خوشکی باپیرت لەداکەوە.
٣٧- خاڵ = برای داك.
٣٨- خاڵان = کەس و کار و عەشیرەت و هۆزی داك.
٣٩-خاڵانە = لە زەمانی زوو: کیژێك بە ماڵ بدرابووایە، خاڵەکەی لـەکاتی گواستنەوەدا، بەر بەست دەبوو.. و نەیدە هێشت بووك بەڕێ بکرێـت. ئەوسا ماڵی زاوا هەندە پارەیان دەدایە. ئەمـە ((چـەکەخاڵانە))ی پـێ دەگوترا. ئەمڕۆ سوواوە و بووە بە ((خاڵانە)). یان لەکاتی مارەکردندا وەردەگیرا.
٤٠- خاڵە = وشەیەکە بۆ گازکردنی خاڵ بەکاردێت.
٤١- خاڵوان = خاڵان.
٤٢- خاڵۆ = خاڵ.
٤٣-خاڵۆزا = منداڵی خاڵ.
٤٤-خاڵۆزازا = نەوەی منداڵی خاڵ.
٤٥-خاڵۆژن = ژنی خاڵ.
٤٦-خوارزا = خوشکەزا.
٤٧-خوچە: ١- لۆ ڕێزلێنان بە خوشکی گەورە دەگوترێت.
٢- لەبەر هۆی سەرەوە هەندەجار پیاو بە ئافرەتی بێگانە دەڵێت.
٣- زمانی زوو کارەکەر بە ژنە ئاغاکانیان دەگوت.
٤٨-خوشك = مێینەیەکە لە باب و داکت بێت، یان لە یەکێکیان.
٤٩-خوشکایەتی: ١-پەیوەندی بەهێز لەنێوان دوو خوشکەوە.
٢- دۆستایەتی دوو ئافرەت بەیەکەوە.
٥٠- خوشکەزا = خوارزا: منداڵی خوشك.
٥١- خوشکەزازا: منداڵی منداڵی خوشك.
٥٢-خوشکی باب = پلك، پوور.
٥٣-خوشکی باب و داکی = خوشکت بێت لە باب و داکەوە.
٥٤-خوشکی بابی = خوشکتە تەنیا لە بابەوە.

٥٥- خوشکی داك = پلك پوور = ((میمك)).
٥٦-خوشکی داکی = خوشکت بێت تەنیا لە داکەوە.
٥٧-خوشکی داك و بابی = خوشکی باب و داکی.
٥٨-خوشکی گەورە ١- خوشکێك لە خۆت گەورەتر بێت.
٢- دوو خوشك یەکێکیان بەتەمەنتر بێت:
٥٩- خوشکی گچکە: ١- خوشکێك لەخۆت گچکەتر بێت.
٢- دوو خوشك یەکێکیان گچکەتر بێت.
((من داخوازی خوشکی گچکەم کرد)).
٦٠- خوشکە لە = لەرووی ڕێزەوە بە ئافرەتی بێگانە و تەمەن گچکە لە کاتی بانگ کردندا دەگوترێت.
٦١-خوشکێ: لۆ گازکردنی ئافرەتی بێگانە و نەناسراو لەلایەن پیاوەوە دەگوترێت.
٦٢- داپیر = داکی باب، یان داکی داك.
٦٣- داپیرە = داپیر.
٦٤- داك = دایك = ئافرەتێك منداڵی ببێت.
٦٥-داکانە = دایکانە = لۆ باڵندەی مێیە بەکار دێت.
٦٦- داك برا = دایك برا = دوو کەسن لە داکێك بووبن.
٦٧- داکی باب = دایکی باوك = داپیر.
٦٨- داکی داك = دایکی دایك = داپیر.
٦٩-دایە: ((ئۆدا)): لۆ گازکردنی داك بەکار دێت.
٧٠-دایە گەورە = داپیرە.
٧١-دش = خوشکی مێرد.
٧٢- زڕباب = زڕباوك = باوە پیارە. مێردی داکت لە دوای بابت.
٧٣- زڕداك = زڕدایك = ژنی بابت. داکی تۆ نەبێت.
٧٤-شووبرا = برای مێرد.
٧٥- کاك = براگەورە.

٧٦- كاكه: ١- كاك.
٢- ناوى كوڕانه.
٣- بۆ گازكردنى پياوێكى نهناسراو بهكار دێت.
٧٧- كاكۆك = كاك.
٧٨- كوڕ = منداڵى نێرينهى داك و باب.
٧٩-كوڕه ئامۆزا = منداڵى نێرينهى ئامۆزا.
٨٠-كوره پلك = كوڕه پوور = منداڵى نێرينهى پلك = پلكزا.
٨١-كوڕه خاڵ = منداڵى نێرينهى خاڵ.
٨٢-كوڕهزا = منداڵى نێرينهى كوڕ.
٨٣- كوڕهزازا = منداڵى نێرينهى كوڕهزا.
٨٤-كوڕهمام = منداڵى نێرينهى مام = ئامۆزا = پس مام.
٨٥-كيژ = كچ = منداڵى مێيينهى داك و باب.
٨٦- كيژه ئامۆزا = كچه ئامۆزا = منداڵى مێينهى ئامۆزا.
٨٧- كيژه پلك = كچه پوور = منداڵى مێيينهى پلك.
٨٨- كيژه خاڵ = كچه خاڵ. منداڵى مێيينهى خاڵ.
٨٩-كيژه زا = كچه زا = منداڵى مێيينهى كيژ.
٩٠- كيژه زازا = كچه زازا = منداڵى مێييهنهى كيژه زا =
٩١- مام = براى باب. براى باوك.
٩٢- مامه = بۆ گازكردنى مام دهگوترێت.
٩٣-مامۆژن = ژنى مام.
٩٤-مامى باب = مامى باوك = براى باپيرت لهلايهن پشتهوه.
٩٥-مامى داك = مامى دايك = براى باپيرت له لايهن زگهوه.
٩٦-نهنه = نهنك.
٩٧-نهنك = نهنكه.
٩٨-نهنكه = داپيره. داكى باب، يان داكى داك.
٩٩-ولآشزاوا = دوو پياو ژنيان خوشك بن.

١٠٠- هەوگیان = ژنی برای مێرد.

***

**تێبینی:**

١- هەر خزمێك لەلایەن بابەوە بێت پێی دەگوترێت: ((خزمی پشت)).

٢- هەر خزمێك لەلایەن داکەوە بێت بە ((خزمی زگ)) ناو دەبردرێت.

***

## چەند خواردنێکی ناوچەکە

**باسترمە:**

ڕۆژێك لەگەڵ دایکم چووینە شاری هەولێر. نەمدەزانی تەمەنم چەند بووە. بەس بلووغم نەبووبوو. میوانی ماڵی خواڵێخۆشبوو ((وەستا مەعرووفی چەخماسان)). ماڵیان لەسەر کەندەکەی گەڕەکی ((تەعجیل))، بوو. دۆستایەتیان لەگەڵ ماڵی ئێمە هەبوو. نەخەسەلە دایکم لەگەڵ خێزانەکەی.

ماڵەکە دوو کاوڕە دابەستوویان کوشتبووەوە. ((ئافرەتەکە ناویم لەیاد نەماوە)) هەر تەختە گۆشتێکی بستێك زیاتر، خوێیەکی زۆری پێدا دەکرد و دەیخستە نێو گۆزەیەکی شینی سەر واڵا.

منیش بەدایکم گوت:

- ((ئەوە چییە؟)). چونکە چ جارم نەدیبوو.

گوتی: ((ئەوە: باسترمە..ی پێ دەڵێن. هەرکە کۆسکەکە پڕبوو دۆنی گەرمی بەسەردا دەکەن. هەرکە دۆنەکە مەیی هەواناداتو بۆگەن نابێت. ئەوسا لە جێیەکی فێنك لە بن عەردی دەنێن. لەوەرزی زستاندا هەر جارێ تەختەیەك، دووان دەردەهێنن و شیوی پێ لێدەنێن)).

لەمە دەردەکەوێت وەرز پایز بوو بێت. چونکە باسترمە لەو.. وەرزە دەکرا.

***

**((بەربەسێر = ((بەربەسێڵ)):**

بەرخ دەکوژراوە تەنیا سەروپێچك و.. ورگەکەی نەبێت هەمووی بە دونگەوە ورد.. دەکرا.

سێڵی ڕەشی نانیان بە زیخ و چەگل جوان دەشوشت و هیچ تەنی و ڕەشایەتیان پێوە نەدەهێشت و دەیانخستە سەر ئاگر و گۆشتەکەیان بەبێ ئاو تێدە کرد. تەنیا بە ئاوی دونگ و بە زەکەیەوە دەکولا.

هەرکە کولا ((بەربەسێر)) یان پێ دەگوت. پێش ئەوەی لەسەر ئاگر بهێننە خوارەوە جامە ماستێکی گەورەیان تێدەکرد. ڕەنگی گۆشتاوەکە بە ماستەکە دەگۆڕدرا. نزیك بە رەنگی قوراو دەکات بۆیە بە ((قوڕاو)) ناو دەبردرا.

دۆستی دڵسۆزم: خوالێخۆشبوو ((خەلەفە عەلی))ی گوندی ((عەتێرە))ی ناوچەی قەراج و عەشیرەتی جبوری بۆی گێڕامەوە:

من لەگەڵ فلان پیاو: ((ناوداری ناوچەکە بوو، بەداخەوە ناوەکەیم لەیاد نەماوە)) چووینە ماڵێك لە گوندی ((گرد گراو))ی هەمان ناوچە، خواردنیان لە نێو سێڵ بۆ هێناین، پیاوە ناودارەکە، لەبەر ئەوە خواردنەکە لەنێو سێڵ بوو و ڕەنگیشی جوان نەبوو بێزی نەهات بیخوات. من بە عەمری خۆم خواردنی ئەو هاخۆشم نەخواردووە.

منیش پێمگوت: ((ئەمە تەنیا گۆشت بەرخ و ماست بووە و بەس)).

ئەمە بۆ میوانی تایبەت درووست دەکرا. ماڵی ئێمە لەبەر ئەوە بەهاران بەرخە کۆرپەمان زۆر بۆ دەهات ساڵی جارێکمان دەخوارد.

**پیرخەنی:**

ئاردە ساوارە، یان ئاردە برووشە، وەك شلە ساوار دەکرێتە شیو. لەبەر ئەوە جوێنی ناوێت و لە قلەقانە ئاوا دەکرێت، بۆ پیری بێددان باش بوو، بۆیە ئەم ناوەی بەسەردا سەپاوە. واتە پیران خەنی دەکات.

***

**تەڕەساز:**

((تورشی کۆنی کوردەواریی ناوچەکە)):

**تەڕەساز بەم شێوەیە دەکرا:**

١- شێلم ورد، دەکراو خوێی پێوە دەکرا و بۆ ماوەی ڕۆژێك دادەندرا.

٢- هەویر بە هەویر ترش دەکراو سەری دادەپۆشرا هەتا دەترشا.

ئەمە لەجیاتی ((خەل))ی ئێستا بوو. ئەوجا هەویرەکە لەنێو مەنجەڵی پڕ ئاو دەکراو هەڵدەپشاوترا.

٣- ئاوی سەرەوە، بەبێ ترپاتەکە لە مەنجەڵێکی تر دەکرا.

٤- دووبارە ترپاتی هەویرە هەڵدەپشاوتراوەو ئاوەکەی لێدەگیرا. ئەوجا دادەندرا هەتا هەویراوەکە ساف دەبوو.

٥- شیلمەکە جوان دەشوورا هەتا خێواوکەی دەبڕاو لە هەوێراوە کە دەکرا.

٦- گەنمە کوتا بلقێکی پێدەدرا و دادەندرا هەتا تۆ زێك گەرمایی دەماو لە ئاوەکە دەکرا.

٧- بۆ ماوەی دوو ڕۆژان سەری دادەپۆشرا. ئەوجا دەبووە تەڕەساز.

ترشێکی بۆ ئەو سەردەما زۆر خۆشبوو.

ماڵی ئێمە زۆر جاریان کردووە و بەبێ ئێوە ناخۆش چەندین جارشیم نۆش کردووە.

***

**جەرگ و دو:**

جەرگ و دو: سواوەی ((جەرگ و دونگ))ە.

جەرگ و دوونگی بەرخ بە ئەندازەی جەرگەکە وەك قیمە ورد ورد دەکرێن و لە نێو مەنجەلێکدا بەس بە ئاوی دونگەکە سوور دەکراوە. خواردنێکی یەکجار بەتامە.

ئەمە زۆرکەم بوو.. و لە ئاواییەکی سەت ماڵیدا تەنیا لە ماڵی ئێمە دەکرا. بەزۆریش ئەگەر جەژنە بکەوتبووایە وەرزی بەهار و بەیانی بۆ مزگەوتمان دەنارد.

((من نەمدیوە جگە لەڕۆژی جەژنە ئەم خواردنەمان بووبێت ـ نووسەر))

***

**دۆ بەکەشك:**

گەنمە کوتا دەکوڵێت و کەشك لەنێو ئاو دەکرێت و پاش نوانەوەی هەتا گرێ و گواری نەمینێت لەنێو هەردوو لەپ وا دەکوشرێت تا لەگەڵ ئاو تێکەڵ دەبێت. ئەوسا لەنێو گەنمەکوتایەکە دەکرێت و دەخرێتەوە سەر ئاگر و هەرکە کوڵا ڕوونی تێدەکرێت. زۆر بەتام و خۆشە.

ساڵێ جارێك هێندێك لە پیاو ماقووڵان داوای ئەو شیوەیان لەو ئافرەتانەی لێزان بوون لە لێنانی دەکرد.

***

**دۆینە:**

دۆینە شیوێك بوو بەم چەشنەی خوارەوە لێدەنرا:

سەر هێڕی بڕووش لەگەڵ دۆ.. و کاردی و تەڕە پیاز و هێندە جاریش پونگی تێدەکرا. ڕوونیش سەربار)).

سەرهێڕ = واتە سەرە سەرە درشتەکەی.

***

**شیوی برنج:**

ئەو ساڵانەی من فەقێ بووم شیوی برنج زۆرکەم بوو. هەموو ماڵێك نەیبوو بیخوات، تاکو بدرابووایە فەقێیان. وادە بوو لە هەفتە، یان دە ((١٠)) ڕۆژ جارێك شیوی برنجی ماڵی ئاغا، یان ماڵی مەلا دەهات. نەشدەزاندرا لێ بندرێت. ((نەکوڵابوو..، یان زۆر نەرم بوو. ئەوجا فەقێ لە حەواوەیان دەقۆستەوە))..

هەرکە شیوی برنج دەهات لە شیوەکەی دیکەمان جوودادەکردەوە. کە فەقێیەکان تێر دەبوون و هەڵدەستان. ئەوسا هەریەکەیان پارە نانێکی لەسەر ناولەپی خۆیدا دەناو فەقێیەك بەملاکی شیو خواردن بە سەریانی دابەش دەکرد. دوای قوتدانی برنجەکە دەمانگوت: ((وای حسێب دەکەین شیوەکەی ئەمڕۆمان هەمووی برنج بووە)).

***

**قاورمە:**

لە دەشت لە بریتی ((باسترمە))، ((قاورمە)) هەبوو.

بەم تەرزە بوو:

دابەستوو، یان ئاژەڵێك بکوژرابووایەوە گۆشتەکەی بە جەمێك و دووان تەواو نەدەبوو، گۆشتەکەیان، بە بەزەوە دەکوڵاند و لەنێو مەنجەڵی شیویان هەڵدەگرت. گۆشتیش بەم شێوەیە و خوێشیان تۆزێك لە حەدی خۆیان پتر تێدەکرد تێك نەدەچوو. ناوە ناوە هێندێکیان دەکردە شیو.

من کاتی منداڵیم ڕۆژێ بەلای کەمییەوە جارێك بەدزی دەچووم پشکە گۆشتێکم بە بەزو دۆنی ساردەوە ئاوا دەکرد.

***

**کفتە:**

کفتە بڕووش و هێندە ئاردەساواری، بۆ ئەوەی کفتەکە یەکتر بگرێت تێدە کراو لەنێو ئاو دەکرا هەتا دەنواوە. ئەوسا دەشێلدرا و دەکرا کفتە.

کفتە بە کابان دەگۆڕدرێت، کابان هەیە کفتەکەی لەکاتی کوڵاندا هەڵناوەشێتەوە. هەشە زوو هەڵدەوەشایەوە.

کفتە لە زەمانی زوو سێ جۆربوو:

یەکەم: کفتە بەگۆشت:

ناوەخنی پڕ گۆشت بوو. لەگەڵ شیوی ترش و گۆشتدا لێدەندرا. ئەمەیان ئەوسا زۆر کەم بوو.

دووەم: کفتەی بە هێلکە:

ناوی لەجیاتی گۆشت هێلکەی تێدەکرا. هێندەجار لە بریتی هێلکە پیازی سوورکراوەی نێوڕوون کەمێك بڕووشیشی وەگەڵ دەخرا، ئەمەش بۆ شێوی دۆخە وا دروست دەکرا. ئەوسا زۆر بوو.

سێیەم: کفتە بەدرۆ:

نەگۆشتی تێدا بوو، نە هێلکە و پیاز. تەنیا بڕووشی ڕووت بوو. لەنێو شێوە ترشێکی زۆر.. ڕوون و بێدان دروست دەکرا.

کفتەکە زۆر.. ڕەق بوو. هێندە جار گەنجەکانی سەردەم لەنێو شانی یەکتریان داوە و شوێنەکەی ئەستوور بووە. ئەمەش زۆر بوو.

***

**نان:**

دەبێ لە بەراییدا باسی ئەمانە بکرێت:

**١- فەرشە:**

فەرشە = (پنە)) خڕ و سێ پێچکەیە و ئەنگوتکە هەویری لەسەر، بەهۆی تیرۆگەوە، پان دەکرێتەوە.. پێشتر فەرشە لە ((گێچ = گەچ)) دروست دەکرا، کەچی ئێستا لە دار و کاشی دروست دەکرێت.

بە دەیان جار دایکم فەرشەی لە گێچ، لەبەر چاومی، بەم تەرزەی دروست کردووە:

گەچەکەی وەك قوڕێکی نە توند، نە شل دەگرتەوە.

سینییەکی گەورەی نانی لێوارەکەی، لەبەر ئەوە زۆر بەرز نەبوو.. و گێچەکەی لێدەڕژا، گوریسی لە دەورەی بە جۆرێکی وا دەئالاند وەك لێواری لێدەهات. ئەوجا گەچە گیراوەکەی تێدەکرد. هەرکە بەرەو پەیتی دەچوو بە گێچی گیراوی دیکە سێ پێچکەی بۆ دەکرد. هەرکە پەیت دەبوو، گوریسەکەی لێدەکردەوە و ئەو لێوارەی بە گوریسەکەیەوە نووسابوو ناڕێك و لیرلیر بوو. بە چەقۆ دەلحاز لووسی دەکرد.

هەرکە تەواو پەیت دەبوو، بە دوو کەسان سینیەکەیان وەردەگێڕاو فەرشەکە لەسەر پێچکەکان دەوەستا. ئەو لێوارەی بە سینییەکەیەوە

نووسا بوو ڕێك دەخست، پشتەکەی بە دەمە چەقۆ، یان بە پەڕۆیەکی دڕ لووسی دەکرد.

**٢- تیرۆك:**

دارێکی ڕاست و لووس و خڕ و درێژی نزیکەی مەترێك دەبێت. ئەنگوتکە هەویری پێ لەسەر فەرشە، پان دەکرێتەوە.

پێشتر دۆم دەهاتن دروستیان دەکرد. ئەو زەمان ئەمسە و ئەوسەری خڕ و ڕەنگاوڕەنگ بوو. هێندەجار بۆ ئەوەی لە کاتی ئەنگوتك پان کردنەوە دەنگی لێوەبێت، هەر سەرێکی دوو بازنی، هەر لە خۆیەوە بۆ دروست کرابوون.

***

**٣- ناوبرێشك:**

ناوبرێشك شەپکە دارێکە، بە ئەندازەی چوار پەنجە پانە و درێژییەکەی مەتر و دەسکێکی چەشنی دەسکە خەنجەر، لە خۆیەوە هەبوو. نووکەکەی بارێك و تەنکە و لە جیاتی دەست نانی لەسەر سێڵ پێ هەڵگێڕ.. و وەرگێڕ دەکرا. دۆم دروستیان دەکرد.

**٤- ئاردبێژتن:**

پێویستە مانای ئەم وشانە، کە پەیوەندی بە باسەکەوەیە بزاندرێت:

- **ئاردەبێژ: هێڵەك:**

**هێڵەك:** وەك بێژینگ وایە، بەڵام گچکەترە و کونی زۆر وردە و لە تێل دروست دەکرێت و ئاردی پێدەبێژرێتەوە. دۆم دروستیان دەکرد.

- **ئاردە بێژانەوە:** لە هێڵەك دانی ئارد.
- **ئاردە بێژراو:** ئاردێکە لە هێڵەك درابێت.
- **ئاردە پینەك:** ئاردێکە لەسەر کەور دەپرژێت، یان بە ئەنگوتك دادەکرێت هەتا هەویرەکە بە کەوڵەوە نەنووسێت.
- **ئاردە پێچ:** ئەمانەن:

أ- پرپۆله.

ب- حەلوایەکە لە ئارد و ڕۆن و شەکر دروست دەکرێت (تەڕە حەواش))ی ناوە.

- ئاردە تەقیاك: ئاردی بێژراو.

لە هەوەلەوە: ئارد پێش ئەوەی بکرێتە هەویر، دەبێ بە هێڵەك ببێژرێتەوە و لە خلت و گرێ و گوارپاك بکرێتەوە ئەو جا دەبێ بکرێتە هەویر.

٥- هەویر ترش:

هەویر ترش ئەنگوتکە هەویرێکی هەڵگیراوی دوو سێ ڕۆژی ترشاوە.

پێش ئەوەی ئاو بکاتە ئارد، دەبێت هەندێك هەویر ترش لەگەڵخوێ لە نێو ئاودا بتوێنەوە. چونکە ئەمەیان ئەگەر نەتوێتەوە بە گرمتی وەگەڵ نان دەکەوێت.

هەویر ترشەکە وا دەکات هەویرە کە زوو هەڵبێت. واتە بترشێت و کیف بکات = پێ بگات.

هەویری هەڵاتە، بەتیرۆك زوو پان دەبێتەوە و نانی جوان و نەرم و شل دەبێت و لە خواردندا نەرم و سوکە. ئەگەرنا، باش پان ناکرێتەوە و هەرکە برژاش وا ڕەق دەبێت، جوێنی زۆر دەوێت.

هەرکە هەویرەکە شێلدرا بەهۆی هەویر ترشەوە زوو هەڵدێت. ئەوسا کابان هەویرەکەی لەسەر فەرشە دەکاتە ئەنگوتك ئەنگوتکی وا یەك نانی لێدەربچێت. لەسەر کەوڵە ئارداوی دادەندرێن، بۆ ئەوەی بەیەکتر وەنەنووسێن و لەکاتی پان کردنەوەدا دەست و تیرۆك و فەرشە نەگرن ئاردییان پێدا دەکرێت.

***

سێڵ:

سێر = ((سێڵ)) جۆرە پلێتێکە و بەرگەی ئاگر دەگرێت و زوو نا ڕزێت. لە شار وەستای تایبەت دروستی دەکرد.

خڕە و ناوی قووڵە و پشتی بەرزە و لەسەر ((سێکوچکە)) دادەندراو ئاگری ((کا))، یان پوش و پەلاش لە ژێر دەکراوە. هەتا سێڵە کە سۆردەبووەوە. ئەو جانانیان دەخستە سەر و زوو دەیبرژاند.

لەم دواییەدا ((پریمس))ی ئاگری تایبەت بۆ نان کردن دروست کرابوو. سێڵەکە ئەوسا لە تەشتێکی تەنەگە دەگیراو کونێکی بۆ کرابوو.. و ئاگری پریمسەکەی دەچووە ناوی و سێڵەکەی سۆردەکردەوە، بەڵام دەنگی زۆر گەورە بوو.. وماڵەکەی هەراسان دەکرد.

پاشدان پریمسی غاز پەیدا بوو. ئەمەیان بێدەنگە و هەتا ئەمڕۆی حازریشی باوی هەیە.

**٦- کەوڵ:**

کەور = ((کەوڵ)) پێستەی ئاژەڵە.

پێشتر ئەگەر خۆشەیان نەکردبووایە، لەبەر هەتاو وشکیان دەکردەوە و دەیانفرۆشت.

لە زەمانی زوو خۆشەیان دەکرد و.. وەك ڕایەخ لە بنە خۆیاندا دەنا. ئەمەیان زۆر لە مێژە و بۆ حەفتا، هەشتا ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە.

لە شارەکاندا دووسێ کەوڵە بەرخیان بەیەکەوە دەدووری و وەك ((ساقۆ = پاڵتاو)) لە وەرزی ساردیدا لەبەریان دەکرد. ((فەروە))ی ناوە. لەم دوواییەدا، لۆ ئەوەی کەوڵەکە، بە دەرەوە نەبێت قوماشیان لەسەر دەدووری و لای لواکە دەکەوتە ژوورەوە. ئێستاش هەیە. زۆر گەرمە. کەسێك فێری بوو هەتا ساردی بمێنێت ناتوانێت فرێی بدات.

ماڵیش هەبوو خوری و مووەکەیان لێدادەڕنی و پاش خۆشەکردنی پشتیان بە بەرۆیەك دەدووری و لەکاتی نان کردندا ئارد و ئەنگوتکیان لەسەر دادەنا. پێدەگوترا: ((کەوری نانی)).

کەوڵ لەم ساڵانەی دووایی‌دا و هەنووکەش پێوە، لە جیاتی پێستە دوو سێ خامیان، بەسەر یەکەوەیان دەدووری و دەیانکردە کەوڵی نان. چوار

گۆشە، یان تۆزێك ـ درێژووکانی. هەردەم ئارد و ئەنگوتکە هەویر ترشی لەناو بوو. لە کاتی نان کردندا ئەنگوتکە هەویری لەسەر دادەندرا. هەتا هەویرەکە بە کەوڵەکەوە نەنووسێت هێندە ئاردی پێدادەکرا.

پێیەکی فەرشە لەسەر کەوڵەکەدا دەندرا. هەر جارێ ئافرەتە نانکەرەکە ئەنگوتکێکی، لەگەڵ قیچێك ئارد لەسەر کەوڵەکە هەڵدەگرێت، بە توندی بە فەرشەکەیدا دەدات و ئەوجا بە تیرۆك تا دەگاتە حەدی نانی، پانی دەکاتەوە و دەیخاتە سەر سێڵەوە هەتا دەبرژا.

***

**نان:**

نان ئەو هەویرە پان کراوەیە، بەئاگر دەبرژێت.

لە چوار جۆرە ئارد درووست دەکرێت:

١- ئاردە گەنم.

٢- ئاردە مزاش.

٣- ئاردە جۆ.

٤- ئاردە ساوار.

**نان دوو جۆری هەیە:**

**جۆری یەکەم:**

نانی ڕووتی. واتە سادەو چی لەگەڵ نەکرابێت و ئەمانە دەگرێتەوە:

١- **نانی تەنك.** ئەمەیان سێ چەشنە:

ا- نانی تیری:

نانێکی تەنك و گەورەیە و بە تیرۆك لەسەر فەرشە پان دەکرێتەوە و لەسەر سێڵ دەبرژێت.

مەشهوورترین نانە لە دەشتی هەولێر.

کاتی خۆی هەموو ڕۆژ جارێك، لە دوای نوێژی بەیانی دەکراو نەدەهێشترا ئەوەندە ببرژێت ئەوسا رەق نەدەبوو.. و بە نەرمی لەناو سێنی، یان

تەشت، یاخۆ لەسەر سەبەتەی تایبەت دادەندرا و نیمدەرەیەکیان پێدادەدا.پێی دەگوترا: ((سەرنان))، ئەمە، نەیدەهێشت ڕەق ببێتەوە. هەتا ماڵ نووستنان، بگرە ئەگەر بۆ ڕۆژی دوایش بمابووایەوە لەبەر داپۆشتنەکە ڕەق نەدەبووەوە.

ب- نانی مەزرەقە:

ئەمڕۆ ((بەنانە ڕەق)) ناودەبردرێت. هەمان نانە تیرییە، بەڵام ئەوەندە لەسەر سێڵ دەبرژێت هەتا ڕەق دەبێت.

ئەو تەرحە، نانە ئەمڕۆ لە شاری هەولێر باوە و لە زۆربەی ماڵان ڕۆژانە، هەیە، بەڵان چەند ڕۆژێك جارێك دەکرێت نەك هەموو ڕۆژ.

پ- نانی هەورامی:

هەر نانی تیرییە، بەڵام تاك تاك نابرژێت، بگرە لە برژاندا دوو سێ نان بەیەکەوەن. لە کاتی برژاندا ئارەقە دەکات. بۆیە لە نانی تیری نەرم و شلك ترە و ڕەنگیشی لەگەڵ ڕەنگی نانە تیری جودایە و ئاماڵ زەردە.

ئەمە نانی هەورامییە لە دەشتی هەولێر، جا نازانم ئەو نانە هەورامییەی ئەمڕۆ لە بازاڕ دەفرۆشرێت، بەم تەرزەیە، یاخۆ بەشێوەیەکی دیکەیە.

***

٢- نانی ئەستوور:

یەکەم: مادە: وەك نانی فڕنی ئەمڕۆ بوو.. و تۆزێك گەورەتر. بە ئەندازەی دوو نانی تیری ئەستوورە و بە تەندوور دەبرژا. ئەمە لە چەند گوندێکی تایبەت دەکرا، نەك لە سەرتاپای ناوچەکە.

دووەم: ئەستوورك:

ئەمانە دەگرێتەوە:

أ- ئەستوورکی سێڵ = ((ئەستوورکە سێڵ)):

ئەمـەیان لـە پانیـدا لـە نـانی تـیری بچووکترە و بـە ئەنـدازەی دوو نانەتیری تۆزێك ئەستوور تـرە و ئـەنگوتکی دوو نانـە بـە تـیرۆك پـان دەکرێتەوە و لەسەر سێڵ دەبرژێت.

هەرکە خرایە سەر سێڵ بەدەست و ((نـاو برێشـك)) دەپەسـترێت. بنـی پـێش ئـەوەی ببرژێـت، بـە سـێڵەوە دەنووسـێت و سـوور هەڵدەگـەڕێت. بـەڵام نابێتـە پـۆرگ. کەچـی ڕووی دەرەوەی دەبێتـە پۆرگە و ڕەنگە سوورەکەی لە دیوەکەی تری جوانتر. دەبێت.

ب-ئەستوورکە تەندوور:

ئەمـەیان دوو هەنـدی ئەسـتوورکە سـێڵ ئەسـتوورە و بـە دەسـت، لەسـەر فەرشـە، یـان بـەبێ فەرشـە پـان دەکرێتـەوە و بـە تەنـدوور دەبرژێت، کەچی لە پانیدا وەك ئەو نییە و گچکەترە.

پ- پەپۆکە:

ئەمە لە ئەنگوتکی نیونانی، لە شێوەی ئەسـتوورکە سـێڵ، تایبـەت بۆ منداڵی گچکە درووست دەکرا.

ئەمە دوو تەرزە:

یەکەم: وەك ئەستوورکی سێڵ خڕبوو، بە تیرۆك، یـان دەسـت پـان دەکراوە.

دووەم: درێژووکانی: پێی دەگوترا ((زمانەگا)).

ت-خەپڵە: بە ئەندازەی چوار ئەستوورکی سێڵ ئەستوور بوو.

نەدەهێشـترا تـەواو ببرژێـت، تۆزێـك شـلی هـەویری دەمـا. ئەمـەش تایبەتی سەیان بوو: ((سەپك))یشی ناو بوو.

ج- خەروا: جۆرە ئەستوورکێك بوو لە شێوەی خەپڵە، بەڵام کاتی خـۆی ڕێبوار لەسەر زیلەمۆی دەیبرژاند.

من ئەمەم بە چاو نەدیوە، بەڵام زۆر جارم بەرگوێ گوتـووە. ((ئـەو نانـە لـە سـەرەتای سـەدەی رابـردوودا هـەبووە. ئـەمڕۆش کەسـی وا نەماوە سەت ساڵی لەمەوبەر لـەیادمابێت تـاکو لێـی پرسـیار بکرێـت.

بەمە خەبیری گۆڤاری ئەکادیمیا رەفزی ئەو بابەتە بەپێزەی کردەوە بڵاو بکرێتەوە)).

چـ- خلۆرە: هەویرەکە وەك پاروو لوولدەدرا ئەوجا دەبرژا = مارمارۆکە.

جۆری دووەم:

نانی ناسادە. واتە شتێکی جگە لە ئاردی لەگەڵ بێت.

ئەمەش ئامانەی خوارەوە دەگرتەوە:

١- نانی بەڕوون: چوار تەرزە:

أ- ئەستورکە بە ڕوون:

ئەستورکی تەندوورە و ڕووەکەی، پێش ئەوەی بە تەندوورەوە بدرێت چەور دەکرێت.

ب-ناسکەنان:

تۆزێك لە نانی تیری ئەستور ترەو لە ئەستورکی سێڵ تەنکترە. هەرکە پان کراوە نیوەی چەور دەکرێت، نیوەکەی دیی بەسەر چەورییەکە دادەنەوە و بۆ ئەوەی ڕوونەکە لەکاتی برژاندا نێتە دەرەوە، لێواری هەر دوولا بە پەنجە دەیشێلنە بار یەك، تا بەیەکەوە دەنووسێن، لەسەر سێڵ دەیبرژێنن. هەرکە. لەسەر سێڵ هاتە خوارەوە، هەننۆب ڕوونی دیکەی تێهەڵدەسوێت.

پێشتر.. ڕۆنەکە ((کەرە)) بوو. بە دوایی یە بووە ڕۆن.

پ- هەرمیشك:

ئەمە بە زۆری ئەستوورکی سێڵە، نانە تیریش دەبێت. هەرکە لەسەر سێڵ هاتە خوارەوە، ورد ورد دەکرێت و لەنێو ڕوون هەڵدەسوێت.

ت-ناوسێری = ((ناوسێڵی = ناوساجی)):

وەك ئەستور کە تەندوور پان دەکرێت و لێوار ئەستوورە و لەنێو ڕوونی داخکراو دەبرژێت. بۆ ئەوەی ناویشی ببرژێت ناوەڕاستی بە

ژووژن کون کون دەکرێت. پێشتر لە نێو دۆنی بزن سۆر دەکراوە، نەك لە ئاو ڕووندا.

٢- نانی بە پەنیر: ئەمانەن:

أ- ئەستوورکە سێڵەو.. وەك ناسکەنانە، بەڵام لە جیاتی ڕۆن پەنیری تێدەکرێت: ((ئەستوور کە بە پەنیری)) ناوە.

ب- ئەستوورکە تەندوورە و هەندە پەنیری لەسەر.. ڕووی دادەندرێت.

٣- نانی بە گونجی: ئەمەش دوو جۆرە:

أ- ئەستوورکە سێڵە، کەچی کونجی لە ڕووی دەدرێت.

ب- ئەستوورکە تەندوورە کونجیی لە ڕووی دەدرێت. هەردووکیان ((ئەستوورکە بە گونجی)) یان ناوە.

٤- ئەستوورکە بە شەکر ئەستورکی سێڵ بوو شەکری تێدەکرا.

٥- ئەستوورکە بە کسکە: وەك ئەستورکە بە پەنیرە. لە جیاتی پەنیر ((کسکە = چزیلك))ی تێدەکرا.

٦- ئەستوورکە بە گۆشت:

ئەستوورکە تەندوورە و لە جیاتی پەنیر گۆشتی تیدەکرا. ئەمە بەو دوایی یە لەگەڵ ((لحم بعجین)) پەیدا بووە.

وێڕای ئەوانەی سەرەوە ئەمەش هەبوو: ((ئەستوورکی سێڵ، یان تەندوور)) بە ئاردە ساوار دەکرا. کەچی برژانی لەسەر سێڵ لە وێنەی خەپلە وابوو. هێندە جار پیازی تێدە کراو زۆر بەتام دەبوو.

***

**نان لە کاتی برسێتیدا:**

تەمەنم دوازدە ساڵ دەبوو.. و لە گوندی ((مەحمەر ئۆمەران))ی ناوچەی قەراج دەگەڕامەوە و گەیشتمە گوندی ((کەندال))ی ناوچەی کەندێناوە، یەکجار زۆرم برسیبوو.. و لامدا ماڵێك و گوتم:

- برسیمە و دوو نانم بدەنێ.

ئافرەتی ماڵەکە دوو نانە ((جۆ))ی بۆ هێنام.
نانەکە بەهۆی نوشتانەوە پارچە پارچە ببوو. هەرکە خواردم ئەوەندە بەتام بوو ئێستاش لەزەتی لەیادم نەچووەتەوە.

***

دەنگ:

دەنگ بە دوو مانا دێت:

أ- هەرچییەك بەگوێ ببیسترێت. ئاوازی لە لێکدانی دوو شت پەیدا ببێت.
ب-باس و خەبەر: دەنگ و باس.
ئەمەش دەنگی هەندێك لە گیانلەبەرانە.
ئەوانی دیم لە خوارەوە باس کردووە:
١- پلنگ: چریکە. دەچریکێنێت.
٢- ڕیوی: ویقە. دەویقێنێت.
٣- شێر: نەڕە. دەنەڕێنێت.
٤- گورگ: لوورە. دەلوورێنێت.

***

دەنگ و دەنگ لێکردنی هەندە ئاژەڵ:

١- پشیلە:
أ- دەرکردنی: لەنزیك: خت.
لە دوور: ختەخت.
ب-دەنگ: میاو میاو.
پ- گازکردنی: پش پش پش.
ت-هەڵچوونی: مڕە.
٢- ڕەشان:
أ- دەرکردنی: پیخەپیخە.
ب-دەنگ، باع.. ع. ماع.. ع. منەئا.

پ- گازكردنی: گدی، گدی.

ت-لۆ وەستانی: پیش پیش.

تەگە لەكاتی: بزن بە تەگە هاتنـدا: بە زمـان دەرهێنانـدا: ((مرقە))یـە.
دەمرقێنێت.

بێڕە = دەبێڕێنێت.

بزن دەهێرێنێت.

٣- سە = ((تاژی و توولە))ش پێوە:

أ- ئازاردانی: قوورە.

ب-بە تەنیاو غەریبی: لوورە.

پ- تێبەردانی تاژی لە ڕاودا: دیاردی، دیاردی.

ت-دەركردنی: چغە چغە = ((چەغە چەغە))، یان توتتە.

ج- دەنگ: عەو عەو. حەپ حەپ. دەحەپێت. وەڕین دەوەڕێت.

چ- گازی كردنی: كوچ كوچ كوچ.

٤- سپیان:

١- داكردنی بەرخ: كۆزە كۆزە.

٢- دەنگ: گەورە: باع باع.

گچكە: ماع ماع.

٣- دەنگـی بـەران: لـە كـاتی مـەڕ بەبـەرانا ((مرقـە)). بـە زمـان دەرهێناندا ((بەرانەكە دەمرقێنێت)).

٤- گاز كردنی: تورڕ.. ڕڕ، تورڕ.. ڕر.

٥- لە بێرداندا: بێرەبێرە.

٦- هاژۆتنی: هسەهس، یان هرە هڕ.

***

دوو تێبینی:

١- بۆ دەنگی: ڕەشان و سپیان ((بارە)) و ((قارە))ش دەگوترێت. هـەر وەك لەو بەیتە شیعرەدا هاتووە:

((كه قاڕه قاڕی مەڕ هات دەستم له شەنگه بڕی)).

٢- سەگ: لووره. گوایا ئەگەر ((عزرائیل))، یان بەڵایەك له ئاسمان هاته خـوارەوه بـه لـوورەی درێـژ دەڵێـت: ((خوایـه لەناوچـەکەمان دوور بێـت)). لـه پاشـدان دەڵێـت: ((خوایـه لـه گوندەکـەمان دووربێـت)). هەرکه نزیك بووەوه دەڵێت: ((خوایه له گەڕەکەکـەمان دوور بێـت)). دوای ئەمەش دەڵێت: ((خوایه له ماڵی ساحیبم دوور بێـت)). هەرکـه زۆر نزیك بووه دەڵێت: ((خوا هەر لەمن دوور بێت)).

* * * *

٥- وڵاخ:

یەکەم: ڕەشه وڵاخ = ((گەوره و بچووك)):

أ- دەنگ = بۆعـ..ع.

ب-دەرکردنی گەوره = وەحه.

دەرکردنی گچکه = وەله، وەله.

پ-گازکردنی گەوره = وۆحه...

گازکردنی گچکه = گۆله، گۆله.

ت-دۆشینی = توێ، توێ.

دووەم: یەکسم:

١- بەرزه = ئەسپ و ماین:

أ- دەنگ = حیو ((حییله)) حیلاندن. دەحیلێنێت.

ب-لێخوڕین = هەچه، هەچه.

پ-گاز کردنی = کوڕ..ڕش، کوڕ..ڕش.

ت-ڕاگرتنی وۆش، یان هۆش.

٢- گوێدرێژ:

أ- دەنگ =

- ماکەر = هعا.. هعا.. هعا.

- نێرەکەر = عۆ.. هـ، عۆهـ، عۆ.

ب–لێخوڕینی = هەچە هەچە.

پ–گازکردنی = کوڕ..ڕش، کوڕ..ڕش.

ت–وۆش، یان هۆش. بۆ ڕاگرتنی.

جـ لەوچین: لەکاتی ماکەر بە تەڵەب هاتندا = دەلەوچێت.

چـ زەڕین لۆ نێرەکەرە = دەزەڕێت.

حـ لەکاتی برسێتی: لووشە لووش.

***

دەنگ و دەنگ لێکردنی هەندەك پەلەوەر:

فەرموون سەیری ئەمانە بکەن:

١– عەلەشیش = ((قەلەموون)):

أ– دەنگ = علوو.. علوو، یان قولوو قولوو.

ب–دەرکردنی = کشـ.. ش.

پ–گازکردنی = تی، تی.

ت–گرتنی = فسـ.. س.

٢– قاز =

أ–دەنگ = قیقە قیق = دەقیقێنێت.

ب– دەرکردنی = کشـ.. ش.

پ–گازکردنی = تی، تی.

ت– گرتنی فسـ.. س.

جـ– بەرگری کردنی لە خۆی و بێچووەکانی = کیفە = دەکیفێنێت.

٣– کۆتر:

أ– دەنگ: مێیە: گم..م = دەگمێنێت.

نێرە: بوغـ..غ = دەبووغێنێت.

ب–دەرکردنی = کشـ..ش.

پ–گازکردنی = تی، تی.

ت–گرتنی = فسـ..س.

٤– مراوی =

أ– دەنگ = غاگ، غاگ، یان غاق غاق.

ب–دەرکردنی = کشـ..ش.

پ–گازکردنی = تی، تی.

ت–گرتنی = فسـ..س.

٥– مریشك:

أ– دەنگ =

جوجکەی = جیو، جیو، یان جوك جوك

کەڵەباب = ققو.. ققو.. قوو.

مریشك = قا.. قا.. قا.

ب–دەرکردنی = کشـ..ش.

پ–گازکردنی = تی، تی.

ت–گرتنی = فسـ..س.

جـ– لەکاتی گرتنی: قیڕە. دەقیڕێنێت.

چـ– لەکاتی هێلکە کردندا: قەپ قەپ قەپ: یان قاقاقا.

ح گەڕان لۆ دیتنەوەی جێگەی هێلکە کردن = دانە دۆزە.

***

دۆم:

دۆم کوردبوون و دزیان هەرگیز نەدەکرد و بە کاسبی خۆیان دەژیان. هەرکە دەهاتن خیوەتیان لەنێو ئاوایی هەڵدەداو چەند ڕۆژدەمانەوە.

تەشی و تیرۆگ و ناوبرێشك و خولخولەی منداڵان و چەقۆ.. و سەرەند و بێژینگ و هێڵەگیان درووست دەکرد.

هەندە جار لەگەڵ خەڵکی ئاوایی کەریان بەکەر دەگۆڕییەوە. بەڵام سەرباقی دەبووایە مریشکێکیان بدرێتێ.

عەیب و سووکییەکەیان ئەوە بوو: ژنەکانیان لەنێو ئاوایی دەگەڕان. ئەوساش بەکارێکی دزێو.. و ناشیرین دەخەملاندرا.

پیاوەکانیان لە ژوورەوە بابەتەکانی سەرەوەیان درووست دەکرد.

دۆمەکان بەخۆیان دەیانزانی کاسبیەکەیان هەموار نییە. بۆ وێنە: ڕۆژێك پیاوێکیان لەگەڵ پیاوێکی ئەو دەشتەی هەولێر بە شەڕدێت و دۆمەکە دەکوژرێت. ماڵە پیاوکوژەکە مەسلەتی دەکەن و ئافرەتێکیان دایە برای کوژراو.

ئافرەتەکە وەك ژنە دۆمان لەنێو ئاوایی دەگەڕا.

جارێك بەخۆم گوێم لە ئافرەتەکە بوو.. و گوتی:

- چەند جارم بە مێردەکەم گوتووە: با واز لەو کاسبییە بهێنن بە کاسبییێکی ماقووڵان خۆمان بژیێنین. لە هەوەلەوە نەیسەلماند. کەچی لەو دوایییەدا لەبەر خاتری من سەلماندی و هەر ئەو ساڵ ئەو کارە دەکەین و بەس.

***

**دوعا:**

دوعا: نزاو پاڕانەوەیە، بۆ هەر شتێك لەبەر خوا. دوعا دوو جۆرە.

١- دوعای نووسراو:

٢- دوعای نەنووسراو:

***

**١- دوعای نووسراو: ئەمەش دووانە:**

**یەکەم: دوعای باداری:**

قامیشێکی مەتر زیاتر درێژ و لەم سەر بۆ ئەو سەر هەڵدە زرێت و هەر چوار سەری لە لۆکەکەی ناوی پاك دەکرێتەوە و لە هەر سەرێکی قامیشەکە ناوی یەك لەو فرشتانە دەنووسرێت: ((جوبرائیل. عزرائیل. ئیسرافیل. میکائیل)).

ئەوجا لەتە قامیشەکان دەخرێنەوە سەر یەك و لەم سەر بۆ ئەو سەر بە خرێنە موو دەپچرێت و لەبەر خانوو.. نێوان ساپیتە و دیواری لای ژوورەوە رادەکرێت.

گوایا بەم چەشنە نەخۆشی باداری چاك دەبێتەوە.

***

دووەم: نوشتە:

نوشتە دوعای نووسراوی سەر کاغەزە. دوعاکە لە کاغەزێکی درێژووکانی دەنووسرێت و پاش تەواو بوونی نووسینەکە، کاغەزەکە دەنوشترێتەوە باریەك وتا دەبێتە قەزمە نووشتی. هەشە گەورەیە و ناکرێتە قەزمە نووشتی.

نوشتە لە وشەی ((نووشتانەوە)) وەرگیراوە.

ئەوسا قەزمە نووشتەکە لە پەڕۆیەکی شەمێدار دەگیرێت و لە پەڕۆیەکی تر دەدوورێت و بەشانی نەخۆش، یان بە ژێرەوەی کورتەکی ئاست مەمکی چەپ دەدوورێت.

جار وا بووە دوعا کەرەکە بە نەخۆشەکەی گوتووە:

- دوای لە شەمی گرتنی نوشتەکەی سێ جار لە ئاوی هەڵکێشە و ئاوەکەش بخۆرەوە.

***

نووشتە چەند جۆری هەیە.

((من تەنیا سیانی دەزانم – نووسەر)).

١– نووشتە ئاسایی.

ئەمەیان سەردەمایەك زۆر باوی هەبوو. هەر کەسێك شوێنێکی بهێشابووایە، دەچووە لای مەلا و نوشتەی پێدەکرد: کە بەم چەشنە بوو:

((بسم الله الرّحمن الرّحيم. الحمدلله ربّ العالمين الرّحمن الرّحيم. مالك يوم الدّين. إيّاك نعبد وإيّاك نستعين. إهدنا الصرّاط المستقيم. صراط اللّذين أنعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولاالضّالّين. ئامين)).

بسم الله الّرحمن الرّجم
قل هو الله أحد. الله الصّمد. لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفواً أحد.
اللّهم صل على سيّدنا محمّد وعلى آلِ سيدّنا محمّد.

***

**سەرقەڵەمانە:**

ئەوەی نووشتەکەی بۆ دەکرا دەبووایە حەقدەست کە پێی دەگوترا ((سەرقەڵەمانە)) بۆ مەلابیات. بە زۆریش ئەمانە بوو: ((مریشك، هێکلە. جەمە کەرەیەك)).

***

من بەخۆم ئەو تەرحە نووشتەیەم زۆر کردووە و سەرقەڵەمانە شم چەند جار خواردووە. ئەگەر نەخۆشەکە لە دوای نووشتەکە چاك ببووایەوە دەیگوت: ((یەکاویەك بوو))، یان دەیگوت: ((نووشتەکەت: موجەڕەب بوو)). ئەگەرنا دەنگ نە دەکرا.

***

**دوعای نەنووسراو:**

**ئەمەیان هەر بە زارەو بەو چەشنە بوو:**

١- یەکێك دەچووە کن ((سەید))، یان ((شێخ))ێك دەیگوت

- ((نەخۆشم و دوعام لۆ بکە)).

ئەویش لەگەڵ دەست بە پشت و سەر داهێناندا سوورەتی ((فاتیحە)) و ((قل هو الله))ی بە پسکە پسك دەخوێند. دوای لێبوونەوە پفێکی لەسەر و گوێلاکی دەکرد و دەیگوت:

- ((چاك دەبیت ئیشاللا)).

٢- هێندە جار داوا لە دوعا خوێنەرەکاندا دەکرا:

((فلان کەس زۆر نەخۆشە و دەبێ دوعایەکی باشی چاك بوونەوەی لۆ بکەیت.

ئەویش بە دەست بڵند کردن بەرەو حەواوە بەم تەرحە دەپاڕاوە:

- خوایه لۆ خاتری ناوه پیرۆزەکانی خۆت و لۆ خاتری قورئانی قەدیم، لۆ خاتری پێغەمبەری ئاخری زەمان و ((شتی تریش)) ئەو نەخۆشیەی لەسەر لابەریت))

***

**تفەڕك:**

**تفەڕك بە دو مانا دێت:**

١- خواردن: ((ئازا تا ئێستا تفەڕکی زادی ئێمەی نەکردووە)).

٢- تەبەڕوك:

شتێکە وەك نووشتە و دوعا پیرۆزە و خەڵك ماچی دەکەن، یان بەکەل و پەلیانەوە هەڵدەواسن، یاخۆ دەیخۆن.

**پیرۆزییەکەی بۆ ئەمانە دەگەڕێتەوە:**

أ- ئەو شوێنەی لێبووە پیرۆزە و خەڵك ڕێزی دەگرت وەك دار و بەرد و پەڕۆی سەرمەڕقەدان، یان ئەو شتانەی لە وڵاتی حیجازەوە دێن.

ب-پیاو چاکان دەعەمەلیان هێناوە. وەك جل و کەل و پەلی بەر.

پ-خواردنێکە ببردرێتە سەر مەرقەدان.

***

**٢- نووشتەی = ((ئەبوو دوجانە))**

**ئەمەش دووعای ئەبوو دوجانەیە = نووشتەیەکی گەورەیە:**

الحمد الله الذي خلق السموات والأرض. وجعل الظلمات والنور. ثم الذين كفروا بربهم يعدلون.. هذا كتاب من محمد رسول الله العربي الهاشمي المكي المدني الأبطحي المي صاحب التاج والهراوة والقضيب والناقة. صاحب قول لا إله إلا الله إلى من طرق الدار إلا طارقا يطرق بخير.. أما بعد فان لنا ولكم في الحق سعة.. فإن لم يكن طارقا مولعا. أو داعيا مبطلا أو مؤذيا مقتصما فاتر كوا حملة القرآن. وأنطلقوا إلى عبادة الأوثان. يرسل عليكما شواظ من نار.. ونحاس فلا تنتصران. بسم الله وبالله ومن الله وإلى الله. ولا غالب إلا الله. ولا

أحد سوى الله. ولا أحد مثل الله. وأستفتح بالله. وأتوكل على الله. صاحب كتابي هذا في حرز الله. حيث ماكان وحيث ما توجه لاتقربوه ولا تفزعوه ولا تضاروه قاعدا ولا قائما ولا في اكل ولا في شرب ولا في إغتسال ولا في جبال ولا بالليل ولا بالنهار. وكلما سمعتم ذكر كتابي هذا فادبر واعنه بلا غله إلا غالب كل شي وهو أعلى من كل شي. وهو أعز من كل شي. وهو على كل شي قدير.....

ثم قال رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم لعلي بن أبي طالب عليه السلام يأبا الحسن أكتب:

اللهم أحفظ يارب من علق عليه كتابي هذا بالسم الذي هو مكتوب على سرادق العرش أنه لا إله إلا الله الغالب الذي لايغلبه شي. ولا ينجو منه هرب. وأعيذه بالحي الذي لايموت. وبالعين التي لاتنام. والكرسي الذي لايزول وبالعرش الذي لايضام وأعيذه بالأسم المكتوب في التوراة والإنجيل. وبالأسم الذي حمل به عرش بلقيس إلى سليمان بن داود عليهما السلام قبل أن يرتد إليه طرفه.. وبالأسم الذي نزل به جبرائيل علي السلام غلى محمد صلى الله عليه وآله وسلم في يوم الإثنين وبالأسماء الثمانية المكتوبة في قلب الشمس. وبالأسم الذي يسيربه الساحب الثقال. وبالأسم الذي يسبح الرعد بحمده. والملائكة من خيفته. وبالأسم الذي تجلى الرب عز وجل لموسى بن عمران عليهما السلام فتقطع الجبل من أصله وخر موسى صعقا. وبالأسم الذي كتب على ورق الزيتون وألقي في النار فلم يحترق. وبالأسم الذي يمشي به الخضر عليه السلام على الماء فلم تبتل قدماه. وبالأسم الذي نطق به عيسى عليه السلام في المهد صبيا وأبرا الأكمة والأبرص وأحيى الموتى بإذن الله تعالى. وأعيذه بالأسم الذي نجا به يونس عليه السلام من الظلمة. وبالأسم الذي فلق به البحر لموسى عليه السلام وبني إسرائيل. فكان كل فرق كلطود العظيم. وأعيذه بالتسع آيات التي نزلت على موسى بطور سيناء. وأعيذ صاحب كتبي هذا من كل عين ناظرة. وأذن سامعة. وألسن ناطقة وأقدام ماشية. وقلوب واعية. وصدور خاوية. وأنفس كافرة. وعين لازمة ظاهرة وباطنة. وأعيذه ممن

يعمل السوء ويعمل الخطايا. ويهم لها من ذكر وأنثى. وأعيذه من شر كل عقدهم ومكرهم وسلاحهم وبريق أعينهم. وحر أجسادهم ومن شر الجن والشياطين والتوابع. والسحرة ومن شر من يكون في الجبال والغياض والخراب والعمران. ومن شر ساكن العيون أو ساكن البحار أو ساكن الطرق. واعيذه من شر الشياطين. ومن شر كل غول وغولة. وساحر وساحرة. وساكن وساكنة. وتابع وتابعة. ومن شرهم وشر ابائهم وأمهاتهم. ومن شر الطيارات. وأعيذه بيا أهيا شراهيا. وأعي صاحب كتابي هذ من شر الدياهش.. الدهانش.. والأبالس. ومن شر القابل والفاعل. ومن شر كل عين ساحرة. وخاطية. ومن شر الداخل والخارج. ومن شر كل طارق. ومن شر كل عاد وباغ. ومن شر كل عفاريت الجن والأنس. ومن شر الرياح. ومن شر كل عجمي. ونائم ويقظان. وأعيذ صاحب كتابي هذا من شر ساكن الأرض. ومن شر ساكن البيوت والزوايا والمزابل. ومن شر من يصنع الخطيئة أو يولع بها. وأعيذه من شر ماتنظر إلية الأبصار. وأضمرت عليه القلوب. وأخذت عليه العهود. ومن شر من يولع بالفراش والمهود. ومن شر من لايقبل العزيمة. ومن شر إذا ذكر الله ذاب كما يذوب الرصاص والحديد. واعيذ صاحب كتابي هذا من شر إبليس. ومن شر الشياطين. ومن شر من يعمل العقد. ومن شر من يسكن الهواء والجبال والبحار ومن في الظلمات. ومن في النور. ومن شر من يسكن العيون. ومن شر من يمشي في الأسواق. ومن يكون مع الدواب والمواشي والوحوش. ومن شر من يكون في الأرحام والأجام. ومن شر من يوسوس في صدور الناس. ويسترق السمع والبصر. وأعيذ صاحب كتابي هذا من النظرة واللحمة والخطوة والكرة والنفخة وأعين الإنس والجن المتردة.. المتمردة. ومن شر كل عقد أو سحر أو إستيحاش أو هم أو حزن أو فكر أوسواس ومن داء يفتري لبني آدم وبنات حواء من قبل البلغم أو الدم. او المرة السوداء والمرة الحمراء والصفراء. او من النقصان والزيادة. ومن كل داء داخل في جلد أو لحم أو دم أو عرق أو عصب أو في نظفة أوفي روح أوفي سمع أوفي بصر أو في شعر أو في بشر أو أظفر أو ظاهر أو باطن. وأعيذه بما إستعاذ به آدم عليه السلام أبو البشر وشيث وهابيل وإدريس ونوح

ولوط وإبراهيم وإسماعيل وإسحاق ويعقوب والأسباط وعيسى وأيوب ويوسف وموسى وهارون وداوود وسليمان وزكريا ويحيى وهود وشعيب وإلياس وصالح واليسع ولقمان وذو الكفل وذو القرنين وطالوت وعزير وعزرائيل والخضر عليهم السلام ومحمد صلى الله عليه وآله أجمعين وكل ملك مقرب ونبي مرسل ألاما تباعدتم وتفرقتم وتنحيتم عمن علق عليه كتابي هذا. بسم الله الرحمن الرحيم الجليل الجميل المحسن الفاعل لما يريد. وأعيذه بالله وبما استنار به الشمس. وأضاء به القمر. وهو مكتب تحت العرش لا غله غلا الله. محمد رسول الله صلى الله عليه وآله أجمعين. فسيكفيكهم الله وهو السميع العليم. نفذت حجة الله. وظهر سلطان الله. وتفرق أعداء الله. وبقي وجه الله. وأنت ياصاحب كتابي هذا في حرز الله... وكنف الله. وجوار الله. وأمان الله. الله جارك وليك وحاذرك الله ماشاء الله كان وما لم يشأ لم يكن. أشهد أن الله على كل شي قدير وأن الله قد أحاط بكل شي علما. وأحصى كل شي عددا. وأحاط بالبرية خيرا إن الله وملائكته يصلون على النبي ياأيها الذين أمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما. إللهم صل على محمد وآل محمد.. ختمت هذا الكتاب بخاتم الله. الذي ختم به أقطار السموات والأرض. وخاتم الله المنيع. وخاتم سليمان بن داوود وخاتم محمد صلى الله عليه وآله أجمعين ألا أن أولياء الله لاخوف عليهم ولاهم يحزنون. وكل ملك مقرب أو نبي مرسل بالله الذي لا غله إلاهو رب العرش العظيم. ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم وصلى الله على محمد وآل محمد الطيبين الطاهرين....

***

**ئیستخاره:**

هەر کەسێك تاکو بزانێت: ئەو مەرامەی لە دڵیەتی دێتە دی، یان نایەتە دی، سێ شەوان لەسەر یەك، پێش چوونە ژێر پێخەفەوە دوو ڕکعات نوێژ دەکات و ئەو دوعایەی کەمن کردوومە بە کوردی دەخوێنێت:

- ((خوایە ئەو مرازەی لەدڵمدایە پێم نیشان بدە: دێتە جێ یان نایەتە جێ)). گوایا شەوی سێیەم بە بوون و نەبوون دێتە خەونی.

مـن جارێـك كـردم پێیـانگوتم: ((ناتـدەینێ))، كەچـی دوارۆژ بـۆم ڕێككەوت، بـەڵام، لەبـەر.. بەرژەوەندییـەكی تایبـەت بـەخۆم ڕەفـزم كردەوە. واتە نەهاتە جێ.

***

**٣- نووشتەی = باڵا بەژن:**

باڵا بەژن نووشتەیەكی گەورەیە و بریتیە لە ((١٢١)) سەت و بست و یەك ((بسم الله الرحمن الرحیم)) و سوورەتی ((قریش)).

ئەم نووشتەیە بۆ كەسێك بترسێت، یان خەونی ترسناك ببینێت دەكرا.

لـە شـێوەی نووشـتەی ئاسـایی دەكرێتـە قەزمـە نووشـتی و لـە شـەمێ دەگیرێت و پەڕۆیەكی بە دوورین لێدەپێچرێت. بە دیوی ژوورەوەی كورتـەك، كەرخی مەمكی چەپەی هەڵدەواسرێت.

ئەم نووشتەیە بە زۆری بۆ ئافرەتان دەكرا.

من بە دەیان جارم لەو ئافرەتانـەی كـە ئـەو نوشـتەیان بـۆ كرابـوو گـوێ لێبووە:

((هەركـە دوعاكـە بـەهۆی شوشـتنی كورتەكەكەمـەوە لام نامینێـت دڵـم دەترسێت)).

***

**فەرموون ئەمەش نووشتەی باڵا بەژن:**

| | |
|---|---|
| بسم اللّه الرّحمن الرّحیم | بسم اللّه الرّحمن الرّحیم |
| بسم اللّه الرّحمن الرّحیم | بسم اللّه الرّحمن الرّحیم |
| بسم اللّه الرّحمن الرّحیم | بسم اللّه الرّحمن الرّحیم |
| بسم اللّه الرّحمن الرّحیم | بسم اللّه الرّحمن الرّحیم |
| بسم اللّه الرّحمن الرّحیم | بسم اللّه الرّحمن الرّحیم |
| بسم اللّه الرّحمن الرّحیم | بسم اللّه الرّحمن الرّحیم |

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم

***

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم
لإيلَفِ قُريشٍ. إلَفهم رحلَةَ
الشّتاءِ وَالصَّيفِ. فَليَعبدوا رَبَّ
بسم الله الّرحمن الّرحيم
هذا البيتِ. ألّذي أطعَمَهُم مِن

بسم الله الّرحمن الّرحيم
جوعٍ وأمنهُم مِن خَوفٍ
***
بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم

بسم الله الّرحمن الّرحيم
بسم الله الّرحمن الّرحيم
***

**بالووكە:**

گرێیەکی بچکۆلەیە، وەك قینچکە لە جەستەی مرۆڤ گیانلەبەران دێت. کەسێك بالووکەی لە دەست و قاچی بهاتبووایە ((هەر دیومە بەس لە دەست و پێ هاتووە، نەك لەسەر تاپای جەستەوە. نووسەر)) دەچووە لای مەلا دوعای بالووکەی بۆ بکات. مەلا ئەم ئایەتەی ((أم أبرموا أمراً فأنا مبرمون))، لە حەوت دنکە جۆ.. و قلە خوێ دەخوێند.

هەردنکە جۆیەك حەوت کەڕەتی دوعاکە لێدەخوێندو بە دەوری ئەو بالووکەیدا دەهێنا، کە لە پێش بالووکەکانی دی پەیدا بوو. هەتا حەوت قلەجۆیەکان تەواو دەبوون. ئەوجا دوعاکەی لە خوێیەکان دەخوێند و بەدەوری بالووکەکەی تایەنی دادەهێنا.

واتە (١٤ × ٧ = ٩٨)) نۆهەت و هەشت کەڕەت دوعاکەی دەخوێند.

دەبووایە دنکە جۆ.. و قلە خوێیەکان لەژێر زەوییەکی تەڕ بنرێن. چونکە لەم تەرزە جێیە جۆیەکان زوو دەڕزن و خوێیەکانیش دەتاوێنەوە. گوایا لەگەل ڕزین و توانەوەیان بالووکەکان دەفەوتێن.

من به گۆته بەدەیان کەرەتم به گوێ کەوتووه: (بالووکه بەو دوعایه چاك بووەتەوه))، بەڵام بەچاو نەمدیوه.

کچێکی ناسیارم بردە کن مەلایەك، چەند بالووکەی له دەست هـاتبوون، قلەجۆ.. و خوێیەکانی لەبن عەردی   نان و بالووکەکانیش چ چاك نەبوونەوه.

***

**بەستانی دەمی گورگ:**

زۆر جـار وا دەبـوو لـه دێهاتەکانـدا، مـەڕ، بـزن، مانگـا و ئـاژەڵی تـر بـزر دەبوو.. و شەوی بەسەردا دەهات خاوەنەکه دەچووه لای مـەلا هـەتا دەمـی گـورگی بـۆ ببەسـتێت. واتـه ئەگـەر گـورگ تووشـی ئاژەڵـه ببێـت نـەتوانێت بیخوات.

مــەلا ئەمــەی خــوارەوەی لــەکاتی قوچـانەوەی دەمــی چـەقۆیەك، یـا خۆگرێدانی گرێیەك له بەنێك، یان پەڕۆیەك دەخوێند:

((بسم الله الرحمن الرّحيم: والضحى واللّيل اذا سجى ما ودعّك ربّـك ومـا قلى ولا الآخرة خيرٌ لك من الأولى ولسوف يعطيك ربّك فترضى. ألم يجـدك يتيمـاً فآوى ووجدك ضالاً فهدى ووجدك عـائلاً فأغنى. فأاليتيم فلا تقهر وامّا السـائل فلا تنهر واماّ بنعمة ربّك فحدث)).

لەگـەڵ قـەپات کردنـی دەمـی چـەقۆ، یـان تـەواوبوونی گرێیەکـه ئەمـەی دەگوت: ((اللّهم يا جامعَ الناس ليوم لاريب فيه رُدْ علينا ضلّتنا)).

مـن بـه چـاوی خـۆم نەمـدیوه، دوای بەسـتانی دەمـی گورگـەوه، گـورگ تووشی ئاژەڵه ونبووەکـه ببێـت وبـۆی نـەخورا بێـت. بـەڵام گۆتـه دەیگـوت: ((بزنێکی بزربوو.. و دەمی گورگی بۆ بەسترا بـووەوه، شـەو گـورگ تووشـی بووه و بۆ بەیانی لـه ئاقـار دیتراوەتـەوه و لەشـی سـەرتاپا بـه کـەفی دەمـی گورگەوه بووه.

دوای دۆزینـەوەی ئاژەڵەکـه، بـۆ بـەیانی بـه واجـب دادەنـدرا مـەلا، یـان خـاوەن ئاژەڵەکـه دەمـی چـەقۆکه، یـان گرێیەکـه بکاتـەوه، هـەتا گورگەکـه بەهۆی دەم بەستانەکەوه له برسان نەمرێت.

### حەشەفە

داپیرێکی فەقێیان، یەکجار زۆر خزمەتی فەقێیان دەکات.

ڕۆژێك سوختەیەك دەچێتە لای و دەڵێت:

- داپیرە ئەتوو زۆر بە ئێمەوە ماندوو بوویت گەردەنمان ئازاد بکە.

ئەویش دەڵێت:

- گەردەنتان سەت جار ئازاد بێت.

پاشدان بە فەقێیەکەی دەڵێت:

- کەواتە ئەتۆش لەجیاتی دووعایەکی خێرم بۆ بکە.

فەقێش دەڵێت:

- یاخوا داپیرە، وەبەر حەشەفەی نێرەکەری عوزێر پێغەمبەری ((د. خ)) بکەویت.

ئەویش بە دووعایەکی چاك تێدەگات و هەر دوو دەست بەرەو حەوا بەرز دەکات و دەڵێت:

- ئا.. میـ..ن ڕۆڵە لەگەڵ داك و بابی تووش.

فەقێش لە دڵەوە پێدەکەنێت دەڵێت:

- ((بەڕاستی قازانجم کرد لە جیاتی دایکم، باوکیشم وەگەڵ کەوت)).

***

### چەند ڕووەکی خواردن

**پاقلە:**

پاقلە دوو جۆرە:

١- پاقلەی ئاسایی:

گیایەکی بەهارییە و دەچێندرێت. بەرێکی درێژی جۆرك ئاسای هەیە و چەند دنکێکی تێدایە. بە چێشت و زەرد کراوی دەخورێت.

٢- پاقلە مارانە: = ((مالانە)):

گیایەکی بەهارییە و بە هەمان شێوەیە و بەس خۆڕسکە و وەك ئەو بەرز نابێت و دەنکی بچووك و زۆرترە و بە کەڵك چێشت و زەردکردن نایەت. کەچی دەخورێت.

***

**پیفۆك:**

پیفۆك: گیایەکی بەهاری و خۆڕسکە و گەڵای سەرەوەی بڵندنابێت و باریکە و لەسەر زەوی دەخشێت کەسکی ئامالّ سپی و هێڵی باریکی سپی تێدایە. بنگی لەناو پووشێکی مەیلەو قاوەیی دایە و هەرکە لابرێت سەلکێکی خڕو سپییە و بە ئەندازەی کەللایەك دەبێت و دەخورێت.

کاتی خۆی ئێمە پیفۆکمان بە گەڵاو پووشییەوە جەلە دەکرد. واتە دەمانهۆنییەوە و بە دیاری بۆ براو خوشکە گچکەکانمان.

***

**توورۆکە:**

رووەکێکی کێوییە و لە ڕووی گەڵاو لاسك و ڕەنگەوە توورە و هیچ جیاوازییەکی ئەووتۆی نییە تەنیا وەك ئەو گەورەنا بێت و نارسکێت و لاسکەکەشی قیچێك دڕە و ئێمە دەمانخوارد. تام تووری لێدەهات.

***

**چەورۆکە:**

چەورۆکە ڕووەکێکە نزیکەی دوو بست پەنچی بڵند دەبێت. لاسکی ڕەق و لق لقە. گەڵایەکی لە شێوەی قۆدیلکەی بچووکە و دەمی بەشەو لێواری دڕکاوییە و ناوقەدی باریکە و دواوەشی لەچاو قەدی گەورە و خڕ و دنکی ورد وردی لە گونجی بچووکتری تێدایە. هەرکە وشك دەبووەوە ئێمەی منداڵ سەرەوخوار دەمانتەکاندە نێو کۆشی خۆمان و دانەکەی دەهاتە خوارەوە و دەمانخوارد. زۆر چەور و بەتام بوو. هەر بۆیەشە بە ((چەورۆکە)) ناو دەبردرێت. بۆنێکی خۆشی لێدێت.

***

**خڕنووك:**

خرنووك: ڕووەکێکی خۆڕسکی دڕکاوییە و لە ئاخر و ئۆخری کژێ هاوین بەردەگرێت و ((خڕنووکی)) ناوەو هەندە جار بەقەت قلە قەسپێك دەبێت. پەلکێکی تەنگی هەیە و ئێمەی منداڵ سپیمان دەکرد و دەمانخوارد. تفتە.

مەعچەچە: خڕنووك هەرکە بەرەو ساردی وەرزی پایز دەچوو بەرەکەی بە خۆیەوە وشك دەبێت.

پێشتر ڕەنگی مەیلەو زەرد و سوور و پەمبە سۆری ئاماڵ سپی بوو. هەرکە وشك بووەوە سۆرویپەمبە هەڵەگەڕێت پێمان دەگوت ((مەعچەچە)) و دەمانخوارد.. ئەمەیان لە ڕاهەژاندندا دەنگی دینکەکانی دەهات.

***

**دۆمبەلان:**

دومبەران = ((دومبەلان، دومەلان)): جۆرە کارکێکی خڕە و لەژێر زەوی دەڕوێت و بەرزی دەکات و بەلام نایەتە دەرەوە.

مەرجی شین بوونی لە هەرزەوییەکدا، دەبێ گیای ((دانەقەتێ))ی هەبێت. ئەو ڕووەکە نەبێت دومبەلان نابێت. چونکە هێزی تیشکی ڕۆژ لەڕەگی ئەو گیایەی وەردەگرێت. زۆر بەتامە.

وام بیستووە، جا نازانم ڕاستە، یا خۆد درۆ ((مەرجی دووەمی شین بوونی دومبەلان، دەبێ مانگێك وەرزی پایز بمێنێت پەڵە بکەوێت)) ئەگەر نا، ناڕوێت.

***

**فسۆس:**

شتێکە لە شێوەی دومبەلانەو.. وەك ئەو زەوی بەرز دەکاتەوە هەرکە هەڵدەقەندرێت ئەوجا دەزاندرێت ئەوە ((فسۆس))ە = زڕ دومبەلانە و ناخورێت.

***

**کەنگر:**

لەبەر ئەوە گەورە و بچووکی ناوچەکە، ساڵانە کەنگر دەخوات بۆیە پێویست ناکات پەنجەی بۆ درێژ بکەین.

**ڕنك:**

کەنگر هەرکە بەتەمەن داچوو ((قەد))ی بن زەوی وەك پێشوو ناخورێت، لاسکەکەی نزیکەی دوو بست بڵند دەبێت: ((ڕنکی پێ دەگوترێت)). پێش پیربوونی سپی دەکرێت و دەخورێت و شیرینێکی بەتام و ئاوە.

***

**شیلمشاق = شمریشاق:**

گیایەکی بەهارییە و گەڵاکەی باریك و گوڵێکی سپیی لە ناوەڕاستی هەیە.

بنکەکەی مەیلەو پانە و پەلکێکی قاوەیی ئاماڵ ڕەشی هەیە و هەرکە لابردرێت لە پیفۆك سپی ترە و بە ئاوە و بەڵام تاڵێکی بەتامە و دەخورێت.

***

**غەردارە:**

رووەکێکی بە هارییە و لە شێوەی ((کڵاوە زەردە))یە و بەڵام لاسکی ئەستوور ترە. تەنیا ((ئەگەر لێمنەبێتە درۆ: هەر لە چیای قەرەچوغ شین دەبێت)). بۆیە بە ڕێواسی قەرەچوغ ناودەبردرێت.

پەلکەکەی لێدەکرێتەوە و تیژێکی تفتی زۆر بەتامە.

***

**قەپقە پۆك:**

ڕووەکێکی بچووکی پنجداری دڕکاوییە و بەرەکەی بەقەت قلە مێوژێك دەبێت.

ڕەنگی پەمبەی ئاماڵ سپییە و هەرکە پیربوو سپی دەبێت. ناوی بۆ شەو پەلکەکەی زۆر تەنکە. کاتی خۆی ئێمەی منداڵ قلێکمان لە نێوچەوانی خۆمان دەداو شەقەی دەهات. ناومان نابوو: ((شەقشەقە)).

دەمانخوارد.

**قێزبەلە:**

قێزبەلە: ((هەپۆك. هەلەكۆك)). گیایەكی بەهارییە و گـەڵای وەك ((بـی)) وایە و بنەكی شیرین و خۆشی هەیە.

((من چەند جارم خواردووە، بەڵام تەواوم لەیاد نـەماوە و ئـەو تەعریفـەم لە فەرهەنگەكان وەرگرتووە. جانازانم ڕاستە، یان درۆ)).

***

**كوارگ**

كوارگ ((كارگ، قارچك)): ڕووەكێكی ناسـك و نێركداری سـەرپان و پـەڕ پەڕە سپییە. لە بەهارانی زۆر بە باران دەبێت.

مـن وام بیسـتووە لـە كوێسـتانەكانی كوردسـتان قورسـی یـەك كـوارگ نزیكەی ((٥)) كیلۆبووە.

ئێستا لە ئێران دەچیندرێت و بۆ ئێرە دێت.

***

**كوارگە سەیانە:**

وەك ئەمـەی سـەرەوەیە لەشـێوەدا، بـەڵام تـەنك و ژێـرەوەی ڕەشـەو نزیكەی بستێك لە زەوی بڵند دەبێت.

بە زۆری لە شوێن كوفەك و زبڵدان شین دەبێت. ئەمەیان ناخورێت.

***

**گاگۆز:**

گیایەكی خۆرسكە و لـە شـێوەی پاقلـە مارانەدایـە، بـەڵام دنكەكـەی زۆر گچكەترە. ئێمەی منداڵ كە دەمان خوارد وەك گێژمان لێدەهات.

دەگوترا: ئەو ڕووەكە : ((گا))ی زۆر پێ قەڵەو دەبێت.

***

**گونە پشیلە:**

گونە پشیلە: گیایەکی بەهاری و گەڵا وردە و بەرێکی قیچەك پانە و ڕەنگی بۆری ئاماڵ سۆرە و دنگی تێدایە و دەخورا، بەڵام بەتام نەبوو. شێوەی لە هێلکە گونی پشیلە دەچوو بۆیە ئەو ناوەی بەسەردا سەپابوو.

***

**سوورانە:**

لەو دێهاتانەی دەشتی هەولێر ئەگەر کابرایەکی نیشتەجێی گوندی ئاغان کیژی خۆی بەمێرد بدابووایە، دەبووایە ماڵی زاوا شتێك بداتە ئاغاکە. ئەگەرنا ڕازی نەدەبوو: بووکەکەی ببەن.

هێندە جار (شەشاگر)) بوو، هێندەجاریش ((٣٠)) سی دینار پارە بوو. ئەو پارەیەش ئەوسا زۆر بوو.

ئەمە ((سوورانە))ی ناوبوو.

***

**شت لێنەکەوتن:**

لە زەمانی زوو: ئەگەر ماڵێك لە کاتی جێبەجێ کردنی کارێکیدا شتێکیان بەسەر بهات بووایە، دەیانگوت ((ئەو شتەمان لێناکەوێت)).

ئیتر ببڕای ببڕ خۆیان لە کارەکە هەڵنەدەسوییەوە. لە گوندی مورتکەی گەورە ماڵێك هەبوو دەیانگوت: ((کاردیمان لێناکەوێت)).

دەستیان بە هیچ شێوەیەك نەدەچوو بنەکاردییەك بکەن.

ماڵێکی دیکە ((پەتە)) هەڵکردنەوەیان لێنەدەکەوت.

کە ماڵی ئێمە ساڵی ((١٩٥٦))دا چووە مورتکە وامان کرد: یەکەم ماڵ کاردی بکەن و دووەمیش پەتەی هەڵبکەونەوە.

***

**سوخەتی گیانلەبەران:**

١- ئەسپ: نەبەزین.

٢- ئێستر: بەکێش.

٣- باز: چاوتیژ. ڕاوچی.
٤- بەراز: لامل و بەهێز.
٥- بولبول: دەنگخۆش.
٦- بۆق: مەلەوان.
٧- پەپوولە: نەرم و نیان.
٨- پەپوولە سلێمانە: موژدەی خۆش.
٩- پەڕەسێلکە: بێگوناح.
١٠- پشیلە: سپلەیی.
١١- پڵنگ: ئازاو خۆ بەزل زان.
١٢- تاوس: جوانی و ناز و فیز.
١٣- چەقەڵ: زەغەل. زەمتە.
١٤- حوشتر: ڕێناس و تۆڵەسێن.
١٥- داڵ: ((خەرتەل)) خۆپەرست و ئەنانی.
١٦- داڵاش: بچووکترە: گەندە خۆری.
١٧- ڕەشۆلە: چیڕ و خۆگر.
١٨- ڕێوی: فێڵباز.
١٩- سەگ: وەفاداری.
٢٠- سیمرخ: خەیاڵ پڵاو.
٢١- شینە شاهۆ: خۆبەزلزانی بەهۆی سێبەری سبیانانیەوە.
٢٢- شێر: ئازاو دلێر و بەرزی.
٢٣- عەلەشیش: هێڕ و دەبەنگ.
٢٤- قەلەڕەشکە: نەگبەت و بەدیۆم.
٢٥- کەر: بەسەبر.
٢٦- کەروێشک = ((کێرووشک: خەوۆک)).
٢٧- کەلەشێر = کەڵەباب = وریا.
٢٨- کەمتیار: بۆگەخۆر. مردوو خۆر.

٢٩- کونده بۆ: شووم و دمۆر.

٣٠- کۆتر: ئاشتی.

٣١- کیسەڵ: لەسەر خۆ.

٣٢- گورگ: چاوچنۆك.

٣٣- لەقلەق: شادی.

٣٤- مار: بێ مەکان.

٣٥- مامز: ئازاو جوانی.

٣٦- ماین: بەجوانی.

٣٧- مەیموون: هۆشیاری و لاساییکەر.

٣٨- مشك: ناپووت.

٣٩- مێرووستان:ماڵداری.

٤٠- ورچ: زۆرخۆر و بەهێز.

٤١- هەڵۆ: بەرزەفڕ و لووت بەرز.

٤٢- هەنگ: یاسا. دەستوور.

***

**قەرەج:**

قەرەج بە مەزەندەی من ((ئەگەر لێم نەبێتە درۆ)) تورك بوون.

پیاویان لەگەڵ نەبوون و ژنەکانیان گوند بەگوند دەگەڕان. کارو کاسبییان بەس دزیبوو.

ژنە دۆمەکان بێ پەردە، دەچوونە ژووری ماڵانەوە و کەس تەقییەیان لێنەدەکرد. کەچی هەرکە ژنە قەرەج دەهاتن ژن و منداڵی ئاواییەکە، بۆ ئەوەی نێنە ژوورەوە. لێکڕا لە دەرگەی حەوشە رادەوەستان و نەیاندەهێشت بێنە حەوشەوە. چەند جار دزییان لێگیرابوو شەرمیشیان بەخۆ نەبوو: دزییان لێ بگیرابووایە.

جارێکیان دوو ژنە قەرەج لە گوندێك ڕێیاندەدەن بچنە ژوورەوە، یان ماڵەکە لە ماڵ نابن پارەیەکی زۆر دەدزن.

خاوەنەکەی درەنگ دەزانێت و گوند بە گوند لە دوایان دەگەڕێت. هەتا لە دێیەك تووشییان دەبێت و پارەکەی لای یەکێکیان دەبێت لێی دەستێنتەوە.

ژنەکەی دی هەرکە زانی پارەکە زۆرە تفێکی زار جوانە لەدووڕ چاوی دزەکە دەکات و دەڵێت:

- قەحپە ئەگەر بەمنت بگوتبووایە پارەکە زۆرە ئەمن لەناو چشتەکەی خۆشم بنابووایە قوتارم دەکرد.

***

**کارێز:**

- کارێز: مانای ئاوێکە لەبن زەوییەوە دەرهێنراوە و سەری داپۆشرابێت.
- کارێزکەن: کارێز لێدەر.
- کارێزلێدەر: ئەو کەسەیە کارێز لێ بدات. وەستای کارێزان.
- کارێز لێدان: ئیجاد کردنی کارێز.
- کارێزاو: ئاوێکە لە کارێزەوە دەربێت.

سەردەمایەکی زوو ئاو لە زوورگ و بەرزاییەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێر زۆر سەر عەردبووە بە دوو مەتر و سێ و چوار مەتر قوڵ دەگەیشتە ئاو.

ئەوسا سێ چوار بیریان لە نزیك یەکتر لێداوە و ئاوەکانیان لەبنەوە تێك کردبووەوە. جا قەرە بەقەرە ئەندازەی لێژایی ئاوی بیرەکان بیری دیکە، بە جۆرێکی وا قوڵ کردووە لە سەرچاوەکە لێژتر بێت و بەشێوەیەکی ئاسایی بەرەو نزمی دەشتی هەولێر شۆڕ ببێتەوە و هاتووە تەسەر عەردی.

هەر بیرێك لە ((١٠٠)) سەت مەتر، تاکو ((٤٠٠)) چوارسەت مەتر لەیەکتر دوور بوون و سەریان بە ((چاتی)) گیرابوو.

سەردەمایەك دەشتی هەولێر چەند جۆگە ئاوی كارێزی هەبووە و خەڵكەكە بۆ كشتوكاڵ و مەرەزە و شینایی و ڕەز و باخیش سوودیان لێوەرگرتووە.

كەچی بەداخەوە لەبەر كەمبارانی چەند ساڵە وشك بوونە و ترپاتی تەڕییان بۆ سونەتیش تێدانەماوە. بگرە شوێنەكانیشیان پڕبووەتەوە.

***

**كەڕامەتی شێخ:**

ڕۆژێك شێخێك لەنێو كۆمەڵە خەڵكێكدا وەك حار بگرێت، ڕەنگی تێكدەچێت و بە سەر لەراندن و دەنگی بەرزەوە دەڵێت:

- چەغە، چەغە، چەغە.

هەركە جەزبەكەی هێور دەبێتەوە خەڵكەكە پێی دەڵێن:

- یاشێخ بە قوربان ئەو چەغە چەغەیەت لە چبوو! ؟..

بە تۆزێك حارگرتنی دیكەوە دەڵێت:

- ئەوەی ڕاستی بێت سەگێكی زۆر پیس و گڕووم دیت دەیویست بچێت پاڵ بە دیواری كەعبەی شەریف بدات و ئاوەگڵی بكات. منیش خۆم پێنەگیراو چەغەم لێكرد و دەرم پەڕاند.

خەڵكەكە بیلبتوون باوەڕیان هات و بە كەڕامەتێكی گەورەیان خەملاند. تەنیا یەكێكیان نەبێت، بەس تاسای نەكرد بەرپەچی بداتەوەو لە دڵی خۆی گرد.

ڕۆژێك كابرای بڕوانەهاتە جەماعەتەكەی گشت دەعوەت دەكات.

هەركە دەچنە ژوورەوە جێگەی شێخ بە تەنیا لەسەرەوەدا دەنێت و ئەوانی دیش لە خوارەوە.

كە شیو دێت، سەری پلاوی هەمووان پڕ گۆشت دەبێت، بەس چێشتی شێخ نەبێت پلاوێكی ڕووت.

شێخ بەمە قەبرغەی دەگرێت و پڕ هەڵدەمینێت، بەخۆی ناوەستێت و ڕووی بەو پەڕی هەڵچوونەوە لە خاوەن دەعوەتەكە دەكات و دەڵێت:

- جەناب ئەوە دەعوەت نییە قەشمەری پێکردنی منە.

خاوەن ماڵ لەبن زاری دەگات، بەڵام خۆی لە گوورەنابات و بەشێوەیەکی شپرزایی یەوە دەڵێت:

- یاشێخ بە قوربان من حەدم نییە، قەشمەری نەك بە جەنابت، بگرە بە منداڵێکیش بکەم.

کەفی غەزەب لالغاوەی شێخی سپی هەڵگەڕاند و گوتی:

- خۆت خەشیم مەکە وادیارە: ئەو هەموو گۆشتەت لۆ جەماعەتت داناوە، کەچی شیوی منیش پشکێك چییە بە سەریەوە نییە. ئەدی قەشمەری کردن کووە.

ئەوسا خاوەن ماڵ سینگی خۆی هەڵدەکێشێت و بە پێکەنینەوە دەڵێت:

- شێخێك گۆشتی لەبن برنجی بەردەمی خۆی نەبینێت، ئەدی پێمناڵێیت کوو لێڕەڕا سەگ لە مەکەوە دەبینێت.

***

## کێشەی ئاغا و کرمانجی:

دوای بەرپابوونی شۆڕشی ((١٤)) چواردەی گەلاوێژی ساڵی ((١٩٥٨)) بە سەرکردایەتی خواڵێخۆشبو: ((زەعیم عەبدولکەریم قاسم))، ئاغا دەورو زەبرو زەنگیان کۆتایی هات و جوتیار باوی ساند.

لەنێو شاری هەولێر چەند هوتافات لێدەدرا: کەچی بەداخەوە زۆرم لەیاد نەماون. ئەوانەی خوارەوە هەندێکیان:

- ماکو زەعیم – ئیللا کەریم.
- زەعیم زەعیم لیلئەمام:

دیموکراتییە وسەلام.

- لیکوللی ئومەتین زەعیم

زەعیمنا عەبدولکەریم.

- بژی گەل ڕۆڵەی گەل

مام رەحمان و شێخۆشەڵ.

((دوو پیاوی به بزێوی حیزبی شیوعی بوون)).

کرمانجه داخ لـه دڵـەکان هەرکـه چـاویان بـه ئاغـان دەکـەوت ئەمانـەیان دەگوت:

- سینی نییه کاشییه

ئاغا گەواد باشییه

- پەنیر نییه ژاژییه

ئاغا توخمی تاژییه

ئاغـاش هەرکـه دەوریـان گـەڕاوه و چـاویان بـه کرمانجـان دەکـەوت و دەیانگوت:

- بن دیوار و بن دیوار

داکتان دەگێین شەعبی پار.

***

**کێوەلی:**

((حاجی فاتمه)) شیان پێدەگوترا. ئەوانه عەرەب بوون و گوند بـه گونـد دەگەڕان. ئێواران لەسەر سەکۆی دیوەخانی ماڵـه ئاغـا پیاوەکانیـان دبکیـان لێدەدا و عەتابەیان دەگوت. ژنەکیش به گوێرەی دەنگی تەپل و عەتابەکەوه هەڵدەپەڕی = ((سەمای دەکرد)).

گەنجانی ئاوایی دەورەیان دەدا.

له کاتی سەماکەدا کێ درهـەمێکی بدابووایـە، چـەفیەکی ڕەشـی لابـوو.. دەیدایێ.

هەرکه کاتی پشوودان دەهات ئافرەتەکه دەچوو له تەنیشت ئەو کەسەی چەفییەکەی لابوو دادەنیشت.

گەنجەکانی ئاوایی، به تایبەتی کوڕی ئاغا زۆر جار دەستیان بۆ دەبـرد و دەنگی نەدەکرد.

من ساڵێك دەبوو بلوغم بوو بوو . و درهەمێکم له دایکم ساند و چووم.

کاکم = ((برا گەورەکەم)) به باوکم دەڵێت:

- لۆ توو زۆر عەیبە کوڕت بچێتە ئەو قاحپەخانەیە.

باوکم گوێی پێنەداو ئەو هەر وازی لێناهێنێت لە ئاخریدا باوکم دەڵێت:

- لێگەڕێ کوڕم، هەمووماڵێك خوێڕیەکیان هەیە با ئێمەش خۆڕییەکمان ببێت.

لەبەر گەنجانی ئاوایی بەبەرەمن نەکەوت و بە دڵ ساردی گەرامەوە.

***

**چەند گەمەو یاریی ناوچە:**

زۆربەی گەمەکانی ناوچەکە خوالێخۆشبوو.. مامۆستای پایە بەرز ((محەمەد کەریم شەریف)) لە کتێبە نایابەکەی، بەناوی ((یارییەکانی کوردەواری))دا بڵاو کردووەتەوە. بۆیە من بەڕەوام نەزانی لێرەدا خۆم لە قەرەیان بدەم. تەنیا ((٩)) نۆ گەمە نەبێت لەبەر مەبەستێکی تایبەتی خۆم و هەندێکیشیان تۆزێك لەگەڵ ئەوانەی ئێرە جوایەزن. بۆیە بە پێویستم خەملاند لێرەدا دووبارە بڵاوبکرێنەوە. ((نووسەر)).

**ئاگر تەقێنە:**

**((ئاگر تەقانێ))یشی هاتووە:**

گەمەیەکی منداڵان بوو. ئاگریان لە حولە حوشتر بەردەدا تاکو دەبووە پۆلیە ئاگر. جا یەکە یەکەیان لەسەر بەردێکی پانی بەقەد دوو ناولەپ دادەنا و بە بەردێکی دیکە قاییمان لیدەدا. تەقەیەکی گەورەی لێوە دەهات.

کەچی ئەو گەمەیە تەنیا بە حولە دەبوو. ئاگرەکەی توند بوو. قەرسەقول و سەرگین لەبەر ئەوە شلن ئاگرەکەیان شلە تەپەی دێت، نەك تەقە.

***

**بابی بابی:**

ئەم گەمەیە بەلای کەمیەوە دەبێ سێ منداڵ هەبێت. تاکو شەش. لە مەزۆرتر یارییەکە درێژەی دەکێشێت و زەوقی منداڵانی سست دەکاتەوە.

یەکێکی زیرەك و تۆزێك لە منداڵەکانی دی هەراشتر دەبووە سەرۆکی یارییەکە و هەر جارێ یەکێك لەم شتانەی لە نێودەست دەگرت:

١- ((قاوە)) = پەڕۆیەکی بچووکی ڕزی.

٢- ((پەنگر)) = پەمۆیەکی کەم.

٣- ((گۆزە)) = پارچە تاسولقەیەکی بچووك.

٤- ((داسووکە)) = زلە قەسەڵێکی بچووك.

٥- ((گای ڕەش)) = قلە قشپل.

ڕووی زاری لەیەکێکیانی دەکرد و دەیگوت:

((قاوە، پەنگر، گۆزە، داسووکە، یان گایڕەش))؟.

واتە هەڵێنەو چیم لە دەست دایە.

ئەویش یەك لەم شتانەی بەر گوێ کەوتبوون دەگوت. بۆ وێنە دەیگوت:

- ((گۆزە)).

ئەگەر هەڵێنابووایە، واتە گۆزەی لەنێو دەست دابوو منداڵەکە لە یارییەکە سەردەکەوت. خۆ ئەگەر ((گۆزە)) نەبووایە. واتە هەڵێنەهێنابووایە. بەدۆڕاو حسێب دەکرا.

لە هەردوو باردا دەستی بۆ یەکێکی تر ڕادەگرت. تا بەم شێوەیە منداڵەکان تەواو دەبوون.

ئەگەر دوو منداڵ، یان سێ سەرکەوتوو نەبوونایە هەننۆب هەڵێنەکەی دووپات دەکردەوە. هەتا تەنیا یەك دۆڕاو دەمایەوە.

سەرۆکەکە سەری منداڵە دۆڕاوەکەی لەنێو کۆشی خۆی دەنێت و بە دەست لە پشتداندا دەڵێت:

- ((تەپەڕەپە. تەپەڕەپە. تەپەڕەپە)).

هەتا منداڵە سەرکەوتووەکان خۆیان بە تاولە پەناو پەسارگەیەکی دوروبەر دەشاردەوە.

ئەوجا سەرۆکەکە بەدۆڕاوەکە دەڵێت:

- ((سەرت قیت کەوە)).

ئەویش دوای سەربەرزکردنەوە و ڕوانینی بۆ هەرچوار ئالییەوە و هیچ کەس لە هاوڕێکانی نابینێت. ئەوسا سەرۆکەکە پێیدەڵێت:

- ((ئازاد لە کاملایە؟)).

ئەویش لەگەڵ دەست درێژکردن بۆ لایەك و دەڵێت:

- ((لەولایەیە)).

سەرۆك بانگی دەکات و دەڵێت:

- ((ئازاد زەڕ...)).

ئازادیش بە ((عۆ..هـ، عۆ..هـ)) لە حەشارگەکەی دەهاتە دەرەوە.

ئەگەر لەو کەرخەی دەرچوو چاو گیراوەکە ئاماژەی بۆ کرد، سەرۆکەکە پێیدەڵێت:

- ((وەی ماکەر)).

واتە دۆڕاندت.

خۆ ئەگەر ئازاد لە لایەکی دیکە دەربهات بووایە سەرۆکەکە دەیگوت:

- ((وەی نێرەکەر)).

واتە بردتەوە.

بەم چەشنە هەتا منداڵەکان لە حەشارگاکانیان گشت دەهاتنە دەرەوە.

ئەمجارە منداڵە چاوگیراوەکە، واتە دۆڕاوەکە دەبێ لەسەر چینچکان و سەری لەنێوکۆشی وەستا بێت تاکو منداڵە نێرەکەرەکە بتوانێت لەسەر پشتی دانیشێت. سەرۆکەکە لەگەڵ پەنجەوەژاندن لە پشت ملیدا دەیگوت:

- ((بابی بابی، حەمەدەی ڕابی تەقڵەی لە چەندان دابی)).

واتە ئەو پەنجانەی لە ملت دەوەژێنم چندن؟.

ئەویش دەڵێت:

- ((سێ پەنجەنە)).

ئەگەر سێ نەبوو ((بابی بابی)) یەکەی دووبارە دەکاتەوە. هەتا هەڵدەهێنێت و نێرەکەرەکە لەسەر پشتی دێتە خوارەوە.

ئەوجارە منداڵە ماکەرەکە جێگەی منداڵە دۆڕاوەکەی دەگرتەوە و چاوگێراوەکە سواری سەر پشتی دەبێت.

ئەگەر ماکەرەکە درەنگ هەڵبهێنێت، سەرۆکەکە وەك یارمەتی دانێك. هەتا رزگار ببێت، پەنجەیەك، یان دوو پەنجە بە توندی لە پشتە ملی دەچەقێنێت و دەڵێت:

- ((بابی بابی حەمەدەی رابی.. ................)).

ئەوسا ماکەرەکە بەم تەرزە خۆی دەرباز دەکات واتە ژمارەی پەنجەکان دەزانێت.

***

**پەنجەکانی دەست:**

یەکەم: ژمارە لە پەنجەی گچکەوە بۆ پەنجە گەورەیە. بە، بەرەواژی نەبووە:

١- پەنجەی گچکە ژمارە ((١)).

٢- پەنجەی تەنیشت گچکە ژمارە ((٢)).

٣- پەنجە درێژە، یان لۆقن ژمارە ((٣)).

٤- پەنجەی شادە ژمارە ((٤)).

٥- پەنجەی گەورە ژمارە ((٥)).

دووەم: پەنجەکان هەریەکەیان سێ ناویان هەیە و لە پەنجە گچکەکەوە دەست پێدەکرێت:

أ- ١- تووتە.

٢- براتووتە.

٣- ئەژنۆ رووتە.

٤- دۆشاو مژە.

٥- ئەسپی کوژە.

مرۆڤی پێشوو هەرکە ئەسپێیەکیان لە جەستە خۆیان بەدی دەکرد، دەیانخستە نێوان نینۆکی هەر دوو پەنجە گەورەکان و دەیانفلیقاندەوە. بۆیە ئەم ناوەی بەدواکەوتووە.

ب-١- قولینچك = ((قجیلك))

٢- مامە لینچك = ((بابەجیلك))

٣- دۆڵەدرێژە.

٤- شادە نوێژە.

٥- ئەسپێ کوژە.

پ- ١- بچین بچین.

٢- بچینە کێندەر.

٣- بچینە دزیێ.

٤- خواقەبوول ناکات.

٥- لەسەرە من.

***

**تەشی تەشی:**

من شەڕە گەڕەکم کردووە. جارێك من و منداڵانی گەڕەکی باشووری کەندەکە، لەگەڵ منداڵانی گەڕەکی سنجاویان، کە لەبەری باکووری رۆژئاوا بوو، یەکترمان دا بەر بەردەقانیان.

کەندیش واهاتبوو سوارهێستر نەیدەوێرا لێی بپەڕێتەوە.

لە کاتی بەردەقانی هاوێشتندا پڕ بەزار هاوارمان دەکرد:

- ((گەڕەکی مە تەشی تەشی، گەڕکینگۆگان دەفرۆشی)).

ئەوانیش وەڵامیان بەجوێن و بەردەقانی دەدایەوە.

***

**تەڵەو ڕیویانێ:**

ئەم گەمەیەم بەس لە پیاوانی گەنج دیوە. نەك لە منداڵان.

یەکێك هەردوو پێی بەیەکەوە دەبەسترێت و هەردوو دەستیشی بەیەکەوە و ئەوسا هەڵدەستەوە سەر هەر چوار پەلی گوایا تەڵەیە.

کەسێکی دی خۆی دەکاتە ڕێوی و دەست و پێی ڕاستەی ((بابلێین)) دەخاتە بۆشایی نێوان هەردوو لاقی تەڵەکەو دەست و پێی چەپیشی دەباتە بۆشایی هەردوو دەستی و ئەوجا سەری نەوی دەکات و دەیخاتە بن زگی تەڵەکەو خۆی بەلای پشتەوەی ڕێوییەکە وەردەگێڕێت تەنگەی تەڵەکە و پشتی ڕێوییەکە دەکەونە عەردی و پاشەڵی ڕێوییەکە بە فشی بەرزە دەبێتەوە.

هەتا تەڵەکە دەست و پێی خۆی شل نەکردبووایە ڕێوییەکە هەرگیز نەیدەتوانی خۆی بە ئاستەمیش بجولێنێت.

من لەدیار نەبووم، بەڵام لە دیوەخانی گوندەکەمان کوڕی ئاغا وایکرد کوڕە کرمانجێك ببێتە ڕێوی و ئەوسا دووسێ کوڕە گەنجی دیکە دۆ خینی شەرواڵەکەی دەکەنەوە و بەڕێککەوتیش مووی بەری درێژ دەبێت و داوداوی دەردەکێشن و کوڕە زیڕەی دەگەیشتە گەشکەلانی حەواوە.

نیازیش لە گەمەکە ڕیسواکردنی ڕێویەکە بوو بە دەرکەوتنی عەورەتییەوە.

***

**تۆپانێ:**

ئەمە تایبەت بوو بە گەوران. واتە کوڕە گەنجەکان نەك منداڵ.

جغزێکی قوتری لە ((٢٠)) مەتر کەمتر نەبوو لێدەدرا.

تۆپ پارچە لبادبوو، بەبەن و شووژن بە جۆرێکی وا دەدوورا، هەتا لبادەکە دەچووە باریەك و خڕدەبوو. هێندە کەس بۆ ئەوەی تۆپەکە بە هەرکەس بکەوێت بیهێشێنێت ((گرێ))ی ((کندڕ)) و ((گوریس)) یان دەخستە ناو. هێندەجار بۆ ئەوەی زەبری تۆپەکە کوشندە بێت، لە کاتی گەمەدا قیچێك بە ئاو تەڕ دەکرا.

چوونە دەرەوە و ناوەوەی جغزەکە هەول جار بەتیر و پشکانێ بوو.. لە دواییدا دۆڕاو دەچووە ناو جغزەکە و براوە لە دەرەوە.

ئەوانەی دەچوونە ژووری جغزەکەوە دەبووایە ((٣)) سێ کەس کەمتر نەبووایە. چواریش دەبوو.

ئەوانەی دەرەوەش سێ چوارێك.

یەکێك لە ئەوانەی لە دەرەوە، لەسەر هێڵی جغزەکەوە تۆپەکەی بەبان سەری ئەوانەی ناوەوە دەهاوێشت. دووەمی بەرامبەری دەیگرتەوە و نابێت لە نێو دەستی ڕایگرێت و دەلحاز بۆی دەهاوێشتەوە.

لەگەڵ هەر تۆپ هاوێشتنێکدا ئەوانەی دەرەوە، دەبێ چەند هەنگاوێك بەلای ڕاستەوە، لەسەر هێڵەکە سووڕا بووانایە.

هەتا تۆپەکە دووسێ جار بەسەر ئەوانەی ژوورەوە نەهاوێشترابووایە حەقی تۆپ وەشاندنیان نەبوو.

ئەوانەی ژوورەوە ڕوویان لە تۆپەکە بوو.. و چاوەڕوان بوون تۆپییان لێ بدرێت لەگەڵ تۆپ هاوێشتندا ئەوان ڕووە خۆیان وەر دەچەرخاندەوە. ئەگەر ئەوانەی ژوورەوە تۆپەکەی بەسەر سەریاندا دەهات بگرتبووایەوە و دەلحاز لەو کەسەی دەرەوەی دەدا کە تۆپەکەی هاوێشتبوو. ئەوسا ئەوەی دەرەوە دەخلچا.

یەکێك لە ئەوانەی دەرەوە تۆپێکی بۆ یەکێك لە ئەوانەی لە ژوورەوە بوون دەهاوێشت. ئەگەر بە جەستەی بکەوتبووایە، ئەوانەی سەر جغزەکە لێکرا هەڵدەهاتن. یەکێك لە ئەوانەی ناوەوە خێرا تۆپەکەی هەڵدەگرتەوە و دەکەوتە دوای یەکێك لە هەڵاتووەکان و تۆپەکەی تێدەگرت. ئەگەر لێینەدا بووایە، ئەوەی ژوورەوە کە تۆپەکەی پێکەوتبوو ((دەخلچا)). واتە دەدۆڕاو دەچووە دەرەوە. ئەگەر پێی بکەوتبووایە کەس لەکەس دەبوون.

ئەگەر تۆپەکە بە دەستی ئەوەی ژوورەوە بکەوتبووایە بە هیچ حسێب نەدەکرا و دووبارە غامێکی تر تۆپی تێدەگیراوە.

ئەگەر ئەوەی دەرەوە و تێگرت و لێینەدا بووایە دەخلچاو دادەنیشت. تەنیا ئەوانەی ژوورەوە ئەگەر یەکێکیان بمابووایە بە دۆڕاو لەقەڵەم نەدەدرا و تۆپانەکە لەم غامە رانەدەوەستا.

ئەوانەی دەرەوە دەبووایە لە دووان کەمتر نەمینێن. چونکە یەکێك لە دەرەوە چی بۆنەدەکرا.

ئەگەر ئەوانەی ژوورەوە هەموویان خلچان، ئەوانەی دەرەوە، دوو..، یان بەسەرەوە مانەوە براوەنە و دووبارە، لە غامی دووەمیش هەر لە دەرەوە دەبوون. ئەگەر ئەوانەی دەرەوە یەکێکیان ما، دۆڕاون دەبێ بچنە ژوورەوە و ئەوانەی ژوورەوە دەهاتنە دەرەوە.

***

لە تۆپانێدا ئەمن زۆر ئازاو چاپووك بووم.

جارێکیان ئێمەی فەقێی حوجرەی گوندی مورتکە گەورە سەردانی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا ((تاهیر))ی کەندا قەڵمان کرد. کە ناوبراو لای باوکمی خوێندبوو.. و ئەوسا مەلای گوندی ((قازیخانە)) بوو.

کە چووین گەنجەکانی ئاوایی تۆپانێیان دامەزراند.

منیش خۆم وەگەڵدا. هەتا لەدەرەوە بووم زۆرم لە ئەوانەی ژوورەوەدا. هەرکە تۆپم بۆ هاورێکەی بەرامبەرم دەهاوێشت و تا بۆم دەگەڕاوە، ئەوانەی ژوورەوە پشتیان لە من بوو تەنگەتاو دەچوومە نزیك ئەوەیان کە لە پەڕگەی لای من بوو، هەرکە تۆ پەکەم بۆ دەهاتەوە، کابرای غەنیم لە مەتر، مەترو نیوێك زیاتر لێم دوور نەبوو.. و ئەویش بێ ئاگا، هەتا هێزم لەبەردا بوو تۆپێکم لە قەبرغەی گیر دەکرد. بەم چەشنە تۆپێکی زۆرم لێدان.

دەستەی ئێمە خلچاو کەوتینە ناوێ. ئەوانەی دەرەوە زۆر قارو غەرەزیان لە من هەڵگرتبوو، تۆپەکەیان بە زۆری بۆ من دەهاوێشت.

منیش ئەوکات گەنج و بە گوڕ بووم و لەش سووك و بە برێو، خۆم کوژدەکردەوە. هەرکە تۆپیان بۆم دەهاوێشت، ئەگەر بڵندبووایە خۆم نەوی

دەکرد، خۆ ئەگەر نەوی بووایە مەترێك لەخۆم هەڵدەدا. مەگەر بە دەگمەن دەنا تۆ پێیان بە من نەکەوت.

پاش چەندین ساڵ خەڵکی قازیخانە هەرکە منیان لە شاری هەولێر دەدیت دەیانگوت:

- ئەوە ئەو فەقێیەیە تۆپانێ باش دەزانی.

***

**تیر و کەوان:**

تیر تێلێکی ڕەق و نزیکەی دوو بست درێژ و سەرێکی وەك ((زەرك)) تیژ و سەرەکەی دی لە پەلە دارێکی تایبەت خوشکراو و بە ئەندازەی پەنجە تووتە ئەستوور و درێژ دەکوترا، یان لە جیاتی دارەکە پارچە تەنەگەیەکی درێژووکانی و تەنکی لێدەدرا.

((کەوان)) دارێکی شلك و تەڕ و لە پەنجەی گەورە کەمێك ئەستوورتر و درێژی ((٤٠)) سەنتیمەتر و بەهۆی گەرمی ئاگرەوە دەکرایە کەوانە.

لاستێکی نێرەی دوو پەنجە پان و بە ((تیرە)) لەم سەر و لەو سەری کەوانەکە دەبەسترا.

بنکی تیرەکە، دار، یان تەنەگە دەخرایە ناوەڕاستی لای ژوورە وەی لاستیکەکەوە و تیر هاوێژەکە بەپەنجە دۆشاو مژەو ئەسپێ کوژەی دەستی چەپەوە بنکی تیرەکەی لاستیك لەسەر، دەگرت، بە دەستە ڕاستەوە، ناوە ڕاستی کەوانەکە و دوای ڕاکێشانی لاستێکی بنکی تیر لە ژێر، بە هەموو توانایەوە بەریدەداو تیرەکە بە تەك دەستی ڕاستی دەڕۆیشت. من هیچ جار بە تیر لە نیشانەم نەداوە. کەچی کاکم بە دەیانجار نیشانەی پێکاوە.

لاموابوو لە ئاخر و ئۆخری چلەکانی سەدەی ڕابردوو دابوو، خوالێخۆشبوو: ((سەعیدەی حاجی محەمەد نەجاڕ))ی گوندی ((عاللا))ی ناوچەی کەندێناوە ژنی دەهێنا. لەبەر ئەوە پەیوەندییان لەگەڵ ماڵی ئێمە زۆر بەهێز بوو لە دوای ماڵی ئێمەیان گێڕاوە. من و کاکم و دایکم چووین.

کاکم لەناو منداڵانی گوندەکە خۆی بە تیر هاوێژ هەڵدەکێشاو ئەوانیش شتاقیان تیر و کەوانیان نەبوو. چەند جار لەدیار منداڵەکان نیشانەی پێکا.

تاکو منداڵەکان بەچاو ببینن تیرەکەی زۆر بڵند دەبێت، بۆ حەوای هەڵداو لەبەر تیشکی ڕۆژ تیرەکەی لە هاتنەوەدا نەدەدیت و لەبەر ئەوە نووکەکە، لە بنکەکەی ((دار و تەنەکەبوو)) گرانتر بوو زووتر هاتە خوارەوە و بە ڕوومەتی ڕاستە کەوت و دوو بەدەری کرد و خوێنێکی زۆری لێهات.

لەو ڕۆژەوە کاکم تیر و کەوانی فڕێدا.

***

**جگانێ:**

جگانێ لە سەرابیدا پێویستە بزانین ((جگ)) چییە.

جگ هێسکێکی بچووك و شێوەی تایبەتی خۆی هەیە و بووەتە پێوەلکانی ئاخیرهێسکی بەلەك و سەرەتای هێسکی ڕانەوە.

جگ چوارلای سەرەکی هەیە. لایە پەرزەکانی ((لووس))ە کە پێدەگوترێت ((کەر)). ئەوی دی ((میر)).

لایە پانەکانی لووس و بەرزەکەی ((پشت))ی ناوە و ئەو تیر.. ((قۆیزان))ە.

**جگ بەگشتی دوو جۆرە:**

أ- جگی ڕاستە: لە جگانێی ((هەرستی = هەڵستی))دا پشتی دەکەوێتە کەرخی ناولەپ.

ب-جگی چەپە: قۆیزانەکەی دەکەوێتە ڕاست ناولەپەوە.

- جگی بەران و نێری لەبەر گەورەیی پێیاندەگوترا: ((جگە حۆلە))، جگە گۆلك گەورەتر بوو گەمەی پێنە دەکراو حۆلەشی بەسەردا سەپابوو.

جگ: سەردەمایەك ڕەنگ دەکرا، بۆ گەمە کردن نەبوو. بەڵکو کوندە کراو ـ وەك شەقشەقە بەلانك لە ئاست سەری منداڵ هەڵدەواسرا. بۆ خافڵاندنی منداڵەکە بوو.

- جگە پووزە: جگی گچکە زۆر سووك.
- جگە جاقی: بەهۆی لە خەنەنان و چەورکردنی و هەڵسوینی لە گیاو گۆڵدا لووس و بتەو دەبوو.
- جگە کرووز: جگێك بوو لەبەر کۆنی کون کونی لێ پەیدا بوو بێت.
- جگە کەنووش: ئەو جگەیە کە هەندێکی لێ شکا بێت.
- دەسکەللا: ئەو جگە بوو گەمەی پێدەکرا.

***

**جگانێ:**

لە دەشتی هەولێر سێ گەمەی سەرەکی جگانێ هەبوو:

١- جغزانێ:

٢- کەللایانێ لەسەر جگ.

٣- هەرستی = ((هەڵستی)).

یەکەمیان: جغزانێکی خرلێدەدرا و لەناویدا بەجگ لەجگ دەدرا تاکو لە جغزەکەی وەدەردەنا. ئەوسا مانای وابوو بردییە و ئەوەی چووە دەرەوە دۆڕا.

دووەم: کەللایانێ لەسەر جگ دەکرا. ئەمڕۆچۆن دینار دەکرێتە: ((مـن = تکە))ی گەمەکە، ئەوسا پارە نەبوو لە جیاتی جگ دادەنراو گەمەی لەسەر دەکرا.

سێیەم: تایبەت بوو بە گەوران. لەسەر پارە بوو. دوو کەس، هەریەکەیان جگێکی تایبەتی خۆی هەبوو یەکەم جگەکەی خۆی لەسەر باری مـیر، لە سەرزەوی دادەناو ئەوی دی بەجگەکەی دەستی لێیدەدەدا و دەیگوت: ((- هەستە)).

ئەوە ئەگەر میقداری پارەکەی لەسەر دەکرا دیاربووایە، ئەگەرنا دەیگوت: ((- یەك عانە)). یان: ((دەفلووس)).

جا ئەگەر جگەکان هەر دووکیان لەسەر پشت، یان ((میر))، یان ((قوێزان))، یاخۆ ((کەر)) بکەو تیووانایە بە هیچ حسێب نەدەکراو کابرای جگە لە دەست، واتە ((وەستا)) دەبووایە هەنۆب جگەکەی لێ بدابووایەوە.

ئەگەر یەك لە جگەکان میر بە چەقی بووایە مانای وابوو کابرای جگ لە دەست بردبیەوە و بۆ دووەم جاریش جگەکەی لێدەداوە. خۆ ئەگەر یەکێکیان ((کەر)) بچە قیبووایە مانای وابوو جگ لە دەست دۆڕاندی.

پارەکەی دەداو لێدانە کەشی لە دەست نەدەما.

هەندەجار هەڵستی لەسەر جگ دەکرا، نەك پارە.

***

**حەوجە حەوجە:**

زۆرجار وا دەبوو کۆمەڵە منداڵێك، گەمەیان بەیەکەوە دەکرد. یەکیان لەبەر هەر هۆیەك بێت تووڕە دەبوو.. و دڕۆیشت. پاش ماوەیەك پەشیمان دەبووەوە و دەچووە ناو منداڵەکان.

ئەوسا منداڵەکان بە چەپڵە لێدان ئەمەیان دەگوت:

- حەوجە حەوجە
  گای گەوجە.
  حەوجە حەوجە
  گای گەوجە.

***

**خیتێ مێردان خیتێ ژنان:**

ئەگەر لەنێو کۆمەڵە منداڵێك دووانیان دەمەقاڵیان ببووایە و بە شەڕیش نەهاتبوونایە، منداڵێك لە سەیرکەرەکان کەوا لە ملی خۆشبوو بە شەڕ بێن، یان سکوت بکەن خێرا دەچوو، بەپێ، یان بە دارێك، یاخۆ بە بەردێکی دەستی، لەناوەڕاستی هەردووکیان لەگەڵ کێشانی خەتێکی ڕاست و چەپ دەیگوت:

- خیتێ مێردان، خیتێ ژنان.

- یەکێکیان لەدوو منداڵەکە بەپێ، یان بەدەست زوو ڕەشی دەکردەوە. واتە ئازامە و ئامادەمە شەڕ بکەم. ئەویدی دەرەقەتی نەدەهات و چاوی بێ غیرەتی لەبەر خۆی دەناو ئیتر دەمەقاڵێکە دەبڕاوە. یاخۆ دووەمیش لە شەڕدا وەك ئەو وا بوو حیزاتی بیدەنگی قەبوول نەدەکرد و بە شەڕ دەهاتن.

***

**زانینی ژمارەیەکی نهێنی لەنێو دڵی بەرامبەردا:**

**کەسێك بە ئەوەی بەرامبەر دەڵێت:**

- ژمارەیەك لەنێو دڵی خۆت بگرە و من دەزانم چەندە:
- دووەمیش دەڵێت:
- باشە.

بابڵێین: ژمارەکە ((٢٠)) بیست بووە.

یەکەم دەڵێت:

- چەندت لە دڵی خۆت گرتووە ئەوەندەشی لۆ قەرد بکە.

دووەم:

ژمارە ((٢٠)) قەرد دەکات و داوێتە سەر ژمارە ((٢٠)) بیستەکەی خۆی. بوو بە ((٤٠)) چل.

یەکەم دەڵێت:

- چواریشی باوێ سەری.

دووەم: چواری داوێتە سەر و دەکاتە ((٤ + ٤٠ = ٤٤)). چل و چوار.

ئێستا ژمارەکە ((٤٤)) چل و چوارە.

یەکەم دەڵێت:

- نیوەی هەموو ژمارەکانی نێو دڵت فرێدە.

دووەم: ژمارەکان ((٤٤)) چل و چوارن و نیوەیان ((٢٢)) بیست و دووە، فرێدەدات. دەمینێتەوە ((٢٢)) بیست و دوو.

- یەکەم: قەردەکەش بدەوە.

دووەم: قەردەکە ((٢٠)) بیست و بوو.. و دەداتەوە دەمێنێتەوە ((٢)).
یەکەم دەڵێت:

- ئەو ژمارەی لە دڵت دایە ژمارە دوو ((٢))ە.

تێبینی:
ئەمە زانینی ئاسانە و پێویست بە ڕاڤە کردنی ناکات.

***

**قاشوانێ:**

گەمەی قاشوانێ لەنێوان مێردمنداڵ و گەوراندا هاوبەشبوو.

من باسی یەکەمەکە دەکەم.

باباڵێین: مێرد منداڵەکان دوانزدە ((١٢)) کەس بوونە. دووانیان لە ئەوانەی دی تۆزێك هەراش و کار.. ڕێك و چازانتر دەبوونە سەرۆکی گەمەکە.

یەك لە سەرۆکەکان لە بەرابیدا بە ئەویدی دەگوت:

- دەبلێ: قیڕ.

ئەویش دەیگوت: قیڕ.

کەسی یەکەم دەیگوت: فلانم لاپیڕ.

واتە کردمە لای خۆم. کە باشترین و ئازاترین منداڵ بوو. لە یارییەکەدا.

دووەم دەیگوت: من فلانم هەڵبژارد.

هەتا بەم جۆرە تەواو دەبوون.

دوو شاریان دادەنا. شارەکانی هەندە جار.. ڕیزە بەردو هێڵ بوو. هێندە جاریش کەندو جۆم و قۆرتی زەوییەکە بوو.

نێوان شارەکانی نزیکەی دووسەت، سێسەت مەتر دەبوو.

هەر دەستەیەك دەچوونە سەر شارێك لە شارەکان رادەوەستان. ناوەناوە شارەکەیان دەگۆڕییەوە. لەکاتی گەمەکەدا دوو سەرۆکەکان بۆ ئەوەی کیهان ((گۆیەکەی لە پێشان لێبدات تیر و پشکیان دەهاوێشت. بۆ چوونە سەر شارەکانیش هەر ئەوها. تیر و پشکەکە ئەوسا بەزۆری بە

پارەبوو: یەکیان ((عانە))یەکی لە دەستە خۆ دەگرت و دەیگوتە ئەوی تر: ((شێرت دەوێت یان خۆت)).

دەیگوت: شێرم دەوێت.

پارەکە وا هەڵدەدرا لە حەواوە هەتا دەگەیشتە زەوی چەندجار دەسوورا. ئەگەر لای شێرەکە لەسەرەوە بووایە ئەوی دووەم. گۆیەکەی لێدەدا. ئەگەر خەتیش بووایە ئەویتر گۆیەکەی پێشتر لێدەدا.

هێندەجار لە جیاتی پارە بەردێکی خڕو پانیان بەقەدەر درهەمێك لایەکیان بە تف تەڕ دەکرد و دەیگوت:

- تەڕت دەوێت، یان وشك.

گۆیە کە دارێکی خڕ و تۆزێك لە هێلکە گەورە تر. ((گۆ))ی بەرد، لە کاتی گەمەکەدا بەلاقی هەر کەسێك بکە و تبووایە ئەگەر نەشیشکاند بووایە، بە قوربانی دەکرد، بەکار نەدەهات.

((قاشۆ)) دارێکی درێژی مەتر و پتر، سەری خواربوو. تاکو پێ لە گۆیەکە بدرێت. ئەگەر بەم جۆرە نەبووایە یاریی پێنە دەکرا.

یەکەمەکە لە ناوەڕاستی شارەکەی خۆیدا کە بە ((قزگە)) ناو دەبردرا هەتا هێزی لەبەردا بوو بە قاشۆکەی لە گۆیەکەی دەدا و بەرەو شاری غەنیمەکانی و بڵنددەبوو. منداڵەکان هەر دوولا پڕتاو دەکەوتنە دوای. هەرکە گۆیەکە دەکەوتە عەردی هەر دەستەی تاکو گۆیەکەی بەرەو شاری دوژمن ببەن قاشۆکانیان بە گڕ دەخست.

گۆیەکە بگەیشتبووایە هەر شارێك خاوەن شارەکە ((غام = نۆرە))یەکی دۆراند.

من لە قاشوانێ ئازا نەبووم. تەنیا لە ((غەننە))دا کەس دەرەقەتم نە دەهات.

((غەننە)) هەر کە گۆیەکە دەکەوتە قۆرتێك ، یان نێوان چەند سەرە قاشۆیان کەلکی ماوەی لێدانی نەدەماو هەر کەس سەرە قاشۆکەی

دەگەیاندە عەردی و گۆیەکەی تەرحی ڕاکێشان بەرەو شاری غەنیمەکەی دەبرد.

***

**قاوقاوانێ:**

**ئەم گەمەیە دوو جۆرە:**

یەکەم: چەند مێرد مندالْ لە شەش ((٦)) بە سەرەوە و پەسند وایە لە هەشت ((٨)) پتر نەبن. بە دوانزدە ((١٢))ش دەبێت بەلاّم سۆزی نا بێت و منداڵەکان هەراسان دەبن.

مێرد منداڵەکان دەبنە دوو چین. بابلێین ((٨)) هەشتن بە تیرو پشکانێ: ((هەڵدانی پارە)) یاخۆ بەردێکی خڕی پان لایەکی بە تف تەڕ دەکەن بۆ حەوا هەڵدەدرێت ((ئەمەش لە شوێنێکی دی باسکراوە پێویست ناکات لێرە دووبارە بکرێتەوە. نووسەر)).

ئەو دەستەی تێدەکەوتن دەچنە نێو جغزێکی تایبەت، بۆ یارییەکە لێدراو لەسەلەپان دەوەستن. چوارەکەی دی بە دەورەیان دەسووڕێن، تاکو هەلّیان بۆ هەڵکەوێت کلاّوی یەکێکیان بفرێنن. ئیتر لەم کێشمە کێشمە بەردەوام دەبوو، هەتایەك لە ئەوانەی ناو جغزەکە لە قەیەك لە یەکێك لە ئەوانەی دەرەوە دەدات. ئەوسا ئەوانەی بە پێوەبوون دەدۆڕێنن و دەچنە ناو جغزەکەوە و ئەوانی دیش دێنە دەرەوە. یاخۆ یەکێك لە ئەوانەی دەرەوە بۆی هەڵدەکەوت کلاّوی سەری یەکێك لە ئەوانەی ژوورەوە دەبات و بە دەنگێکی حێل دەڵێت ((قاو)) و بەرەو ئەو شوێنەی پێشتر دیاری کرا بوو: ((کەندە، جۆمە. دیوارە))، یان جغزێکی تایبەت کێشرا و پڕتاو تێدەقێنێت. ئەگەر نەگیرا بووایە هەموویان سواری سەر پشتی ئەوانەی لە ژوورەوە بوون دەبوون و بەرەو شارەکەیان دەگەڕانەوە و دووبارە گەمەکە بە چوونە ژووری نێوجغزەکەوە ئەوانەی پێشتر لە نێویدا بوون و ئەوانە دەرەوەش هەر لە دەرەوە.

ئـەوە ئەگـەر قزگەکـەیان نزیـك بووایـە، بـەڵام ئەگـەر دور بووایـە قـاو فڕێنەرەکە قاوەکەی = کڵاوەکەی دەستی لە بای غـارا دەدا یـەك لـە هـاوڕێ خۆشبەزەکانی.

خۆ ئەگەر قاو لەدەستەکە پێش ئەوەی بکاتە شارەکە بگیرابووایە ئەوسا ئەوەی دەیگرت سواری سەر پشتی دەبوو.. و بەرەو قزگەکەی دەهێنـاوە و کۆمەڵەی قاو فڕێنەکە دەبێ بچنە ناو جغزەکەوە و ئەوانی ژوورەوە دەچوونە دەرەوە

دووەم: ئەمەیان بە زۆر گەنج پێهەڵدەستان. لە کاتی گێرە و جـۆخین لـە گۆڕێدا بەم شێوەیە دەکرا:

گـەنج = ((سـەپان))ێك لـە خافڵەتـەوە کـڵاوی یـەکێك لـە سـەپانەکانی جۆخینێکی دی دەفڕاند و دەیگوت ((قاو)). بەرەو جـۆخینی گـەڕەکێکی دی هەیپەی لێدەکرد. ئەگەر نەگیرابووایە کڵاوفڕێنەر بردییە، ئەگەر گیراش منای وابوو دۆڕا.

مەبەست لێرەدا بەس بە زینەکەبوو.. و دووبارە نەدەبووەوە.

تەمەنم دوازدە، سێزدەساڵان دەبوو.. و لە حوجرەی گونـدی ((مەحمـەر ئۆمەران))ی ناوچەی ((قەراج)) سوختە بووم. دۆستی دڵسۆزم خوالێخۆشبوو ((ئیـبراهیم حەسـەن بـاپیر))ی شارۆچـکەی ((مـەخموور)) لـە گونـدی ((قۆشەنە))ی هەمان ناوچە سەپان دەبێت. شـەوێك قـاوی برادەرێکـی خـۆی بەرەو گوندی مەحمەر ئۆ مەران دەفڕێنێت.

پیاوێکی بەخۆ..وە و تێکچەقی بوو.. و زۆر دەبەزی هاوڕێکانی دەیانزانی پێیاننـاگیرێـت، یـەکێك بـە سـواری بـارگین دەکەوتـە دوای هەرکـە گەیشـتە کەرخی دەیزانی بێتە خواری بۆی ناگیرێت، ناچار بەبارگینەوە قەرەبەقەرەی غاردەدات و هەتا دەگەنە سەر جۆخینی گوندی مەحمەر ئۆمەران.

***

**قەبۆ قەبۆ:**

جارێك ئێمە منداڵانی ئاوایی بە سەرگوندی ((عەللا)) ماندادا. ئەوسا ئەو بەسەردا دانا باوبوو.

من بەشداریم کرد، بەڵام لەبەر گچکەیی لە دواوە بووم. بەردەقانی و چەند بەردی بەرقانیم لە بەرکی خۆم نان.

بەبیرم دێت کاکۆك دووبەردەقانی ڕاست و چەپ، وەك خەریتەی تفەنگ لە خۆیداو جۆرکێکیشی، توورەگە ئاسا پڕ بەردی لە ملی خۆی هەڵواسی. لەگەڵ چەند منداڵی دیکە چووینە بن ئاوایی عاللاو لێکرا بە بەردەقانی گوندەکەمان داگرت و بەدەنگی بەرزەوە دەمانگوت:

- ((قەبۆ قەبۆ عاللایینە داکتان بگێن وەرنەدەرێ)).

خەڵکی گوندی تایەن، بەزەلام و منداڵەوە، تاکو زیان بە خەڵکەکە نەگەینێن کەوتنە دوامان. هەریەکەمان لە ترسانا بەلایەکدا تێمانتەقاند.

***

**هەلوور بەلوور:**

ئەم گەمەیە بەسێ منداڵ ئەنجامدەدرێت، کەچی بە حەوت و هەشت گەرم تر دەبێت و لەم دوو ژمارەش بەسەرەوە هەراسانی منداڵەکانی بەدوادادێت.

منداڵەکان بەڕێز دادەنیشن و هەردوو لاقیان درێژ دەکەن و هەتا نزیك چۆکیشیان ڕووت.

بە زۆری ئەو منداڵە دەبێتە سەرۆك لە ئەوان لێزان و بە ئەمەنتر بێت.

سەرۆکەکە. پەنجەی دۆشاو مژەی داوێنە سەریەکەم پێ و دەڵێت:

- ((هەلوور...))

لە دووەم پێدا دەڵێت: ((بەرلوور))

لە سێیەمدا:

((تەکامە........))

ئـيتر لـه گـوتنی هـەر وشـەیەك پەنجـەی لـە لاقێـك، بـۆ لاقێكـی تـر دەگواستەوە. گوتنەكە لە سەر چ پێیەك كۆتایی هات ((نقورچەیەك))ی حێلی لێدەدات. شوێنەكەی سوور هەڵدەگەڕێت.

قونجرکـە لێدراوەکـە دەبـێ پێیەکـەی هەڵکێشـێت و بەشمەکـەکانی داشیپۆشێت.

سـەرۆکەکە هـەرکاتێك ببینیـت پێیەکـە بەدەرەوەیـە، بـێ ئـەوەی خاوەنەکەی بزانێت لەنکاو قونجڕیکی قایمی دەخێوێنێ.

نوقرچـە لێـدراو ناچـار دایدەپۆشـتەوە و نایـەڵێت جـارێکی دی بەدەربکەوتەوە.

نیازیش لەم یارییەدا تەنیا قونجڕکە لێدانەو بەس.

ئەمانەش بابەتەکانی لەم گەمەیە دەگوترێت:

١- هەلوور بلوور تەکامە

زەرد و سۆر و شەمامە

باربانجە - کۆترە قنجە

ئەسپە ڕەشە - میخم کوتا

مێخ هەڵبەزی

پەنجەی راستەم ((یان)): دەستی راستەم.

ئەوەی گەزی.

٢- هەلوور بەلوور تەکامە

زەردو سۆر و شەمامە

عەیشێ مامان - لەخۆشناوان دەگری چاوان

چاوێ بەگوو - پێم تێڕاچوو هەرگرە ئەتوو.

***

## چەند گیانلەبەری گچکە

**بالیفۆکەی خوا:**

بالیفۆکەی خوا گرمێکی بچووکی بە ئەندازەی پەنجەی گچکە درێژ و ڕەنگاو ڕەنگ و نەرمۆکەیە.

***

**بزن مشك:**

بزن مشك = ((بزن مژ. بزن مژەك)) دەعبایەکی چنگداری کلك درێژە.

گوایا دوژمنی مارە: ((من بەچاو نەمدیوە، بەڵام لەزۆر کەسانم بەم شێوەیەی خوارەوەم بیستووە _ نووسەر)):

((ماروبزن مشکێك بەشەڕدێن.

بزن مشکەکە هەر جارێ کلکی خۆی بڵنددەکرد و لەسەر.. ڕا، لەمارەکەی دەدا. مارەکەش دەلحاز پێیوەدەدا.

بزن مشکەکە دوای پێوەدانی پڕتاو خۆی دەگەیاندە بنە ((کەبەر)) و یان ((گۆرمزە))یەك و گەڵایەکی لێدەکردەوە و لە قلەقانەی ئاوا دەکرد، کە گوایا: ((گەڵای ئەو دوو ڕووەکە دژی ژارەو نایەڵێت کاری لێ بکات)) دەچۆوە گژمارەکە. بەم شێوە مارەکەی دەکوژێت.

گوایا: یەکێك لە دیارە شەڕەکە بووە و جارێك لە دوای پێوەدانی مارەکە لای ڕووەکەکانی لە بزن مشکەکە دەگرێت و لایەڵێت گەڵایانی بخوات..، زۆری نەبردووە بزن مشکەکە لەرزییە و پاشدان پەلەواژ بووەتەوە.

***

**پڕ بەقوونە:**

پڕ بەقونە: زندەورێکی بچووك و باڵدارەو پاشەوەی سێ هەندەی جەستەی درێژە و پڕیشە. واتە پاشەڵی لەچاو خۆی گەورەترە.

***

**پند: - بە دوو مانا دێت:**

١- زندەورێکی بچووکە بە (ئەسپێ))ی مریشك ناو دەبردرا.

٢- کونی قوون.

**جۆبڕکە:**

جۆ بڕکە: ((ملە، ولە)). زندەورێکی گچکەیە و لەناو زەویی تەڕ و نمداردا ڕەگی شینایی دەخوات. ((دووکلکە)) شی ناوە.

***

**خاڵخاڵۆکە:**

خاڵخاڵوکە = ((خارخارۆکە)) باڵندەیەکی بچووکە و پشتی سوورە، یان زەرد، خاڵخاڵی ڕەشی تێدایە و سەر و ملیش ڕەش.

ئێمەی منداڵ هەرکە دەماندیت لەسەر ناو لەپی خۆماندا دەناو دەمانگوت:

- خاڵخاڵوکە ماڵی خاڵم لە کێیە؟.

ئەویش بە کیهان لادا بفڕیبووایە دەمانگوت:

- ماڵی خاڵمان لەولایە.

***

**من لە ١٩٧٥/٥/٥دا ئەم شیعرەم لەسەری نووسیوە.**

**خاڵخاڵوکە**

- هۆ.. خاڵخاڵۆکەی قەشەنگ.

هۆ باڵندۆکەی دوو ڕەنگ

وەرە لامەوە گیانە

وەرە سەر ئەو پەنجانە.

هەڵت دەدەم بۆ ئاسمان

بفڕە بۆ سەیری جیهان

هۆ.. خاڵخاڵۆکەی خاڵ جوان

پێم نالێیت تۆبی یەزدان

ماڵی خاڵم لەکوێیە

لەشارە، یان لە دێیە.

***

**خاڵۆزە**

**خاڵۆزە = ((خەلووزە)):**

زندەوێکە تۆزێك لە مێش گچکە تـرەو ڕەنگـی کـە سـکی ئامـاڵ سـپییە و جەستە نەرم.

لەکاتی هاتنی بای ((شەماڵ)) و دنیا فێنکی لەنێو بێستان پەیدا دەبێت. دەچێتە بن گەڵای بڕکەوە و شیلەکەی دەمژێت و بڕکەکە زەرد هەڵدەگەڕێت، پاشدان وشك دەبێت. کەچی ئەگەر ((با))ی هوڕەی بێت و دنیا گـەرم دەبـوو ئەو زێدەی نە دەکرد و بگرە لەناو دەچوو.

مـن دەسـتم دەدا بـەردێك و پـەلکی بڕکـە بیسـتانەکەم هەڵـدەداوە و دەمتولخاندەوە.

***

**داو**

داوێك لە کلکی گوێدرێژ، یان وڵاخی بەرزە دەکراوە و بە دووقەدی لە زلـە قەسـەڵێکی بسـتێك درێـژ هەڵدەکێشـرا. هـەردوو سـەری داوە مووەکـە بـە دەستێك دەگیراو بە دەستەکەی دی زلـە قەسـەڵەکە. لایەکـەی دی دەبـووە ((قولفانگە)).

بیرەکانی ئاوایی قورتی چڵکاویان هەبوو.. مێش و مەگەز و زەنگە زۆرە و زەرگەتەی بۆ ئاوخواردنەوە لێنەدەبڕا. منداڵ قلفەکەیان لە ملـی زەنگـە زۆر، یان زەرگەتە یەك دەکرد و مووەکەیان ئەوسا رادەکێشا. زەنگە زۆرەکە پێوە دەبـوو.. و پـەلی بـە حـەوا دەکـەوت هـەتا دەمـرد، یـان مووەکـەیان زۆر رادەکێشاوە دەیبڕییەوە، بە دەستیانەوە دەگرت.

**تێبینی:**

داوە مووی کلکی یەکسم ڕەق و قاییم بوو.. و نەدەچەماوە. کەچـی داوە دەزی شل بوو بەکەڵك نەدەهات.

***

**دووپشك**

دووپشك زندەوەرێکی کلك درێژو گرێ گرێ و جزووە دارەو بە مرۆڤ وەدەدات.

ئەم ڕەنگانەی هەیە

١- ئاماڵ سۆر.

٢- بۆر = کەوی.

٣- ڕەش.

٤- زەردی ئاماڵ سپی.

٥- کەسك = ((کەسکون)).

گوایا ژاری ئەمەیان لە هی هەمووان پیسترە.

بێچووەکانی زگی دایکیان دەدرێنن و دەیکوژن ئەوجا دێنە دەرەوە.

من شەوێکی هاوین، لە حەوشەی ماڵی خوالێخۆشبوو: ((حاجی ئاشەوانی دراوسێمان)) لەگەڵ منداڵەکانی دانیشتبووم لە ناکاو دووپشکێکی ڕەشی گەورە پێیوەدام. دەتگوت ژووژنە لە بەلەکم ڕاچوو.. و دەنگی لێوەهات. زۆر ئێشا. کەچی هەرزوو چوومەوە و نووستم و ژارەکە لەنێو سەرتاپای لاقم مێرووڵەی دەکرد. بۆ بەیانی بە ئەندازەی درهەمێك شوێنەکەی شین و مۆر هەڵگەڕابوو.

***

**دووپشك کوشتن:**

ئێمەی منداڵ لە کژی هاویندا، دەچووینە سەر قەبرستانی ئاوایی، کە لەرۆخ گوندی بوو.. و لە کونە دووپشکان دەگەڕاین.

کونە دوو پشك درێژووکانی بوو.. و لە دوورەوە دەمانزانی کونە دووپشکە. هەندە جار مەسینە ئاومان لەگەڵ خۆمان دەبرد و ئاومان لە کونەکە دەکرد و دووپشکە یەکسەر دەهاتە دەرەوەو دەمانگوشت.

بەزۆری میزمان تێدەکرد.

دووپشکەکان زۆربەیان زەردی ئاماڵ سپی بوون.

هەر جارێ بیست سییەکمان دەکوشت.

**سیسرکە: = ((سفرە بڕ)).**

زندەوەرێکی باڵدارە و هەندە قەلۆچە ئەستوور نییە، بەڵام درێژترە و بەبزێوە و لە شوێنی گەرم و پیس دەژین. لە چەشنی کلۆ ئامبازان داوێت.

***

**سیسەمار:**

سیسەمار: جۆرە مارێکی زەردی ڕیویلەیە وا تەبارێك و.. لاوازە.

***

**شارە زەنگە زۆرە:**

هەرشارە زەنگە زۆرەیەکم بدیتبووایەوە، تۆپە قوڕێکم لە کونەکەی دەداو بە چیلکەدار کونێکم بە قەدەر زەنگەزۆرەیەکی پێوە بچێت لێدەکردەوە. هەرکە زەنگەسوورەیەك بهات بووایە دەر، بە مەقەس سەریم پەلدەدا، لە ئاخر و ئۆخریا، هەتا ئەوەی تێیداماوە بێتە دەرەوە پووشکەم تێوەردەدا. ئەوجا کونەکەیم هەڵدەدڕی و شانەکەیم تێك و لێك دەدا.

جارێك من خەریکی تێکدانی شانەیەك بووم، زەنگە زۆرەیەك لە دەرەوەهاتەوە و بەباسکی وەدام. نزیکەی ((٦٥)) شەست و پێنج ساڵ دەبێت ئێستاش شوێنەکەی لە باسکم دیارە.

***

**فسە گورگ:**

((فسە گورگ)): زندەوەرێکی بچووکە و هەندی مێش دەبێت ئاودالّی چوونە بن خۆڵی وردە.

هەرکە دەچێتە ژێر خۆڵەوە جێیەکەی دەبێتە قۆرتێکی گچکە، سەرەوەی بە ئەندازە درهەمێك یانە و بنەکەشی زۆرتەسکە.

ئێمەی منداڵ پێمان دەگوت: ((قۆرتی فسە گورگ)). گوایا گورگ شەوهاتووە و فسی تێکردووە.

هەرکە دەمان دیت میزسان پێدا دەکرد و ڕادە وەستاین هەتا میزەکە خۆڵەکەی دەکردە قورێکی پەیت، ئەوسا خۆڵی هەر چواردەورەمان لادەدا و قورەکە دووسێ پەنجە بەرزدەماوە. هەرکە پاڵمان پێوەدەنا فسە گورگەکە دەکەوتە گۆڕێ.

***

**قرنە:**

زندەوەرێکی بچووکی پانکەلەیە و.. وەك زێرو و بە ئاژەڵوە دەنووسێت و خوێنی دەمژێت.

ڕەنگی سۆر و بۆری ئاماڵ سپییە.

***

**قوز بڕکە:**

قوز بڕکە.. لە شێوەی داپیرۆچکەیە و چوارپەلی هەیە و ڕەنگی سۆر و زەردی ئاماڵ سپیە و بەبزبزێوە.

***

**قومقمۆق:**

**قومقمۆك: خەمە گڕوو:**

زندەوەرێکە وەك مارمیلۆق. تەنیا سەری گەورەترە. بە ناپەسند حسێب دەکرا بۆیە هەرکە دەماندیت دەمانکوشت.

***

**کلۆ:**

جانەوەرێکی بچووکە و بە قاچ و دەم دوژمنی بەرهەمی کشتوکاڵ و شینایییە.

لە بچووکیدا پێی دەگوترا: ((پێکوڕە)).

ئەمەیان کارەسات بوو.. و باڵینەبوو بفرێت، زوو زوو شوێنی خۆی بەجێ بیلێت و بەپێ دەڕۆیشت، هەرشینایەکی بکەو تبووایە پێشی نەیدەهێشت.

به بیرم دێت قورتی درێژووکانیان له نێو کێڵگه لێدەدا و کلۆی پێکوڕه زۆر دەکەوتنه ناوی و ئەوجا قۆرتەکەیان پڕدەکردەوە. بەڵام ئەوەنده زۆر بوو.. کەس دەرەقەتی نەدەهات. ئەوساش دەرمان نەبوو.. تاکو چارەی بکرێت.

***

**شێرە کلۆ:**

کلۆیەکی گەورە و به شاقەڵ بوو.. و ڕەنگی ئاماڵ زەرد بوو. من ڕەنگ کەسکیشم دیوە.

کەچی ئێمەی منداڵ پێمان دەگوت: ((ئەسپە پێغەمبەرە)) و زۆرمان خۆشدەویست و ئازارمان هەرگیزنەدەدا.

***

**گوو ئەستێرە:**

((گوڵئەستێرە))شی پێ دەڵێن، گیانلەبەرێکی لەمێش گچکەترە و شەوان بەهۆی ڕۆناکی دامەنییەوە دیاربوو.

هەرکە شەو دەمان دیت دەکەوتینه دوای هەتا دەمان گرت. هەبوو بڵند دەبوو دەستمان نەدەگەیشتێ و هەشبوو لەبەر تیژی بۆمان نەدەگیرا.

که دەمان گرت لەسەر ناولەپی خۆمان دادەنا، نەك به پەنجه گرتن چونکه لەبەر نەرمی جەستەی دەتولخاوە. دەمێك سەیرمان دەکرد و ئەوجا بەرەلامان دەکرد.

***

**گوو خلێنکه:**

گوو خلێنکه جۆرە ((قالۆچە))یەکە ڕەنگ ڕەش و پەلەکانی دڕو بەهێزن. نەخاسمه پاشەڵەکانی.

له گوو.. و ڕیخ و تەرسی تەڕ بەقەد سێ هەندی جەستەی خۆی، بەخڕی وەك کەللا بەرد، دادەبڕێت و به پاڵ پێوەنان، له شوێنێکی دوورەوە بۆناو کونی خۆی دەبرد.

من بەمنداڵی وامدەزانی دەیخوات، کەچی لەو دوای یەدا لە گۆڤارێك خوێندمەوە: ((لە ژووری هێلانەکەیەوە لایەکی ڕیخەکەی دەکۆڵێت و ئەوجا ((گەڕا = هێلکە))ی تێدا دەنێت. لەبەر گەرمی گەراکەی نافەوتێت و زوو هەڵیدەهێنێت

من بە منداڵی چۆکاوچۆك لەگەڵی دەڕۆیشتم، هەتا دەگەیشتە کونەکەی خۆی.

***

**مار:**

مار: زندەوەرێکی درێژ و باریك و بێ پێیەو لەسەر زگ دەخشێت و ژاراوییە و بە هەرگیانلەبەرێك وەبدات دەیکوژێت.

**مارانگاز:**

مارانگاز: کەسێکە مار پێیوەیدابێت و بە چەشتنی ئازار و ژانەکەیەوە چاوترسێن بوو بێت و دەڵێت:

((مارنگار لە گوریسی ڕەش دەسڵەمێتەوە)). واتە بەدیتنی گوریسی ڕەش بەترسەوە ڕادەجفرێت.

***

**ڕەنگی مار:**

ڕەنگی مار: ئەمانەی خوارەوە هەندەك ڕەنگی مارە:

١- ئاماڵ بۆر: کەوی.

٢- ئاماڵ زەرد و بن زگ سپی.

٣- ئاماڵ سپی و پتك پتك بۆر، یان ڕەش، یان زەرد.

٤- بەڵەك: قەف قەفی ڕەش و سپییە.

٥- ڕەش: جەستەی سەرتاپا ڕەشە. هەندێك لە ڕەش لغاوەی سۆرە و هەندێکیش بن زگی.

***

**هێلکە:**

مار هێلکە دەکات. هەرکە ترووکاندی و هاتە دەرەوە ((فەرخە = بێچووە))، ماری ناوە.

دوای ماوەیەك ((تیرە مارە)). پاشدان دەبێتە مار.

مار هەیە کورت و کلك ئەستوورە: ((کولە وەیباب))ە = ((کۆرە مار، کوێرەمارە)). ژاری زۆر پیس و کوشندەیە.

ماری لەڕادە بەدەر گەورە ((عەزیا = ئەژدیها = ئەژدیهاك))ی پێدە گوترێت.

***

**ئاشقە و ماشقە:**

ماری نێرە و مێیەی کاتی جووت بوونیان ((ئاشقە و ماشقە)) یان پێ دەگوترێت.

گوایا کەسێك یەکێکیان دەکوژێت و مارەکەی دی لە دوای گەڕاوە و خۆی لە ملی ئاژەڵان ئالاندووە و هەتا دەیبینێتەوە و پێیوەدەدات و دەیکوژێت.

تێبینی: ((من سەرم لەمار تەواو دەرنا چێت تکایە ئەگەر هەلم کردبێت لێم ببوورن)).

***

**مارگیر:**

**مارگیر = ((کەبەر)):**

رووەکێکە لە دەشتی گەرمییان شین دەبێت. گەلای کەمە و دڕکی تیژ و لاسك قاییم و بەرێکی هەیە بە ئەندازەی قلەقەسپ دەبێت و ڕەنگی وەك شفتی وایە. هەرکە پێگەیشت لە درێژاییەوە شەق دەبێت و ناوەکەی سۆرێکی کراوەیە، لە خواردندا خۆشە و بە ((شەفەلە)) ناو دەبردرێت.

کاتی خۆی لە دەشتی هەولێر دەیانکردە هەراش = (هەلاش))ی خانوو. لەسەر دارە ڕێ، دادەندرا. ئەمەم باس کردووە.

لەبەر دڕکە تیژ و قایمەکەی مشك نەیدەتوانی بچێتە ناوی.

**مار ماسی:**

مارماسی جۆره مارێکی ئاوییه و بێ زیانه له شێوەی ماسیدایه.

***

**مارمیله:**

مارمیله = مار میلکه، مارمیلۆق. مار میلۆك زندەوەرێکی بۆر و کلك درێژ و چنکداری بێ زیانه.

***

**ماره زیو:**

مارەزیو: = ((هەزار پێ، هەزارپا)):

زندەوەرێکی گچکه و درێژۆوکانییه و پێی زۆره و سۆر و زەردی ئامال سپییه.

***

**مۆرانه:**

مۆرانه: گیاندارێکی ورده و جەسته نەرمه و بەهۆی کەلوپەل و خوری ماوەنەوه له شوێنی تەڕ و شێداردا پەیدا دەبێت و دەیخوات.

***

**مێرووستان:**

**مێرووستان به دوو مانا دێت:**

١- شانه و شاری مێرووڵان.

٢- مێرووله. مەبەستی ئێمەش ئەمەیه:

مێرووله: گیاندارێکی گچکەی سەر گەوره و پاشەڵ خڕو ناوقەد باریکه.

مێروستان لەڕووی ڕەنگەوه ئەمانەن.

١- ڕەش.

٢- سۆر.

٣- زەرد.

٤- زەردی قوون سۆر.

٥- زەردی قوون ڕەش.

٦- بۆری ئامالّ سوور.

**مێرووستان: دوو تەرزن:**

١- بە بالّ.

٢- بێبالّ.

**دووەمیان سێ چەشن:**

أ- بچووك: ((گێرکە))یان ناوە. سێ ڕەنگی هەیە: ((زەرد و سوور و ڕەش)).

ب-گچکە لە ئەوەی یەکەم گەورەترە. بگرە دوو ئەوەندەی ئەو دەبێت. مێرووستانی ئاسایی.

پ- گەورە. ئەمە لەچاو دووەمیان زۆر گەورە و بە شاقەلّ ترە.

یەکـــەم: بـــەبالّ. ئەمـــەیان دوای لێکردنـــەوەی بـــارانێکی زۆر و ڕۆژهەلاتن ((واتە سووی ڕۆژەکە ساردنەبێت)). پەیدا دەبن.

بالّیان هەیە و لە ئاسماندا ئامە شۆدەکەن. کەچی باڵـەکانیان زۆر ناسکەو زوو دەوەرێت.

نێچـیرێکی لــە مشــەبوو بـۆ باڵنــدە کچـکەکانی وەك: کێشــکە، لەحەواوە دەیانقۆستەوە. بۆیە گوتراوە:

- خودا ئەگەر غەزەب لە مێرووستان بگرێت باڵی بۆ درووست دەکات.

***

## هەندە گیانلەبەری گەورە

**توورك:**

**توورك = ((چەقەڵ)):**

دەعبایەکی کێوییە و لە سەگ دەچێت.

زەمانی زوو هەرکە دەشتی هەولێر زەلکاو.. و قامیشەڵانی هەبوو تـورکی زۆر بوو.

بەستەی بەسەردا هەڵگوتراوە. ئەمەش یەکێکییە:

توورك توورکی ئێمەیە.

ددانی وەك شەلفەیە

دای لە عومەرا غەیە

عومەراغای شێخ شەروانی

دای دوو کاوڕ بەرانی

لەبۆ مەلا عوسمانی

هەتا دوعای لۆ بکا

تا توورك پێینەزانی

زۆرە، بەڵام بەداخەوە لەیادم نەماوە.

***

**دەڵەك:**

دەڵەك دەعبایەکی کێوییە و جەستە درێژو کلکی تۆزێـك لـە کلکـی ڕێـوی گچکە ترە. پەلەکانی لە چاوبەدەنی کورتن و سەری گچکە و لمووز کورتە.

ڕەنگی سـۆر و بـۆری ئامـاڵ زەردە و لەسـەری لموزییـەوە هـەتا ئـاخیر کلکی هێڵێکی ڕەشی هەیە.

گوایا سەردەمایەکی زوو.. زۆر هەبووە لە دەشتی هەولێر.

من نەمدیوە، بەڵام کەولێکیم دەست کەوتووە.

***

**ڕیوی = ((ڕێوی)):**

گیاندارێکی کێوی وکلك درێژ و فش و گوێ قیت فێڵبازە.

دووبا بەتم دەرحەقی بیستووە:

١- هەر.. ڕێوی ڕیوی ڕێوی

کلکی بەبابی خێوی

ڕێوی نییە دەڵەکە

سەری کلکی بەڵەکە.

٢- ((حیکایەتی: شیردا لۆداپیردا، داپیرە کلکە قولەم وێدا)) — لە زۆر شوێنان بڵاوکراوەتەوە بۆیە خۆم لە قەرەی نەدا.

***

**((سە)) = ((سەگ)):**

سە: گیاندارێکی چوار پێی دڕەو متووی بنیادەم و ئاوەدانییە و زۆر بە وەفایە.

چوار جۆرە:

**یەکەم: سەی ئاسایی. ئەمەیان دوو تەرزبوون:**

١- ڕەسەن: ئەو سەیە بوو داك و بابی لە توخمە سەیەکی دڕو بەناوبانگی دەڤەرەکەبوو.

هەرکە دێڵی ئەو تەرحە سەیە، دەترەکی زۆر کەس دەچوون گوجیلەیەکیان بە ڕەزامەندی خاوەنەکەی دەخواست.

هەبوو هەر لە هەوەڵەوە کلکی ئەو گوجیلەی بۆی دیاری دەکرا لە بەرزگی داکیدا دەبڕی. گوایە کە گەورەبوو لە شەڕدا سەگی تر ناتوانێت زوو بەهۆی گەستنی کلکییەوە بەرزەفتی بکات.

٢- ناڕەسەن: ئەمەیان توخمەکەی، یاخۆ دایکی ترسنۆك و دەوگەرم نەبوویێت. گوجیلەی ئەو تەرحەی کەس داوای نەدەکرد. کە گەورە دەبوو سەیەکی خۆڕی لێدەردەچوو. واتە خاوەنی نەدەبوو. زستانان بەزۆری گوفەکی هەڵدەدڕی و شەو لەناوی دەنووست.

**دووەم: زڕ سە = ((سەگ)): ئەمەش دوو نەوع بوو:**

١- زڕ تاژی: چەشنە سەیەك بوو، نە هەندی سەی بە تەنگەو کاپێلك ئەستوور بوو، نە هەندی تاژیش باریك و لاق درێژ. گوایا ((مـن بەچاو نەمدیوە. نووسەر)) لە سەگ و تاژی پەیدا بوو بوو. واتە دایکی سەگە و باوکی تاژی، یاخۆ بە بەبەرە واژییەوە. ((زڕ تاژی))یشی پێدە گوترا.

٢- زڕ گورگ: ئەمە لە یەکەم پەل ئەستوور و بە تەنگ ترو بۆرو سەروگوێلاك گورگانی بوو. گوایە لەسەگ و گورگ پەیدابووە: ((زڕ گورگ))یشی ناوبوو.

**سێیەم: تاژی = ((سەگی ڕاو)):** ئەمەیان باریك و پەل درێژ و خۆش بەزبوو. بۆ ڕاوی کێرووشك و مامز بەکار دەهات. کەروێشکی پێدەگیرا. کەچی نەدەگەیشتە مامز. تەنیا دوای باران بارین، لەنێو زەوی نەرماندا، مامز سمی پێی تیژە و لە زەوییەکە دەچووە خوارەوە، پێی تاژیش پانە و ناچێتە خوارەوە لۆی دەگیرا.

لە زەوی چەقێندا، واتە بەردەلاندا، مامز پێی ڕوو ناچێت بەتاژی ناگیرێت.

**چوارەم: توولە:** لە جەستەدا زۆر بچووك بوو بەس لە ئامەشۆدا بەبزێو بوو. ئەمەش بەس بۆ ئەوە بوو ئەگەر ڕێوییەك بچووبووایە کونێکەوە. توولەیان دەنارده ناوی و ڕێوییەکەی بە ویقە ویق دەردەهێنا.

***

**سەگ لەبەر دەرگەی خاوەنی درە:**

سەگێکی خۆڕی لە گەڕەکەکەمان هەبوو. کەس نانی نەدەدایە. من زگم پێی دەسووتا و سێ ژمە تێرنانم دەکرد.

ڕۆژ بە ڕۆژ قەڵەو دەبوو.. و گوێپەڕەی ملی وەك کۆپەڵان خوار ببووەوە. دوو سەگی تر لە ئاوایی هەبوو. ماڵە خاوەنەکەیان لە ماڵی ئێمە دیاربوو.. و بەڵام دووربوو.

یەکێکیان سۆرسۆر بوو.. و ناوی ((گۆمر)) بوو. ئەویتر زەردی بەڵەك ((خازر))ی ناوبوو.. و کەلەش گەورە. ئەو دوو سەگە زۆر دڕبوون تاکو جارێك گورگێکیان خنکاند. ئەگەر تووشی سەگێکی ئاوایی بهاتبوونایە وازیان لێنەدەهێنا هەتا نەیانتۆپاندبووایە.

ڕۆژێك لەیادم نەماوە چ ئاژەڵێکمان کوشتبووەوە گۆمر و خازر هاتنە حەوشەمان، سەگە خۆڕییەکەی بەردەرکەی ئێمە هەرکە چاوی پێیان کەوت دەلحاز پڕیدا گومر و سواری سەر ملی بوو.

من ئەوسا گوتم: ((ڕاستە دەڵێن: سەگە لەبەر دەرگەی خاوەنەکەی دڕە)).

***

**سەگ و گورگ:**

کەم سەگ تەنێ بە تەنێ دەرەقەتی گورگ دێت.

مندالێ بووم وام هاتە بەرگوێ سەگێکی زۆر دڕ و ملەوەز لەگەڵ گورگێك بەشەڕ دێت.

وێرای ئەوە خاوەنەکەی لەدیار دەبێت، هانی سەگەکەش دەدات. پاش بەردەوام بوونی شەڕەکە و یەکتر شێلانی زۆرەوە گورگەکەی دەتۆپێنێت.

سەگەکە، بەهۆی خاوەن و دیارییەکەیەوە، ورەی بەرز دەبێتەوە و گورگەکەش، ترسی نەك لە سەگەکە بگرە لە خاوەن و هاندانەکەشی پەیدا دەبێت و.. ورەی بەرگری کردنی لەبەدەندا بێهێز بووە. ئەگەرنا موستەحیلە سەگ بەتەنیا، بەگورگ بوێرێت.

من زۆر جارم بیستووە و جارێکیش بەچاو دیومە:

گورگ هاتووەتە ئاوایی زۆربەی سەگەکانی، لە ترسانا بە ڕاجفرینی جەستە و نوزکە نوزکەوە خۆیانداوەتە پەناو پەسارگانەوە.

***

**سیخوڕ دوو مانای هەیە:**

١- جاسووس. خەفیە.

٢- دەعبایەکە هەندی کێسکێکە، جەستەی تۆزێك درێژترە. پاشەڵی پەڕی
دڕکاوییە. سەری پەڕەکانی وەك ژووژن تیژە و ڕەنگی سپی و ڕەشە.

هەر کەسێك نزیکی بکەوێت پەڕی تەرزی تیری بۆ داوێت و بریندار دەکات. بەڵام سەری پووتە و زۆر ناسکە. شتێکی بە سەبریش کاری لێدەکات.

منداڵ بووم هەروەك خەوم بەبیرم دێت شەوێك سیخوڕێك دێتە گوندەکەمان و گەڕەکی سنجاویان.

خوالێخۆشبوو ((مام سمایلی باوکی خوالێخۆشبوو: هادی شێرە)) و باپیری شەهید خەسرە و شێرە، ناوێری تخوونی بکەوێت. خێرا دوو لبادان بەبەرە خۆی دەگرێت و خۆی بەسەردا دەدات. ئەوجا پەڕی لە هەردوو لبادڕادەرچوو بوو.. و مام سمایلی بریندار کرد. کەچی لە ئەنجامدا کوشتیەوە و گۆشتەکەشیان خوارد.

بۆ بەیانی چەند پەڕێکی دایە فەقێیان. ئەوسا لەجیاتی قەڵەمی ئێستا بەنووکە باریکی پەڕە کەیان دەنووسی.

لاموابوو فەقێ سەرەنووکە تیژەکەیان تۆزێك دەتاشی لە موڕەکەبیان دەنا و پێیاندەنووسی.

ئەوسا قەڵەم بەزۆری قامیش و پەڕە سیخوڕ بوو. تازە نووکە قەڵەمی ((حیبر = موڕەکەب)) پەیدا بووبوو.

***

**کێرووشك:**

کێرووشك = (کەروێشك)) گیانلەبەرێکی تیژڕەوی = ((خۆشبەن))ی گوێ گەورە و قیتە و دەست کورتی لاق درێژە. دوو جۆرە:

یەکەم: کێوی و جەستە گەورە و ڕەنگ زەرد، یان سۆری ئامال زەردە و بن زگ سپی.

پازدە، شازدە ساڵ دەبووم جۆتە بێچووە کێرووشکی کێویان بۆ هێنام ((بەڵام لەیادم نەماوە کێبوو)). لەماڵەوە بەخێوم کردن و گەورە بوون و

بوونه کەروێشکی ماڵی و دەچوونە دەرەوەی حەوشە و سەگ ڕاوی دەنان و پرتاو خۆیان لەحەوشە دەکوتاوە.

یەکێکیان نەخۆش کەوت و مردار بووەوە. ئەوسا دەگوترا: مردنەکەی لەبەر ئەوەبووە: بۆنی ڕوونی قرچاوەی کردووە.

چەند ڕۆژێکی پێچوو دووەمیش بزر بوو. لام وابوو مێیەبوو.. و کاتی بەفاڵ هاتنی هاتبوو.. ئەمە وای کرد مل لە دەشت بنێت.

***

دووەم: خۆماڵی بوو. پێی دە گوترا = ((کێرووشکی بەغدایی)).

زۆر لە ئەوەی یەکەم گچکە تر بوو.. سێیەکی دەبوو. یەك ڕەنگ نەبوو: ((سپی و ڕەش و بۆری ئاماڵ زەرد. زەردی ئاماڵ سوور)) بەڵەکی ((ڕەش و سپی)) و ((زەردو سپی)) و ((سوور و سپی)).

ئەمەیان دیواری حەوشە و ژووری ماڵەوەی نەدەهێشت.

خانووی لادێ ئەوسا خشت و قوڕبوو هەڵدڕ بە هەڵدڕیان دەکرد و کونی قوڵیان لێدەداو تێیدا دەزان. تووکی خۆیان لێدەکردەوە و لەناو لانەکەیاندا دەناو ئەوجا لەسەری دەزان. هەرکە دەزان کەس نەیدەزانی، هەتا بێچووەکان قوتە قوتی گچکە دەهاتنە دەرەوە.

من لە گوندی مورتکە زۆرم ڕاگرتن. لەنێو چل پەنجا شەو دەزان. جارێك یەکێك سێزدە بێچوو بوو.. و بەدەنی دایکەکە تەحەمولی نەکرد مردار بووەوە.

***

**گورگ:**

دەعبایەکە لە سەگ دەچێت. پاشەڵ پووتی سینگ پانە زۆر زیان بەخش و چاوبرسییە و مێملی مەڕ و ماڵاتە. هەرکە گەیشتە مێگەلە مەڕێك وەنەبێت یەکێك بکوژێت و بیخوات هەتا لەدوا بێڵی بێت مەڕان زۆر کەل و کلۆم دەکات.

- گورگانە = وەك گورگ. لە شێوەی گورگ.

- گورگانه شەوێ: گۆرانییەکە منداڵیان پێدەخەواند.
- گورگە: ١- سواندەی خانووی شارستانی.

٢- هەندە دیوار هەیە، بۆ ئەوەی باران کاری لێنەکات و زوو نەرووخێت، سەری بە هەلاش وەك خانوو سواق دەدرا سواندەی بۆ دەهێڵدراوە. ئەمەش ئەو ناوەی بەسەردا سەپابوو.

٣- خۆسرک هەڵخست: ((ئازاد بە هەموو شتێك خۆی گورگە هەڵنایەخێت)).

- گورگە لوور = لوورەی گورگ.
- گورگە لۆقە = نەرمە غار. هەرِوەلە.
- گورگ خواردە = ((گورگان خواردوو)). کەسێك بەهۆی کەسێك دیکەوە تووشی کێلەوەژەو ئاژاوە بوو بێت.
- گورگ کوژ: کەسێکە گورگی کوشتبێت. بەسەگی گورگ کوژیش دەگوترێت.
- گورگ نەخۆر: شتێکە گورگ لەبەر پووتی و بێسوودی نەیخوات: بۆ گیانداری زۆر لاوازیش دەگوترێت.
- گورگی باراندیتە: مرۆڤێکی چاو کراوە و جاقی کۆڕی ژیان و فێڵباز.
- شەوی گورگان: واتە شەوێکی تاریکە ساتی وابێت چاو چاوی نەبینێت.
- گورگی بێچوو کوژاراو:

((وام بە منداڵی بیستووە: دێڵە گورگێگ چەند بێچووی دەبێت یەکێکی ناوچەکە کونەکەی پێدەزانێت و بێچووەکانی دەکوژێت، یان دەیان بات: ((تەواوم لەیاد نەماوە)).

دایکەکە هاروهاج بوو. هەموو شەو بەسەر گوندەکەی نزیکیەوەی دادەدا و زیانێکی زۆری بە مەڕ و ماڵاتی گەیاندن. پاش ماوەیەك گورگەکە ناوچەکە بەجێدێڵێت)).

**مامز:**

گیانـدارێکی کێـوی و چـاوڕەش و جـوان و زۆربـەغارە و لـە وشـکاتی و چەقێندا بە تاژی ناگیرێت.

ڕەنگی کەوی، یان سۆری ئامـاڵ زەردە و بـن زگ سـپی و هێڵێکی ڕەش کەوتووەتە نێوان هەردوو ڕەنگەوە و زیاتر پێ جوان بووە و سمدارە.

نێرەکە شاخی هەیە. سەردەمایەك لە دەشتی هـەولێر گـەلێك زۆر بـووە. بەڕەوە دیتراوە.

ئەمڕۆی حـازریش بـەهۆی ئـەوەوە حکومـەت ڕاوی قەدەغـە کـردووە زۆر بووە.

لەم یەك دوو ساڵەی دواییدا ناوچەکە بارانی نەبوو.. و بێ گیا و سەوزایی حکومەت ناوەناوە عەلەف و ئاو یان بۆ لـەناو کـۆڵ دەکـات لـە بنـاری چیای قەرەچوغەوە.

ئەمەش کارێکی کەڵێك پیرۆز و مرۆیانە یە.

***

**مامز ڕاگرتن:**

گچـکە بـووم بێچـووە مامزێکیـان بـۆ هێنـام. ((لـەیادم نـەماوە کێبـوو)). منیش قەرێتەیەکی جوانم دایکم درووسـت کـرد و لـەمل کـرد. ڕۆژێ بـەڕۆژێ بەگوانی بزنان دەم مژاند. ئەویش فێر بوو هەرکـە چـاوی بـە بزنـان دەکـەوت تاوی بە موشتاوە دەداگوانی. گەورە بوو.. و مامزی تـەواو. زۆرجـارم لەگـەڵ خۆم دەبردە دەرەوە. کەچی لەبیرم نەماوە. لە دواییدا چی بەسەر هات.

***

**وڵاخ = ((وڵاغ))**

وڵاخ = چـوار پێـیماڵییـە و لـە سـپیان و ڕەشـان بـەدەرە و ئەمانـە دەگرێتەوە:

یەکەم: ئەسپ:

ئەسپ: نێری ((ماین))ە.

هەرکە لەدایك دەبێت، تا لەشیر دەبێتەوە ((جوانی))یە. دوای دابڕانی لە شیر ((جوانە ئەسپ))ە.

کە پشتی کرا. واتە بەرگەی سواری گرت ((ئەسپ))ی ناوە. ئەسپ لەبەر ئەوە سوار سوارانێی پێدەکرا فێرە ((رەوهان))ی نەدەکرا. هیشکە رۆبوو. هەر.. ولاخێك لە ڕۆییندا ڕەوهان بێت لە غار دانابەزیت، ئەگەرنا زۆر دەبەزیت.

ئەسپ هەر کە بەناو سالْ کەوت: ((پیرە ئەسپ))ە.

ئەگەر هات و باری دەغلْ و شتی تری لێبارکرا ((بارگین = بارگیر))ی پێدەگوترێت.

بەپیری ((پیرە بارگینە)).

ئەگەر خەسابووایە، بە ((یەختە بارگین)) ناو دەبردرا.

بەناو سالْ کەوتن ((پیرە یەختە بارگین)) بوو.

***

دووەم: ماین:

ماین مێیەی ئەسپە. بەگچکەیی هەتا لەشیر دەبێتەوە ((جوانی))ی ناوە. دوای دابڕانی لەشیر ((جوانە ماین))ە.

- هەرکە پشت کرا: ماینە.
- کەوتە ناو سالْ ((پیرە ماین))ە.
- ئەگەر باری لێبارکرا ((بارگین = بارگیر))ە و پاشدان ((پیرە بارگین))ە.
- بێلەمە: جلێکە ئەگەر ئەسپ و ماین لەبەر گەرما ببەستترابوونایەوە لەسەر پشتیان دادەندرا.

***

**ڕەنگی ئەسپ و ماین:**

((داوای لێبوردن دەکەم: هەر ئەوەندە ڕەنگەی دەزانم. لە هەندێکیش تەواو دڵنیا نیم. نووسەر)).

١- بۆر = ڕەش و سپیی تێکەڵاو خۆڵە مێشی.

٢- ڕەش = سیا. دژی سپی.

٣- ڕەشبۆرە = خۆڵەمێشی. ئاماڵ ڕەش.

٤- رەشبۆز = ڕەشی ئاماڵ شین.

٥- سپیی = بەفری و چوڕی شیری.

٦- شەو دێز: بەم مایانە دێت:

أ- تارمایی لە شودا.

ب- ئەسپ وماینی ڕەشی تاماڵ سپی.

پ- ناوی ئەسپی خەسرەوی مێردی شیرین بووە.

٧- شینبۆر = کەویی ئاماڵ بۆر.

٨- شینبۆز = ڕەشی ئاماڵ شین.

٩- شێ: سۆرێکی ئاماڵ زەردە و مووی کلکی و بژی زەردە.

١٠- کوێت = سۆرێکی تاریکە، یان قاوەیی یەکی تۆخە و مووی کلك و بژی ڕەشە.

***

**سوار سوارانێ:**

زەمانی زوو چەند سوار ((ئەسپ و ماین)) شوێنێکیان تەرخان دەکرد و کێهان لە سوارەکان گەیشتە قزگەو زووتر گەڕاوە براوە بوو.

هەرکە سوارەکان ڕیزدەبوون و پێش ((هەو)) لێدانی سواران ئەو ئەسپ و ماینەی ((ڕەسەن)) بوون هەستیان دەکرد غاریان پێدە درێت. جەستەیان سەرتاپا دەلەرزی.

جا ئەو تەرزە وڵاخانە بێ هەچەلێکردن و قامچی لێدان هەرچەند هێز یان لەبەر دابوو تەکانیان دەدابەر خۆیان. بەزۆریش هەر ئەو تەرزانە پێشدەکەوتن.

***

سوار و غاری ئەسپ:

زۆر بەزین و نەبەزینی ئەسپ و ماین بەسوار دەگۆڕێت. سوار هەیە وا دەکات وڵاخەگەی ژێری هەراسان بکات. واتە لە خۆگرتندامە علان نەبێت و هیوایەتی ئەوە دەبێت بەر نەبێتەوە و بەس. هەشە بەشێوەیەکی ئاسایی وا خۆی لەسەر زین دەگرێت وڵاخەکەی هەست بە قورسایی یەکەی نەکات. بۆ وێنە:

بەبیرم دێت: کابرایەکی عەرەبی سوار ماین هاتە گوندەکەمان. خوالێخۆشبوو: ((عەزیزی شەریفەقیت)) جوامێرێکی ئاوایی بوو ماینێکی زۆرچاکی هەبوو.. و بە عەرەبەکەی گوت:

- سوار سوارانێم لەگەڵ دەکەیت؟.
- عەرەبەکە یەکسەر گوتی: ((بەڵێ)).

ئەوسا عەزیز ئاماژەی بۆ خوالێخۆشبوو ((ساڵحی مام ڕەسووڵ))ی جوامێرێکی ئاوایی بوو کردو گوتی:

- بەڵام من ماینەکەم دەدەمە ئەو پیاوە.

عەرەبەکە لە مام ساڵحی ڕووانی و گوتی:

- ئەوە سوارە دەمبەزێنێت، بەڵام تۆ لەسەر و سەرکوتترا دەزاندرێت سوار نیت و دەتبەزێنم.

***

سێیەم: ئێستر:

((هێستر = قاتر))یشی ناوە. وڵاخێکە دایکی ماین و باوکی گوێدرێژە. لە ڕۆیین و باڵ هەڵگرتندا زۆر چیڕ و بەکێشە. باشترین وڵاخی کاسبیی جوتیارانی سەردەمی زوو بوو.

ئێستری باڵابان. واته باڵا بەرز.

ئێستری بالابانی = ئێسترێکە دایکی گوێدرێژ و باوك ئەسپ بێت. من ئەو تەرزە هێسترەم بەچاو نەدیوە.

ئێستری گاییلە = ((ئێستری باڵابانی)).

ئێستری ماچە = ئێتری مێیە.

ئێستری نێرەکی = ئێستری نێرە.

ئێستری ماچە: دیومە دەلەوچی. واتە پێویستی بە چاکردن بوو. نەمدیوە نێر بکەوتە سەری.

ئێستری نێرەکی: دیومە عەورەتی دەرهاتووە، بەڵام سستێکی وابوو بۆ پەڕین نەدەشیا.

***

جاش ئێستر = ساوای هێستر و هێشتا پشتی بۆ بار و سوار بوون نەکرابێت.

ئێستری نێرەکی فەقیر و لەکار و ڕۆیشتندا، لە ئێستری ماچە گرانتر بوو.. مەگەر بەدەگمەن دەنا لووشکەی هەرگیز نەدەهاوێشت. کەچی ئێستر ماچە هەبوو زۆر ((چەمووش)) و لووشکەی دەهاوێشت.

من لەدیار نەبوومە، بەڵام پیاوێکم دیتووە قۆرتایی یەکی لە شێوەی سمی وڵاخ بەنیوچەوانیەوە بوو.. و گوتی: ((هێستر لووشکەی لێداوم)).

چەندین جاریش دیومە هێستری ماچە لووشکەی هاوێشتووە.

***

جوتیارێکی گوندەکەمان جووتە هێسترێکی ماچەی زۆر چەتوونی دەبێت ڕۆژێك لە کاتی جووت کردندا جوتیارەکە، لەگەڵ هەچە لێکردنێکی حێل، هەریەکە و دار جووتێکی قاییم دەخێوێنتە کەفەلیان، هێسترەکان پێ بە غارێ وەدەنێن و هەوجاڕ لە دەست جوتیار دەترازێت و گاسنەکە، لەکاتی هەڵقۆز هەڵقۆزیدا نووکەکەی لە قووڵایی سەرەوەی سمی یەك لە هێسترەکان

ڕادەچێت و دووبە دەری دەکات. ئەمە وای کرد هێسترەکان ناچار بووەستن و خاوەنەکەی هەر چۆنێك بوو گاسنەکەی ڕادەکێشێت و دەری دەهێنێت.

هێسترەکە توانای نەما لەسەر لاقەکەی بڕوات. بۆ ئەوەی لەکاتی تمارکردنی برینەکە، هێسترەکە پەل بزاوت نەکات هەرزاڵەیان بۆ هەڵبەستا.

تەنگەی هێسترەکەیان خستە نێوان دوو تەژانەوە و بە گوریس پێچایان و ئەوجا هێسترەکەیان بەهۆی تەژەکانەوە خستە سەر هەر زاڵەیەکی تایبەتەوە. هێسترەکە پێی لە زەوی بڕاو لەبەر بەستانەکەش جوولەی بۆنەدەکرا. ئەوسا من لە دیاربووم ڕوونی گەرمیان لەنێو برینەکە کرد.

پاش شکانی ژانی ڕۆنەکە هێسترەکەیان هێنا خوارەوە. لەیادم نەماوە برینەکە چاك بووەوە، یانە.. نا.

چوارەم: گوێدرێژ:

لەدەشتی هەولێر سێ جۆرە گوێدرێژ هەبوو.

یەك: گویدرێژی ئاسایی

دوو: گوێدرێژی حەساوی: ئەمەیان گەورە و باڵا بەرزی بەقەت ئێستر دەبوو. دوو تەرز بوون:

١- ڕەنگی چەشنی گوێدرێژی ئاسایی.

٢- سپی بوو.

سێ: بەغدایی. ئەمەیان تەنیا سپی بوو. وەك ئەوەی پێشوو گەورە نەبوو بەس پەل ئەستوورتر بوو.

***

وا باو بوو.. و بەخۆشم لە نووسین بەکارم هێناوە:

١- دەڵێیت: نێرەکەری حەساوی. واتە گەورە و زەبەلاحیت.

٢- هەتا نێرەکەری بەغدایی نەزەڕیت بەرتنادەم.

ئەمەش مەحاڵ بوو. چونکە بەغدا دوور بوو.

***

گوێدرێژ زۆر فەقیر بوو.. و منداڵێك سواری پشتی ببووایە دەڕۆیشت. قەت لووشکەشی نەدەهاوێشت. تەنیا ساڵێك ئێمە فەقێ بووین لە گوندی مورتکە، ژووری حوجرەکەمان دوو دەرکەی هەبوو. لەکاتی نیوەڕۆ راتبەمان تازە هێنابووەوە گوێدرێژێکی ڕەنگ مەیلە و سوور چووە ژووری حوجرەکە و بەربووە نان خواردن. ئێمەش ویستمان دەری بکەین کەچی کەری چەمەری هەرکە ئەمەی لەسەر عەتەبەی دەرگەی حوجرەکە دەدیت تەنگە تاوپڕی دەداینێ. لە پێشەوە قەپی دەهاوێشت لە دواوەش لووشکە. هەتا تێری نان خوارد ئەوجا بەکەیف و ماشای خۆیەوە چووە دەرەوە. ئێمە نەوێراین تخوونی بکەوین.

***

بێچووە گوێدرێژ لە دوای زاندا ((جاشکۆلە))ی پێ دەگوترێت. پاشدان جاشك.

ئەم بیستووە ((جاش))ی پێ بڵێن. ئەمەیان ((ساوای هێسترە)). بەس ئەم تەرحانە سەردەمایەك باوبوونە.

١- ئەگەر مێ بووایە: ((جاش ماکەر)).

٢- ئەگەر نێر بووایە: ((جاش نێرەکەر)).

٣- هەر کە لەشیردا بڕا ((کۆرەبژی)) ناوبوو.

٤- کە هاتە حەدی پشت کردنی بە ((کەر)) ناو دەبردرا. مێیەکە ((ماکەرە)) و نێرەکە ((نێرەکەر)). پاشدان پیرەکەر.

٥- جۆرە گوێدرێژێك بەژنی هەڵنەدەدا و باڵای لەچاو گوێدرێژان کورت بوو: ((کەرە کولە))ی ناوبوو.

٦- ئەگەر خەسا. واتە گونی دەرهات ((یەختە کەر))ی ناوە.

***

ئەو گوێدرێژانەی ناوبانگیان هەبوو:

١- نێرەکەری باشتەپەی.

٢- نێرەکەری سۆری دەشتی هەولێر.

٣- نێرەکەری گەلیاوە.

کەچی بەداخەوە هۆی ناو دەنگەکە یان ئێستاش نازانم و کەسی واشم دەست نەکەوتووە، دڵم لەم ڕووەوە پێیدا بکەوێت.

تەنیا هۆی ناو دەنگی دووەم ئەمە بوو: خوالێخۆشبوو ((حوسێنی مەلا))ی ئاغای گوندی ((قازیخانە))ی دەشتی هەولێر هەردەم لە کۆڕ و کۆبوونەواندا دەیگوت:

((من نێرەکەری سۆری دەشتی هەولێرم))

***

**جاشبڕ:**

بۆ ئەوەی ((جاشك)) لەشیردا ببڕێت، پارچە بەرمیلێکی کەوانەیی لەگەڵ لمووزی جاشك ڕێك بکەوێت. سەرەوەی چەند بزماری لێدرا بوو. وەك قەڕاسە لە سەر لمووزی جاشکەکە دەبەسترا. هەرکە سەری بۆ مژین دەبردە بن زگی دایکیەوە سەری بزمارەکان بە مەلاو بەولای گوانی دایکەکە دەچەقی و دەیهێشاند و ئەوسا ئەویش نەیدەهێشت بیمژێت.

***

**گوێدرێژ لەڕووی ڕەنگەوە:**

١- بۆز: ڕەش و سپی تێکەڵاو. بە ((شینی ئاماڵ سپی دەچێت)).

٢- دێزە: ڕەشی ئاماڵ بۆر.

٣- ڕەش ((ڕەشێکی ئاچوخ)).

٤- سپی.

٥- سۆر: سۆری ئاماڵ زەرد. هەشبوو سۆری تاریك.

٦- شین. شێنێکی ئاماڵ سپی.

***

**پێنجەم: ڕەشە وڵاخ:**

**ڕەشە وڵاخ دوو جۆرە:**

**١- گامێش:**

بەداخەوە هیچ زانیاریم دەربارەی گامێشەوە نییە و کەسی واشم چنگ نەکەوت لێی پرسیار بکەم. بۆیە پشتمان تێکرد.

٢- گاو چێڵ و گۆلك:

من لەمەش بەڵەدنیمە و هەر ئەوەندەم نووسیوە لێیدە زانم. تکایە ئەگەر کەم و کووڕی هەبوو چاوپۆشیم لێ بکەن.

یەکەم: بە ساوایی: ((گۆلك، گوێرەکە))ی ناوە.

هەر ئەو ناوەیە تا ماوەیەك پاش دابڕانی لەشیر. هەرکە پێینایە دوو ساڵییەوە: ئەم ناوانەی دەقەبەڵ دەکرێت:

١- پارگوێر.

٢- پارێن.

٣- پانێر.

٤- سەنگۆ.

٥- گوێلپار.

هەرکە لەمانە ڕەتبوو ((مێیەکە))، ((مێنگوێن))ی ناوە و کاتی بە کەڵ هاتنیەتی. دوای مێنگوێناتی ((مانگا، چێل))ی پێدە گوترێت. پاشدان ((پیرە چێڵ)).

نێرەکە ((جوانەگا))ی ناوە و بۆ پەڕین ڕادەگیرێت.

هەرکە پێینایە سێ ساڵ ((تۆبەن))ە و پاشدان (گاو پیرەگا))یە.

کەندۆ = مانگایەکە پاش زان بە ساڵێك و گۆلك نەمانی شیر بدات.

***

چەند وشەیەکی پەیوەستدار بە بابەتەکەوە:

١- ئاخوڕ: ئاخوڕی وڵاخ لە قەد.. دیوار، یان سەربەخۆ بەخشت ئەوەندە بڵند درووست دەکرا ڕەشان و سپیان دەویان نەگاتێ.

ئاخوڕی وڵاخی یەکسم، لەبەر ئەوە لەکاتی ئالیك خواردندا پێکنە دەهاتن، بەزۆری تاك تاك دەکرا. نەك وەك ڕەشان و سپیان درێژ و بەیەکەوە بن. سێ جەمە کاو جۆی تێدەکرا.

٢- **ئاوزینگ لێدان - ((ڕەکێب لێدان)).**

((سوارەکە ئاوزینگی لێدا، یان ڕکێبی لێدا))، وا باوە هەردووکیان یەك مانایان هەیە و ئەویش تاودانی وڵاخە بە زینەوە.

بە بۆچوونی من ((ڕکێبی لێدان، هەرکە سوارەکە بیەوێت غاربدات: بە درێژایی هەردوو پێی، کە لەناو ڕکێب دانە رکێبەکەی لە ملاو لەولای قەبرغەی ئەسپەکە دەدات. کەچی ئاوزینگ لێدان: ڕکێب لە ئاست قونپانی سوار ئاسنێکی، بە ئەندازەی پەنجە ئەسپە کوڕەی هەیەو سوارەکە بەو قوتکە ئاسنە لە جیاتی پانایی یە کە لە ئەسپەکەی دەدات)).

بەمەش ئەسپ، یان ((ماین))ەکە پتری لەهی بەرایی دێشێت و تەکان زیاتر لەخۆی دەدات.

کەواتە ئاوزینگ لێدان لە ڕکێب لێدان توندترە.

((بۆچوونی خۆمە و ئێوەی خوێنەریش کەیفی خۆتانە. نوسەر)).

***

٣- **پیسایی گیانلەبەران:**

پیسایی گیانلەبەران ئەمانە بەخۆیەوە دەگرێت:

أ- پیسایی پەلەوە: ((جیقنە))ی ناوە.

ب-پیسایی حوشتر ((حەولە))یە.

پ- پیسایی درندەی گۆشت خۆر ((گوو))ە.

ت-پیاسیی ڕەشە وڵاخ: بە پەیتی ((سەرگین، تەپاڵە))یە. بە شلی ((ڕیخ))ە.

ج- سپیان و ڕەشان: ((قشپل، پشقل))ە بە پەیتی، کەچی بەشلی ((سل))ی پێدەگوترێت.

چ- مامز: ((قشپل))ە.

ح- وڵاخی یەکسم: قەرسە قول، تەرسە قول))ە، بە پەیتی، بە شلی ((تەرس))ە.

***

٤- تەویلە:

تەویلـە = ((پشـتێر، گـەوەڕ)) ژووری وڵاخـی یەکسـم. بـە هاوینــان حەوشــەیەکی بچـووکی تایبــەت بــوو. دیــواری ئەوەنــدە بڵنــدبوو.. وڵاخ نەیدەتوانی بەسەریدا پازبدات.

لە وەرزی سارديدا لە ژووری تایبەت دەکرا. لـە زەمـانی زوو لەبـەر دزان ژووری وڵاخـان لابیانەیـەکی ژووری ماڵـەوە بـوو. بـۆن میـز و تـەرس ژووری ماڵەوەی پڕدە کرد. لەبەر بەردەوام بوونی بۆنەکە: خاوەنەکەی لێڕاهـاتبوو.. و بۆنی نەدەکرد. کەچی میوانی لاییدە زوو پێدەحسیا.

من بـەخۆم لـە ژووری مـاڵی وڵاخـدار دانیشـتبووم سـەری وڵاخـانم لێـدیار بوو.. و پرمەو شوڕەی میزیشیانم دەبیست. بۆنیش هەر هیچ.

***

٥- چارەوا:

چارەوا = ((چـارەوێ)): وڵاخـی یەکسـم و بارهـەڵگر: ((ئەسـپ و مـاین و ئێستر و گوێدرێژ دەگرتەوە)).

***

٦- ڕۆیینی یەکسم: ئەمانەن:

أ- هێدی هیشکەڕۆ. دژی ڕەوهان.

ب- رەوهان خۆشڕۆ.

پ- لەنجە = ڕۆیشتنی هەڵقۆز هەڵقۆز.

ت- لۆقە = گورگە لۆقە: ((لاموایە ئەمەیان لەگەڵ لەنجە یەکە)).

ج- غار: ئەمەیان دوو تەرزە:

یەکەم: نەرمە غار.

دووەم: پڕتاو. ئەنگەتاو.

٧- سەرگەلە:

چنراوێکی دەستی تایبەتـەو لـە شـێوەی کەژیـدا دەهۆنرێتـەوە. بـەڵام زۆر باریکترە و قیچێك لە دۆخین پانترە. لۆ دوومەرام بەکار دەهات:

أ- هەر دوو سەری بەملاو بەولای قەوچی سەر لمووزی یەكسمەوە دەبەستران و ناوەڕاستیشی دەكەوتە پشت گوێیەكانی.

ب-زەمانی زوو ئافرەتی ناوچەكە لە جیاتی پشتێن، یان قاییش لە پشتە خۆی دەبەستاو كراسە دوو قەدەكەی پێدا شۆڕ دەبووەوە.

٨- سندم

سندم: پەیوەندی ئاسن بوو. دوو ئەڵقەی بازنەیی دیواری چوار پێنج سەنتمەر بڵند و بە زنجیر بەیەكەوە بەسترابوون. ئەندازەی بیرازەكەشی تۆزێك لە پێی وڵاخی بەرزە بەرینتر بوو.

لە زەمانی زوو: لەبەر دزی ئەڵقەكان لە پێی ئەسپ كلیل دەدران. تایبەت بوو بە ئەسپی بەبزێو.. و سەركەش.

ئەگەر ئەسپەكە زۆر چەتوون نەبووایە سندمەكەیان لە هەردوو دەستی دەكرد. ئەگەرنا لە دەست و پێیەك.

***

٩- فەلاقە: بەم مانایانە دێت:

أ- ئەو دار تەژەیە لەجیاتی دەركە دەخرێتە كونی دیواری ئەملاو ئەولای دەرگای تەویلەوە.

ب-هێچكێكە، یان قەفیزێكە لە دیواری ئاخوڕ لۆ بەستانەوەی ولاخان بوو.

پ- پەت و دارێكە لە هەردوو پێی تاوانبار دەپێچن و بەداران، یان قامچی لە بنی پێیاندەدا.

١٠- قەشاویش:

لەبەر میل دروست دەكرا.. و .. وەك شانە ددانی هەبوو جەستەی وڵاخیان پێدەخوراند. ((ئەسپەكەم قەشاویش كرد)) واتە بەدەنیم بە قەشاویش خوراند.

١١- وڵاخدار: = چارەوێدار:

كەسێكە وڵاخی هەبێت. خاوەن وڵاخ.

١٢-ولاخداری = ((ولاغداری)):

کەسێکە ژیانی لەسەر بەخێوکردنی ولاخەوە بێت.

١٣-ولاخی بەرزە:

((ئەسپ و ئێستر و ماین))ە.

***

**جلەو و قەوچ و لغاو و شتی تر:**

من لێ.. وەدەست هێنانی مانای ئەو.. وشانەی خوارەوە، زۆربەی فەرهەنگەکان گەڕام. ڕاڤەکردنی هەندێکیان نەدەچووە عەقڵمەوە. کەسی واش لەژیاندا نەماوە، کە جەرباوی ناو دنیای ئەو.. وشانە بێت و کەلەکەی ئۆخەم لە ئاستیاندا بخەوێنمە عەردەوە. بۆیە.. ویستم، بێ پەیڕەوی فەرهەنگەکان ((ئەللای ئەرمان لە جێی نەرمان)) بدەمە بەرێ. کەچی پاشدان لەگەڵ چەند برادەری کەمێك ئاگادار لەم بواوارەوە، لەسەر ئەو مانایانەی خوارەوە ڕێککەوتین. جا تکایە ئەگەر لەشی کردنەوەی هەندێکیان سەرچیخ چووبم، بەنووسین وەڵامم بدەنەوە. هەتا جارێکی دی پێ لەجێی ئەوها خوار دانەنێمەوە.

لەبەرایبدا پێویستە ئەمانە بزاندرێت: ((قەوچ و قەڕاسە)):

تایبەتە بە ((گوێدرێژ و هێستر)) بەرامبەریشیان ((جلەو و ڕێشمە))یە و بۆ ئەسپ و ماین بەکاردێن.

***

**وشەکان:**

١- جلەو: زنجیرە، یان کشتە بەنێکی هۆنراوەی گوریسییە، بەلام لە ئەستووریدا بە ئەندازەی نیوەی ئەوە. سەرێکی لەدەست سوارەو سەرەکەی دیشی بەناو لایەکی ((زەناخە))کەی بن چەنەی ئەسپ و ماینەوە دەچێت و بازنەیی بەبان لمووزی ئەسپ و ماینەوەدا دەسووڕێتەوە. هەتا دەگاتە وەلایەکەی دی کە زەناخەکەی پێوە نووساوە.

بەشێوەیەکی دی:

((زەناخـــە)) ئەڵقــە زنجیرێکـــی خـــڕو بچـــووکی قـــوتری چـــوارپێنج سـەنتیمەترییە و سـەرێکی جلـەوی پێوەنووسـاندراوە و سـەرەکەی دی ((بـابلێین زنجـیری مـامزە دارە)) و بـە سـەرلمووزی وڵاخـەکانی تایەنـدا دەسووڕێتەوە و ئەوسا مامزەکـە بـەناو زەنـا خەکـەدا دەچـێت و هـەتا دەگاتـە دەسـت سـوارەوە. واتـە ((ئـەوەی گەیشـتە دەسـت سـوارەکە مامزەی سەری جلەوەکەیە)).

٢- **ڕەشمە: ((ڕێشمە))شی هاتووە:**

قاییشە، یـان زنجـیر و سـەرکەلەیە، ناوەڕاسـتی لەپشـت گوێیـەکانی ئەسـپ و ماینەوەیـە و سـەرێکی لـە ئاسـت گـوێی راسـتەوە بـە سـەر لاڕوومەتی وڵاخەکاندا دێتە خوارەوە و لەبازنە قـەفیز دارەکـەی دەوری لمووزیان، لۆ راگرتنی تەوازوونی بازنەکە شـەتەك دەدرێـت، سـەرەکەی دی بە هەمان تەرح لەلایەکەی تر دەبەسترێت.

٣- **قەڕاسە:** هـەمان مانـای ڕێشـمەی هەیـە، تـەنیا بـۆ گوێدرێـژ و هێسـتر بەکاردێت، نەك بۆ ئەسپ و ماین.

٤- **قەوچ:** لەگەڵ جلەودا هاو.. واتایە، بەڵام دەچێتە پاڵ قەڕاسەوە، نەك ڕێشمە.

٥- **لغاو:** ئەمەیان تایبەتە بە ئەسپ. ئاسنێکە و ئەستوورایی بە ئەندازەی پەنجە تووتەیە و ئەمسەر و ئەو سەری بەدەسجلە و ڕاگیراوە و تـەرحی بزمـووکی دەمـی کـارەوە دەخرێتـە دەوی ئەسـپەوە. سـەرەکانی لـە دەرەوەی لغاوەکـانی ئەسـپەکەیە. هـــەر بۆیەشــە بــە ((لغـــاو)) ناودەبردرێت.

ئەگەر ئەسپەکە لەکاتی غاروشتی تردا، لەسەر کەشی خۆی بۆ سـوار نەدەستا، بەلغاوەکە بەرزەفتی دەکات.

٦- **هەوسار:** ئەمەیان تەنیا کشتەکە بەنەو لە جلەو و قەوچ گشتی ترە و لۆ سەرتاپای ولاخی یەکسەمەوە بەکاردێت و: ((هەوسـاری گۆلکیشم لەمنداڵییەوە بەرگوێ کەوتووە ـ نووسەر)).

***

**زین**

**زین تایبەتە بە ئەسپ و ماین و لە ئەمانە پێکهاتووە:**

١- دوو ئاسنی کەوانەیینە و نێوان هەردوو ئاسن جێگەی دانشتنی سوارە.

٢- ئەو قایشەی ئاسنەکانی داپۆشتووە بە ((خانەی زین)) ناودەبردرێن.

٣- **((ئاو زەنگی = ئاوزینگ))** رکێبە.

٤- ((بن ڕان)) = **((قەلتاخ))** چوار دارە و بە چەرمی خاو پێچراون و دەکەونە سەر تەکەلتوو.

٥- **تەکەلتوو** ئەو قایشەیە لەملاولەولازین شۆڕ دەبێتەوە و دەکەوێتە بن ڕانی سوارەوە.

٦- رکێب = ڕکێڤ = رکێو: دوو ئاسنی تایبەتن بەراست و چەپدا، بە قایش شۆڕکراونەتە خوار زینەوە و سوار پێیان لەسەردا دەنێت.

٧- **بن زین:** پارچە لبادێکە دەخرێتە ژێر زینەوە = ((ئارەقگیر))یشی ناوە. نایەڵێت ئارەقە بگاتە زینەکەوە.

٨- ئەو پارچە زینەی دواوە، دەکەوتە سەر نێکی ولاخەوە ((پاشکۆ))ی زینە.

٩- **قشقوون** = قایشێکی درێژ و باریکی تایبەتەو بە دواوەی زینە و دەچێتە بن کلکی ولاخەوە. بەرامبەر ((پاروو))ە لە کورتاندا.

١٠- **قەرپۆز** = ((قەڵپۆز)). ئەو شتە بڵندەی، وەك ملە حوشترە و دەکەوێتە پێش سوار و هێندە جار دەستی پێدەگرێت.

١١- **بەرە:** قایشێکی درێژ و نزیکەی چوار پێنج پەنجە پانە و نەخشی لێکراوە و هێندە جار بۆ جوانی پلپلەی زیویان پێوە دەکرد. سینەبەندی ئەسپە کە بەتەنگەی زینەوەیە ـ هەژار وای فەرمووە.

١٢- **زەناخە:** قەفیزێکە لەژێر قەوچەو توند و شلی قەڕاسەی بەناودا دێت و دەچێت.

١٣- **تەنگە و بنتەنگە:** هەر یەکەیان لە شێوەی قایشی پشت تۆزێك ئەستوورترە و یەکیان وەك ((بن زگ))ە و زینەکەی لەژێر زگی وڵاخەوە شەتەکدەدات. ((بنتەنگە))ی ناوە. ئەویتر زینەکەی لەسەر پشتی وڵاخ دەبەستێتەوە و بە ((سەرتەنگە)) ناو دەبردرێت.

١٤- **دەسجرەو** = ((دەسجڵەو)) کشتە بەنێکی ڕەنگاوڕەنگی تایبەتە و تۆزێك لە پەنجەی گەورە ئەستوورترە. بە زەناخەوە بەستراوە. لە لغاودا دەسجلەو قاییشێکە و ئەمسەر و ئەوسەری لغاوەکەی پێراگیراوە و ناوەڕاستی لە دەست سوارەوەیە. ((دەستجلەو))یشی هاتووە.

***

**کورتان:**

کورتان ژێرەوەی، بۆ ئەوەی پشتی یەکسم بەهۆی قورسایی بارو سوارەوە ئەزیەت نەخوات لباد بوو. لبادیش لە ((الوا))ی بەرخ درووست دەکرێت نەرم و لووسە و دڕ نییە.

سەرەوەی کورتان ((بەڕە)) یان ((جەواڵ)) و تۆباتیش ((خراں)) بوو.

تاکو قەدی کورتانەکە پۆزی ببێت و لەکاتی باری گراندا ئازار بە قەبرغەی یەکسم نەگەیەنیت و تەوازووی بارەکەش ڕاگرێت شتی تێدە ئاخێنرا.

ئەگەر بۆ فرۆشتن = ((تیجارەت)) بووایە کورتان درووەکە پووشی تێدە کرد، ئەگەرنا لباد و گوش و شتی تر بوو.

دوو ((باڵۆڵە))ی جوڕك ئاسا، درێژووکانی گوش بوون بۆ فرۆشتن بە پووش پڕ یاندە کردەوە، بۆ تایبەت لباد و گوش بوو.

کورتان درووەکە ناوەڕاستی لباد و بەڕەکەی بە جۆرێکی وای قوڵ دەکرد تیخی تیلەقەی پشتی وڵاخ، یان گوێدرێژەکە بریندار نەبێت، دەکەوتە مەعبێن هەردوو باڵۆڵەکانەوە.

**دووەم:** سەرەوەی کورتان پان دەبوو.. و باری ڕادەگرت و نەیدەهێشت بەملاو بەولادا بخزێت.

**سێیەم:** سواریش پاشەڵی باش دەخێوایێ.

کورتانەکە پەتێکی لەشێوەی ((سەرکەلە)) بەملاو بەولای دامێنییەوە بوو.. هەتا نەرمەی ((پاشەوە))ی کورتانە بەملاو بەولادا نەچێت دەخرێتە ژێر کلکی یەکسمەکەوە و ((پاڵوو))ی پێدە گوترا.

پەتێکیش بە لێواری کورتانەکەی ئاست ڕانی سوارەوە بوو.. و سەرەکەی دی بەژێر سگی گوێدرێژەکەوە دادەچوو.. و لە قولفەیەکی ئاسن، یاخۆ بەنی لێوارەکەی دی دەبەسترا.

ئەمە کورتانەکەی ڕادەگرت و ناوی ((بن زگ)) بوو. کورتانی بە جۆرێکی وا شەتەك دەدا زۆرجار بار، یان شەغرە لەسەر پشتی یەکسمەوە کەوتووە و کورتانەکە لە شوێنی خۆی نەترازاوە.

کورتان بە زۆری لەشار درووست دەکرا، نۆبات لەلادێ.

منداڵ بووم وەك خەون بەبیرم دێت جاروبار وەستای کورتان دووریـن دەهاتە گوندەکەمان و کورتانی درووست دەکرد.

***

**منداڵی پێ نەگرتە:**

هێندە منداڵ لەبەر نەخۆشی، یان لەبەر هەرشتێکی دیکەوە درەنگ پێی دەگرت. خاوەنەکەی لەکاتی دابەستنی نوێژی هەینیدا هەردوو پێی دەبەستاوە و لەبەر دەرگەی حەوشەی مزگەوتی دادەنا.

ئەو کەسەی لە پێشان لە مزگەوت دەهاتە دەرەوە دەبێ پێی منداڵەکە بکاتەوە.

گوایا بەم تەرزە پێدەگرێت.

***

**ناڵبەند:**

ناربەند = ((ناڵبەند)): کەسێك بوو.. وڵاخی یەکسمی ناڵ دەکرد.

لە زەمانی زوودا ولاخی یەکسم کاریان یەکجا زۆر پێدەکرا:

((جووت و جەنجە ڕوکێشەو بارهەلگرتن و سواری سەرپشتی)) و زۆرشتی تر، بەزەبرو کاری قورسی بەردەوامییەوە سمیان دەسواو لەکار دەکەوتن لۆیێ ناڵ کردنیان بەواجبە دەزانی. واتە کووپێلاو پێی بنیادەم لە زۆرشتان دەپارێزێت ناڵیش وەك پێلاو پێی ولاخی دەپارێزت.

ناڵبەند ساڵێ کەرەتێك، دەهات گوندەکەمان. ((ئەگەر لێمەنەبێتە درۆ. تەواوم لەیادنەماوە ـ نووسەر)).

یان لەسەرەتای دروونە و گێرە دەهات، یان لەسەرەتای وەرزی پایزدا.

ناڵ: گەورە و گچکەی هەبوو. ئەمەیان لۆ گۆیدرێژبوو، ئەویدی لۆ ولاخی بەرزە.

ناڵ دوو جۆر بوو:

١- خڕو پتەو بوو. تەنیا چەندکونی جێی بزماری تێدابوو.

٢- دووەم ناوەڕاستی کون بوو. واتە ناڵەکە تەنیا لێوی سمەکەی دادەپۆشت.

***

**ولاخ ناڵکردن:**

خاوەنەکەی پێی ولاخەکەی بلندەکرد و ناڵبەندەکە بە گێردێکی لەشێوەی دەمەداس زۆر تیژ بن سمی ولاخەکەی دەتاشی هەتا لەگەڵ ناڵەکە ڕێکدەکەوت.

ناڵێکی بەئەندازەی پێی لەسەر بنی سمەکەی دادەناو ئەوجا بەبزماری تایبەت درووست کراوی نووك تیژ و سەرخڕ و گەورە، ((هەندەجار سەری بزمارەکان چوار گۆشەبوو)). ناڵەکەی چەسپ دەکرد.

سەری بزمارەکان لەلای دەرەوەی سمی ولاخەکە دەردەهات و دەیپاچاندەوە.

هەرکە تەواو دەبوو بە مەورەد سمەکەی لەگەڵ ناڵەکەی ڕێکدەخست.

جار وابووه بزمار زندەی ولاخەکەی دەگرت، لە ڕاتلەکانی ولاخەکە ڕادەزاندراو شەلی دەکرد. ناڵبەندەکە ناڵەکەی یەکسەر لێدەکردەوە و بزماری لەوێڕوە تر دەداوە.

***

زۆرجار.. وادەبوو هێستری ماچە لەبەر چەمووشی و بزێویدا نەدەوەستا ناڵ بکرێت ((لەواشە)) دەکرا.

**لەواشە بە دوو ماناديت:**

**یەکەم:** ئەستوورکێکی ئەستووره و لەسەر سێڵ دەبرژێت و تەڕمپیازی تێدەکرا.

ئەمەش لەناوچەی ((سیوەیل)) و ((شارباژێڕ))م خواردووە نەك لەناوچەکەی خۆم.

**دووەم:** دوو پەلەدارە لەشێوەی جزوبەندی کتێبانە، لە لچی ئەسپ و هێسترەکەیان دەبەستاو یەکێك دەیگرت و ئەوسا هەتا ناڵ دەکرا نەیدەتوانی پەل بزاوت بکات.

***

**نێرەکەرە شین:**

خوالێخۆشبوو: ((حاجی جەردیس))ی گوندی ((گرد قۆشەنە))ی ناوچەی قەراج، کاتی خۆی بەجاشکی دایە ئێمە.

گورکن بوو. واباویشە: لە دنیادا ((سێ شت پەسندن)):

((مندالی چلمن. جاشکی کورکن. گۆلکی زگن)).

من بە مندالی چلمنیش بووم چ پەسندێکی ئەوها دەرنەچووم.

بەلگەی چلمنیم: ڕێزدار ((رابیحەخان))ی ((پلکە عەیشێ)) دراوسێمان بوو، لەژیاندا ماوە و شاللا عەمری نووحی دەبێت. ئێستاش بگاتە من دەست بۆکەپووی خۆی دەبات و فننەیەکی لێدەهێنێت)). واتە تۆ چلمن بوویت.

ولاخ، یان گوێدرێژ لەگەڵ پشت کردنیدا: ((واتەکاتی بەرگەی سوارو باربگرێت)) چۆنت فێر کرد هەتاماوە هەر ئەوها دەبێت.

ئەگەر لەهەوەلەوە فێرە: ڕەوهانیت کرد لە ڕۆیشتندا ئیتر لە غاردانا زۆر نابەزیت، کەچی لە ڕۆیشتنی ئاساییدا زۆر خێرا دەبێت. ئەگەر فێر نەکرا بووایە لە ڕۆیشتندا تەمبەڵ دەبوو.. و، بەڵام زۆر دەبەزی.

کە هاتەلامان من هەرغارم پێدەدا. واتە زۆر دەبەزی، کەچی لە ڕۆیشتندا هیشکە ڕۆبوو.

زۆر فەقیر بوو.. و بەرەلاشت بکردبووایە نەدەڕۆیشت. ڕۆژێك لەکانگە بەهارێکی تەڕدا من و کاك: ((حەمەزیادی خاڵە موسا)) خەڵکی ئاوایی بوو.. و دووسێ ساڵ لە من گەورەتر، بۆ گیاکردن چووینە قەدی چیای ((قەرەچوغ)). گیای ئەوسا لە پشتێنی منی دەدا.

گوێدرێژەکەی ((ماکەر)) و بەتەڵەب بوو.. و داوای کرد:

- نێرەکەرەکەت باشترین نێرەکەری ئاواییە بێلە با ماکەرەکەمی لێ چابکەم.

منیش ڕێمدا. لەو ڕۆژەوە نێرەکەرە شین فێرە زەڕە زەڕبوو.

گوتم لە غاردانە زۆر دەبەزی و بەگیرەش بوو. نەخەسە لە شتێك، ولاخێك، یا گوێدرێژێك بە غار پێشی بکەوتبووایە هەتا هێزی لە بەدەن دابوو هەوڵی دەدا پێشی بکەوێت.. بۆ وێنە:

ڕێزدار: ((مامۆستا مەلا حەسەن حوسێن حەوێز)) لەگەڵ خوالێخۆشبوو ((عەزیز پیرداود))ی دیبەگە، باوکی ((عەبدولواحید)) دیبەگەیی ژن بەژنیان کرد. بووکیان لەنیوە ڕێگەی نێوان دیبەگە و چەغەمیرە گۆڕییەوە.

لە کاتی گەڕانەوەدا تەقەی خۆشی لەهەر دوولا کرا. خوالێخۆشبوو ((حوسێن سەوەر)) دەستی بە مقام گوتن کرد.

من تەنیا ئەوەندەم لەیادماوە:

- ((هاتینەوە و هاتینەوە.
بووکمان هێناو هاتینەوە
شیوێ لێنێن ساردکەنەوە
جێی رایەخن پاڵدەینەوە)).

لەپێش بووك سوار سوارانێ كراو لەم سەر دەچوونە ئەوسەر و كەرەشین هەركــە چــاوی بـــەغاردانی ولاخـــەكان كـــەوت، بـــەبێ دارتێوەژانـــدن و هەچەلێكردندا، لەگەڵ سوارەكان دەستی بەغار كرد. چ غاردانێك مەگەر هــەر خوا بزانێت. بڕوا بكەن لەبەر تەوژمی غارەكە نكەنكی لێوە دەهات.

قەرە بەقەرەی سوارەكان دەڕۆیشتن و هەنگاوێك دوانەدەكەوت.

من بلووغم نــەبووبوو، بــەس باخۆشـبووم ئێسـتاش نـازانم كـوو.. لەسـەر پشتی ڕووتی و بەبێ جلەو بەرنەدەبوومەوە.

***

## چەند نەخۆشییەك

**بازەرە = ((بازەڵە))**

بازەرە = ((بازەڵە)) گرێیەكی زێدەیە لـەنێوان ڕان و موسـولدانی منـداڵی تازە بوودا دەهات.

كاتی خۆی پڵاو ساواریان لێدەنا هەتا چاك ببێتەوە.

من بەدەیان جارم بیستووە: ((فلان منداڵ بازەرەیەتی)).

كەچی لە چۆنیەتی و چارەسـەر كردنەكـەی دڵنیـانیم. ئەمەشـم لـەدایكی منداڵان وەرگرتووە.

***

**چاو كوڵی**

چاو كوڵی = ((چاو ئێشە)): كەمێك لەم یەك دووانەی خـوارەوە دەزانم = ((نووسەر)).

١- **وەردێنە:**

نەخۆشییەكی چاوەو: ((ئەگەر لێم نەبێتە درۆ ئـەمڕۆ بـە ((تـەراخۆما)) ناو دەبرێت ـ نووسەر)). زیپكەیەكی ورد وردە و لـەژێر پێڵـووی چـاودێت و ئازار بەچاو دەگەیەنێت.

ئافرەت بەچارەكردنی هەڵدەستا. زیپكـەكانی بـەدەمی ((مێرووسـتان)) دەتەقانـد و چـاوەكەش پـێ باشـتر دەبـوو. كەچـی لـەوەرزی سـاردیدا

مێرووستان پەیدا نەدەبوو.. و تووشبووەکە بەهۆی ژانی چاوییەوە هەراسان دەبوو.. و بە گرمتە شەکری قەند زیپکەکانیان دەتەقاند.

ئەمەم یەکجار بەچاو دیوە و بەڵام لەیادم نەماوە چاوەکە چی بەسەر هات. کەچی ئەوی دیم چوار پێنج کەڕەت بینیوە ((نووسەر)).

٢- چاوپووشاوی:

((ئەم چاوکولییە ئەوکات و ئێستاش نازانم چی پێدەڵێن: نووسەر)).

چاوی نەخۆشەکە پێ سوورسوور هەڵدەگەڕاو شلیپاوی هەردەم پێدەهاتە خوارەوە و برژانگەکانی تاك و لۆك دەوەستان و ڕێچکەی شلیپاوەکە لەهەر دوولا دەبووە دوو هێڵی سووری ئەملاو ئەولای لووتی.

ئێمە بەو تەرزە منداڵە چاوپووشاوییەمان دەگوت: ((ڕیقلاو)).

ڕۆژێك دختۆرێکی ئەهلی لە گوندان دەگەڕاو ئەو نەخۆشییەی چاك دەکردەوە. بۆ.. وێنە:

- برا گەورەکەم = ((مەلا محەمەد ئەمین))ی ناو بوو ئەو نەخۆشییەی هەبوو. کەچی لەبەر.. ڕێز گرتنی باوکم منداڵانی ئاوایی ((ڕیقلاو))یان بەدوا هەڵنەبەستا.

من لە دیاربووم و نازانم تەمەنم چەند بووە بەڵام باشم بە بیردێت: ((دختۆرەکە جۆرکێکی خامی پڕ قوڕی لیچی پێبوو.. و ناو قوڕەکە چەند ((زێروو))ی، بەئەندازەی سەرە پەنجەی ئەسپێ کوژە دەبوون تێدابوون. نزیکەی هەشت نۆ زێرووی بەدەوروبەری چاوی کاکم وەناو سەری پێ شۆڕکردەوە و چارۆکێکی بەسەر داداو نزیکەی سێ چوارێکە سەعاتی خایاند و چارۆگەکەی وەلاناو سەری پێ بەرزکردەوە و زوێرووەکان لە قەڵەویان پەنمابوون و سێ هێندەی پێشوو گەورە بوو بوون.

دختۆرەکە هەریەکەیانی لێدەکردەوە و بە دوو پەنجە ڕایدەکوشی و خوێنەکە لە دەمی دەهاتە دەرەوە و زێرووەکە وەك جاران گچکە دەبووەوە و لەناو جۆرکەکەی دەنانەوە.

خوێنەکە ڕەش ڕەش بوو.

چاوی کاکم لەوساکەوە بەلاو قەلای نەماو بگرە هەتا مردیش چاوی کول نەبوو.

بەس لەیادم نەماوە دەسحەقەکە چەند بوو.

٣- چاو کولی دیکە:

زۆرجار وا دەبوو خەڵك تووشی چاوکولی دەبوون. دەرمانێکیان تێدەکرد ڕەنگــی ((ســوور))ی ئاچــوخ بــوو. ئــەملاو ئــەولای چــاوەکە، بــەهۆی دەرمانەکەوە لە دوورەوە سوور دەچووەوە. پێیاندەگوت ((دەرمان قرمز)) ئافرەت هەبوو لەبەر ئەوە قرمزی زۆر لەچاو دەکرد و هەردەم پێـوەی دیـار بوو ((قرمزی)) بە دوا دەکەوت:

((فاتە قرمز. عەیشە قرمز)).

***

**خرکانە:**

خرکانە جۆرە زیپکەیەکە لەسەر و دەم و چاوی منداڵ دێت:

لاموایە ئەگەر لێمنەبێتە درۆ: زانستی ئەمڕۆ پێیدەلێت: ((وان)).

ئێمە پێنج برا بووینە لێمان هاتووە. شوێنەکەی بە ئاستەم لـەلا ڕدێنـی من و برایەکم ئێستاش دیارە.

کەچی خوشکەکانمان لێیان نەهات.

لە کوڕەکانی منیش هات و لە کچەکانم نەهات.

ئەو جانازانم لەبەر چیبوو.

***

**دەغەڵ:**

دەغەر: ((دەغەڵ)) بەم مانایانە دێت:

١- گیای بێگانە لەنێو دەغڵ دا.

٢- کەسی فێڵباز و قوڵبڕ.

٣- جۆرە نەخۆشییەکی هەناوە.

مەرامی ئێمەش ئەمەیانە.

دەغەڵ بەمنداڵێك، یاخۆ گەورەیەك دەگوترا: لە هەناوەوە ساخ نەبێت و ڕەنگ زەرد و لاواز و ڕۆژ بەڕۆژ ببنەسا بووایە.

((لاموابوو ئەگەر لێمنەبێتە درۆ بەو منداڵە دەگوترا: کەوا کرمی هەبووایە. _ نووسەر)).

لە ئاخر و ئۆخری پەنجەکانی سەدەی رابردوودا ڕۆژێك هاوڕێیەکم: ((لە ژیاندا نەماوە و ناتوانم ناوی بێنم)) پێی گوتم: ((هەر شتێکی بخۆم دڵم دەخێورێتەوە. تەنیا بە ماست نەبێت. دەڵێن: کرمت هەیە)).

دەستیشیان زۆر کورت بوو. منیش زۆر پێ دڵگیربووم و هەرگیز لەیادم نەدەچوو. ڕۆژێك ڕێم کەوتە شارو هەندە حەبی کرمم لۆکڕی.

ئێوارە قلێکی خوارد و بەیانی و نیوەڕۆژ هەروا. دوای نوێژی عەسر هاتە لام و گوتی:

((دڵم تێکدەچێت و دنیام لەبەرچاو زەرد هەڵگەڕاوە)).

منیش گوتم:

((شاللا کرمەکان لە حەلاو.. وەلای مردندانە)).

ئێوارەش قلێکی خوارد و بەیانی دووەم ڕۆژیش قلێك و گوتی:

((لە شەوێوە بەرچاوم زەرد هەڵناگەڕێت و دڵیشم هەڵناچێت)).

چشتان هاتەلام و گوتی:

- وەرە وەرە:

دیتم ((١١)) یازدە کرمی باریك و زەرد و درێژی هەریەکەیان نزیکەی ((٣٠)) سی سەنتیمەتر دەبوو فڕیدابوو.

لەو ڕۆژەوە. وەك گوێز ساخ بووەوە.

***

**دەغەڵ لۆ.. ولاخیش دەگوترا:**

کابرایەکی جیرانمان لە گوندی ((چەغەمیرە)) بارگینێکی هەبوو دەیانگوت: ((دەغەرە)) و ڕۆژ بە ڕۆژ لاواز و باریکانی دەڕست و.. ورگی گەورە دەبوو.

خاوەنەکەی ڕۆژێ بە ئەنقەست دۆی زۆر دەدایە، هەتا پێ چاك بێتەوە.
لە دواییدا تۆپی و لەبەر چاوی من ((ورگی دڕی پڕی کرمی درێژی لە بستێك پتر. نووسەر)).

***

**دەوکوڵی:**

دەم کوڵی: نێودەم و ژێر و ئەملا و ئەولای زمان پفکەیان لێدێت، یان شەقار شەقار دەبن.

ئەم دەرمانەیان بەکار دەهێنا پێ چاك دەبووەوە. (بەخۆم چەندجار پێ چاك بوویمەوە — نووسەر).

دەرمانی دەوکوڵی:

ئەمانە:

١- گوڵە هەنار.

٢- گروان.

٣- سیچکە.

٤- مازی.

٥- شەب.

دوای ورد کردن و هاڕینیان تێکەڵ یەکتر دەکران. ئەوەی دەوی کول بووایە ڕۆژێ سێ جار تۆزێکی لە دەوی خۆی بکرد بووایە پێ چاك دەبووەوە.

وام بیستووە لە هەندێ ناوچە لە (٤١) چل و یەك بابەت درووست دەکرا، بەڵام لە بیرم نەماوە چ و چ بوون. بەس لەماڵی ئێمە دایکم یەکەم کەسی ئاوایی بووە ئەو دەمانەی لەو پێنج شتەی سەرەوەی درووست دەکرد.

***

**دوو پشك پێوەدان:**

یەکێك دووپشك پێوەی بدابووایە تیژایی هێلکەیەکیان دەشکاند و لەسەر برینەکەیان دادەنا. پاش دوو سێ دەقیقە ناو هێلکەکە ڕەش دادەگەڕا. گوایا

ژارەکەی کێشاوە.

(من ئەوەم بەچاو نەدیوە، بەڵام هەتا شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا هەر باو بوو — نووسەر).

***

**ڕەشی کەڵەك:**

ڕەشی کەڵەك گیایەکە لەچیای قەرەچوغ هەیە. بۆ دەرمان بەکار دەهات.

من بەچاو نەمدیوە، بەڵام فەقێ بووم لە گوندی (لاوەر)ی بناری باکووری ڕۆژئاوای کێوی تایەن، دۆستی دڵسۆزم خوالێخۆشبوو (مەلا عەلی)ی خەڵکی گوندەکە، ئاوزەی من بوو. هێندە زیپکەی لە چەنەکەی هات.

دایکی: (ئێستاش لە ژیاندا ماوە) ئەو گیایەی کوتا و لەگەڵ (خەنە)ی تێکەڵ کرد و وەك هەویری لێکرد و هەندێکی لە زیپکەکان هەڵسوی. نیو سەعاتی نەبرد مەلا عەلی فەقیرە لە حەزمەت ژان بە لەشتیێ کەوت و غارەوغارە. هەتا دوو سەعات ئەوجا ژانەکەی هێور بووەوە.

بۆ بەیانی دەرمانەکە جێگەی زیپکەکانی سووتاندبوو.. و واتە.. وەك بە ئاگر سووتابێت ڕەشهەڵگەڕا بوو. بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك زیپکەکان نەمان پاشدان بەبنیانداوە.

***

**زەرتك:**

ئەگەر کەسێك تووشی نەخۆشی (زەرتك) بووایە (مێروو)ێکی زەردی تایبەت، لەگەڵ دوو پەلە قامیشی درێژی بە ئەندازەی (ئاخزە)ی جگەرە لەمل دەکرا. گوایا پێ چاك دەبووەوە.

مێرووەکە بە دەگمەن هەبوو. لای هێندێك لە پیرێژنە دیندارەکان دەست دەکەوت.

وادەبوو گوندی نەخۆشەکە مێرووەکەی نەبووە، بەس دەزاندرا لای چ ئافرەتێکی گوندەکانی دەوروبەر هەیە و دەچوون دەیانهێنا.

***

**سەروبن**

نەخۆشییەکی منداڵانە، هەردەم ئیسهال دەبوو.. و دەبەری دەخست و بێشنگ دەبوو. دەیانگوت: سەر و بنیتی.. واتە نەخۆشییەکە لە سەر و بنی مانگان پەیدا دەبوو.

خەنە و گژنیژیان لە شیلکی سەری دەنا.

***

**شەوتا:**

هێندە نەخۆشی لە زەمانی زوو هەبوو شەوان نەخۆشەکە (تا)ی دەهاتێ و بەڕۆژیش بەریدەدا.

یەك دوو خزم و کەسی نەخۆشەکە شەو لەنێو ئاوایی دەگەڕان و دەچوونە نزیك ئەو ماڵەی پیاوەکە دوو ژنی هەبوو و بە دەنگی حێلەوە دەیانگوت:

- شەوتا، شەوتا، شەوتا.

بەشەو دەگری تا

بەڕۆژ بەردەدا.

ماخۆی چوار چاو چدەرمان دەدا.

(ماخۆی چوار چاو = خاوەن دوو ژن).

پاش چەند جار بانگ ڕاهێشتن خاوەن دوو ژنەکە، دەهاتە جەواب. ئەگەر ماڵی نەخۆشەکە دەوڵەمەند بووایە دەیگوت

- (گۆشت کاوڕ، یان گۆشت بەرخ).

ئەگەر نا دەیگوت:

- (گۆشت فروج)

دەبووایە بشکوژرابووایەوە.

گوایا تایەکە بە خواردنی گۆشتەکە چاك دەبووەوە.

***

ئەم تەرزەش هاتووە (خودانی چوار چاو)، یان خاوەن چوار چاو

***

**فرچك كەوتن:**

ئەمە نەخۆشییەكی منداڵانە و گوایا لەترسانا تووشی منداڵ دەبێت.

منداڵەكە ڕۆژ بەرۆژ زەرد و لاواز و دەبنێسا، ئافرەت هەبوو بە چارەكردنی هەڵدەستا.

هەردوو دەستی لەملاو لەولای موسولدانی دەناو دایدەگرتن. ئەوجا پشتی بەرز دەكردەوە و بەسەر و لاق لە نشێو و پاشدان دەیخستە سەر سەری خۆی و دەیسووڕاند گوایا پێ چاك دەبێتەوە.

***

**قوڕباقە:**

قوڕباقە بەم مانایانە هاتووە:

١- بۆق:

٢- جۆرە نەخۆشییەكی منداڵانە و گەروو و بناگوێی ئەستوور دەبن.
به عەرەبی پێیدەگوترێت (خناقە).

٣- لە مریشكدا ئەملا و ئەولای گەرووی ئەستوورێكی وادەبوو و بە (قیقە قیقێكی) نائاساییەوە هەڵدەپەڕیوو، بەماوەی دوو سێ دەقیقە قوڕگی دەگیرا و دەیكوشت.

ئێمە ئەوسا دەمانگوت: (قوڕباقەیەتی).

(جا نازانم بۆچوونەكە ڕاست بوو و یان نا - نووسەر).

٤- لە یەكسمدا، بەتایبەتی گوێدرێژ دەگوترا: (گوێڕەپە).

***

**كۆخەڕەشە:**

منداڵێك تووشی (كۆخە ڕەشە) ببووایە (گووخلێنكە)یەكی مردوو، تەرزی (مێزوو) لە نێوان دوو پەلەقامیشی گچكە، بە دەزوویان دەكرد و لەملی نەخۆشەكەیان هەڵدەواسی. گوایا كۆخە ڕەشەكەی پێ چاك دەبێتەوە.

***

**لێهاتن:**

نەخۆشی لێهاتن واتە (سندان لێهاتن). بەس لەبەر نا هەمواری وشەی (سندان) لەسەر زاری میللەتەوە فڕێ درابوو.

پێشتر ئەگەر یەکێك زگی بە حوجەت بهێشابووایە، مەنجەڵە زنجیرداریان ئاو تێدەکرد و لەسەر زگی نەخۆشەکەیان دادەنا. پاشدان (سندم)ی وڵاخیان لەنێو ئاگر جۆش دەدا و دەیانخستە ناو ئاوی مەنجەڵەکە و جزەی لێوەدەهات.

گوایا گەرمایی سندمەکە چاکی دەکاتەوە. ئەوسا لە مەنجەڵ زیاتر دەفری تر نەبوو ئەو کارەی پێ ئەنجام بدرێت. (دڵنیا نیم و نازانم سندم تایبەت بوو بە نەخۆشییەکە، یان هەر ئاسنێکی دیکە بووایە دەبوو. ئەگەر لێم نەبێتە درۆ ئەوسا ئاسنی بقەپابووایە باریەك لە سندم زیاتر نەبوو). نووسەر.

من بەچاو دیومە ژانەکە بەم کارە هێور بووەتەوە. ڕەنگە هۆی ژانەکە سەرما و گوچیلك و شتی تر بووبێت. ئەمەشم دیوە ژانەکە کوشتوویەتی و گوتیان : (لێهات = ڕیخۆڵە کوێرە — نووسەر).

**مار پێوەدان:**

من لە گوندی (لاوەر)ی بنار چیای (قەرەچوغ) فەقێ بووم. خوالێخۆشبوو: (ئەحمەد حاجی مەولوود)ی باوکی دۆستی ئازیزم (مەلا هادی)، لە قەدی چیای گۆڕێن شوێنێك ئاوی دەبێت و دەچێت ئاوبخواتەوە دەبینێت ئاوەکە پڕی پووش و چیقەنەیە و دەیەوێت بۆ ڕێبوارێکی دی پاکی بکاتەوە و دەستی درێژ دەکات و ناگاتە ئاوە بە پووش و جیقنە داپۆشراوەکە، مارێك بە پەنجە وەدەدات.

بە تفەنگ مارەکەی دەکوژێت و بە خەنجەر گۆشتی ئەملا و ئەولای پەنجەکەی، تاکو ژەهری مارەکە نەچێتە لەشیەوە دەتراشێت. لەدواییدا بەخۆی گێڕایەوە: (تومەز ئەو جێیەی تەڕاتی پێوەنووسابوو بڕیبوو. ئەویش شوێن لێوی مارەکە بوو، نەك شوێنی ددانی.

واتە تراشینی گۆشتی پەنجەکەی بێ سوور بوو.

**مارمژ:**

مارمـژ ئـەو کەسـە بـوو چـارەی پێـوەدانی مـاری دەکـرد. (مـام عـەولا)ی (مارمژ) یەختیارێکی ئاوایی بوو جێی ددانی مارەکەی بە چەقۆ، پەلە دەولکی شەق کرد و بە کەڵە شاخ بۆ ئەوەی هەندێك لـە ژارەکـە، لەگـەڵ خـوێن بێتـە دەرەوە خوێنەکەی دەمژت.

خوێنەکە بە زەبری مژینەوە دەهاتە نێو کەڵە شـاخەکەوە و پـێش ئـەوەی بگاتە دەمی وازی دەهێنـا و ڕووی دەکـرد. هەنـدەجار خوێنـە هەڵمژراوەکـە، دەگەیشتە دەمی و دەلحازی دەیتفاندەوە و ئاوی بە غەڵغەڵە، لە دەمی خۆی وەردەدا.

بۆ بەیانی دەموچاوی مام عەولای مارمژ ئەستوور بوو: و گوتی:

- قەت تووشی ژاری ئەوها پیس و بەحوجەت نەبوومە.

لەدواییدا خوالێخۆشبوو (مـام ئەحمـەد) چـاك بـووەوە، بـەڵام پەنجەکـەی سەقەت بوو.

***

کەڵەشاخ: شاخێکی بچووکی ڕەشـان بـوو. سـەرە باریکەکـەی بـە ئاسـتەم کون کرابوو.. و دەخرایە سەر برینەکە و بە قوم لەکونە گەورەکەیەوە خوێنی پێ هەڵدەمژرا.

***

**هەتاو بردن:**

تاو بردن = (ڕۆژ بردن). یـەکێك لـە وەرزی گـەرمادا تـای بهاتبووایـە و شـا دەمارەکـانی جەسـتەی بهێشـابووانایە. دەیـانگوت: (تـاو بردوویـەتی). واتـە گـەرمای ڕۆژ کـاری لێکـردووە، ئەوسـا ماسـتیان لـە سـەرتاپای لەشـی نەخۆشەکەیان هەڵدەسوی و دەیانشێلا. بەمە ژانەکە هێور دەبووەوە.

***

**واریقاتی ژیان:**

ئەو واریقاتانەی خوارەوە زۆربەی هەرە زۆریان فۆلکلۆرن. تاك و تەرایان نەبن. ئەوانیش بە بۆچوونی خۆم خزاونەتە نێو قەپێلکی فۆلکلۆرییەوە.

لۆ بکێش کردنی زەوقی جەنابتان هەندێکیانم بەشێوەی چیرۆك دارشتووە و لە هەندێکیشیان خۆم تێیدا پاڵەوانم.

چەند واریقاتی کۆنم بەدەست کەوتن و ناچاریان کردم سەر بە کتێبە پیرۆز و نایابەکەی مامۆستای ئازیزم پایەبەرز و رێزدار: (عەلائەدین سەجادی) دابگرم. ئەوانەی لەو دابوون هەر ئەوسا جیڕ بە جیڕم کردن. کەچی لە تاك تاکەیان دڵم ئاو ناخواتەوە و زۆریش لە کتێبی گۆرین گەڕام نەکەوتنە بەرچاوم. بۆیە گریمان لە ڕشتەی مروایی ئازیز دابوون داوا لە گیانی پاکی مامۆستای تایەن دەکەم بەدزم لەقەڵەم نەدات.

**تێبینی:**

قسەی دزێو و قۆڕی وایتێدایە من لەکاتی نووسیندا شەرمم دەکرد، بەڵام کەلەپووری میللەتەکەمە و ڕزگارکردنیان واجبە. بێ پەردە بەگۆڕێم وەرکردینە. نووسەر

***

**ئاو هاتنەوە:**

لەسەرتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا کوڕێکی گوندی (لاوەر)ی نکار چیای قەرەچوغ: تۆزێك گێل دەبێت، ناوی عەسکەری دێت. لە قەزای (مەخموور) بۆ ئەوەی (فەحس) بکرێت: ئایا بە کەلك سەربازی (بەزۆر دێت)، یان نایەت بانگ دەکرێت.

ئەوکات دختۆر دەستی لە عەورەتی ئەوکەسانە وەردەدا، کە دەکرانە عەسکەر. هەرکە دختۆری مەخموور دەست بە عەورەتی ناوبراو دادهێنێت لەبەر لووسی پەنجەکانی کوڕە.. ڕەحەت دەبێت و ناولەپی دختۆرەکە پڕ

دەکات. ئەویش بەبێز کردنەوە (ئێح) بە ئاوەوە زرچەی لە بنا گوێی کوڕە دەهێنێت.

***

**ئەتوو لە داواکەم نەگەیشتی:**

کابرایەك بە کێوێکی بەرز هەڵگەڕا و پێش ئەوەی بگاتە لوتکە هیلاك دەبێت و توانای ڕۆیینی نامێنێت و دادەنیشێت. ڕووی لە ئاسمان دەکات و دەڵێت:

- خوایە کەسێکم بۆ بنێرە بەسەرم بخات.
- کاتێك دیتی دوو پیاوی گەنج و حەیزەران لەمست گەیشتنە لای و گوتیان:
- ئەوە بۆ دانیشتوویت؟.
- هێزم لەبەر براوە و ناتوانم چیتر بڕۆم.
- بێ چەند و چوون قیتیان کردەوە و یەکێکیان سواری سەرپشتی بوو... و ئەویتریش بە حەیزەران لە پاشەڵی دەدا و هەتا سەرکەوتن. کابرا ئەوسا ڕووی لە ئاسمان کردەوە و گوتی:
- ئەتوو لە داوایەکەی من نەگەیشتی خودایە.

***

**ئەدی ئەمن گەواد باشی خۆتان نیمە:**

سێ ژن سواری تەکسییەك دەبن و لە شوفێرکە دەپرسن:

- ناوت چییە؟.
- مام سابیر.
- خێزانەکەت ناوی چییە؟.
- خەجێ.
- منداڵت هەیە؟.
- بەڵێ، کوڕ و کچێکم هەیە.
- کوڕەکەت ناوی چییە؟.

- ئاسۆ.
- کچەکەت؟.
- ئاسیا.
- کوڕەکەت ژنی هێناوە؟.
- بەڵێ دوو منداڵی هەیە.
- ئەی کیژەکەت؟.
- منداڵێکی هەیە.

زۆر نابات ئاساییش دەیانگرن و ڕوو لە مام سابیر دەکەن و:

- ئەتوو ئەو قەحپانە لۆ کێندەر دەبردن؟.

بەواق وڕماوییەوە دەڵێت:

- قاحپەچی.. نەفەربوون هەڵم گرتبوون.
- ڕاست ناکەیت.
- دەتوانن تەحقیق بکەن.

یەك لە ژنەکان بانگ دەکەن و پێی دەڵێن:

- ئەو پیاوەی دەناسیت؟.

یەکسەر دەڵێت:

- بەڵێ ئەوە مام سابیری گەوادباشی خۆمانە.

مام سابیر هار و هاچ دەبێت و بە هەڵچوونەوە دەڵێت:

- کچێ هەی بێناموس ئەمن کەینێ ئەنگۆم ناسییە!.

ژنەکە بەشێوەیەکی ئاساییەوە دەڵێت:

- لۆ تووڕە دەبیت: ناوت مام سابیرە و ژنەکەت ناوی خەجێیە و ئاسۆی کوڕت دوو منداڵی هەیە و ئاسیای کچیشت منداڵێکی هەیە.

مام سابیر هیچ بەڵگەی پاکانەی نامێنێت و سەری بەخۆدا شۆڕ دەکاتەوە.

ژنی دووەمیش بە هەمان تەرز.

ئاسایش ڕووی تێدەکەن و دەڵێن:

- ئەگەر سێیەمیش ئاوا شایەتی بدات ڕەوانەی مەحکەمەت دەکەین.

لە ژنی سێیەم دەپرسن:

- ئەو پیاوە دەناسیت؟.

یەکسەر، بێ سێ و دوو دەڵێت:

- بەڵێ: ئەوە ئەو مام سابیرەیە فەرەنسۆی کوشت.

ئەملا لەولا خراتر. مام سابیر سەت خۆزگەی بە تۆمەتەکەی بەرایی دەخواست، بەو پەڕی قار و غەزەیەوە بەژنەکەی دەڵێت:

- کچێ هەی بێناموس ئەدی ئەمن مام سابیری گەوادباشی خۆتان نیمە !.

***

**ئەستەغفیروڵلا:**

سەلیم ناوێک حەزی زۆر لە شیعر و ئەدەبیات دەبێت و گەلێک ڕێزی شاعیرانی دەگرت و خزمەتی دەکردن.

برادەرێکی شاعیری میللی دەبێت، لەدوای هەر شیعرێك (ئەستەغفیروڵلا) یەك دەڵێت.

ڕۆژێك سەلیم دەعوتی دەکات. ئێوارە شیوی (دۆینە)ی لۆ لێدەنێت.

شاعیرەکە دەستی زۆر کورت دەبێت و دەیویست سەلیم یارمەتییەکی بدات. کەچی نە یارمەتی دا و نە شیوەکەشی شیوی دەعوەت کردن بوو. بەڵام چاو و ڕووی نەبوو لەو ڕووەوە زار کەم و زۆر هەڵێنێت. سەلیم لە نیوەشەودا پێیدەڵێت:

- دەبێ شیعرێکمان بۆ بڵێیت.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

- دۆینەلێنا بە قوڕ و لیم
هیچم نییە تا پێ بژیم
لەبابی بابت بەم سەلیم
ئەستەغفیرڵلاهیل عەزیم.

**ئەگەر ئەوێ نەبینم:**

کابرایەك بەلای کۆڵکەرانی دەشت دادەڕوات و بە ئەنقەست خۆی کوێر دەکات.

ژنە کۆلکەرەکان هەرکە دەیبینن وا بە کوتە کوتی کۆپاڵەوە دەڕوات، یەکێکیان بۆ تەجروبە، بەڕووتی دەچێتە پێشی و دەستی خۆی دەخاتە سەر نێو چەوانی و دەڵێت:

- ئێرە نابینیت؟.

دەڵێت:

- نەخێر.

دەستی داوێتە سەر مەمکی و:

- ئەی ئێرە؟.
- نایبینم.

دەست لەسەر ناوکی دادەنێت و دەڵێت:

- ئەی ئێرە؟.
- نایبینم.

لە دوا جاردا دەست داوێتە سەر عەورەتی و دەڵێت:

- ئەدی ئێرە؟.

کابرا دەڵێت:

- ئەگەر ئێرە نەبینم مانای وایە کۆرەی دنیا و قیامەتم.

***

**ئەگەر ئێرەت، یان ئێرەت بەکار بوو:**

ئافرەتێك هەبوو: هەموو جارێ لەنێو کۆمەڵە ژنێکدا، بەناولەپ شەپەی لەنێو چەوان و ناوگەلانی خۆی دەهێنا و دەیگوت:

- ئەگەر ئێرەت، یان ئێرەت بەکار بوو مەترسە و.. برۆ ڕێی شێری.

من کاتی منداڵی نەمدەزانی بۆ وا دەڵێت. کەچی هەنووکە بە هەر دە پەنجان بۆی مۆر دەکەم.

بەندە لە ژیاندا شتاق لام بەکار نەبوو. بۆ متمانەی دڵی دوو دڵان لەم ڕووانگەوە فەرموون سەیری ئەمانە بکەن:

یەکەم: دایکم لاواز و سوور و سپی و زۆر جوان بووە، باوکیشم ڕەش و قەڵەو. من لاوازییەکەی دایکم و ڕەشییەکەی باوکم بەرکەوتووە.

دووەم: چاوم لە ژیاندا بە برا گچکەیی هەڵێناوە: (ئۆ.. ھ یاخوا کافر بەحاڵی برا گچکان نەبێت).

ژن ناحەقیان نەبووە ئەو زەمان دەیانگوت: (ژنی بن ژنان بە، بەس ژنی برا گچکان مەبە).

برا گەورەکەم دەتگوت: (کێخوای تەلەمەتار و دینگاوەیە) بیست و چوار سەعات لە ماڵێ پاڵی دابووەوە. منیش سوکەڵەی ماڵ بووم. لە هەموو کار و ئیشێك ناخۆشتر سواری دۆڵاب بوو. ڕۆژی دوو کەڕەت واجب بوو، سواری دۆڵاب. هەر جارێك بەلای کەمییەوە سەعات و نیوێکی دەبرد. بە گەرما باش بوو بە فێنکی بەیانی و ئێواران بوو. کەچی لە وەرزی ساردیدا بە تاقە کراسێك، بە سەری کۆت و پێخواسی و بەبێ دەرپێ وەك نێرکە کاردی دەلەرزیم. کورتانیش پشتەکەی جەواڵ، یان بەڕە بوو، هەر جاری بەری ڕانەکانم، لەبەر دڕی کورتانەکە دادەماڵدران و دەزوورانەوە.

کەرەشین ئەوەندەی دۆڵاب پێکرابوو جاقی و مەعلان دەرچووبوو. هەرکە پێی دەگوترا: (هەچە) دەڕۆیشت، کە دەگەیشتە سەری (کەرەکیش) دەگوترا: (یاڵڵا) دەگەڕاوە. هەتا دەهاتەوە تەنگەی بە (کەروکە)ی بیرەکەی دەدا. چ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەوەی نەبوو منداڵێکی سواری پشتی بووایە. تەنیا ڕەنگە بەهۆی زەختەی منداڵەکەوە تۆزێك خۆشتر بڕۆیشتبووایە.

منیش بەقەدەر کەرەشین ئەزیەتم دەکێشا.

ئەوەندەیان بە سوارکەر و ئیش و کاروباری ماڵەوەیان ڕەتاندیمەوە هەتا جەستەم لە گشت خوشك و براکانم پووزە تر دەرچووە. تا ئەمڕۆی حازری لە حەفتا و چوار ساڵیم ڕەتداوە کێشم هیچ کات خۆی لە قەرەی (٥٠) پەنجا

کیلۆ نەداوە. مەگەر لە وەرزی ساردیدا شمەك زۆر لەبەر بکەم و پاش جەمە خواردنێکی باشیش.
لە قوتابخانەی (١١ی ئازار)دا من و مامۆستا زرار مامۆستا بووین. ئەو وانەی (زانست)ی دەگوتەوە. ڕۆژێك گوتی: (پێویستیمان بەهۆی ڕوونکردنەوەی پەیکەری (عەزمی) هەیە).
منیش گوتم: (هەرکە دەرسەکەت گوتەوە من دێم خۆم ڕووت دەکەمەوە و تۆش ئاماژە بۆ یەکە یەکەی ئێسکەکانی لەشم بکە).
بە پێکەنینەوە فەرمووی (ئەوەی دەڵێیت: پەیکەرێکی ڕاستەقینەیە و سەت قات لە پەیکەری وێنە باشترە).
***

**ئەگەر دەمدەیتێ:**

ئافرەتێك منداڵێکی بەر مەمکانی پێیە و لەنێو (ئامانە)دا، لەتەك پیاوێك سوار بوو.
منداڵەکە دەگریا و دایکەکە بۆ ئەوەی کڕ ببێتەوە مەمکی بۆ ڕادەگرێت، کەچی منداڵەکە وازی لە گریان نەدەهێنا. دایکەکە پێی دەڵێت:
- ئەگەر مەمکەکە نەگریت دەیدەمە مامەی.
- دوو سێ جار دووپاتی دەکاتەوە.
پیاوەکە دەڵێت:
- قەتعەی هاتنە خوارەوەم زۆر نەماوە ئەگەر دەمدەیتێ.
***

**ئەگەر لەگەڵ دایکت بووایت:**

کابرایەك لەگەڵ کوڕێکی گچکەی خۆی دەچێتە (گەرماو). منداڵەکە لەسەر کاشی لووسی گەرماوەکە خلیسك دەبات و خۆی بە گونی باوکی دەگرتەوە.
باوکە ئەوسا دەڵێت:
ئەگەر لەگەڵ دایکت بووایت پشتە سەرت بە عەردی دەکەوت.
***

**ئەگەر لۆ تامیبێت:**

پیاوێك چووە لای شفتی فرۆشێك شفتی بکڕێت. هێندێك لە شووتیەکان کونێکی ڕەشیان تێدابوو. کڕیار پەنجەی لەکونی (شامی) یەك ناو بۆ دەمی خۆی برد تامی بکات.

شفتی فرۆش پێی هەڵدەچێت و بۆ ئەوەی پێی بسەلمێنێت کارێکی درێوە و گوتی:

- توخوا ئەگەر من ئەوها لەتۆ بکەم تووڕە نابیت ! ؟.

ئەویش بەشێوەیەکی ئاساییەوە دەڵێت:

- ئەگەر بۆ تامیَ بێت ناو.

***

**ئەگەر نەمدەیتەوە:**

لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا خۆشناوێك تووتن بۆ فرۆشتن دەباتە دیوەخانی گوندێکی عەرەب لەناوچەی قەراجدا.

عەرەبێك دوو دیناری قەرزدار دەبێت و خۆشناو داوای لێدەکات. عەرەبیش دەڵێت:

- نیتم و جارێکی تر وەرەوە بۆت پەیدا دەکەم.

- ڕێم زۆر دوورە و ناتوانم بێمەوە.

لێیان دەبێتە مشتومڕ و عەندەك دۆنەك. خۆشناو تووڕە دەبێت خەنجەر هەڵدەکێشێت و دەڵێت:

- نەمدەیتەوە دایکەکەت ئەوها و ئەوها لێدەکەم.

ئەوکات ئەخلاق و ڕەوشتی مرۆڤایەتی لەو پەڕی بەرزیدا بوون و عەرەبەکان بە ماچکردنی ئەملا و ئەولای خۆشناوی هێور دەکەنەوە و بەهەموو لایەکیانەوە پارەکەی بۆ جێبەجێ دەکەن.

***

**ئەمنت هەند....**

پیاوێکی پووخەڵە و بێهێز لە ڕووی (جنسیەوە) نەیدەتوانی کامی دڵی خێزانەکەی تەواو دامرکێنێتەوە. کەچی هەر زاری دەکردەوە پێی دەگوت:

- دایکت بگێم.

ئافرەتەکەش جارێك بە ڕوویدا زیت دەبێتەوە دەڵێت:

- ئەمنت هەند گایە ئەوجا نۆرەی دایکمە.

***

**ئەمن کەی لەخوا دەترسێم:**

کابرایەکی قەساب چەقۆ لەبەر پشت ئێوارەیەك دەچێتە مزگەوت مەلا و چەند پیاوی بە دین خەریکی عیبادەتی خودا دەبن و دەڵێت:

ـ کێ لەخوا دەترسێت با لەگەڵم بێت.

یەك لە پیاوەکان لەگەڵی دەچێت. ئاژەڵێکی بۆ خێر سەردەبڕێت و پیاوە بەدینەکەش یارمەتی دەدات.

ئەوجارە دەچێتەوە مزگەوت، یەك دووانێك پەیدا بکات گۆشتەکەی بەسەر ماڵان دابەش بکەن. لەش و چەقۆکەشی بەخوێنن و دەڵێت:

ـ کێ لەخوا دەترسێت؟.

وادەزانن، ئەوەی پێشووی کووشتووە و لێکڕا دەڵێن:

ـ ئەمڕۆ.. ئەوەی لەخوا بترسێت تەنیا مەلامانە.

مەلاش بەو پەڕی هەڵچوونەوە دەڵێت:

ـ هەی درۆزنینە من کەی ترساوم.

***

**ئەمن لە پێشەوەم دایە:**

دوو ئافرەت یەکیان لە پێشەوەی (ئامانە) سوار دەبێت و ئەویتر لە دواوە. ئەوەی بەرایی پارە دەدات و بە دەنگی بەرزەوە دەڵێت:

- کچێ عەیشێ ئەمن لە پێشەوەم دایە ئەتوو لە پاشەوە نەدیت.

***

**أنا موافيج:**

پیاوێکی ناوداری دەشتی هەولێر، لە زەمانی (نووری سەعید)دا (نائیب) دەبێت. ڕۆژێك كۆبوونەوەیەك دەكرێت ئەو خەوی لێدەكەوێت، قاعەكە چۆل دەبێت. فەراش دەست بەماڵینی قاعەكە دەكات. نائیب بەهۆی خشەخشی گێسكەكەوە بە ئاگا دێتەوە و یەكسەر لەگەڵ قیت بوونەوەیدا دەڵێت:

- أنا موافیج.

***

**ئەو بوختانە گەورەیە:**

دەروێش كەریم بە دەروێش (هەمین) فێر بوو.. و ناوە ناوە لەجێی ژوواندا بەكامی خۆیان دەگەیشتن.

دەروێش كەریم جارێك لەكاتی هێنان و بردنی دەڵێت: نازانم ئەو عالەمە كوو ئەو بوختانە گەورەیان هەڵبەستاوە و دەڵێن: (دەروێش كەریم بە دەروێش هەمین فێر بووە !).

ئەویش لێیوەردەگرێتەوە دەڵێت:

(ئاخری زەمانە هەرچی بڵێیت ڕوو دەدات و دەوی خەڵكیش كونە دیوار نییە تۆپە قوڕێكی پێدا بدەیت).

***

**ئەوەی پێکی دەهێنایەوە مردووە:**

ژن و مێردێك بەشەڕهاتن و هەر پێك نەدەهاتنەوە.

كوڕەكەیان ڕووی لە باوكی كرد و گوتی:

- بابە ئەنگۆ كە پێشتر بەشەڕ دەهاتن زوو پێك دەهاتنەوە كەچی ئەوا ماوەیەكە لە یەكتر تووڕەنە و پێكنایێنەوە.

بابەكە بە ئاخ هەڵكێشانەوە دەڵێت:

- ڕۆڵە ئەوەی پێكی دەهێنایەوە مردووە.

***

**ئەوە حەمەدی برامە:**

کابرایەکی فەقیر و گێلۆکە ژنی بۆ دەهێنن. هەر چەند هەوڵ دەدات چی بۆ ناکرێت. ناچار دەچێت بە براکەی دەڵێت و ئەویش لە جیاتی دەچێتە گژ بووک و زۆر نابات ژنە هاواری لێهەڵدەستێت.

مێردەکەی لەو دیو دیوارەوە دەڵێت:

- ئەوە ئەمن نیمە حەمەدی برامە حەمەدی برام، وەڵڵا هەتا ورگت نەدڕێنێت یەخەت بەرنادات.

***

**ئەوەی خوا بە ئێمەی کردووە:**

لە ئاخر و ئۆخری خەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا شەوێك کەندە گەورەکەی ناوەڕاستی ئاوایی (چەغەمیرە)ی ناوچەی کەندێناوە یەکجار زۆر دێت و خانوویێکی زۆر دەڕووخێنێت. هەتا مزگەوتەکەشی لە بن و بۆتکەوە هەڵتەکاند و زەرەر و زیانێکی زۆر بە خەڵکەکە گەیاند. هەر لەم ساڵەدا بەرپرس و نووسەری سەرژمێر = (ئیحسان) دەچنە گوندەکە و میوانی ماڵی مەلا دەبن.

هەرکە لێی دەپرسن:

- زەرەرتان بە لافاوەکە زۆر بووە؟.

مەلا یەکسەر دەڵێت:

- ئەوەی خوا بە ئێمەی کردووە، حەرەس قەومیش نەیکردووە.

***

**ئەوی دانوو زۆر بخوات:**

لە گوندێك لە گوندەکانی دەشتی هەولێر چەند ماڵێك ساواریان دەکوڵاند. یەکێك هێندە دانووی خستە نێو دەمی و گوتی:

- دەڵێن: ئەوەی دانوو زۆر بخوات کێری پێ ئەستوور دەبێت.

کابرایەک لەگەڵ خێزانەکەی لەدیار وەستابوون و ژنەکە هەرکە دڵنیابوو پیاوەکەی دەست بۆ خواردنی دانوو نابات بە تووڕەییەوە پێی دەڵێت:

- هەی دوژمنی قەلبی خۆ، دە دو قلان باوێ دەمی خۆ.

***

**ئەوەی قوندەرە:**

سوڵتانێکی عوسمانلی، لەسەر بانێکی بەرزی کەنار دەریاوە بە دووربین، یەکێك لەنێو پاپۆڕێك دەبینێت (هێدی، هێدی وا هەوڵ دەدات سەری عەورەتی خۆی بخاتە دووبرەیەوە). یەکسەر فەرمان دەدات و: (هەر ئێستا ئەو پیاوەم بۆ بێنن).

هەرکە دەچتە لای و پێی دەڵێت:

- ئەوە لۆ ئەو ئیشە قۆڕەت دەکرد!؟.

ئەویش دەڵێت:

- قوربان هەرچی قوندەرە ئەتوو وەزیفەیەکی گەورەت داوەتێ. منیش هەوڵمدا بچمە ڕێزی قوندەرانەوە تاکو وەزیفەیەکم بدەیتێ.

سولتان دەلحازر دەڵێت:

- ئەوا تۆم کردە پاسەوانی تایبەتی خۆم.

کابرا یەکسەر دەست بە گریان دەکات.

- ئەوە لۆ دەگرییێت؟.
- قوربان پەلەت کرد و نەتهێشت سەرەکەی بگەینێ ئەوسا بێگومان دەبوومە سەرۆکی پاسەوانەکانت.

***

**ئەو کەتنەی بەو کراوە:**

ئافرەتێك لە پەڕینەوەی ڕووبارێکدا، کەس دیار نابێت و ئاوڵکراسەکەی لەپێ دەکاتەوە.

کابرایەکی قەشمەرباز، لەپەناوە دەیبینێت و پێی دەڵێت:

- ئەریێ خوشکێ چشتەکەت بۆ وا شێواوە؟.

ئەویش خۆی هەرگیز لە گورە نابات و دەڵێت:

- ئەو کەتنەی بەو کراوە، بە دەمی تۆ بکرابووایە چشتاقە ددانت نەدەما.

***

**ئەو کچە:**

تازە زمانی کوردی لە قوتابخانەکانی شاری هەولێر دەخوێندرا. ڕۆژێك لە قوتابخانەیەکی خانەی مامۆستایاندا، مامۆستاکە لەسەر سەبوورەکە دەنووسێت:

ئەو کچە قژی ڕەشە.

قوتابییەکی کیژ کوردی باش نەدەزانی و خوێندوویەوە:

- ئەو کچە قوزی ڕەشە.

***

**ئەوەی لێرە کون دەکەیت:**

ئافرەتێك پێش ئەوەی مێرد بکات خۆی دۆڕاندبوو.

ماڵە مێردی گوارەیان بۆ کڕیبوو ئەویش تا ئەو کاتە گوێی نەسمرابوو.

ڕۆژێك خەریك دەبێت بیسمێت. خەزووری ڕووی تێدەکات و دەڵێت:

- ڕۆڵە ئەوەی لە ماڵە باوکت کون کرد، دەبووایە لێرەت کون بکربووایە، ئەوەی لێرەش کونی دەکەیت لەماڵە باوکت کون بکردبووایە.

***

**ئەو مشت و مڕەتان لە چییە:**

خەزوور و خەسوویێك، بۆ ئەوەی بووکەکەیان، تازە هاتبوو ماندوو نەبێت خەزوورەکە دەستی دا گۆزەیەك و گوتی:

- دەچم ئاو لە کانی دێنم.
- ژنەکە گوتی:
- نەخێر من دەچم.

هەر یەکەیان قولێپێکی گۆزەکەی گرتبوو.. و دەیگوت:

- من دەچم.

بووکەکەش لەجیاتی بلێت: (ئێوە خەزوور و خەسووی منن چۆن دێڵم ئێوە بچن) گوتی:

- ئەو مشت و مڕەتان لەچییە: با ئێستا یەکێکتان بچێت، پاش ئەم ئەویتر بچێت.

***

**ئەی بەراز مەلا:**

کاتی خۆی کتێبی مەلایان زۆربەیان جگە لە عیبارەتە سەرەکییەکەی (حاشیە = پەراوێز)یشی بەوردی لەملا و لەولای عیبارەتەکە نووسرابوو.

کابرایەکی نەخوێندەوار، لەکاتی (متالعە)ی مەلایەکدا دەچێتە لای. زۆر بە وردی حاشیەکە سەرسام دەبێت و پێی دەڵێت:

- مەلا ئەتوو ئەو هوردانەش دەزانیت؟

- بەڵێ.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

- ئەی بەراز مەلا.

***

**ئۆباڵت بەومله:**

لە ساڵی (١٩٦١)دا هەتا بەیانی (١١/ی ئادار ١٩٧٠)ە خەڵکی ئەو گوندانەی لەژێر دەستی پێشمەرگاندا بوون نەیاندەتوانی سەفەری حەج بکەن. دوای بەیانەکە خەڵکێکی زۆر هاتنە شاری هەولێر بۆ حەج بچن.

یەکێك لەوانەی نیازی حەجی هەبوو لەنێو پاس: (ئامانە) = مەسلەحە، بەرەو پشت لەسەر کورسییەك دانیشت.

جابییەکە پێی گوت:

- خاڵە نیازت چییە!؟.

- بەتەمامە بچمە حەج.

جابی هەتا شەب گرتی لە ملی خۆیدا و گوتی:

- ئۆباڵت بەو ملە مەچۆ حەجت لەسەر نییە.

***

**ئۆی... لەو درۆیەی:**

مامۆستایەکی بچم زۆر ناشیرین ڕۆژێك وانەی (ڕێزمـان) دەڵێتـەوە. پاسـی ڕستەی (ڕابردوو) و (ئێستا) دەکات و دەڵێت:

- من زۆر ناشیرین بووم.

ئەمە بۆ ڕابردووی دوور بەکار دێت.

هەرکە دەڵێت:

- من زۆر جوانم.

قوتابییەکان نایێڵن تەواوی بکات و دەڵێن:

- ئۆی... لەو درۆیەی.

***

**ئێرە جاستانە:**

ساڵێك بەفرێکی یەکجار زۆر لە شار هەلێر و دەشتەکەی دەبارێت.

کابرایـەکی خـەڵکی گونـدی (جاسـتان)ی بنـاری باشـووری ڕۆژهـەڵاتی (زورگەزراو)ی ناوچەی کەندێناوە، شەو دێتە دەرەوە و دەبینێت نزیکەی دوو بست بەفر لە ساکە گۆڕ باریوە و هەرواش دەبارێت. ئەو بـەفرە زۆرەشـی بـە عەمری خۆی لەناوچە نە دیبو، دەڵێـت: ئێـرە جاسـتانە جاسـتان، کوێسـتان نییە.

***

**ئێمە (سە)مان هەیە**

دوو سێ پیاوی ڕێبواری کـورد تووشـی هۆبـە ڕەشمـاڵی عـەرەبان دەبـن و دەبنە میوانی ڕەشماڵێك.

سەیر دەکەن قاپ و قاچاخی ماڵەکە زۆر پیسن و بێزیان نایەت نانی بخۆن و هەڵدەستن دەچنە ڕەشماڵێکی تر قاپ و قاچاخیان، زۆر خاوێن بوو.

دوای نان خواردن واریقاتەکەی بۆ خانە خوێیەکە دەگێڕنەوە.
ئەویش دەڵێت:

- ڕاستە: ئەوان سەیان نییە هیرباریان بلێستەوە، کەچی ئێمە سوپاس بۆ خوا سەمان هەیە و هیربارمان دەلێستەوە.

***

**ئهیچی و ئهیچی:**

ڕابەرێکی پەروەردەی شاری (عیمارە)، لەگەڵ ڕابەرێکی پەروەردەی شاری هەولێر، لە ئاخر و ئۆخری پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا، دۆستایەتی پەیدا دەکات. چەند ساڵ لە یەکتر دادەبڕێن. لە سەرەتای هەشتاکاندا لە شاری بەغدا تووشی یەکتر دەبن. عیمارەیی یەکە بە ئەوەی تر دەڵێت:

- ئێستا ئیشت چییە؟.
- وەك جاران ڕابەری پەروەردەمە.

ئەویش لەمێژ بوو دەرکرابوو و بەناو لەپ وەگێڕان بەملا و بەولادا دەڵێت:

- وەڵڵا کاکە: ئەتوو لەژیاندا دەبێ (ئهیچی ئهیچی) بێت. ئەگەرنا هەتا هەنووکە هەر لادەدرایت.

***

**بابی ڕەحمەتیت:**

بێوەژنێك کیژێکی هەبوو بە مێردیدا. هەرکە کیژە لۆ باوە خوون گەڕاوە دایکی لێپرسی:

- ڕۆڵە کووە لەگەڵت؟.
- زۆر باشە. پێشتر کە جووت دەبوین سەرم لەسەر بالیف دادەنا، کەچی ئەو لە دواییە دا گوتی:
- ئەگەر سەرت لەسەر بالیف بێت، دوو سەنتیمەتر دەمێنێت بچێتە ژوورەوە، ئەگەر بالیفەکەی لا بدەیت قەپات دەبێت.

دایکەکە ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

- کەواتا بابی ڕەحمەتیت چەند کیلۆمەتری من قەرداره.

***

**با دەستنوێژم نەشکێت:**

فەقێیەك دەچێتە ماڵێك دەڵێت:

- توخوا سێڵمان بدەنێ نەختێك ئیشمان پێیه.

ئافرەتی ماڵەکەش کۆشی خۆی هەڵدەداتەوە و دەڵێت:

- فەرموو ئەوە سێر = (سێڵ).

فەقێیەکەش شتەکەی دەردەخات و دەڵێت:

- توخوا قوفەکەی بەو سینگە وەبکە با دەستنووێژم نەشکێت.

***

**بارانە پایز:**

لەوەرزی پایزدا سێ جۆر باران هەیە:

١- بارانی (کەپرەشینە)ی جوولەکان: (٢٢) بیست و دووی مانگی ئەیلوول یەکەم ڕۆژی کەپرشینەی جوولەکانە و ((٩) ڕۆژە. جوولەکە بە جەژنی خۆیان دەزانن. من بەچاوی خۆم دیومە: هێلکەیان لەوڕۆژەدا ڕەنگ کردبوو.

٢- بارانی (قوون سستان):

لە دەشتی هەولێر لەبەر ئەوە سەری خانوویان قوڕێکی تەنك بوو هەرکە منداڵ، یان ئاژەڵێك بەسەر بکەوتبووایە دەقەپا، بۆیە هەموو ساڵێ لە وەرزی پایزدا، پێش بارانی پەڵە تەنکە سواقێکیان دەداوە.

هێندەکەس هەبوون تەمبەڵی و کەمتەرخەمیان دەکرد، درەنگ خانووەکەی خۆیان سواق دەدا. هەرکە بارانی پاش کەپرە شینە بباریبووایە ئەو کەسانە تەنگا و دەبوون خەمی سواقدانیان ئەوسا دەخوارد.

٣- بارانی پەڵە. لە جێگەیەکی دی باس کراوە.

***

**بارگین:**

کابرایەکی دەشتەکی لە زەمانی زوو بارگینێکی پیری دەبێت و کاری ئەوی پێنەدەکرا. ڕۆژێك بردییە شاری هەولێر و فرۆشتی.

دوای حەفت ڕۆژان چوو بارگینێکی جاحێڵی کڕی.

هەرکە چۆوە خەڵکەکە گەمارۆیاندا و گوتیان:

- بارگییەنەکەی خۆت بە چەند فرۆشت؟.
- بە هەشت (٨) دینار.
- ئەدی ئەوەت بە چەند کڕییە؟.
- بە دوازدە (١٢) دینار.

خەڵکەکە بیلبتوون لە حریتەیاندا و گوتیان:

- کورە خۆ ئەوە هەر بارگینەکەی خۆتە!.

هەرکە باوەڕی نەهات لە دەستیان ڕاستاند و بەرەڵڵایان کرد و حۆتر حۆتر چۆوە ماڵی خۆیان.

تومەز حەفتەیەك تێر ئالیك و بژیان قوت کردبوو و ڕێشمەیەکی جوانیشیان لەسەر نابوو نەیناسیبووەوە.

***

**با کەس لە جێگەی خۆی نەجووڵێت:**

پاسێکی نەفەر هەڵگری نێو بازاڕ، زۆر بە تیژی لەگەڵ لۆرییەکی گەورە دەعم دەکات.

کیژێکی نێو پاسەکە، لەسەر کورسییەکەی دەپەڕێت و دەکەوێتە سەر کۆشی کابرایەك و یەکسەر هاوار دەکات و دەڵێت:

- خزمینە هەتا لێژنەی تەفتیش دێت باکەس لە جێگەی خۆی هەڵنەستێت.

***

**باوکم و سەگەبۆر:**

ڕۆژێك کابرایەك باوکی بە دانی سبیانێ ئەمری خوا بە جێدەهێنێت، دوای ناشتنی بۆ دانی ئێوارە سەگێکیان دەبێت دەتۆپێت.

کابرا دەڵێت:

- وا دیارە باوکم و سەگەبۆر لە گرۆیان کردووە.

***

**بایك حەلالنا:**

لەساڵی کەرگیرانی = (١٩٦٣)دا ئەو کارەساتەی کاربەدەتانی عەرەب بەسەر میللەتی کوردیان هێناوە بڕواناکەم بەسەر هیچ میللەتێك هاتووبێت. فەرموو سەیری ئەمانە بکەن:

- أحنا بدو.. وينا العدو.
- أخذنا بسلاح البيض.
- أحنا العرب أهل الغيرة
- نطرد الكراد من ها لديرة.
- الرأسُ لنا والمال لكم.
- غير جئت من الجبال.

دووەمیان وتەی سوپای دەوڵەتی عێراق بوو.. و هەرکە سوپاکە دەگەیشتە هەر گوندێك پیاوەکانی دەکوشت، یان دەگرت: (مێرد منداڵی نێرینە و پیرو ژن و منداڵیش پەراگەندە و دەربەدەر.

سوپاکە بە بارە بارِ دەیگوتە: عەشیرەتە عەرەبەکانی کوردستان و سەر سنووری: (وەرن کوردان تاڵان بکەن).

بە لێشاو و چاوئێشانە گوند بە گوند بۆ تالانی ماڵە کوردان دەگەڕان. بەتایبەتی ناوچەی قەراج و کەندێناوە و دۆڵی ساڵەیی. هەر پەڕۆ و پاتارێکیان دەست بکەوتبووایە هەتا سینگولکەی دیواریش، بێ پەردەی شەرم و حەیاوە ڕادەپێچا.

هەر کوردێك نقەی کەم و زۆر لەبەر بهاتبووایە، بە قوربانی گوللەیەکیان دەکرد.

زیندە ماڵ و مردەماڵی ناوچەکانیان نەهێشت.

سوپاش (دیاردی)ی تاژیانەی لێدەکردن. کافری حەوت دینانیش زگی بە گەلی کوردی ژێر چەپۆك و بێ ئەنوا دەسووتا، تەنیا عەرەبە دراوسێکان و چەکدارانی خۆیی نەبن.

لە ئاوایی (لهێبان)ی ناوچەی کەندێناوە دەغلێکی زۆریان خڕ کردەوە و بە کاروانێك بۆیان نەچوو... و چەند کەسیان نارد لۆری بهێنن و فەرهوودی بکەن. کوردێکی پەرپووت کراوی بێ زەخیرە لە تاو دەردی برسێتی لە گوندی گۆرین خرارگە نمێك لە دەغڵە کۆم کراوەکە دەبات. یەك لە عەرەبە فەرهوود کەرەکان دەزانێت و دەچێت لە ماڵی خۆی گوللەیەکی لێدەدات. چابوو ئەجەلی نەهاتبوو.. و پاش ماەیەك چارەو تیمار کردن ئەو جا چاك بووەوە.

بە عەرەبە تالانکەرەکەیان گوت:

- ئەوە بۆ ئەو گوللەیەت لێدا؟.

بەو پەڕی لوت بەرزییەوە گوتی:

- هاذ الكلب بايك حلالنا.

***

**بە خۆت و ئیمامی شافعی:**

کابرایەك نوێژی دەکرد و یەکێکی تر ئامۆژگاری کرد و گوتی:

- بە مەزەبی ئیمامی شافعی ئەوها نییە و ئەهایە.

لە پێگوتنی هەلەی دووەمدا کابرای نوێژکەر بایەکی لێ بەر دەبێت و دەڵێت:

- بەخۆت و ئیمامی شافعی وازتان لێنەهێنام هەتا دەسنوێژتان پێ شکاندم.

***

**بەڕولەی گوڵ بەدەم**

کابرایەکی شاری سلێمانی تەرۆزی لە بازاڕ دەفرۆشت. تەرۆزی سەر لە بەیانیان تازە لە بڕك کراوەتەوە و زۆر تەڕ و ناسك و کولیکەی گەشی پێوەیە و بانگی دەکرد و:

- وەرن تەرۆزی گوڵ بە دەم و بەمێ. وەرن تەرۆزی گوڵ بە دەم و بەمێ.

هەرکە ئێوارە دادەهات تەرۆزییەکەی سیس دەبوو.. و کولیکەکەشی پووت و دەوەری دەیگوت:

- وەرن بەڕولەی گێڕم و بەمێ. وەرن بەڕولەی گێڕم و بەمێ.

***

**بەکێندەر بچینە ڕاتبان:**

لە جووتە نەهاتی ساڵی (١٩٤٧ – ١٩٤٨)دا چەند فەقێیەك لە حەجرەی ئاواییەك دەیانخوێند. ڕاتبەکەیان تەواو بەشی نەدەکردن. یەکیان زاری خۆزگە هەڵهێنا و گوتی:

- بریا بە بریایێ خودا هەر چوار لای ژووری حوجرەکەمان، هەتا بن ساپیتەی برنج و گۆشت و ڕوون و شەکر و چا دەبوون.

دووەمیان دەڵێت:

- کە هەر چوار لامان بگیرێت ئەدی بەکێندەر بچینە ڕاتبان.

***

**بەو قورئانەی:**

دوو فەقێ دانی سبیانەیەك بەڕێگا دادەڕۆن شفتی فرۆشێکیان تووش دەبێت و یەك و شووتیان دەداتێ.

فەقێکان هەتا هەنگلیان دێشێت شفتی دەخۆن. میزیان بە ئەوەی لەبەریان مابووەوە داکرد.

دانی ئێوارە گەڕانەوە و زۆریان برسی دەبێت و هەریەکەیان لەکاتی خواردنیدا دەڵێت:

- بەو قورئانەی بەخۆم بسمیلام لێکردووە من میزم بە ئەوەیان دانەکردووە.

هەتا پاشماوەی شفتییەکان هەموو دەخۆن.

***

**بڕمووت:**

تووتنێکە وەك کل وردکراوە هێندەکەس لەکاتی کەپوو گیراندا تۆزێکی هەڵدەکێشێت، دەلحاز لووتی دەبێتەوە. چەشنی جگەرەیە ئەگەر کەسێك فێری بوو زەحمەتە بتوانێت وازی لێ بهێنێت.

جارێك پیاوێك لەگەڵ هەڵکێشانی دەنگێکی لێوەدێت جا دەڵێت:

- بڕمووتێکی زۆر بە قووەتە.

ئەوەی تەکییەوە بە بزەیەکەوە دەڵێت:

- لۆیێ هەموو کەس بەرگەی ناگرێت.

***

**بڕۆ بیدێ:**

دوو جوامێری دۆستی یەکتر، یەکیان دەچێتە لای خێزانی ئەویتر و پێی دەڵێت:

- بۆ بە مێردەکەت ناڵێیت: هەر داوای گانم لێدەکات.

ژنەش یەکسەر دەڵێت:

- لێی مەترسە: بڕۆ بیدێ.

***

**بریا باوکمت بکوشتبووایە:**

کابرایەکی کورد بە سەیارە لە سەگێکی ماڵە عەربێك دەدات و دەیتۆپێنێت.

کوردە سێ چوار پیاوی ماقووڵی دەور و بەری خۆی دەبات و بۆ تەوازوو خواستنەوە دەچنە ماڵی عەرەبەکە و دەڵێت:

- مادام ئێوە تەشریفتان بۆماڵی من هێناوە ئەوا من لێیخۆشبووم، بەڵام برا باوکمی بکوشتبووایە نەك سەگەکە.

***

**بژەن بژەن:**

مام عەولا ناوێك بە بێوەژنێك فێر دەبێت.

سۆفی (حەسەن) ناوێك هەست پێدەکات. ئەوساش شەو تاریك و بێ کارەبا بووە دەچێتە گژ، ژنەکە.

ژنە هەر زوو هەست دەکات چشتەکەی لە هی مام عەولای گەورەترە و دەڵێت:

- بژەن بژەن بێ بەلابی.

زەحمەت ئەتوو مام عەولابی.

سۆفی حەسەن بەجواب دێت و:

- مام عەولا نیمە سۆفی حەسەنم

- فەتەق ئەمن زۆر باشتر ناژەنم؟.

***

**بنیادەمە و شەوە نییە:**

خوشکێکی نەقوستانم هەبوو. چەپ و چوێڕ و ڕەش و ناشیرین و دەم و چاو لپرلپر و بەموو... و کورتەڵە. عاجباتییەکی وابوو بەڕۆژ بتدیتبووایە بەشەو دەهاتەوە خەونت. لە بەختان کەس نەهاتە داخوازی، تا بەڕێی خۆیدا بڕۆشت بووایە. خوداش نەسیبی هەڵنەقەناندبوو.

ڕۆژێك لۆکەل و پەل کڕین لەگەڵ خۆم بردە شاری هەولێر. من لۆ نوێژ چوومە مزگەفت و ئەویش چووە ماڵێك.

هەرکە گەڕامەوە دیتم پێش ئەو ماڵەی (عەیشۆك)ی چوو بووێ لە ژن و ژار و منداڵ و تووال سیرەی دەهات و دەرزیت هەڵاویشتبووایە بە عەردی نەدەکەوت. لە دڵەوە هەترەشم چوو.. و گوتم: (ئیلّلا و بیللا خوشکۆلەم شتێکی بەسەر هاتووە). لە شروان بەرچاوم تار هەڵگەڕا و گوێم بە عەشاماتە

زۆرەکە نەدا و خۆم دەلحاز فجوور کردە ناوەڕاست و بە هەردوو پیلان درم بەکۆمەڵی خەڵکەکە داو کاتێک پێم لە ژوریَ سەنگرایەوە بینیم عەیشۆك بەزنجیر بەستراوەتەوە و ژووژنێکیشی لە بەرۆك دراوە. توومەزماڵەکە دوو ڕۆژبوو منداڵیان بوو بە (شەوە)یان حەملاندبوو. هەرکە چاوی بەمن کەوت، لە هۆڕژنی گریانیدا و دوای ماوەیەك بە نزگرەوە گوتی:

- هێزە وسو دەخیلت بم تا زووە لە دەستیانم قووتار بکە.
- بە هەزار سوێند و عەندەك دۆنەك و نالی عەلییەوە تا باوەڕەیان هات بنیادەمە و شەوە نییە.

(ئەمە لە شاری هەولێر ڕوویداوە نووسەر)

***

**بووك و زاوای کەسك و زەرد:**

کوڕێك ژن دەگواستەوە و هەرکە بووك دەگاتە ماڵی زاوا دایکی بووك ئەوسا دەزانێت: زاوا لە حیزبی ئەوان نییە و سەر بە حیزبێکی ترە. هار و هاج دەبێت و بەخۆی ناوەستێت تەنگەتاو دەچێتە ماڵی زاوا و داوای کچەکەی دەکاتەوە و دەڵێت:

- کوفرە کەسك و زەرد بەیەکەوە بژین.
- دوای تکا و ڕجایەکی یەکجار زۆر، خەسووەکە بە دەغەزەوە ڕوو لە کچەکەی خۆی دەکات و دەڵێت:
- چاوپان دیارە لۆ مێرد ئاگرت تێبەر بووە، ئەگەر نا کوو بێزت دەهات مێرد بەو خائینە بکەیت.

ئیتر لە تەشکی خۆی دەدات و دەگەڕێتەوە.

ئەمە لە شار هەولێر ڕوویداوە.

***

**پەنجەی تێدا ختم کردبوو:**

کابرایەك لە هەڵس و کەوتی ژیانیدا، لەچاو کەسانی دەوروبەری لە یەغباری خۆی نارازی بوو.. و شەو و ڕۆژ لە یادی نەدەپەڕی و هەردەم

دەیگوت:

- لە زێدە ئەو عالەموڵلایە تەنیا من بێ هێر و بەختم.

شەوێك خەون دەبینێت: (خەڵکێکی یەکجار زۆر... ڕاوەستاون و ئاسمانیانیان زۆر لێ نزیکە و لە ئاست سەری هەریەکەیان شەبەقێکی گەورەی تێبووە و سەیری دەکەن. تەنیا ئاسمانی ئاست سەری ئەو کونێکی زۆر گچکەی تێدایە.

پرسیار دەکات و دەڵێت:

- ئەرێ ئەوکونانە چنە؟.

ئەوانیش دەڵێن:

- کونی یەغبار و شانسە و هی هەمووان وەك یەك گەورەنە تەنیا هی تۆ گچکەیە.

ئەویش ئەوسا پەنجەی بە هەموو هێزییەوە لە کونەکەی خۆی ڕادەکات، بەڵکی قیچێك فراوان ببێت. کاتێك لە شرووی ژانی (دوبرە)ی وە ئاگا دێت و پەنجەی تێدا ختم کردبوو.

***

**پەنجەی تێڕادەکات:**

پیاوێك لە گوندێك لە گوندەکانی ناوچەی کەندێناوە هەر کچی دەبوو.. و کوڕی نەدەبوو.. و هەر جارێ کە کیژێکی دەبوو دەیگوت:

- لۆ مەلائیکەتی درووستکەری منداڵ زەحمەتە کێر و دوو گونی بۆ درووست بکات، یەکسەر پەنجەیەکی تێڕادەکات و دەیکاتە کچ.

***

**پلکە چەمرە:**

ناوبراو بێوەژن بوو. خێزانی خوالێخۆشبوو (مام خارە مەند کارەوان) بوو. سێ کوڕ و دوو کچی هەبوو. کوڕ و کچێکی لەمن گەورەتر و کوڕێکی ئاوزەی من و کوڕ و کیژێکیشی لەمن بچووکتر بوون.

ئافرەتێکی دەم بە پێکەنین و گوراح خۆشبوو.

من زۆرم خۆشدەویست.ماڵیان لە ماڵی ئێمە نەختێك دوور بوو. من هەندە شـەوانی درێـژی زسـتان دەچـوومە ماڵیـان. دەسـتیان کـورت و قشـپلی سووتانیان نەبوو. لەجیاتی (سۆپا) بە کاو کۆت و زبڵی سەر گوفەکان ئـاگری لەبن (بەردەسێڵ) دەکردەوە. هەرکە ئاگری بەردە سـێڵەکە بـەرز دەبـووەوە پفێکـی لـە (چـرا) پلیتەکـەی دەکـرد و دەیکوژانـدەوە. کـە ئاگرەکـە کـز دەبووەوە پوشکەیەکی بە ئاگر دەکـرد و پێـی دەکـردەوە. بـۆ ئـەوەی بـوو. تاکو نەفت زۆر سەرف نەکات.

ئەوکات (قاپە نەفت) = بوتڵێك = دوو هێندەی شوشەی بیبسی دەبوو. بە (١٠) دەفلووس، یان بە دوو هێلکە بوو. بوتڵەکە بەنی بە لوولەی هەڵدەکێشرا و لەجیاتی سەر (قلە) قەسپێکیان لە دەرکەی دەپەستا و بـە کورتـانی ولاخ، یان گوێدرێژ هەڵدەواسرا. زۆر جار بەم تەرزە دەناردرا شارۆچکەی (دیبەگـە) بوتلە نەفت دەهات. بەشی هەفتەیەکی چرای ماڵێکی ئەوهای دەکرد.

بەیانی کە هەڵدەستامەوە کونە (کەپوو)م لەبەر دووکەڵی چرا پلیتەکە پڕی تەنی بووە.

***

**سەگی هار:**

خوالێخۆشبوو: (مەلا مستەفای مام باقی)ی گوندەکەمان ژنـی گواسـتەوە. ئەو نان و شیوەی لەبـەر میوانـان مـاوە لەسـەر گوفـەکیان ڕشـت. سـەگێکی خـوێڕی و بێخـاوەن و برسـی، گوایـا لەبـەر زۆر خـواردنی پاشماوەکـە (هـار) دەبێت[1].

دوو قازی ئێمە گرت.

باوکم گوتی: (نـەبادا نەزانـدرێت کـام قـازە) هـەموومانمان سـەربڕین و کـە لەشەکانمان لەبن عەردی شاردەوە.

---

[1] چۆنم بەچاو دیوە و بەگوێم بیستووە خستوومەتە سەر کاغەز.

سەگەکە کیژە گچکەکەی پلکە جەمرەی گرت. عەمری شەش حەوت ساڵان و (خاتوون)ی ناوبوو، قشت و زۆر جوان.

سەگەکەش هەر لەنێو ئاواییدا دەهاتوو دەچوو. خەڵك خۆیان لێدەپارێزت. تاکو فەقێ (سەیدە) ناوێك، خەڵکی گوندی (خۆشاو)ی بناری باکووری ڕۆژهەڵاتی چیای (قەرەچوغ) بوو، لە حوجرەی ئێمەی دەخوێند کەڵەگەت و تێکچەقی و بەوەج بوو، بەردێکی پڕ بە چەنگی هەڵگرتەوە و لێیچووە پێش و تا هێزی لەبەردابوو لە قەپرغەی دا و تۆپاندی.

چل ڕۆژی پێچوو: (من وا حەملاندرابووم، ئەگەرنا لە پلەی ئەوسای منی (١٠) دەساڵاندا نەبوو. خاتوونی بەستەزمان تووشی نەخۆشی هاریبوو.

خوالێخۆشبوو (مام برایم کارەوان)ی مامی کیژە، چووە کن باوکم و پێیگوت:

- خوا ڕەحمی پێ بکات.

بردیانە خزمەت خوالێخۆشبوو: مام (سەید خدری) گوندی حەسەن بلباس. پیاوێکی بەتەمەن و زۆر بەدین و دووعا گۆ. بە ڕێککەوت: من و دایکم ئەو ڕۆژە سەردانی ماڵی مام سەیدی تایەنمان) کرد. لە کۆنەوە دۆستایەتیمان زۆر بەهێز بوو. لە ڕێگادا تووشی کیژە بووین. لەسەر پشتی گوێدرێژ بەستبوویانەوە و دەیانهێناوە

هەرکە چووینە ماڵی مام سەید فەرمووی:

- داك مەلاژن ئەوشۆکە ئەو کیژە هاتە خەونم و لاگری کۆمەڵە کیژێك دەڕۆیشت و حەیرانەیەکی گوت: (چیبکەم لە دەستەخوشکان دابڕام). بۆیە پێمگوتن: بڕۆن تا زووە بیبەنەوە).

لە نزیك ئاوایی جوانەمەرگ بوو. لەبەر بێ باوکی خەڵکی گوندی لێکرا پێتاسان و کار و کاسبیان ئەو ڕۆژە وەستاند. یەك بەباری خۆم زۆر بۆی گریام.

***

**پیاسەی ئەوهامان:**

من و دایکی منداڵان ڕۆژێك بە ئیش چووینە بازاڕ، کوڕ و کچێکی جاحێڵ لەپێشمان پیاسەیان دەکرد و دەست لەنێو دەست و بەڕووی یەکتری دەتریقانەوە.

منیش بەدایکی منداڵانم گوت:

- داخوا کوڕە بۆ فریودانی کیژە چەندین درۆی دوو زەردێنە هەڵدەڕێژێت.

بەسەر لەراندنەوە گوتی:

- گوتنی ناوێت.

پاشان گوتی:

- پاویژگەکاتی خۆی من و تۆش پیاسەی ئەوهامان زۆر کردووە.

لە مەرامی حاڵیبووم و چاوی مۆنم بەخۆمدا شۆڕکردەوە.

***

**پیاو ئەو ڕۆژەی ژن دەهێنێت:**

ڕۆژێك لەکاتی نانخواردندا بە دایکی منداڵانم گوت:

- حورمێ نیازم وایە ژن بێنم.

یەکسەر ڕاجفری و دەستی لەسەر نان ڕەق بوو.. و چاوی لە مۆلەق و دەمی شلەژانی بەش بووەوە و بەجاوە جاو گوتی:

- لۆ پیاوەکە ئەمن چ عەیبم هەیە؟.

- نەخێر، بەڵام تەعام گۆڕینم پێخۆشە.

پاش هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر و لەبەرم مرد و سۆت دینارێکی (برێمری) نەهێنا. لەتاوان دەلحاز هاواری بۆ دەستە خوشکێکی خۆی لەئاوایی بوو برد.

چتۆ ئافرەت بوو. ئۆینباز و بەبلحاتی وەك خۆی نەبوو.. و جۆی بە دیوار هەڵدەگێڕا و دەیزانی لەشی پیاوانی ئاوایی چەند مووی پێوەیە. کە دەگوترا: (فاتە هەیتە دەبڕاوە). بە قسەکەی هەتا لەسەر پشت کەوت لە حریتەیدا و گوتی:

- له ژیاندا هەندە ساویلکە و عولعولی مەبە و پیاوان بناسە. مێردی تۆ ئۆمەرە و پیاوی دوو ژنان نییە.

بەڕوویدا تەقیەوە و:

- شەکرت خوارد. مێردی من (خدرە) و سوێندیشی خواردووە ژن بێنێت.

هەننۆب لە قاقای داوە و:

- نا.. نا.. خوشکم ئەگەر خدربووایە ئەو وەختە دەهاتە سەر مارە بڕین پێی دەگوتی.

بەمە دڵی تۆزێك. داکەوت و کەلەکەی ئۆخەی کەوتە عەردی، کە ئەمەی لێبیست.

- پیاوی ئۆمەر، بۆ ئەوەی ژنەکەی لێی بترسێت و لەگوێ و حەمدی دەرنەچێت، ئەوڕۆژەی ژن دەهێنێت هەتا مردن ئەو گوانە دەخوات.

***

**تا تووشی مایەسیری نەبم:**

چوار کەسی خەڵکی شار هەولێر، بۆچارە سەری (مایەسیری) دەچنە شاری (دیالە). ئەوسا ژنێکی عەرەب عەمەلیاتی مایەسیری دەکرد.

یەکیان تۆزێك لە عەمەلیاتەکە دەترسێت و لەدڵەوە بڕیار دەدات: (وا چاکە ئەمن نەیکەم. پاشە ڕۆژ ئەگەر ئەوانە چاك بوونەوە ئەوسا دەیکەم).

هەر یەکەیان بە تەنیا لەگەڵ ژنە دەچێتە ژووری عەمەلیات.

کابرای چوارەم لە ژوورەوە بە ژنەکەی دەڵێت:

- من مایسیریم نییە و لەگەڵ ئەوانە هاتوومە. بەس پێم خۆشە لەبەر دڵی ئەوان، تاکو بزانن منیش عەمەلیات کراوم لای جەنابت بمینێمەوە.

دوای ماوەکە کابرا بە لاکەلاك دێتە دەرەوە. لە ڕێگای هاتنەوەیاندا ئەوەی عەمەلییاتی نەکردبوو هەرکە هاوڕێکانی دەدیتن لە شروی ژانی پاشەڵیان عەجمانیان نییە و خۆیان بەم لاو ئەولای کوشینی ئۆتۆمبێلەکە دادەدەن، لە تریقەی پێکەنین دەدات.

هاوڕێکانی ئەوسا دەحسیێن و پێی دەڵێن:

- دیارە تۆ عەمەلیات نەکراویت؟.

بۆ ئەوەی لەکۆڵی ببنەوە، بە پێکەنینەوە دەڵێت:

- خۆ من وەك ئێوە بێ عەقڵ نیمە، کاتی خۆی تاکو تووشی مایەسیری نەبم بە منداڵی قوونم داوە.

***

**تاقی کردنەوە:**

مەترانێکی مەسیحی چەند ڕاهیب و ڕاهیباتی وا پەروەردە کردبوون هەستی (جنس)ی حەزحەزۆکێیان لە جەستەدا نەهێشتبوو. بۆ ئەوی تاقیان بکاتەوە، هەردوو لای ڕووت و قووت کردنەوە و زەنگوڵێکی بچووکی دەنگ گەورەی بەسەری عەورەتی هەر.. راهیبێکەوە کردبوو. ئەگەر بە ئاستەم بجووڵێت دەنگی لێوە بێت.

راهیبەکانیشی بەرامبەریانی ڕاگرتن. پاش نیو سەعات زیاتر سەیر کردن هیچ جم و جۆڵییەك نەبوو.

مەترانەکە بە شانازییەوە ڕووی لە ئامادەبووان کرد و گوتی:

- من ئەو جۆرە دیندارانەم پەروەردە کردوونە، کەوا بەچاو دەبینن هەستی جنسیان بە ئاستەمیش لەبەدەنیاندا نەماوە.

- ئەوجا بەوپەڕی کەیفسازییەوە گوتی:

- کار تەواو بوو دەتوان پەرتە بکەن.

هەرکە ئافرەتەکان بۆ ڕۆیشتن پشتیان لە پیاوەکان کرد زەنگوڵەکان لێکرا دەنگیان هات.

***

**تاکو بەچاو ببینن:**

شووشەوات فرۆشێك ڕۆژێك شووشەواتەکەی بۆ فرۆشتن لە پشتی گوێدرێژ هەڵدەدات و بیباتە دێهاتەکانی دەورووبەر.

ڕێگاکە لەسەر لێواری کەندەلانێکی زۆر بڵند دەبێت. بە ڕێککەوت کەرەکە ساتمەیەك دەکات و سەرانگرێی خوارەوەی کەندەلانەکە دەبێت.

هەرکە خاوەنەکە دەگاتێ: کەرەکە سگوردی شکاوە و شووشـەواتەکانیش بیلبتون و ورد و هەڕا بوونە.

هەر ئەو سات دوو سێ دەمانچان بەسەر ئاواییدا داوێت. خەڵکەکە، هەرکـە گوێیان لە تەقە بوو گەورە و گچکە بە هەڵە داوانەوە بەسەریدا دەقرژقرژێن.

خاوەن شوشەوات دەڵێت:

- من بۆیەم بانگ کردن هەتا بەچاو ببینن: واریقاتەکـە کـووە، نـەك زارم شل بێت و بۆ یەکە یەکەتان بگێڕمەوە.

***

## تاکو ببێتە موختار:

ڕۆژێـك کابرایـەك دەچـێتە لای دختـۆر هــەر سـی و دوو ددانــی خــۆی دەکێشێت.

ئێـوارە لـەتاو ژان لەسـەر سـەر دەسـوڕا و هــاوار هــاواری دەگەیشـتە کەشکەلانی فەلەك.

ژنەکە پێی گوت:

- پیاوەکـە ئـەتوو هـار بوویـت، شـێت بوویـت: پـێم ناڵێیـت: ئـەو ددانـە ساخانەی خۆت بۆ دەرهێنا؟.

ئەویش لە شروی ژان بە جرەجرِ بۆی تەواو کراو:

- ئافرەت ئەگەر بێددان بم حکومـەت بـەپیرم دەزانێـت ئەوسا دەمکاتـە موختار.

***

## تەنەکەی سەراولێژ:

چەند گەنجێك یەك دوو ساڵ بوو ژنیان هێنابوو، گشـتیان لەسـەر ئـەم ڕا و بۆچوونە كۆك بوون: (ژن هێنان تەنەکـە پیسـایی یـە کـە و سـەرەکەی چـوار پەنجە هەنگوێنە).

یەکێکیان لە حریتەی پێکەنینیدا.

پێیان گوت:

- بە چ پێدەکەنیت؟.

گوتی:

- هەرکە من ژنم هێنا تەنەکەکەی من سەراولێژ دانرابوو.

***

**ترسی خوام لا گەورەترە:**

دوو پیاو دراوسێ دەبن. یەکیان پێنج کوڕی دەبێت و ئەویتر کوڕێك و چوار پێنج کچ.

ڕۆژێك تاکە کوڕە بە کوشتنی یەك لە کوڕەکانی دراوسێکەی تاوانبار دەکرێت و شکات دەچێتە لای قازی ناوچەکە.

لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگە و شایەت نابێت قازی ڕوو لە تاکە کوڕە دەکات و دەڵێت:

- تۆ تاوانبار نیت و.........

پێش ئەوەی بڵێت: (دادگا تۆی ئازاد کرد)، باوکی تاوانبار دەچێتە بەرامبەر قازی و سێ جار دەست بە قورئانەکەی پێش قازی دادەدات و دەڵێت:

- بەم قورئانە، بەم قورئانە، بەم قورئانە، ئەو کوڕەی من لەگەڵ کوژرا و بەشەڕ هات و پێمەڕەیەکی لە تۆقی سەریدا و کوشتی.

قازی دەڵێت:

- دەزانی ئەو شایەتییەت چی لەدوایە.
- بەڵێ: ئیعدامی لەدوایە. بەڵام ترسی خوام لا گەورەترە لە جەرگ سووتان.

پاشان بە چاوی پڕ فرمێسکەوە لە باوکی کوژرا و ڕادەمینێت و دەڵێت:

- تەنیا ئەوەندە ڕجایەم هەیە جەنابی چوار کوڕی دیکەی هەیە و منیش هەر ئەو کوڕەم هەیە، ئەگەر بەزەییەکی بە ڕیشی سپیمدا بێتەوە و بەس.

باوکی کوژراو یەکسەر دەڵێت:

- جەنابی قازی تۆ شایەت بە: ئەوا من لە خوێنی کوڕی خۆم خۆش بووم.

باوکی تاوانبار دەڵێت:

- من بە شایەدی جەنابی قازی ئەوا چوار کیژی خۆم پێشکەش بە کوڕەکانی کرد.

قازی لە خۆشیان چاوی پڕ فرمێسکی شانازی دەبێت و ئەملا و ئەولای هەردووکیان بەسۆزەوە ماچ دەکات و دەڵێت:

- هەتا پیاوی مەرد و دیندار و خاوەن هەستی مرۆڤایەتی وەك ئێوە هەبێت پێویست بە قازییێتی من ناکات.

***

**ترکەن:**

دوو برادەر لە نزیك ڕووبارێك دادەنیشن و ئافرەتێکیش لەسەر ڕووبارەکە خەریکی شمەك شووشتن دبێت.

یەك لە دوو کەسەکە بە ئەوەی دی گوت:

- ئەگەر بچم ئەو ژنەی ماچ بکەم چمدەدەیتێ؟.

ئەویش لای مەحاڵ بوو گوتی:

- ئێوارە گیسکێکت بۆ دەکوژمەوە.

کابرا بۆ لای ژنەکە دەخشێت و داوای سابوونی لێدەکات دەستی پێ بشوات. لەکاتی دەست شووشتندا دەنگێکی لێوە دێت و ژنەش دەڵێت:

- پیاو و تڕیان گوتووە.

کابرا لە ترسی شەرەف چوون زۆر لە ژنەکەی دەپاڕێتەوە سڕی هەڵنەماڵێت و لە ئەنجامی تکا و ڕجایەکی زۆر دەستی و ڕوومەتی ماچ دەکات و ژنە بەڵێن دەدات دەنگ نەکات.

برادەرەکەی دیتی ژنەکەی ماچ کرد ئێوارە بەڵێنەکەی خۆی بەجێ هێنا.

چەند ساڵی پێدەچێت ڕۆژێك مێردی ژنەکە لەگەڵ کابرای تڕکەن بەشەڕ دێت. ئێوارە بۆ ژنەکەی دەگێڕێتەوە.
ئەویش دەڵێت:
- لەگەڵ فلان تڕکەن؟
مێردەکەی دەڵێت:
- کوو دەزانی تڕکەنە؟
ئەویش واریقاتەکەی لە سیری هەتا پیازی بۆ دەگێڕێتەوە. لەو ڕۆژەوە تڕکەنی بەدواوە دەکەوێت.

***

**تف لە تکە خۆر:**

کابرایەك دەچێتە لای دکتۆر بۆ ئەوەی لە کاری شەوان بەهێزتر بێت و دەڵێت:
- دکتۆر شەوانی پێشتر سێ چوارێکم پێدەکرا، هەنووکە هەرچەندی هەوڵ دەدەم، هەر یەکەکم پێدەکرێت جا هاتوومە چارەیەکم بکەیت.
دکتۆر دەڵێت:
- خواردنت بەزۆری چییە؟.
- ساوار و بڕووش و نیسك و کفتە و گەنمە کوتایە.
ئەوسا دکتۆر بێزی لەخۆی دەبێتەوە، هەموو شەوێی پێناکرێت، چ جای دوو و سێ، خواردنیشی بەزۆری تکە بووە و سەری بۆ عەورەتی خۆی شۆڕدەکاتەوە و دەڵێت:
- تف.. عەمرت نەمێنێ تکە خۆر.

***

**تۆبەکەم دەشکێت:**

پیاوێك دوو گوێدرێژی هەبوو جووتی پێدەکردن و گوزەرانی خێزانەکەی پێوە بەڕێوە دەچوو.

ڕۆژێك كابرا لەسەر دەستی شێخێك تۆبەی وەرگرت و بوو بە سۆفی و وازی لە جووت هێنا.

ژنەکەی پێیگوت:

- پیاویژکە بۆ ناچیتە جووت؟.
- حورمێ ئەگەر بچمە جووت پاشەڵی ماکەرەکەمان دەکەوێتە بەرامبەرم و ئەویش حەرامە و تۆبەکەم پێدەشکێت.

***

**جارێ ئەوەی گەورە بکە:**

پیاوێك بووکێکی گێل و شێتۆکەی دەبێت و ڕۆژێك بووکە دەنگێکی گەورەی لێوەدێت. بۆ ئەوەی بەسەر خۆیدا نەشکێتەوە خەزووری بە بافرەیەکەوە پێی دەڵێت:

- کیژم ئەوە نیشانەی ئەوەیە نۆبەرەت کوڕ دەبێت.

بووکەکە زۆری هەوەست پێدێت و بە گوراح خۆشییەوە دەڵێت:

- مامە یەکێکی دیکەش بکەم؟.
- نا.. نا.. ڕۆڵە جارێ ئەوەی گەورە بکە، لۆ یەکێکی دی دوو ساڵی دەوێت.

***

**جبۆ هێواش:**

کابرایەکی کەمفام و دیندار، زۆربەی شەوی تەنیا لە مزگەوت بە عیبادەتی بەسەر دەبرد.

کابرایەکی مەفتوقی ئاوایی لە شەوێکی ئەنگوستە چاودا دەچێتە سەربانی مزگەوتەکە و لە کونی (دووکەڵکێش) بە دەنگێکی بەرزەوە دەڵێت: – فلان من جوبرائیلم خوای تەبارەك وەتەعالا بۆ ئەوەی ڕەوان کردوومە، لەتۆڵەی ئەوەی لە ژیانی دنیای هیچ و پووچدا خۆت زۆر بە عیبادەت هیلاك و مادو کردووە، جەنابت بۆ ئاسمان هەڵبکێشم. ئەوا کندرم شۆڕ کردەوە توند لە تەنگەی خۆت ببەستە.

کابرا لە خۆشیان باڵ دەگرێت و تەنگە تاو کندرەکەی توند توندی چەند گرێ لە قەدی خۆی شەتەك دەدات.

کابرا هەڵیدەکێشێت و هەرکە سەری بە ساپیتەی مزگەوت دەکەوێت و تۆزێك دەیەشێت، دەڵێت:

- هێواش حەزرەتی جوبرائیل.

هەرکە پتری دێشێت و دەڵێت:

- هێواش جوبرائیل.
- جاری سێیەم دەڵێت:
- جبۆ هێواش، جبۆ هێواش.

***

**جدم دەمەوێت:**

لە زەمانی زوو گوندێك لە گوندەکانی دەشتی هەولێر فەقێی دەبێت. لە وەرزی زستانێکی یەکجار سارد و تووشدا سوختەیەك بۆ (قشپل)، ئەو سەردەمە سووتەمەنی سەرەکی بوو، لە ڕۆژێکی بەفر و کرێوە باریندا دەچێتە ماڵی مەرِدارێك.

ژن و منداڵی ماڵەکە هەرکە دەیبینن هاتە حەوشەیان لە دوورەوە بە دەنگی بەرزەوە دەڵێن:

- کورە فەقێ مەیە پێش قلە قشپلێکمان نییە.

ئەویش پشتێنێکی ڕەنگا ڕەنگی ناو لە کەسکی لە پشت دەبێت و. بلەز لە پشتەخۆی دەکاتەوە و بە تووڕەییەوە فڕێدەداتە ناو قوڕ و چڵپاو و لەگەڵ لێدانی پێلەقەیەکی قاییم لە پشتێنەکەی و دەڵێت:

- جدم دەمەوێت ئەو ماڵەی کۆر بکەیتەوە.

ژن و منداڵەکان هەرکە دەزان سەیدە و دۆعاشی لێکردن، هەموویان بە غاردان بە پیرییەوە دەچن و دەیبەنە ژووری ماڵەوە و لەبەر ئاگری دادەنێن و پشتێنەکەی جوان بۆ دەشۆن و بە ئاگر وشکی دەکەنەوە و ئەوجا چارۆکێکی پڕ قشپل دەکەن و هەتا حوجرەش بۆی هەڵدەگرن.

***

**جوولەکە:**

کاتی خۆی (٣) سێ ماڵە جولەکە لە گوندەکەمان هەبوون. خاوەن ماڵە گەورەکەیان ناوی (عیمران) بوو. ئێمە پێمان دەگوت (مام عەمران).

دوو ماڵەکەی دی (ڕەحمان و سەلمان) برابوون و ماڵیان لە یەك حەوشەدا بوو.

عیمران دوو کوڕی هەبوو: (نووری و نیسان). ئەمەیان ئاوزەی من بوو.

نووری و نیسان لە جل و بەرگ و زمان و هەڵس و کەوتی دەرەوەیان هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ ئێمە منداڵە کورد نەبوو.

بەکاسبی خۆیان دەژیاند. بەزۆری عەتارییان لە ماڵەوە هەبوو.. و بە سواری گوێدرێژ لە گوندانیان دەگێڕا و لەم ڕووەوە زۆر زیرەك و چازان بوون.

بۆ نموونە:

جولەکە دووکاندارەکانی شاری هەولێر پشتی دووکاندارە موسڵمانەکانی دەوروبەریان شکاندبوو. هەیانبوو: شەکری بەو نرخەی کڕیبووی دەیفرۆشتەوە. بەر دووکانەکەی ڕۆژ تا ئێوارە سیڕەی لە کڕیاران دەهات. ڕۆژێ بەلای کەمیەوە (٥) پێنج فەردەی دەفرۆشت. ئەوانی دی بە (٥) ڕۆژان ئەگەر فەردەیەکیان بفرۆشتبووایە

جووەکە دەیگوت:

- فەردەی شەکرەکە بە (٢) دوو درهەم دەفرۆشم. (٥) فەردە دەکاتە (١٠) دە درهەم. ئەوە نیو دینارم پێ بڕا. وێڕای ئەوەش بەهۆی شەکرەکەوە زۆر شتی دووکانەکەم لێدەکڕن.

ڕەحمان کچێکی کورتە خنەی یەکجار جوانی هەبوو. هەرکە دەگوترا: (فەهیمی ڕەحمانە جوو) دەبڕایەوە.

ڕەنگە دووساڵ، سێ ساڵ لەمن گەورەتر بووبێت.

جارێك ئێمەی منداڵ لەنێو (قانە) تورکەیەکی بەرماڵان گەمەی (گورز گورزانێ)مان دەکرد، نیسان و فەهیم بەشدار بوون. من خۆم گوێم لە فەهیم بوو بە نیسانی گوت:

- لەو کافرانە نزیك مەکەوە، بێدینن خراپت لێدەدەن.

ناحەقیش نەبوون، ئەو دەردەی ئێمەی کوردی موسڵمان دەماندانێ مەگەر هەر خوا بزانێت. هیچ کاتێك بەچاوی مرۆڤایەتییەوە سەیرمان نەدەکردن. ئیهانەش هەر هیچ. بۆ وێنە:

- من خۆم چەندین جار سەرم لەسەر دیواری حەوشەیان هەڵدەکێشا و پڕ بەزار دەمگوت:

- ئۆخەی ئۆخەی فەهیمە جوان!.

وادیارە خەڵکەکەش بیلبتون بەشتێکی ڕەوایان دەحەملاند. ئەگەرنا یەکجاریان بۆ باوك و دایکمیان بگێڕابووایەوە دەلحاز سیر هەنجنیان دەکردم.

هەتا لە ناوچەکەمان بوون، ئێمەی موسڵمان ئەوەمان هەڵبەستابوو:

دووکەس لە ڕێیان زۆر خۆش دەڕۆن:

- جوو لەترسان، فەقێ لەبرسان.

لەنێو شاری هەولێر خراتر. موسڵمانەکان شەوان دەچوون دزیان لێدەکردن و ئەوجا بەحەڵاڵیشیان دەزانی. بۆیە هەرچی خانووی جووبوو لەنێو شاردا حەوشەی گچکە و دیوار بڵند و کۆشکدار و لەپاڵ یەکتر و کۆڵان تەسك و تریسك. ئەگەر سەیری کەلاوە خانووەکانیان، لە شاری هەولێر بکەین بە باڕە باڕ دیارە.

پیسترین ئیهانە، لەلایەن ئێمە کوردی موسڵمانەوە ئەمە بوو:

ئەگەر یەکێکمان بچووبووایە سەر دەستاو پێیان دەگوت:

- کێوە دەچیت؟.

ئەویش دەیگوت:

- دەچم قەردی جووان دەدەمەوە.

کەچی بەداخەوە لەئاست داگیرکەرانی خاکمانەوە خۆمان هەردەم بە بچووك و ملکەچیان دەحەملێنین. ئەوجا جووەکان سەت قات لەئێمە کورد دلێر و چاونەترس تر بوون. هەرچەند خێزانێکیان لە وڵاتێکدا خڕ کردنەوە و بە زیرەکی و بلیمەتی و دڵسۆزی و هەوڵ و تەقەلای ماڵی و سیاسی

بەردەوامیانەوە خۆیان لە چەقی جەرگەی دوژمانەوەکردە حکومەتێکی بەهێز و توانای وا بە هەموو دەوڵەتە ئیسلامییەکان لەناو ناچن. کەچی ئێمەی کوردیش لە (٣٠) سی ملیۆن زیاترین و (سۆگە)یەکی کەمیش سنوورمانی بڕ نەکردووە، ئەوجا لەجیاتی (پێ)ی کۆشان و مەردایەتیمان لەجێ پێی پیرۆزی ئەوان دابنێین و خۆمان هەڵکوتینە ڕێزی مرۆی سەربەرزی ئەو جیهانەدا، جاشاتی و کرێگرتەی داگیرکەری خوێن مژانمان دەکەین و هیچ هەنگاوێك لەم ڕووەوە بێ ڕەزامەندی ئەوان ناوێین و بگرە عەبای پیرۆزی هەستی نیشتمانی و کوردایەتیمان بەسەر شان و شەپیلکی هەرە چەتوون و خوێنرێژ و دەغەزدارەکانی ئەملا و ئەولامان هەڵکێشانەوە و کوێرانە، لە پێناوی بەرژەوەندیان ئارەقەی شەکەتی و هیلاکی دەڕێژین، بەحسێبی کورد و کوردستان پەروەریشی لەقەڵەم دەدەین. تا سەریش بمێنێت، پاشەڵ عاجباتیان دەبینێت.

***

هەرکە ماڵە جووەکان ڕۆیشتن هەموویان هاتنە ماڵی ئێمە و خوا حافیزیان بە موشتاق و گریانەوە کرد.

چەند گەنجێکی ئاوایی خۆیان تەیار کرد، لەکاتی ڕۆیشتنیاندا فەهیمی بفرێنن و بۆ فتوادانیش هاتنە کن باوکم. کەچی باوکم بەرپەرچیانی بە توندی داوە و دەلحاز هەڕەشەی لە ئاغای ئاوایی کرد و گوتی:

- ئەو کارە قەڵپە هەرگیز درووست نییە ئەتووش لەم ڕووەوە بەرپرسیت.

ئەمە گەنجەکانی پاشگەز کردەوە.

***

**جیرە جیری قەڵەم:**

بێوەژنێك یەك تاکە کوڕی دەبێت. ئەویش لەناو فەقێیانی دەخوێند. جارێك زۆر درەنگ و لە وەرزی زستانێکی تووش دەچێتەوە.

دایکەکـە ئێـوارە خـواردنێکی باشــی بــۆ درووســت دەکـات و شــەویش پێخەفێکی گەرمی پێدادەدات.

فەقێ هیلاك و سەرمابردە هەرکە تێربـوو.. و گـەرمیش بـووەوە ناوەنـاوە لەبن جێگادا دەنگێکی لێوە دەهات.

دایکە پێی گوراح خۆشدەبوو.. و بە پێکەنینەوە دەیگوت:

- ئـەی لەبـەر جـیڕی جـیڕی قەڵـەمت مـرم ڕۆڵـەی فـەقێ. لـەکاتی نووستنیشدا داکەسانی نییە و هەر جیڕە جیڕی قەڵەمی دێت.

***

**جێم کەن جێم کەن:**

لە ڕۆژی قیامەتدا، کاتی تێك قژقژانی خەڵکە هەزارە زیلەکە و چاوەڕوانی هەق و حسێبدا یەکێك تەنگەتاو دێت و بە دەنگی بەرزەوە دەڵێت:

- جێم کەن، جێم کەن من شەهیدی کەپکی (حەمەد ئاغا)مە.

یەکێك بەڕوویدا دەتەقتەوە و:

- سەبر بگرە هۆ باب سەبر بگرە. من شەهیدی بەدرم هێشتا نەچوومەتە بەهەشت ئەوجا تۆرەی جەنابتە.

***

**چابوو ئەتوو نەچویت:**

لەکاتی دۆلار گرانیدا نووسینگەیەك تەلەفۆن بۆ ماڵێك دەکات و دەڵێت:

- وەرن دۆلارتان لە دەرەوە بۆ هاتووە.

ئافرەتەکە لەماڵ دەبێت و ویستی بچێت پیاوەکەی بەسەردا هاتەوە و پێی گوت:

- لە فلان نووسینگە تەلەفۆنمان بۆ کراوە دۆلارمان بۆ هاتووە.

پیاوەکەش دەچێت.

خاوەن نووسینگەکە دەڵێت:

- دەبێ بە کیرت ئیمزا بکەیت.

کابرا تووڕە دەبێت و بە هەڵچوونەوە دەڵێت:

- كاكە قەشمەریمان لۆ پێدەكەیت!.

خاوەن نووسینگە ناچار بۆ ئەوەی بڕوای بێت ئەم سوێندە مزرەی پێ دەدات:

- حەلاڵی دنیایێ لەمن حەرام بێت هەتا بەكیر ئیمزای نەكەیت ناتدەمێ.

كابرا ناچار دەبێت لە پەنایەكەوە بەسەری كیری ئیمزا دەكات.

هەركە دەچێتەوە دەڵێتە ژنەكەی:

- هەرچابوو ئەتوو نەچوویت.

***

**چاوەش:**

لە زەمانی زوو هەركە وەرزی دروونەی دەغڵدا دەهات چاوەشی دۆستی ئاغای گوندەكان پەیدابوو.. و دەچووە سەر پەرێزان قرشە خڕبكاتەوە، زۆربەی هەرزۆری جوتیارەكان، لەترسی زمانی پیسی چاوەشەكە نائومێدیان ڕەوان نەدەكردەوە.

ساڵێكی نەهات چاوشێك دەچێتە سەر پەرێزی جوتیارێكی یەك لە گوندەكانی دەشتی هەولێر جوتیارەكە پێی دەڵێت:

- كاكە لۆ خۆم نییە لۆ تووی لەكێ بینم.

هەر ئەو ڕۆژە چاوەشەكە ئەو بوختانەی هەڵبەستا:

- هەركە لە پەرێزیان نزیك كەوتمەوە، ئاگایان لەمن نەبوو هەوەلجار دیتم: بابە سواری كوڕە بوو، لەدواییدا كوڕەش سواری بابە بوو.

***

**چمان لەجوانیدایە:**

كچێكی گێلێ و شێتۆكە و نەزان زۆر دەوڵەمەند دەبێت. ڕۆژێك كیژ و ئافرەتانی دەورووبەری پێی دەڵێن:

- بۆ مێرد ناكەیت؟.

ئەویش لەبەر گێلی خۆی نەیدەزانی مێرد كردن چییە. وادەكەن مێرد بە كابرایەكی زۆرزان و مەفتووق بكات.

شەو بە ئەنقەست لاقەی ناکات. بۆ بەیانی ئافرەتەکان دەڵێن:

- خۆشبوو؟.
- ناوەڵڵا چ خۆش نەبوو.

زانیان لاقەی نەکراوە و پێی دەڵێن:

- هاتە لات چی کرد؟.
- هاتە لام نووست و هەتا بەیانی هەر پرخ و هۆڕی دەهات.

پێی دەڵێن:

- ئەو شەو بە مێردەکەت بڵێ: (دەبێ گەمەم بە دار ڕبە)کەت لەگەڵ بکەیت خۆشە.

بۆ شەوی دوایی دەڵێت:

- گەمەم بە دار ڕبەکەت لەگەڵ بکە خۆشە.

یەکسەر دەست بە گریان دەکات.

- لۆ دەگرییێت؟.
- دار ڕبە بە پارە دەکڕێت و منیش فلووسێك شك نابەم.

کچە هەندەك پارەی لەچنگ دەنێت و دەڵێت:

- هەنووکە برۆ بیکڕە.
- کابراش پاش پارە وەرگرتن دەچێتە دەرەوە و دوای دەمێك خۆ بواردن دەگەڕێتەوە و دەڵێت:
- کڕیم.

سێ جاری لەگەڵ جووت دەبێت و ژنە زۆری پێ خۆش دەبێت و دەستی پێدا دەهێنێت و دەڵێت:

- ئەو درێژە دار ڕبەکەیە ئەدی ئەوانەی بنەوەی چنە؟.
- گولێنگی دار ڕبەکەنە.
- لۆ چ باشن.
- لۆ جوانییە و بەس.

ئافرەتەکە ئاخێکی گەورە لەبن زگییەوە هەڵدەکێشێت و دەڵێت:

- ئێمەی فەقیر چیمان لە جوانی دایە. بریا پارەی گولینگەکانیش لە درێژایی دار ڕیەکەت خەرج بکردابووایە.

***

**چیتر میز لە چایەتان ناکەم:**

فەراشێکی قوتابخانەیەك، وێڕای گێلی و نەزانی زۆر زەغەل و عەمەل مەندە دەبێت و هیچ ئیشێکی پێ نەدەسوورا. بە هەزار نالی عەلی چایەی بۆ مامۆستاکان پێ لێدەندرا. کەچی لە قسان ئاوقاتێك بوو هەر مەپرسە.

مامۆستاکان هەردەم سەرکۆنەیان دەکرد و تان و تەشەرەیان لێدەدا و ناویان نابوو: (قسە دروستی عەمەل سست) ڕۆژێك مامۆستاکان زۆری هەراسان دەکەن و ئەویش لە شروان دەست بە گریان دەکات.

مامۆستاکان ئەوسا زگیان پێدەسووتێت و ئەمە وای کرد هەر زوو پەشیمان ببنەوە و گوتیان:

- ئەگەر ئەتوو ئەوجارە گەردەنمان ئازاد بکەیت ئێمە جارێکی دی هەتا لێرەیت شەرت بێت دڵت نەشکێنین.

ئەویش بە پێکەنیەوە دەڵێت:

- هەتا ئەنگۆ گەردنی من ئازاد نەکەن ئەمن گەرندی ئێوە ئازاد ناکەم.

ئەوانیش لە تەمبەڵییەکەی بترازێت خراپەی دیان کەم و زۆر لێنەدیتبوو، بۆیە هەر زوو گوتیان:

- گەردنت سەت جا ئازاد بێت.

ئەویش دووبارە لە حریتە دەداتەوەو دەڵێت:

- گەردنی هەمووتان ئازاد بێت.

هەتۆب شین بووەوە و:

- شەرت بێت لە شەرتی خوا منیش لەمەودوا چیتر میز لە چایەتان نەکەم.

ئەوانیش ئەوسا عاجباتیان هات و بە حەیر مانەوە گوتیان:

- پێمان ناڵێیت: میزی چی!؟.

- زۆر جا وادەبوو چایەکەی لێمدەنا کەم دەردەچوو.. و بەشی ئەنگۆی نەدەکرد، منیش نەمدەتوانی هەستم دەرماچایە و ئاوی دیکە لە چاپەستی ڕەنگەکە بکەم و لەسەر ئاگری دانێمەوە هەندە میزم تێدەکرد.

***

**حەزرەتی عیزرئیل بەقوربان:**

پیرێژنێك لە دارەتی دنیاییدا یەك تاقە کوڕی دەبێت کوڕە نەخۆش دەکەوێت و حاڵی زۆر شڕ دەبێت. پیرێژنی دایکیشی شەو و ڕۆژ هەردوو دەست بە دوعاوە بەرەو حەوا بەرز دەکردەوە و دەیگوت:

- خودایە من بکە قوربانی کوڕەکەم.
- خودایە مەرگم بەپێش مەرگی ئەو بکەوێت.
- خودایە ڕووحی من بکێشە ڕووحی کوڕەکەم مەکێشە.

پاش ڕۆژ ئاوا بوونە و دنیا شرەکە بوو... و پیرێژنیش هەر دەست بە دوعاو نزاوە لە بارەگای خوا دەپاڕاوە. لەوساتەدا چێلێکیان دەبێت لەحەوشە بۆ ئاو خواردنەوە سەر لەنێو مەنجەڵێکی پڕ ئاو دەنێت. سەری لە مەجەڵەکە عاسی دەبێت و نایەتە دەرەوە. مانگاکە بەرەو دەرگای ژووری ماڵەوە هەنگاو دەنێت. پیرێژن هەرکە دەیبینێت ئەو شتە ڕەشە زەبەلاحە و سەری ڕەش و زۆر گەورەیە و دنیاش سامالە ئاوی لێدێتە خوارەوە دەلحاز بە فرشتەی ڕووح کێش تێدەگات و دوعا و نزای لەیاد نامێنێن و هەترەشی دەچێت و لەپاش غیرەتدا بەرخۆیەوە بەناورانەوە دەڵێت:

- حەزرەتی عیزرائیل بەقوربان ئەمن نەخۆشەکە نیمە ئەمن نەخۆشەکە نیمە.

بە دەست ئاماژە بۆ کوڕەکەی دەکات و دەڵێت:

- قوربان ئەوە نەخۆشەکەیە. بەڵێ ئەوە نەخۆشەکەیە.

***

**حەوت ژن و هەلاویرتکەیەك:**

نزیکەی (٦٠) شەست ساڵ بەر لە ئێستا پیاوێکی زۆر بە تەبیعات و کەشخەم دیت تەمەن دایهێنا بووەوە. من وای بۆ چووم لە کاتی گەنجاتیدا بەینی لەگەڵ ژنان زۆر کۆك بوو بێت. بۆ دڵنیایی پێمگوت:

- خاڵە لە ژیاندا چەند ژنت هێناوە؟.

بەزەردە خەنەوە گوتی:

- حەوت ژن و هەویرتکەیەك.

بە حەیرمانەوە گوتم:

- لە هەلاویرتکەکەت ناگەم.

ژنێك بوو بە مارە و تەلاق هەڵمگرت و چەند ڕۆژێکم لابوو پاشدان دامەوە خاوەنەکەی.

***

**خەریج زراعە:**

لە زراعە تەخەروجم کرد و لە گوندێکی سەر سنوور بە مامۆستا دامەزرام. ئێوارە موختاری ئاوایی بردمیە ماڵەوە. تازە ژنی دووەمی گواستبووەوە. شەو ڕاشکاو هاوارێك بە دوای موختارەوە هات. من لەگەڵ خێزانەکەی ماینەوە. هەرهەندەم زانی ئافرەتەکە گەنجێکی جوان بوو هاتە بن پێخەفەکەمەوە. تومەز بە موختاری شەست ساڵە بڕی نەشکابوو. هەرچەند هەوڵ و تەقەلایدا و دەستەو دامێنم بوو، لەبەر باری ئایینی بوو بێت، یان کۆمەڵایەتی بۆم نەسەلماند.

بەیانی هەرکە هەستامەوە دیتم (٩) نۆ کەڵەباب و مریشکێکیان لە حەوشەیە.

بە سەر سوڕمانەوە گوتم:

- حەکوو ... نۆ کەلەشێر بۆ یەك مریشك! . لای ئێمە بە پێچەوانەیە.

ئافرەتەکە یەکسەر لە حریتەیەکی وایدا لە دوورە دەبیستراو جا گوتی:

- ئەو کەڵەبابانە هەموو خەریج زراعەنە.

**خدر و ئۆمەر:**

لە ماڵی من و دراوسێکم بترازێت ماڵ نەبوو، لە گەڕەکەکەمان حەفتەی کەرەتێك و دووان پرتە و بۆڵەی لە دەرەوە نەبیستریێت. بۆیە هەردووکمان ناومان، لە گەڕەکەکە بە (خدر) دەرکرد بوو. کە دەگوترا: (عەولای قەراجی و مەردانی قەلاتی) دەبڕاوە.

ڕۆژێك من لەگەڵ دایکی منداڵان تێك گیراین بۆ ئەوەی دەنگمان دەرنەچێت، من بە هەڵەداوانەوە بۆ دەرەوەی حەوشە تێمتەقاند.

پیاوانی گەڕەك ڕۆژانە ئاسا بۆ کات بە سەر بردن لە بن دیواری حەوشەی بەرامبەرمان، کە بە گردی (گەمبۆلان) مەشهوور بوو، دانیشتبوون، کەمنیان دیت دوای دیقەتدانێکی زۆرەوە لە حریتەیەکی وایاندا لە گەڕەکەکە دەنگی داوە و گوتیان:

- عەولا وا پێدەچێت لە ماڵەوە لۆت نەگونجابێت لە نەینۆك تەماشای سەر و پۆتەلاکی خۆت بکەیت؟.

وەك دێمکە ئاوێکی شەویم پێدابکرێت لە جێگەی خۆم سارد بوومەوە و لەو کاتەدا مردن بە پارە بووایە دەمکڕی، هەرکە دیتم لە باتی جەمەدانی ئاوەڵکراسی دایکی منداڵانم لە سەر ناوە.

مەردان بە پێکەنینێکی شانازییەوە سینگی لە ئاستمدا هەڵکێشاو گوتی:

- کەواتە خدری گەڕەك ئەمڕۆ تەنیا هەر کاکی خۆتە و بەس.

ئەوە قەبرغەی گرتم و بە خۆم نەوەستام و گوتم:

- نەخێر قوربان لەو گەڕەکە تەنیا من و تۆو ئۆمەرین. ئەوانەی دەنگیان دێتە دەرەوە، دەوێرن لە بەردەمی ژنەکانیان زیت ببنەوە کەچی من و جەنابت ئەوەندەشمان لە دەست نایەت، ئەوەی پێشتر دەمانبڕی و دەمانکوشت هەر بەراز بوو .. و بەس.

- هیچ وا نییە و ئەتوو گیزان لە باخەڵی خۆت دەژمێریت.

- مادام ئەوەندە بە خۆتەوە دەنازیت مەیدان مشکان نەخواردییە.

ئەمە لێیکردە غیرەت و یەك پێ هەستاوە و گوتی:

- هەنووکە کەرخی پیاوان دەردەکەوێت هۆباب.

ئەمەی گوت و تەرحی ئەسپی غورد و سەرکەش خێرا خۆی کوتاوە حەوشە. دوو سێ قوم لە جگەرەیەك بدەیت تەنگەتاو بە ڕەنگ پەڕین و تەتەلێوانەوە، گەڕاوە.

به پێکەنینێکی تەوسەوە پێمگوت:

- ها .. خدرە ئەفەندی دەڵێیت دایکی منداڵان بە گژت داچووە و سەرتی شکاندووە؟!.

لەگەڵ سڕینەوە خوێنی لاسەری و گوتی:

- نەحەد و .. وار.

***

**خەنجەری وەسیەتێ:**

پیاوێك وەفات دەکات و خەنجەرێکی دەبانی زۆر باشی دەبێت و پێش مردنی دەڵێتە کوڕەکەی:

- ڕۆڵە وەسیەتە پاش من دەبێ ئەو خەنجەرەی بدەیتە بێ ئاقڵ ترین کەس لە دنیادا.

کوڕەش دوای مردنی باوکی و گەڕانێکی زۆر دەچێتە شارێك خەڵکەکەی بیلبتوون خڕبوونەتەوە و یەکێکیان لە ناوەڕاستیاندا لینگ لە سەر لینگ دانیشتووە و کەیفی یەکجار خۆشە و حریتەی لە دوورەوە دەبیسترێت.

یەکێکی تریش لەتەکی دانیشتووە و هەر کەس دەچێت تفێکی زار جوانەی لە دوڕچاوی دەکات.

کوڕەش پرسیار دەکات و دەڵێت:

- ئەوە چییە؟.

ئەوانیش دەڵێن:

- ئەوەی تفی لێدەکرێت سەرۆکی وڵات بووە و ئەمڕۆ شەرتی هەڵاتووە و ئەوی دیش دەبێتە سەرۆك.

هەرکە ئەمەی زانی خەنجەرەکەی دەلحاز دەداتە سەرۆکە نوێیەکە.

***

**خوات بە خولامی دایکت بکات:**

پیاوێك دایکی دەموچاوی زۆر ناشیرین و لپر لپر دەبێت.

ڕۆژێك دایك ناشیرین لەگەڵ مەلایەك دەکەوێتە دەمە قاڵییەکی توند و تیژ. لەسەر ئەوەی دەڵێت:

- مامۆستا شەوە درۆیە و هەر وجوودی نییە.

مەلاش دەڵێت:

- خوات بە خولامی دایکت بکا، ئەگەرنا شەوە ئەتووی بردبوو.

پیاوەکە بە مەراقە دەڵێت:

- کوو..!؟.

هەرکە شەوە چوو ئەتوو ببات، چاوی بە دایکت کەوت، وایزانی شەوەیەکی دیکەیە و گوتی:

- ئەو شەوەیە هەر دەیبات ئەمن لۆ خۆم پێوەی ماندووە بکەم.

***

**خوارم کرد بووەوە:**

مەلایەک زۆر حەز لە ژنی کابرایەکی دراوسێی دەکات. نەیدەزانی چۆن لە ژنەکەی بە ئاوات بگات. چەند ڕۆژ دەکەوتە دنیای تەکبیر و مشوور خواردن و لێکدانەوە. تاکو ڕۆژێك پیاوەکە دەبینێت وا بەرەو قیبلە لەسەر ئاوەو یەکسەر پێی دەڵێت:

- مادام بەرە و قیبلە دەستت بە ئاوگەیاند تەڵاقت کەوت.

بەم چەشنە ژنەکەی لە دەست ڕادەستێنێت بۆ خۆی مارەی دەکاتەوە.

کابراش لەو ڕۆژەوە سایەدی پیاوەکە دەکات تاکو ڕۆژێك دەیبینێت بەرەو قیبلە دەست بە ئاو دەگەیەنێت و پێی دەڵێت:

- کوڕە تۆش بەرەو قیبلە دانیشتوویت تەڵاقت کەوت.

مەلایەکە بە پێکنینەوە دەڵێت:

- خۆ من وەك تۆ گەوج نیمە سەرەکەیم خوارکرد بووەوە.

***

**خۆت ماوی سەرم:**

کاربرایەکی نەخۆش میزی فەحس دەکات. لەبەر کەمتەرخەمی بەرپرسانی (موختەبەرەکە) ناوی کابرا بە هەڵە، لەسەر شووشەی میزی ئافرەتێکی دوو گیان دەنووسرێت.

هەرکە ئەنجام دێتەوە بە کابرای دەڵێن.

- تۆ زگت هەیە.

کابرا ئەوسا باوەڕی دێت و سەری غەزەبی لە ژنەکەی خۆی بادەدات و دەڵێت:

- حورمێ چەند جارم پێگوتی خۆت ماویێ سەرم خۆت ماویێ سەرم.

***

**خۆ چ ناتخۆم:**

کابرایەکی ناوچەی (شارباژێڕ)ی سەر بە پارێزگای سلێمانی، خۆراکی بە زۆری نانە (هەرزن) دەبێت. ڕۆژێك دەچێتە (زەرووری) هەرچەند هەوڵ و تەقەلا دەدات بەرخۆیەوە گووی دەرنایەت و دەڵێت:

- دەسەر بێنە دەرەوە خۆ چ ناتخۆم.

***

**خۆشەویستی زاوا:**

زاوایەك سەردانی ماڵی خەزووری دەکات.

ئێواره هەرکە شیو داندرا خەسووەکەی چوو ملاّکە ڕوونێکی تایبەت لە نێو قاپە شیوی زاوا کرد.

لە دووبارە کردنەوەدا دەڵێت.

- نەکوو شیوەکەت بێ ڕوون بێت.

ویستی سێبارە هۆ بداتەوە، خەزوور دەلحاز دەچێت هیزەی ڕوون دەهێنێت و دەرکی لە دەمی زاوا دەکات و دەڵێت:

- سەگباب دەوت بگرەوە خەسووت بەو حاڵە نەبێت دڵی داناکەوێت.

***

**خۆ نامخۆیت:**

لە پەنجاکانی سەدەی رابردوودا مامۆستایەکی سەرەتایی بە لەش گەورە و زەبەلاح دەبێت دەرس لە قوتابخانەیەکی ناوشاری هەولێر بە پۆلی یەك دەڵێت.

جارێك مامۆستا لە کاتی دەرس گوتنەوەدا باویشکی دێتێ و دەمی بەشدەبێتەوە.

یەك لە قوتابییەکان بە ڕەنگ پەڕین و تەتەڵەی لێوانەوە دەڵێت:

- مامۆستا خۆ نامخۆیت!.

***

**دایکم وەدڵێت:**

ڕۆژێك کۆمەڵێك جوامێر و ڕدێن سپی دانیشتبووین. لە ناکاو منداڵێکی شەش حەوت ساڵان بە هەڵەداوانەوە پەیدا بوو .. و ڕووی بێ پەردەی شەرمەوە لە منی حەفتا ساڵە کرد و گوتێ:

- ئەتوو پیاوێکی بێناموسیت.

لە شروان هار و هاج بووم و چاوی دەغەزم چووە پشتە سەرمەوە و ویستم زارهەڵێنم، کەچی ئەوەی تەکمەوە بە هەڵچوونەوە گوتی:

- هەتیم دەوت بگرە! دەزانی چتگوت!.

- بەڵێ دەزانم و زۆریش بێناموسە.

منیش پشکم دەهێنـاو یـەکێکی دیکـە بـە دەنگـی بـەرزی غەزەبـەوە گوتـی:

- ئەتوو چت لێدیتووە .. هەتا .. ئەو ...
- نەخێر.
- ئەدی کوو .. وە دەڵێیت هەی ...
- دایکم وە دەڵێت دایکم.

واژی بوونـەوەی ڕاسـتییەکە بـووە جەلعـە ئـاوێکی شـەوی و بـە تـۆقی سەرم داکراو لە جێگەی خۆم ساردبوومەوە. ئەگەر مردن لەم ساتـەدا بـە پارە بووایە دەمکڕی. ناچار چاوی مۆنیم بە خۆمدا شۆڕ کردەوە.

***

**دەبێ ئەو جارە لە پێشەوەم بنێیت:**

سەردەمایەك گوندەکانی خۆشناوەتی جادەیـان بـۆ نەچـوو بـوو. هـەموو ئۆتۆمۆبێلێـك نەیـدەتوانێت بچێت. ئـەوەی دەشچـوو بـە زۆری جێـب بـووە. هەڵتەك هەڵتەکی زۆر بووە. سوار بووانی پشتـەوە پێ هەراسان دەبوون.

هــەرجێبێك بچـوو بووایــە گونـدێك، دەبووایــە ســەر لــە ئێـوارە نەفــەر پێشەوەی بۆ خۆ بەڕادان بدات. ئەگەر نا بەری نەکەوت.

ئێوارەیــەك ئافرەتێـك دەچـێتە لای شــوفێری ئــەو جێبــەی ئامەشــۆی دێیەکەیان دەکات و دەڵێت:

- کـاکی شـوفێر ئـەتوو هـەموو جـارێ لـە پاشـەوەم دەنێیـت، دەبـێ ئەوجارە لە پێشەوەم بنێت.

شوفێرەکەش دەڵێت.

- باشە.

***

**دەتوانی قەردەکەی بدەیتەوە:**

ئافرەتێك دەچێتە لای مەلایەك و دەڵێت:

- مامۆستا مێردەکەم، پێش مردنی زۆری داوا کرد لەگەڵی جووت ببم منیش نەمسەلماند. دەبێ گوناحم نەگاتێ؟.

مەلا گوتی:

- ئەمڕۆ دەتوانی گوناحەکەی لەسەر خۆت لابەریت و قەردەکەی بدەیتەوە.

***

**دەروێشاتی:**

لە دوای ڕاپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێر، دژی ئاغان ساڵی (١٩٥٣)ی سەدەی ڕابردوودا، دوو شێخ هەر یەکەیان بە کۆمەڵێك دەروێشەوە، بۆ کزبوونی هەستی ڕاپەڕینەکە، بە ناوی دین و تۆبەدانی خەڵکەکەوە، لە دێهاتەکانی دەشتی هەولێر، بەتایبەتی ئەو گوندانەی سوێندیان تێداخواردبوو، چاو ئێشانە دەگەڕان. بگەیشتبوانە هەر دێیەك، پێش پشوودان زیکریان دادەبەستا و تەپڵ و دەفەیان لێدەدا و لە گەرمەی زیکرەکەدا زەرگ و شیریان لە خۆ دەدا و پاشدان تۆبەیان دەداخەڵکەکە.

هەژار و مەزلووم و غەدر لێکراوەکانیان دەکردە، دەروێش و ئاغاکانیش خەلیفە.

بۆ ئەوەی خەڵکەکە کە باوەڕیان پێ بهێنن و زۆربەیان تۆبە وەرگرن، دەروێشێکی یەك لە شێخەکان هەر جارێ کە زیکر دادەبەسترا ورگی خۆی ڕووت دەکردەوە و لوولەی تفەنگی تێدەکرد و گرمەی لێوە دەهێنا. تەنیا شوێن گوللەکە ڕەشدادەگەڕا و بەس.

خەڵکەکە بیلبتوون بە موعجیزەیان دەزانی و کۆمەڵ کۆمەڵ تۆبەیان بە موشتاقەوە لە سەردەستی شێخەکە وەردەگرت.

دەروێشێکی شێخەکەی تر زۆری لە دڵ گران دەبێت. شێخی خۆشی زۆر بە پایە بەرزتر دەزانی لە شێخەکەی دی. ئەمە هانیدا، لە گوندێك هەرکە زیکر دابەسترا و پڕ بەزار هاواری کردو:

(قۆندەری شێخی من سەت قات لەسەری شێخی دەروێش عەولا رۆکی تفەنگ وەشێن پیرۆز و گەورەترە، کوو گوللە ئەوی نابڕێت، بێگومان منیش نابڕێت).

لەبەر نەخوێندەواری و کەمفامی و بێ ئاقڵی خۆیەوە هەرگیز هەستی نەدەکرد گوللەکەی ئەو تەنیا بارووت بووە و بەس. فیشەکێکی کارخانەی کوللە سۆری لەبەر تفەنگە قۆنداغ بە گرێیەکەی ناو دەدوازدە جار بە حایی و حوویەوە، لەگەڵ ورگ ڕووت کردندا هاواری دەکات و دەڵێت:

- هیمداد هیمداد پیری پیران هیمداد. هیمداد هیمداد شێخی قوتبی مەدار هیمداد.

هەتا دەنگی لەبەردا بوو گوتی:

- قوربان بە هاواری دەروێش بایزی خولامت وەرە.

تەقەی لە موسولدانییەوە دەهێنێت گرمتی قوونی کردە شەبەقێك و بووە شەهیدی بەرپەچدانەوەی جم و جۆلی هەستی نیشتمانییەوە.

***

**دەستی تۆم شکاوە:**

شوانی مەڕدارێك زیز دەبێت.

ئاغای گوندی بە دوایداچوو نەگەڕاوە. مەلا چوو .. و پاشدان ڕیش چەرمووان نەگەڕاوە.

تا شوانێکی دۆست و هاوتەمەنی خۆی بەدوای چوو .. و هەر لە دوورە کلکە کۆپاڵێکی لە پاشەڵیەوەی هەڵدا و پێی گوت:

- وەرە بگەڕێوە خۆڕی.

ئەویش بە دڵساردییەوە دەڵێت:

- چبکەم دەستی تۆم شکاوە دەنا بە تەما نەبووم بگەڕێمەوە.

***

**شێتێك:**

کابرایەکی دێهاتی کوڕی شێت دەبێت و دەیباتە تەکیەی شێخێك لەشار.
پاش چەند ڕۆژان بە دوا دادەچێت و شێخ پێی دەڵێت:

- بیبەوە چاك بووەتەوە.

باوکەش زۆر هەوەستی پێدێت و پڕ دەداتە ماچ کردنی دەستی شێخ.

بۆ لای کوڕەکەی دەچێت، لە ژێر زەمین دەبێت، بە گوراح خۆشییەوە ئەملا و ئەولای ماچ دەکات و دەڵێت:

- کوڕم سوپاس بۆ خوا بە هیممەتی شێخ چاك بوویتەوە !.

کوڕەش دەڵێت:

- بەڵێ: بە هیممەتی شێخ چاك بوویمەوە.

دووبارە سوپاسی خوا دەکات و بەزمان دەرهێنان پێی دەڵێت:

- لە گەڵم دێیتەوە ؟.

***

**دەنا هەرکچی:**

ئافرەتێك حەوت مێردی کردبوو .. و پێیان گوت:

- چی مەلا بوو؟.
- نەخێر.
- دەنا هەر کچی.

***

**دەنگی کەرێت خۆشە:**

دوو خۆشناو لە کارواندا بە یەکەوە دەڕۆیشتن کەری یەکیان زەڕی.
ئەویتر گوتی:

- برا دەنگی کەرێت زۆر خۆشە.

خاوەن کەر زۆری کەیف پێدێت و دەڵێت:

- برا ئەوە لە پیاوەتی خۆتە ئەگەرنا من چ چاکەم لەگەڵ تۆ نەبووە تا مەدحی کەرەکەم بکەیت.

***

**درۆی ئاسمانان:**

لەنەوەی شێخ ڕەزایانم کە فەرموویانە: (ئەگەر خودا سەروسیمایەکی قۆز و زمانێکی لووسمان بداتێ ڕزقمان لێیناوێت).

منیش لەم دووانە هیچ کەم و کووڕێم نەبوو. تەماعیش دین بەرەو هەوای نانی درۆزەش لەسەریدام.

فەقێ عەزیزی دراوسێمان کاتی خۆی سپیارە و جزوعەممەی خوێندبوو. (فەقێی) بە دواکەوتبوو. ئەگەرچی هەڕەی لە بڕەی دەرنەکرد، بەڵان زمانلووس و لەبلەبانێکی وابوو شەیتانی لە خشتە دەبرد. کردمە ڕەفیقی سەفەرەکەم و برابەش لە هەرچی بەنسیبمان دەبێت. بەو شەرتەی لە هەر جێیەك قسەیەکی جڕناو فڕنام لە دەو دەرهات ئەو بە گوێرەی عەقڵی خەڵکەکەوە بیخاتە قاڵبی کەرامەتەوە. گوند بە گوند گەڕاین و پارەیەکی باشمان دەست کەوت.

ڕۆژێك لە دیوەخانێك، لەسەر سفرەی نانخواردن، من پاش چاوخستنە سەر یەك و بڕێك ڕامان لەبەر خۆمەوە هەڵمدایە:

- دەنگی سەیانم لە عاسمانەوە لە گوێ دێت.

فەقێ عەزیز هەرزوو بە دەست لەسەر سینگ وەریگرتەوە گوتی:

- فەرموو دەکەی جەنابی حەزرەتی شێخ لە کونی کار ڕاسترە.

خەڵکەکە لێکڕا بە واق وڕمانەوە دیقەتیاندا دەوولەوسی و ئەویش بە ڕووێکی ئاساییەوە گوتی:

- بیلامانا بارگینێك تۆ پیوە و سەگی ئاوایی ناو هەناویان خواردووە. دێڵە سەگێکیش لەناو دەندەرۆکەکە ترەکییە و چەند داراشی گەورە و زەبەلاح لاشەکەیان لۆحەوا بەرز کردووەتەوە، هەتا چ گۆشتی پێوە

هەرکە دووەم جارم بەرچاو کەوتەوە خێرا خۆم گەیانە نزیکی و بێ ئەوەی هەست بکات قەرە بە قەرەی هەنگاوم دەنا و هەست ڕاگربووم. تا تەواو تێیگەیشتم بانگی دەکرد:

- ڕەحمەت لەوی: لەبابی وی دوو کیلۆ شەکر و پاکەتە دەرمان چایەك لەناو مەقرییەکییە و لە دووکانێکم داناون، دووکانەکە لە کێندەرە هۆ ... ی.

***

**ڕبە لە ماڵی چ گەوادییە:**

دوو کەس گوندێکیان لە دەشتی هەولێر بە یەکەوەنا.

یەکیان خۆی بە ئاغا دەزانی و لە دەراوی ئەوی دی ئاوی نەدەخواردەوە و دەسەڵاتیشی نەبوو بە سەریدازاڵ بێت و سوخرە و بێکاری پێ بکات.

بە هەردوو ماڵ یەك ڕبەیان هەبوو.

ڕۆژێك ئاغا ڕبەی پێدەویست و دەیزانی لە ماڵی کرمانجەکەیە و لە خۆشی ڕانەدەدێت بڵێت:

- ڕبەکەم لۆ بێنن. بە خۆشی بێژی هەرگیز نەدەهات بچێت. ناچار بەم جۆرە .. ئێە بەڵکو کرمانجە و ڕبەکەی بۆ دەهێنێت بە دەنگ زۆر بەرزەوە گوتی:

- ئەری ڕبە لە ماڵی چ گەوادییە؟.

***

**ڕست = (ڕستە):**

کیژە مەلایەکی گوندێك لە گوندەکانی دەشتی هەولێر (ڕستە)یەکی جوان و ڕازاوە، بە دڵ و داو بۆخۆی درووست دەکات. ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیشت، مەلا کێژەکەی دەداتە جوتیارێکی دەوڵەمەندی نەخوێندەوار.

کچەش وای پێخۆشبووە بدرێتە مەلایان. دوای مارە کردن ڕستەکەی فرێدەداتە پێش باوکی و دەڵێت:

- من ئەوەم درووست کردووە تاکو کەواو جوبەی بخرێنە سەر نەك کەرك و قاپووت.

***

**وشەی (ڕست = ڕستە) بە چەند مانا دێت:**

١- لە ڕێزماندا بە مانا (جوملە)ی عەرەبییە.

٢- تاژی ڕاو قایشێکی چوار پەنجە پانی لە ملە و (قەرێتە)ی ناوە، هەرکە دەبردرێتە ڕاو کشتەکە بەنێکی درێژ لە قەرێتەکە هەڵدەکێشرێت و هەردوو سەری کشتەکەکە بە دەست ڕاوچییە کەوەیە. هەرکە لە نێچیری بەردەدات سەرێکی ڕستەکەی شل دەکات.

بە (ڕست = ڕستە) ناو دەبردرێت.

٣- تێلە، یان وایەر و کندرە لەناوەڕاستی حەوشان هەڵدەواسرا. کەل و پەلی تازە شووراوی بۆ .. وشك بوونەوە پێ هەڵدەواسرا. ئێستا ڕستە لەسەر بانانە، نەك حەوشە.

٤- کشتە بەنێکە بە ئەندازەی نیوەی گوریس ئەستوورە بەبەنی باریك و کشت و ڕەنگاو ڕەنگ پێچراوە. گوڵینگی ڕازاوەی بە قەد شۆڕ کراوەتەوە. گولینگەکان دوو چین بوون:

یەکەم: گەورەنە و بە (سوارە) ناو دەبرێن.

دووەم: گچکەنە و (پیادە)یان ناوەو بە ژێر گەورەکانەوە نەوە بەستراون.

لە ناوەندی ژووری سەرەکی ماڵەوە هەڵدەواسرێت و جل و کەل و پەلی لەبەرکردنی ڕۆژانەی لەسەر هەڵدەواسرێت.

***

**ڕووی ئەوها .. ڕەش کردووە:**

کابرایەك لە یەکێك لە گوندەکانی دەشتی هەولێر دەموچاوی زۆر ... ڕەش دەبێت.

خۆشناوێك ترێی بۆ فرۆشتن دەباتە گوندەکە.

جوتیارەکە پێڵاوەکانی پڕ ئاوبوون و زوو، بۆ ئەوەی چارەیەکی دەغڵەکەی پێ بکرێت لە پێکردنەوە و هیچی پێنەکراو دەستی لە قونگ خراری ئومێدی براو ئەوجارە گوتی:

- دە بڕووسکەیەك لێدە هەتا پێڵاوەکانم دەبینەوە.
- ئەوجا بە ئاخەوە گوتی:
- ڕەبی ڕووی بابم ڕەشبێت وەکی ............

***

**ڕیش:**

سێ چوار دەروێشی ڕدێن گەورەی شاری هەولێر دەچنە زیارەتی مەرقەدی (کاکە ئەحمەدی شێخ). لە شاری سلێمانی.

مێرد منداڵێکی مەفتووق و قەشمەرباز ڕووی لە یەکێکیان دەکات و دەڵێت:

- خاڵە ئەو ڕیشە چییە؟.

ئەو بلەز و گواح خۆشییەوە دەڵێت:

- چما باوکت ڕیشی نییە!؟.
- نەخێر.
- ئەگەر چوویتەوە داوای لێ بکات هەرزوو ڕیش بهێڵتەوە.
- بۆ؟.
- چونکە گووی دەگێڕتەوە و نایەڵێت: بگاتە دەمی.
- چۆن؟.
- دایکت ئەگەر ئێستا جوێن بەتۆ بدات دەڵێت: (گوو بە دەمی باوکت بێت، کەچی ئەگەر ڕیشی هەبێت دەڵێت (گوو بە ڕیشی باوکت بێت).

***

**زمق زمق تەماشام دەکات:**

تازەتە تەلەفزیۆن پەیدابووبوو، ڕۆژێك ئافرەتێکی خزممان، لە ژیاندا نەماوە و ناو هێنانی شیاو نییە، لە گوند هات و شەو لامان ماوە. بە عەمری

خۆی تەلەفزیۆنی نەدیبوو. دەمێکی زۆر سەیری (موزیعەکە)ی کردو گوتی:

- بە حەقی خودا ئەو کابرایە، وا زەق زەق تەماشای من دەکات.

***

**زێدەت لێوەر ناگرێت:**

سێ پیاوی دۆست بە یەکەوە دادەنیشن یەکێکیان تەسبێحێکی باشی پێدەبێت.

دووەم دەڵێت:

- ئەو تەسبێحەم بدێ.

ئەویش یەکسەر دەڵێت.

- بە یەکێك.

دووەم زۆر تووڕە دەبێت.

سێیەم دەڵێتە دووەم:

- برام لۆ تووڕە دەبێت زێدەت لێوەر ناگرێت بە چەندی کڕیوە بە ئەوەندەت دەداتەوە.

***

**ژنێکی شێت:**

ئافرەتێکی شێت هەبوو، هەموو ڕۆژێ لە بەیانیی زووەوە، هەتا ئێوارە لە پێش چێشتخانەکەی بەرامبەر گازینۆی (مەچکۆ) بە سەردەبرد.

ژنە بەتەمەن بوو، بەڵام جل و بەرگی هەردەم جوان و ڕەنگاو ڕەنگ و باسکی پڕ بازن و بەربازن بوو.

ڕۆژێك خاوەن چێشتخانەکە لێی دەپرسێت:

- ئەتوو مێردت کردییە؟.
- بەڵێ.
- کوو ..؟.
- بابم ئەوەلجاری منی دا مەلایەك، سەری کیری زۆر گەورە بوو .. و هەرجارێ گۆلمە ئاوێکی تێدەکردم.

مەلا مرد و بابم ئەو جارە منی دایە پیاوێك چنە بوو.

**سەرتاشین:**

خوالێخۆشبوو: (مام برایم کارەوان) جوامێرێکی خێرخوازی ئاوایی بوو گوێزانێکی تایبەتی هەبوو. هەموو ڕۆژێ هەینیان سەری پیاو و منداڵی نێرینەی ئاواییەکەی نزیکەی سەت (١٠٠) ماڵ دەبوو خۆڕا دەتاشی.

بەس هەر سەرێکی بتراشیبووایە گوێزانەکەی لە نێو ئاوی کوڵاوی دادەنا هەرکە دەری دەهێنا بە هەسان تیژی دەکرد و ئەوجا سەرێکی دیکەی پێدەتراشی.

هەرجارێ کە سەری منی بتراشیبووایە، دوای لێبوونەوە دەیگوت: ملت شۆڕکە تا کو جێی بازنان لووس بکەم. ئەوسا زللیەکی کۆییانەی لە پشتە ملمی دەدا.

جا نازانم تەنیا هەر لە ئاستە من وابوو، یان لە ئاست منداڵانی دیکەش.

***

**قاقۆل:**

قاقۆل = (کودلە):

مام برایم هەر جارێ بە ئەندازەی ناو لەپ قیچێك گچکەتر مووی لە تۆقەسەرمی دەهێشتەوە. ئەمە بە (قاقۆل) ناو دەبردرا. من زۆرم هەوەست پێدەهات. لەو دواییەدا قاقۆل لۆ پێش نیوچەوان گوازرایەوە نازانم هۆیەکەی چ بوو.

***

**سەرەکەی باوێمە ناوێ:**

ڕۆژێك پیاوێك لەگەڵ خێزانەکەی بۆ مریشك کڕین دەچنە لای مریشك فرۆشێك.

پیاوەکە لە نێو سەریارەکە دەبێت و ژنەکەی مریشکێك دەکڕێت و مریشك فرۆشەکە بۆی سەر دەبڕێت و لە نێو عەلاگەیەك دەنێت و دەڵێت:

- سەرەکەی باوێمە ناوێ.

ئافرەتەکە بە خراپ تێدەگات و بە ڕەنگ پەڕین و هەڵە داوانەوە بە مێردەکەی دەڵێت:

- ئەو بێناموسە بە من دەڵێت (سەرەکەی باوێمە ناوێ).

هەردووکیان زۆر چاك سەر و گوێلاکی یەکدی دەکوتنەوە.

***

**سەگێکی ترسنۆك:**

گۆڵە سەگێکی زۆر ترسنۆك هەبوو. لە ترسی سەگی تر، بەهیچ شێوەیەك نەیدەوێرا لە حەوشەی خاوەنەکەی بچێتە دەرەوە. ڕۆژێك (دێڵە بەبایەك) چەند گۆڵ لە دوا دەچنە پەنا دیواری خانووی خاوەنەکەی و حەزی دەچێتی و چەندی کردی و کۆشا. تاسای نەکرد بچێتە ناویان و ناچار چووە سەربانی خانووەکە و لە سەربانڕا هەر تەماشای دێڵەکەی دەکرد و گۆڵەکان دەورەیان داوە. لەتاو سوق بوونەوە لە سەربانەوە دەژەنێت کاتێك لەگەڵ دابەزینی ئاوی حەزی لەنگەری تەوازووی خۆی لە دەست دەترازێت، سەری خانووەکەش (جزیری)یەکی لێژبوو سەرانگرێی ناو سەگەکان دەبێت. گۆڵەکان تێر و پڕی دەشێلن و تەنگە تاو بە لەشی زامدارەوە خۆی لە حەوشە دەکوتتەوە.

***

**سەموونی پێخۆری نان:**

تازە یەکەم ڕۆژ بوو (سەموون) لە شارۆچکەی (مەخموور) پەیدا بوو بوو. یەکێك دەچێت چەند سەموونان بە گەرمی دەکڕێت و لەگەڵ منداڵەکانی بە نانی دەخۆن و منداڵەکانی دەڵێن:

- وەللا شتێکی زۆر خۆش و بە تامە.

***

**سندان لە ژنی من بدات:**

دوو پیاو یەکیان سعوودی و ئەویدی لوبنانی لە شارێکدا ژنەکانیان لێدادەبڕێت گوتیان:

- با هەریەکەمان بە بەلایەکدا بچێت.

سعوودییەکە گوتی:

- پێویستە ئەگەر دیتمانەوە بیانناسین هەر یەکەمان وەسفی ژنی خۆی بۆ یەکتر هەڵبدەین.

لوبنانیەکە گوتی:

- ژنی من سوور و سپی و چاوشین و گەورە و قژ مێشەکراو و سینگی ڕووتە و تاناوەڕاستی مەمکەکانی دیارن و تەنوورەیەکی ڕەشی کورتی لەبەردایە، تا نیوە سمتە خڕۆ کوشتن و سپییەکانی بەدەرەوەن.

- سعوودییەکە هەرکە وەسفەکەی بیست و ژنەکەی خۆشی سەتاپا ڕشپۆشە و پێستەشی ڕەش گوتی:

- سندان لە ژنی بدات، با جارێ لەهی تۆ بگەڕێین.

***

**سونەتکەر:**

خوالێخۆشبوو: (مام موتەلیب) ناوێك سونەتکەر بوو. پیاوێکی بە ساڵاچوو بوو .. و جانتایەکی لە دەستدا بوو. دەیانگوت: (هی باکووری کوردستانە) هاتە ئاوایی و ماڵ بە ماڵ دەگەڕا و منداڵانی سونەت بکات.

من نازانم تەمەنم چەند بووە بەس زۆر باشم بەبیر دێت خوالێخۆشبوو: (مام برایم کارەوان) یەك ماڵبووین و پەیوەندیی لەگەڵ ماڵی ئێمە زۆر بەتین بوو .. و منی گرت و لەسەر کۆشی خۆیدانام و فەرمووی (ئەها .. ئەو تەیرە والە ئاسمانێ؟). هەتا سەرم بڵند کرد و تەواو تەماشای حەوام نەکرد کار لە کار ترازا.

دوو جار، یان سێ جار بۆ تیمار کردن هاتەوە.

***

**سیان و مامەسینیّ:**

دوو عـەرەب میـوانی دیوەخـانی خوالّیخۆشـبوو (هـادی ئاغـا)ی گونـدی سەربەشـاخ دەبـن. ئێـوارە نانیـان دەدەنـێ و کـاتی نووسـتن پێخـەفیان بـۆ دەبەن.

شەو ڕاکشاو نۆبەتـداری دیوەخـان گـوێی لـە شـرب و هۆرێـك دەبێـت لـە ژووری دیوەخان. دەبینێت هەردوو عەرەب ئەوەندەیان بە عەگالان لەیەکداوە تا هەردووکیان شرار بووبوون.

نۆبەتدارەکە هەر چۆنێك لێکیان دەکاتەوە و دەڵێت:

- پێم ناڵێن: ئەو شەڕەتان لەسەر چییە؟.

یەکێکیان دەڵێت:

- من دەڵێم: عەشیرەتی سیان ناندەر و پیاوترن، کەچی ئەو مەلعوونـەش دەڵێت: نەخێر مامەسێنی ناندەرو پیاوترن.

***

**شەیتان پێیکردم:**

کابرایەك لەسەر کارێکی خراپ گیرابوو حاکم پێی دەڵێت:

- کوڕە ئەو کارە قوڕەت لۆکرد؟.

ئەویش دەڵێت:

- قوربان شەیتان پێی کردم.
- شەیتان بێـژی نـەهات سـەجدە بـۆ ئـادەم ببـات کـوو گـەودای لۆقـوون دڕایەکی وەك تۆ دەکات.

***

**شتاقە لنگت عەردی ناگرێت:**

ئـافرەتێکی زۆرجـوان و قـۆز و بەکەشـخە، مێردەکـەی زۆر پووخەڵـە و ناشیرین دەبێت.

پیاوێك وەبەر گوێی هەڵدەدات و دەڵێت:

- سەت حەیف و مخابن ئەتووێکی پەری، ژنی ئەو قورمەیتەرەیت!.

ئافرەتەکەش خۆی لە گوورەنابات و دەڵێت:

- من پێپرازیمە.

کابرا دەڵێت:

- چ مێردت هەیە هەتا پێی ڕازی ببێت.

ئەویش بە پێکەنینەوە دەڵێت:

- ئەوەی لە پێشەوەی منی نایە، لە پاشەوەی جەنابت بنێت شتاقە لنگت عەردی ناگرێت.

***

**شێخی شێراوە:**

لە گوندی شێراوەی دەشتی هەولێر شێخێك پەیدا دەبێت خەڵکەکە بڕوایان زۆر بــە شــێخاتییەکەی دەبێــت و یــەکجار ڕێــزی دەگــرن و بــە هــەموو توانایەکیانــەوە خزمــەتی دەکــەن. لـە ناوچـەکەش هەرکـە دەگـوترا (شـێخی شێراوە) دەبڕایەوە. پـاش چـەند سـاڵان شـێخ پارەیـەکی یـەکجار زۆر پـەیدا دەکات و بە خەڵکەکەی دەڵێت:

- من غەریبی کەس و نیشتمانەکەی خۆم دەکەمەوە و دەمەوێت بچمەوە.

خەڵکەکە زۆر پێدڵگیر دەبن، بەڵام دەسەڵاتی ڕەتدانـەوەی فـەرمانی شێخیان نابێت و گەورەوگچکە بۆی لە برا ڕۆدەدەن. پیاوەکان وەگـەلی دەکەون تا دەگەنە سەر زێی (کەلەلێی یاسین ئاغا). زێیەکە یـەکجار زۆر هاتبوو کـەس نـەدەوێرا لێـی بـدات. کەچـی شـێخ مەلـەوانێکی مـەعلان دەبێت و بەشمەکی بەریەرە مل لە ڕووبارە دەبێت و دەپەڕتەوە.

خەڵکەکە پـەرێنەوەکەیان بە کەرامەت دانـاو .. لـەزگ بـوو زەمانیـان تێ بگێڕن، کەچـی شـێخ سـەرنج کێشـیان بـوو بـە دەنگێکـی بـەرزەوە وابانگیان دەکات:

- موسڵمانی خەشیمینە، موسڵمانی خەشیمینە تـڕادن ئـەوها دەبێـت مـن موسـڵمانیمە و مەسـیحیمە، مەسـیحی. بـۆ شـاهیدیش لەگـەڵ عـەورەت ڕووت کردنیدا دەڵێت:

- چاك سەیرم بکەن کێرم نەبڕاوە.

***

**شێرێکت برایە شێر:**

(تەمەنم شەش حەوت ساڵان دەبوو ئەمەم بیستووە. جانازانم ئەوکات ڕوویداوە، یان پێشتر. نووسەر)

کابرایەك کچێك هەڵدەگرێت و لە ترسان دەچێتە ناو (یەزیدی)یان.

(ئەو حەیام چووناو یەزیدیان کارێکی زۆر ئاسان نەبوو). پیاوەکە شەوان نەدەنووست و نۆبەتی دەگرت. شەوێك ژنەکەی پێی دەڵێت:

- پیاوەکە ئەوە بۆ نانوویت؟.

ئەویش دەڵێت:

- لە ترسی برات.

ژنەکە دەڵێت:

- ئێرە لە کوێ و برام لە کوێ.

کابرا بە ئاخەوە دەڵێت:

- ئەتوو شێرێکت برایە شێر.

براکەش لەبەر دەرگایان دەبێت و هەرکە گوێی لە قسەکان دەبێت یەکسەر دەڵێت:

- سەگباب مادام ئەمنت بەشێر دانا ئەوا لێت خۆشبووم و وەرە مەملەکەتیش، بەس مێنەوە بەرچاوم.

***

**عەبدولقادر و لئەتانی:**

لە یەکێك لەو گوندانەی دەوروبەری شاری هەولێر پیاوێکی ناو (عەبدولقادر) دۆستی فەقێیان دەبێت. ڕۆژێك داوایان لێدەکات:

(پێم خۆشە لەقەبێکی باشم بۆ ببیننەوە).

فەقێیەکانیش دەڵێن:

- ئێمە لەمەو دوا بە عەبدولقادر و لئەتانی گازت دەکەین.

ئەویش زۆری هەوەست پێدێت.

ڕۆژێك دەچێتە شاری هەولێر و سەردانی خوالێخۆشبوو: مامۆستا (ڕەشاد موفتی) دەکات. کە لە کۆنەوە دۆستایەتیان هەبووە و بە شانازییەوە ڕووی تێدەکات و دەڵێت:

- فەقێی گوندەکەمان ئەو لەقەبەیان بۆ داناوم (عەبدولقادر و لئەتانی):
  ئەویش دەڵێت:
- دەزانی ئەتانی مانای چییە؟.
- ناوەللا.
- ئەتانی مانای (ماکەر)ە.

کابرا یەکجار زۆر تووڕە دەبێت و هەڵدەستێتەوە بڕوات، کەچی جەنابی مامۆستا ڕەشاد هێوری دەکاتەوە و پێی دەڵێت:

- ئەگەر ئەوها .. خۆت تووڕە بکەیت ناوەکە، یەکسەر بە دوات دەکەوێت. بەگوێی من بکە هەرکە چوویەوە، بە هێدییەوە پێیان بڵێ:
- ئەو لەقەبە زۆر گرانە و نایەتە سەرزارم لەقەبێکی دیکەم بۆ ببیننەوە.

پاش ماوەیەکی دیکە دەچێتەوە خزمەت: مامۆستا ڕەشاد و پێی دەڵێت:

- ها .. چتکرد؟.
  ئەویش بە گوراح خۆشییەوە دەڵێت:
- کرایمە عەبدالقادر و لکوڕەیشی) کە زۆر لە (قوڕەیش)ی عەشیرەتی پێغەمبەر (د . خ) نزیکە.
  جەنابی ڕەشاد موفتی دەفەرمووێت:
- چەند دەبێت ئەو لەقەبەیان بۆ داناویت؟.
- نزیکەی شەش مانگ دەبێت.
- (کوڕەیش) مانا جاشك بە شەش مانگ بوویەوە (ئەتانییەکە)ی جاران.

***

**عەگالی:**

کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی، ڕۆژێك لە پشتەوەی لۆری سواردەبێت بۆ شار.

هەرکە دەگاتە شارەکە بە دەست لە بۆ دیی لۆرییەکە دەدات ڕاگرێت.

هەرکە ڕادەگرێت و عەرەب خۆی بە دەرگاوە شۆڕ دەکاتەوە و لەگەڵ پێگەیاندنە عەردی عەگالەکەی بە قوولابی پشتەوەی گیردەبێت شوفێرەکە هەست پێناکات دەڕوات.

عەرەب لەتاو عەگالی دەکەوتە دوای و پڕ بە زار، لە گەرمەی غارا دەڵێت:

- عەگالی چەلب بللۆری.
- عەگالی چەلب بللۆری.
- عەگالی چەلب بللۆری.

***

**غایەتم لە سەیەکتدا:**

سەرۆك عەشیرەتێك بە ئۆتۆمۆبیل لە پیاوێکی پێردەدات و هەتا دەیگەیێننە نەخۆشخانە پیاوەکە ئەمری خوا بە جێدەهێنێت.

بە دوای کوڕەکەی دەنێرن. کە چاوی بە تەرمی باوکی دەکەوێت شێت و هار دەبێت و پشکی لەبەر خۆیەوە دەهێنا. پاشدان هەرکە غەنیمەکەی ناسی دەلحاز، گوراح خۆشی دایدەگرێت و دەڵێت:

- قوربان خەم مەخۆ غایەتم لە سەیەکتدا.

***

**فەقێ هەتا ئەومم هەبێت:**

فەقێیەکی دەشتی هەولێر بە دیمەن زۆر جوان دەبێت جارێك دەیەوێت بۆ دیوی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بچێت. لە ڕێگادا تووشی ئافرەتێکی زۆر جوان قۆز دەبێت پێی دەڵێت:

- دایە ئەتوو بە تەنیا لەو ڕێگایە ناترسێیت؟.

ئەویش بە دەست خستنە سەر عەورەتی خۆی و دەڵێت:

- فەقێ من هەتا ئەوەم هەبێت لەکێ دەترسێم.

ئەویش لە شەرمان هەتا دەگەنە ئاوەدانی لەفزی دیکەی لەگەڵ ناگێڕێت.

***

**فرێدانی دایکێك:**

دایکێکی پەککەوتە شەوێك کوڕەکەی فرێیدەدات و سێ ڕۆژ تازییەشی بۆ دەگێڕێت.

پاش دوو سێ ڕۆژان برادەرێکی کوڕی پیرێژن دەعوەت دەکات. لەسەر سفرەی نان خواردندا دایکی خۆی دەبینێت، لە حەژمەتان دەلحاز گیان لە دەست دەدات و دایکەکەش بۆی دەگریێت.

تومەز برادەرەکەی هەڵیگرتبووەوە و دەعوەتەکەشی بە ئەنقەست بوو.

***

**قوزێ بزنێ:**

کوره جاحێلێکی گوندەکەمان شێت و چەپ و چوێر و زمان ناتەواو دەبێت.

کیژوکاری ئاوایی هەرجارێ بەئەنقەست دەورەیاندەدا و دەیاندوواند و هەرکە پشتیان تێدەکرد هەتا لە سەرپشت دەکەوتن پێدەکەنین.

ڕۆژێك دایکم پێیاندەڵێت:

- ئەرێ ئەنگۆ کە دەچنە کن ئەو شێتەی بە چ پێدەکەنن.

ئەوانیش دەڵێن:

- بە قسەی شێتەکە، هەر جارێ ئێمە دەورەی دەدەین پێمان دەڵێت: (قوزێ بزنێ).
- دایکم ئەوسا پێیان شین دەبێتەوە و لەگەڵ سڕینەوەی سڕیلەی دیدەکانی دەڵێت:
- کچێ ئەنگۆ خراپ لێیحالیبوونە و ئەو مەبەستەی نییە.
- ئەدی؟.

- دەڵێت: قوزتان بگێم.
- ئەوسا کچەکان پەنجەی قاریان دەگەزن و لەو ڕۆژەوە لە جیاتی پێکەنین بە ڕووێکی دڕدۆنگەوە گەشکەیان پێدەگرت و زارجووە تفیان حەواڵە دەکرد.

***

**قوونت دەهاتە سەرکیرم:**

ئەفەندییەك و مەلایەك لەسەر سووڕانی زەوی و نەسووڕانی دەبێتە کێشەیان و شتاق لا بۆ یەکتر ناسەلمێنن پاشدان ئەفەندییەکە دەڵێت:

- چۆن دەزانم خوا هەیە ئەوهاش دەزانم زەوی دەسووڕێت.

مەلاش دەڵێت:

- منیش بەڵگەیەکی زۆر بەهێزم لایە کە زەوی ناسووڕێت.

ئەفەندی دەڵێت:

- پێم ناڵێیت چییە ! ؟.
- ئەگەر بسووڕابوویە هەنووکە قوونت دەهاتە سەرکیرم.

***

**قوون سەعات:**

کابرایەکی بە دین لە یەکێك لە گوندەکانی دەشتی هەولێر پێنج قەرزە بانگی دەدا. نەخوێندەوار بوو .. و بەبێ سەعات دەیزانی نوێژ چ کات دەبێت. بە هیچ شێوەیەکیش غەلەتی نەدەکرد.

خەڵکەکە دەیانگوت: (فلان هەرکە گووی هات بزانە ئەوە نوێژە).

لەبەر ئەوە (قوون سەعات)ی بە دواکەوت.

***

**قوونم پتە پت دەکات:**

سەردەمایەکی زوو شێتێك لە شاری هەولێر هەبوو. هەر شایی و زەمان وەندێك بگێڕدرابووایە ئەو دەلحاز ئامادە بوو.

ڕۆژێك پێیانگوت:

- کوو هەموو جارێ دەزانی زەماوەند و شایی هەیە؟.

گوتی:

- هەرکە شایی و زەماوەند دەست پێدەکات، قوونم یەکسەر پتە پت دەکات.

***

**قۆچ کەر و نانی مەلا:**

ڕۆژێك یەکێك نەخۆش دەکەوێت و حەکیمی سەردەم دەچێتە سەری و دەڵێت:

- ئەتوو بە دوو شتان چاك دەبیتەوە:

یەکەم قۆچی کەر و دووەم نانی ماڵی مەلا.

کابرای نەخۆش دەڵێت:

- لەگینە قۆچی کەر دەسکەوێت، بەڵام نانی ماڵی مەلا موستەحیلە.

***

**کارەبا گەیشتە قوونی من:**

کابرایەك چوار پێنج ساڵ هەوڵدەدات کارەبا بۆ گوندەکەیان ڕاکێشێت. بەرپرسانی میری داواکەی پشت دەخەن.

کابرا تووشی (مایەسیری) دەبێت و دەچێتە لای دکتۆر.

دکتۆریش پێی دەڵێت:

- دەبێ بە کارەبا کەوی بکرێت.

کابرا ناچار لە حەبرەیی خۆیەوە ڕازی دەبێت.

هەرکە دکتۆر خەریکی پلاك گەرم کردن دەبێت کابرای نەخۆش دەست بە پێکەنین دەکات.

دکتۆر پێی دەڵێت:—

- بەچی پێدەکەنێت؟.

- کارەبا گەیشتە قوونی من هەر نەگەیشتە گوندکەمان.

***

**کافرۆش:**

- وسو ماندوو نەبیت.
- خودا عافووت بکات ئۆمەر.
- ئەورۆ باری (کا) چەند دەکات؟.
- بیست عانە.
- بڵێ لە نان و کەبابەکەت دا.

ئەو سەردەم کەباب خواردن بۆ لادێیی کە بچووبووایە شار لە پێش هەموو شتێك بوو.

- کورە کەبابی چی و تەرەماشی چی؟ ئەوەی ئەوجارە بەسەر من هاتووە یا خوا بە سەر دوژمنی بابە گەورەشت نەیەت.
- لۆ چ بووە!؟.
- بە کاکی خۆم بڵێم فەردەکایەکم مابوو، کابرایەکی قەڵاتی لێی کڕیم.

ئەمنیش پێم زەحمەت بوو کەرەکەم سەربێخم، فەردە کام هاوێشتەسەر شانم.

هەرکە پێم لە دەرگەی حەوشە یاننا و هەرهەندەم زانی ئافرەتێکی سپیلکەی خاوێن و باوێن لە پێشم زرووکاندی و گوتی: (وەی شێرە) و سەرانگرێی عەردی بوو .. و جوولەی لێبڕا. مسۆگەرم کرد جارێکی دی نان دوولەت ناکات. لەشروان فەردە کایەکەم توور هەڵدا و بە پرەپڕ تێمتەقاند. هەتا کن کەرەکەم لنگانم لەیەك نەنا. سوسکانی خۆم هەڵدەسەر پشت و تەقڵەکوت هەتا لە شاریش دەرچووم نەموێرا ئاوڕان بدەمەوە.

- ها .. ها .. ها .. برا نا حەقی نەبووە حورمەکی چاونەکراوە و دنیا نەدیتەو پەروەردەی کۆڵانی قەڵاتێ، بڕواناکەم بە عەمری خۆی دووجار زەلامی دەشتەکی بینیبێت. بێ شك زەندەقی لەسر و سەکوتت چووە.
- لۆ لەبەر چی..!؟.

- لۆی ناوێت ئەتوو جارەك لە نەینۆکی تەماشای بچم و فەسارە ناشیرین و دەعەجانەکەی خۆت کردووە، نەخەسەلە فەردەکاشت لەسەر پشت بێت.

***

**کەرگان:**

شوانێکی ئاوایی (گردەشینە)ی ناوچەی کەندێناوە ئێوارە، کە لەبەر مەڕ گەڕاوە و بەخەڵکەکەی گوت:

- کەری فلانم لە نێو ئاقار دیت، یەکێك دەعەمەلی دەهێنا.

پێیان گوت:

- چی لە بن پێی خۆیدانابوو، یان نا؟.

گوتی:

- دوور بوو لێم دیار نەبوو.

سبەینێ بڕۆ شوێنەکەی ئەگەر شتی لەبن پێی خۆیدا نابوو، خەڵکی گوندی (دووشیوانە)، ئەگەرنا (مەلا کاغایی)یە.

***

**کەڵە شاخ:**

سەردەمایەك ڕوون لە ناوچەکەدا زۆر کەم بووە. ئەوەی گوزەرانی زۆر خۆش نەبووایە توانای نەبوو هەموو ڕۆژ شێو لێ بنێت.

کاکی تۆش هەموو سبیانان و ئێواران، کە دەچوومە دیوەخان بەرسمێڵم چەوری پێوەدیار بوو. کەشتێکی چەورم خواردووە.

دۆست و هاوڕێکانی دیوەخان حەسوودیان پێدەبردم. خۆزگەیان دەخواست وەك من بە خواردن بوونایە.

ڕۆژێك بە ڕوویان هەڵدام و گوتیان:

- ئەرێ عەولا ئەتوو ئاژەڵێکی دۆشین شك نابەیت، کەچی لە چەوی بەرسمێڵت ڕادەزاندرێت: ڕۆژانە دوو کەرەت چەوری دەخۆیت. پێمان ناڵێیت ئەو ڕوونەی لە کوێ دەهێنیت؟.

منیش بەسینگ هەڵکێشانی شانازییەوە گوتم:

- دۆشاو لە پاشا قات نییە من وەك ئەنگۆی قرچۆك و پارە پەرست نیمە و هەتا پارەم لە بەرك دابێت خۆم و منداڵم بێ چەوری ناکەم.

تاکو ڕۆژێك دانی سبیانێ لەبەر سێبەری دیوەخان دانیشتبووم، تەرحی ڕۆژان لە پێش هاوڕێکانمەوە دەستەسڕم بە سمێڵە چەورەکەی خۆمدا داهێنا و گوتم: (لە کیسەت بە زیاد بێت خوایە لەو نیعمەتەی بەمنتداوە).

لەو ساتە کیژێکی حەفت ساڵانم هەبوو بە هەلەداوانەوە هات و بە دیار عەشاماتەکەوە گوتی:

- بابە، بابە ئەو کەڵەشاخەی سبیانان و ئێواران سمێڵی خۆت پێ چەور دەکرد پشیلە بردی.

هەرکە ڕاستییەکە ڕوون بووەوە هاوڕێکانم لێکرا لە حریتەیاندا و منیش چاوی پانی درۆی خۆ هەڵکێشانم بە خۆدا شۆڕکردەوە.

***

**کەینێ من ئەوەندە کەم خۆر بوومە:**

ڕۆژێك کابرایەك دەچێتە لای مەلا و دەڵێت:

- مامۆستا ئەو شەو لە خەونمدا پتکە گووێکم خوارد.

مەلاش دەڵێت:

- پارەت دێتە دەست.

کابرا دەگەڕێتەوە و لە ڕێگادا لێرەیەك دەبینێتەوە و ئەوسا دەڵێت:

- تۆ خوا: کەینێ من ئەوەندە کەم خۆر بوومە.

***

**کوڕە بمگێن مەمکوژن:**

کابرایەك شەو سەعات دوازدە بەسەر خۆشی دەگەڕێتەوە ماڵ.

گەڕەکەکەش چەند شەو بوو دزی لێدەکرا و پۆلیس بۆ گرتنی خۆیان لە کون و قوژبن و پەنا و پەسارگان دادەنووسێنن.

هەرکە کابرا دەگاتە لایان پۆلیسەکان لێکڕا چەك ڕادەکێشن و دەڵێن:

- کوڕە ڕاوەستە و لە جێگەی خۆی نەبزویت دەنا دەتکوژین.

ئەویش لەگەڵ دەست بڵند کردندا دەڵێت:

- کوڕە بمگێن مەمکوژن. کوڕە بمگێن مەمکوژن.

***

**کوڕی سێو لە باخەڵێ:**

سێ پاڵە لەبەر بەرینە و ئەوەندە لە دروونەدا بە گوڕ و شەوق بوون هەر سەلاوەتی پێدەویست. داسیان بە هەموو هێزیانەوە لە تەیارە دەهاوێشت وا دەبوو گوڵە گەنم بە تەوژمی داسەوە لە بان سەریان ئاوا دەبوو.

عادەت بوو پشوو دوای دوورینی دوو بەران بوو، کەچی ئەوان کرد بوویانە سێ و ئەوجا نەیاندەزانی شەکەت و هیلاکی چییە. مچوڕکەی ئەوینی لە نێو ماسولکەکانیانەوە، مێروولەی دەکرد. نەخەسەلە هەرکە ناوە ناوە لە دواوەیان بەرگوێیان دەکەوت:

- دەی لەو چاوەتە کوڕی سێو لە باخەڵێ.
- دەی بەلا گێرت بم کوڕی سێو لە باخەڵێ.
- دەی لە بەرێت مرم کوڕی سێو لە باخەڵێ.

شێت و هار دەبوون و مکووڕی و گوڕیان پتر بە دروونەکە دەدا و لە ئارەقەدا شرار بووبوون و ئەوجا کەم و زۆر هەستیان پێنە دەکرد. ئەوەندەیان زۆر دەدووری کیشەکەرەکە، گەر تەکانی زوو، زوو لە خۆی نەدابووایە دەرەقەتی هەڵگرتنەوەی سوارە دووراوەکانیان نەدەهات.

تەبارەکە بای چوار پاڵە بوو لە ڕۆژێکدا، کەچی لەبەر چاپوکی و خێرایی یان هێشتا سەعاتێك ڕۆژ مابوو ئاوا بێت داوەڵیان لێبڕی.

کیشەکەرە تاندەرەکە، لەگەڵ دانی کرێیەکەیان لە حرێتەیەکی وایدا لە دوورەوە دەبیسترا و سۆما جوان و مەڕانییەکەی پڕ ئاوبوون. پاڵەکان ئەوسا حسیان: (کەر لە کوێ کەوتووە و لە کوێ دڕاوە). ئەو شیشیەی ئەو لێیانی

داوە عەرەب لە حوشتری نەداوە. ناچار بە چاوی مۆن و سەری شۆڕەوە لە تەشکی خۆیاندا.

زاریێ تازە تەمەنی خۆی لە قەرەی (٢٠) ساڵی دەدا و تاقانەی پیرەدایك و باوکێك بوو. کەڵکی کاری دەرەوەیان نەمابوو. ناچار بوو دەغڵەکەیان بە کرێپاڵە بدوورنەوە. دەغڵەکە بە ڕۆژێکی چوار پاڵەیی دەدورراوە. کەچی پارەی سێ دوورنەکەریان زیاتر شك نەدەبرد.

هەرچەند سەری مشوور خواردنی هێنا و برد پارەی دیکەی بۆ پەیانەکرا. ناچار چوو سێ پاڵەی بە کرێ گرت و گوتی:

- خوا کەریمە بۆ ئەوەندە تەبارەی دەمێنێتەوە:

پاشان ئەو ڕێیەی ئەللا خوایی گرتەبەر: لە هەوەلەوە خۆی تاس و لووسدا و چاوی بە کل دارشت و بسکەکانی کردنە گرواز و بەناز و فیزەوە خۆی گەیاندن یەکێکیان و وەبەر گوێی هەڵداو:

- ئەمن ئەتووم بەردڵ کەوتووە و لەمەودوا نابێ پەیوەندیمان لەگەڵ یەکتر ببڕێت.

هەتا باوەڕی پێ بهێنێت خۆشی دەوێت سێوێکی دایە و گوتی:

- ئەوەش نیشانەی خۆشەویستیەکەمە.

لەگەڵ چاو بەملاو بەولادا گێڕانی و:

- بەس چاوەکەم ئابڕوومەبە و نهێنی نێوان خۆم و خۆتەوە بێت.

- ئەو حەق و حسێبەی لەگەڵ دووەکەی تریش کرد بوو.

***

**کوڕی من زۆر گەورە بوو:**

ڕۆژێك کابرایەك لە نێو (ئاوقەرانی) خۆیدا گوتی:

- خزمینە کوڕی من زۆر گەورە بووە.

ئەوانیش گوتیان:

- بووە بە مامۆستا؟.

- نەخێر گەورەتر.

- بووە بە ئاوقات؟.
- نەخێر گەورەتر.
- بووە بە ئەندازیار؟.
- نەخێر گەورەتر.
- بووە بە دکتۆر؟.
- نەخێر گەورەتر.
- بووە بە وەزیر؟
- نەخێر گەورەتر.

ئەوسا خەڵکەکە بە واق وڕمانەوە گوتیان:

- دەپێمان بڵێ لە ئەوانەی گوتمان گەورەتر چییە؟.
- هەرکە مەلاو ڕدێن سپی و جوامێری ئاوایی دەچنە کنی بێزی نایەت ئاخێزێکیان لەبەر بکات.

**ئاخێز = خۆجوولانێکی کەم.**

***

**کوشتنی چی:**

لەسەرەتای چلەکانی سەدەی ڕابردوودا ژن و مێردێک لە گوندەکەی خۆمان (چەغەمیرە)، لە دەرەوەی حەوشەیان بە شەڕ دێن. (ناو هێنانیان هەموارنییە) پیاوەکە ژنەکەی لەبنە خۆی دەنێت و وازیشی لێناهێنێت.

خەڵکەکە زۆر بە پەرۆشی ژنەکەی بوون پیاوەکە لە کۆڵی نابێتەوە.

خوالێخۆشبوو (مام سمایل خەزاڵ) یەختیارێکی پیاو باش و بەدینی ئاوایی بوو. زگی بە ئافرەتەکە دەسووتێت و بۆ ئەوەی ڕزگاری بکات هەتا کۆپاڵ دەگرێت لە پاشەڵی پیاوەکە دەدات و دەڵێت:

- کوڕە هەی ناپیاو ئەو ژنە قوڕبەسەرەت کوشت هەستە وازی لێ بێنە.
- کابراش دەڵێت:
- کوڕە کوشتنی چی ..! ئەو لەبنەوە منی بەرزەفت کردووە و جێیەکی وای گرتوومە چەندی دەکەم بەرم نادات قیت ببمەوە.

***

**کولیکه مێلاقه:**

کولیکـه مێلاقـه – (خورمەچیچان)یشـی پـێ دەگوترێـت. کـولێکی زۆر گەورە و پەلکی سووری تۆخە و نزیکە مـەترێك بـەرز دەبێتـەوە. پەلکەکـەیم هەڵدەپشـافت تـاکو ئـاوی لێدەهات و لەسـەر دەست و قاچـم دادەنـاو بـە پەڕۆیەك دەمپێچا. بۆ بـەیانی شـوێنەکەی دەبـووە (پفکـە). ئەمـەش جـۆرە سووتانێك بوو.

***

**کێری باوکی ماچ بکە:**

کابرایەك ژنێکی زۆر جوان دەبینێت منداڵێکی لە ئامێزە و پێی دەڵێت:

- بێنە منداڵەکت ماچ بکەم چونکە لەو شتە جوانەی تۆ دەرهاتووە.
- ئەویش دەڵێت:
- ناوەللا بڕۆك کێری باوکی ماچ بکە.

***

**کێهان پێشان ژنی هێنا:**

دوو فـەقێ دۆسـت و ئـازیزی یـەکتر دەبـن و بـۆ خوێنـدن لـە یەکدیـدا نەدەبڕان. لەسەرەتایی لاوێتیان بەڵێنیان بە یەکتردا: کێهان ژنی پێشتر هێنـا (کێشە)یەك بداتە ئەویدی.

ڕۆژ دێت و ڕۆژ دەڕوات یەکیان زووتر ژنی هێناو بووە مەلاش لە گوندێك.

دوای دوو سێ مانگان فەقێی ڕەبەن سەردانی دەکات و پێیدەڵێت:

- برام من بە دوای هەرێیەکە داهاتووم.

ئەویش بە ڕەنگ پەڕین و شپرزاوییەوە دەڵێت:

- کوڕە وسبە عەیبە، کوڕە وسبە عەیبە و حەیام مەبە.

ئەویش بە دەنگی کەمێك بەرزەوە دەڵێت:

- لۆ .. وسبم حەقی خۆمە.

پاش تکاو ڕجایەکی زۆرەوە میوان نەرم لێدەکات و دەڵێت:

- بە مەرجێك ئێوارە مریشكێكی قەڵەو بكوژیتەوە و سینگ و ڕانێكم بدەیتێ.

خانەخۆی مەمنوون دەبێت و:

- سەرچاو.

ئێوارە سینگ و ڕانێكی لە پێش دادەنێت و دەڵێت:

- دەها سرفنجی بكە.

***

**كیهانت دەوێت:**

ئافرەتێكی زۆر گێل و نەزان لە مێردەكەی خۆی دەتۆرێت. هەرچەندە مێردەكەی هەوڵی لەگەڵ دەدات ناگەڕێتەوە. ڕۆژێك ژنەكەی لەبەر بێری ماڵە باوكی مەڕ دەدۆشێت و ئەویش بە ئەنقەست دەچێتە سەر بێر و مەڕی بۆ دەگرێت و بە دزییەوە پێی دەڵێت:

- جگە لە شتەكەی خۆم دووترم پەیداكردووە.

بۆ ئەوەی پێی باوەڕ بكات:

یەكەم: سوورەكەی خۆی نیشان دەدات.

دووەم: هێند ڕێخی مەڕ لەسەری هەڵدەسوێت ڕەشدا دەگەڕێت.

سێیەم: هێندە كەفی شیری بەسەر ریخەكەدا دەكات. سپی دەبێت.

ژنەكە باوەڕی تەواو دێت: سێی هەیە. ئەوسا دەسەلمێنێت و لەگەڵ مێردەكەی دەگەڕێتەوە. لە ڕێگادا پێی دەڵێت:

- كیهانت دەوێت؟.

ژنە دەڵێت:

- ڕەشەكە لۆچاو زاریێ، سپییەكە لۆ بەرەكەتی ماڵێ. سۆرەكەش بە جەرگی باوكی خۆم نادەم.

***

**کێچ و پێشکە:**

کێچ و پێشکەیەك بە سەفەر چوون و لە ڕێگادا سەرمایان بەسەر داهات و خۆیان گەیاندە ئافرەتێك و هەریەکەیان خۆی لە شوێنێکی ئافرەتەکەدا حەشاردا.

هەرکە دنیا گەرم داهات و هاتنە دەرەوە و کێچ لە پێشکەی پرسی:

- ئەرێ جێگات کووبوو؟.
- چەندی بڵێیت گەرم بوو، بەڵام ناوە ناوە کەرتە شاخێك دەهاتە خوارەوە ئەگەر خۆم نەدابوایە پەنایەك هەپڕوون بە هەپڕوون دەبووم.

پێشکە لە کێچی پرسی:

- ئەدی جێگای جەنابت کووبوو؟.
- وەللا چەندی بڵێیت گەرم و نەرم بوو، بەس ناوە ناوە ئەفەندییەکی سەرسۆرم، بە هەڵە داوانەوە لێدەهاتە ژوورێ و هەتا دوو تفی زار جوانەی لە دوڕ چاومی نەکردبوایە نەدەگەڕاوە.

***

**کێ کفتەی خواردووە:**

لە زەمانی زوو کوڕێك ژن دەگواستەوە شیوی بووك (کفتە) دەبێت.

زاوا بە ئیشێك دەچێت و هەتا دەگەڕێتەوە کفتە نامێنێت. زۆر تووڕە دەبێت و بەس دەنگ ناکات.

ئێوارە پێی دەڵێن:

- کاتی هاتووە و بڕۆ لای بووك.

ئەویش دەڵێت:

کێ کفتەی خواردووە، با ئەویش بچێتە کن بووك.

***

**گرۆ:**

ڕۆژێك ئامیر فەوجێکی سوپای عێراق تەلەفۆن بۆ ئامیر لیواکەی خۆی دەکات و دەڵێت:

- قوربان فلان سەرباز بۆ لای جەنابت نەقل دەکەین دەبێ قەبوولی بکەیت.

ئەویش دەڵێت:

- بۆ لەبەر چی؟.

- قوربان هەرچەندە گرۆی لەگەڵ دەکەین هەر ئەو دەباتەوە. بۆیە پێمانخۆشە نەقل ببێت.

ئەویش دەڵێت:

- بینێرە بزانن چۆن گرۆیان دەباتەوە.

هەرکە سەربازەکە دەگاتە لای ئامێرلیواو دەڵێت:

- ئەتووی گرۆیان دەبەیتەوە؟.

ئەویش دەڵێت:

- بەڵێ ئەگەر فەرمان بدەیت لەگەڵ جەنابیشت دەکەم.

دوای ڕەزامەندی دەربڕینی ئامێرلیوا، سەربازەکە دەڵێت:

- قوربان جەنابت خاڵێکی ڕەشت لە پشت قوونە.

ئەویش بە دڵنیاییەوە دەڵێت:

- نەخێر هیچ خاڵی ڕەش لە پشت قوونم نییە.

ئەوسا سەربازەکە لەگەڵ ڕاگرتنی (١٠٠) سەت دینار بۆ ئامێر لیواکە و دەڵێت:

- قوربان ئەگەر وانەبوو ئەوسەت دینارە بۆ جەنابت، خۆ ئەگەر واشبوو دەبێ جەنابت (١٠٠) سەت دینارم بدەیتێ.

ئامێر لیواش سوور دەیزانی خاڵی لە پشت قوون نییە و بۆ ئەوەی بە سەریدا زاڵ بێت دەلحاز قوونی خۆی ڕووت دەکات و خاڵی نەبوو.

سەربازەکە بە مەیلە و کزییەوە گوتی:

- ئەمن دۆڕاندم.

ئامێر لیوا هەر ئەودەم تەلەفۆن بۆ ئامێر فەوجەکە دەکات و دەڵێت:

- هەر ئەوەشە گەرۆتان لێدەباتەوە! یەکەم گرەوی لەگەڵ من کرد و .. دۆڕاندی.

ئامیر فەجەکە بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

- چۆن؟.

هەر کە واریقاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە ئامیر فەوجەکە دەست بە پێکەنینێکی حێل دەکات و دەڵێت:

- هەرکە بۆ لاتان هات گرۆی لەگەڵ من کرد و گوتی: (دەچم قوون بە ئامیرلیوا ڕووت دەکەم). منیش گوتم (ناتوانێت).
- گرۆکەشمان لەسەر دووسەت دینار بووە.

تێبینی: ئەو سا سەت دینار زۆر بوو.

***

**گووی باوکی خۆم:**

پیاوێکی ناوچە کوێستانەکانی کوردستان، لە شەوێکی هەرە ساردی وەرزی زستاندا لەگەڵ خێزانی خۆی جووت دەبێت. لەکاتی نوێژی بەیانیدا دەچێتە سەر جۆگەکەی بەرماڵان (وسل) دەربکات. لەبەر ساردی ئاوەکە لەرز دەیگرێت و هەرچەند تەکان لە خۆی دەدات لێوەکانی وێك نایێنەوە نیەت بێنێت و چەند جار دەڵێت:

نییەتم، نییەتم ....

بۆی تەواو ناکرێت لە دواجاردا هەرکە دەزانیت بۆی نایەت دەڵێت:

- نیەتم وەیە جارێکی دی گووی باوکی خۆم ناخۆم.

***

**گۆردە و چەورە:**

لە ڕاپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێر ساڵی (١٩٥٣)دا ئەم دوو .. پەیڤە سەری هەڵدا:

یەکەم: گۆردە:

گۆردە مانای گەوادێکی مل پان، دەقەبەڵ ئەو جوتیارانە کرا، کە لە کاتی سوێند خواردنی (خێرمان خێر و شەڕمان شەڕ)دا لایەنگیری ئاغا بوون.

دووەم: چەورە:

چەورە بەو کەسە دەگوترێت شتێك بە کەیف و ماشای خۆی جێ هێشتبێت و بۆی بگەڕێتەوە.

ئەمەش: دەقە بەڵ ئەو جوتیارانە کرا سوێندیان خواردبوو ئامەشۆی ئاغا نەکەن. پاشدان پەشیمان بوونەوە و چوونەوە کن ئاغا.

***

**گیر پسانێ:**

دوو منداڵ بەرامبەر یەکتر دا دەنیشتن و گیری خۆیان دەردەهێنا و یەکێکیان سەری داوە بەنێکی لە گیری دەخست و ئەویتر سەرەکەی دی و ئەوجا پاشەو پاش دەکشانەوە.

دۆڕا و ئەوەیان بوو پێشتر بێزیراند بووایە.

***

**لا بس گونیە:**

گەنجێکی قۆز و ئاکار .. ڕێك و باڵا بەرزو ڕانك و چۆغەیەکی شینکی نوێم لەبەردایە و کڵاشێکی پەڕۆیینی چوڕی شیر سپی لە پێ و بەرك پڕ پارە و بێکار، بە فاك و فیکی لووت بەرزی جاحێلییەوە لە شەقامی (سەعدون)ی بەغدا پیاسەم دەکرد. ئامانەیەك لە (قەتعە)یەك ڕایگرت و خەڵکێکی زۆر سوار بوون. دوای خەڵکەکە ئافرەتێکی گەنج و شلك و نەشمیل و سفور سەرکەوت. منیش (ئێ .. هـ) بە دوایا خۆم تێکوتا. ناوە ناوە جمەی دەهات. بە ئەنقەست خۆم لێی نزیك خستەوە و دوو سێ جار شانم لە شانە سوور و سپی و گۆشتنەکەی خشاند. کاتێك بە دڕدۆنگییەوە ئاوڕی لێدامەوە و گوتی:

((لابس گونیە و یەزروب کەشخە عەلێنا)).

***

**لە ئێوەیە، یان لە ئێمە:**

کابرایەکی دەشتەکی کەڵەبابێکی شامی دەباتە بازاڕ بیفرۆشێت.

کابرایەکی دیکە، لەلا ڕا بۆ قەشمەری پێی دەڵێت:

- خاڵە ئەو کەڵەبابە لە ئێمەیە، یان لە ئێوە؟.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

- لە گوو خواردن لە ئێوەیە، کەچی لە بانگداندا لە ئێمەیە.

***

**لە خەرات نەدراوە:**

ڕۆژێك (فەقێیەکی خەڵکی دێهاتەکان)، لە مزگەوتی نێو بازاڕ دەست بە ئاو دەگەیەنێت، یەکێکی خەڵکی شاری هەولێر پێی دەڵێت:

- ئەنگۆ خەڵکی دەشت لە ئەدەبخانە گووی قەت ڕاست بە ڕاستی کونەکەی ناکەن و بەملاو بەو لایدا دەکەن.

ئەویش بێ ئەوەی خۆی لە گوورەببات و دەڵێت:

- ڕاست دەکەیت چونکە ئێمە قوونمان بە منداڵی، وەك قوونی ئێوە لە خەرات نەدراوە و خوارە. لۆیێ هەچەند هەوڵدەدەین گووەکەمان وەك ئێوە لە ڕاست کونەکە پێناکرێت.

***

**لە سێ مەوجەکانە:**

چەند گەنجێکی خەڵکی شاری هەولێر بە سەفەر دەچنە شاری سلێمانی.

چەند لاوێکی سپۆرت بەرەو ڕوویان دێن یەك لە هەولێرییەکان بە ئەنقەست دەڵێت:

- بە خوا بابە سلێمانی قەزایەکی خۆشە.

یەکیان گورگانە ئاوڕ دەداتەوە دەڵێت:

- ئەوە لەسی مەوجەکانە.

***

**لە کەریش کەرتری:**

ڕۆژێك لەسەر جسری فولکەی (زەعیم) گۆڵمی خۆم بە پرگەنمەوە لە حەواوە ڕاگرت.

خلەی دۆستم بەرەو ڕووم هات و لە دوورەوە گوتی:

- بلە ئەوە چ دەکەیت؟.
- کێشکەی دەگرم.

بە حەیرمانەوە گوتی:

- کێشکە بەو حاڵە کوو دەگیرێت؟.
- لۆ ناگیرێت. لۆ دان خواردن دێنە سەردەستم ئەوسا دەیانگرم.

لە حریتەیەکی وایدا ئاو لە چاوانی بازرەقەی بەستاو ئەوجا گوتی:

- بە خوا کەری.
- کەرم؟.
- لە کریش کەرتری.
- بە ڕاستی لە کەریش کەرترم!.
- ئەرێ وەللا.
- کەواتە، تەماشای خوارەوە بکە.

دیتی باوکی والەبن جسرەکە، چوارچمکی دانیشتووە.

پێش ئەوەی زار هەڵێنێت و بڵێت:

- ئەوە بابم لێرە چدەکات؟.

بە پێکەنینەوە گوتم:

- پێشەکی پارەی پێنج کێشکەم لێوەرگرتووە. بە مەرجێکیش هەتا هەر پێنجیان نەگرم نێتە سەرەوە.

***

**لە مست دەنێت:**

لە زەمانی کۆندا دوو پیاو لە وەرزی زستاندا سەردانی ماڵە خزمێك دەکەن.

ئەوساش نوین وەك ئێستا نەبوو .. و زۆر کەم بوو.
هەردووکیان بە یەکەوە دەنوێنن و جاجم و بەڕەیەکیان پێدا دەدەن.
شەو یەکیان ئەویتر بە خێزانی خۆی تێدەگات و دەست بۆناو گەلانی دەبات.
ئەویش سێ و دووی لێناکات کیری بە ڕووتی لە مست دەنێت.

***

**لباد و تایەی تورمێل:**

لە زەمانی زوو کابرایەکی یەك لە گوندەکانی نکار = (بنار)ی چیای (قەرەچوغ) جێبێك دەکڕێت و دەگەڕێتەوە.
هەرکە دەگاتە ئاقاری گوندەکەیان بە هاوڕێکانی دەڵێت:

- هەتا دەگەینە ئاوایی پێچکەکانی بە تیشە بەردی تیژ پارچە پارچە دەبن.

ئەوانیش باوەڕیان دێت و دەڵێن:

- — ئەی چارە؟.

پاش ماوەیەك تەکبیر و مشوور خواردن واڕێکدەکەون لبادی لە تایەکانی بپێچن هەتا (تایە)کانی نەدڕێن.
دەنێرنە ئاوایی و لبادیان لۆ دێت و لە تایەکان دەدروون ئەوجا دەچنەوە.

***

**لۆ ئەوان زۆر دەکات:**

سەردەمایەك ئازووقە زۆر بە کەمی و سست دەدرا، خەڵکەکە وای بۆ دەچوون (بایەع)ەکە لۆخۆی دەدزی. ڕۆژێك ژنێك لەنێو پاسدا بە ئەوەی تەکییەوەی گوت:

- خوشکم ئەوەندەی لەمن دەبڕن و ئەوەندەی لە توو دەبڕن و ئەوەندەی لە یەکێکی تر دەبڕن لۆ ئەوان زۆر دەکات.

***

**مادام ئەو عەرەبیەت دەزانی:**

دوو خۆشناو چوونە ناو عەرەبان و سوێندیان خوارد هەتا فێرە زمانی عەرەبی نەبن نان نەخۆن.

لەو گوند چوونە ئەو گووند و برسێتی سات بە سات پتر هیلاکی دەکردن.

پاش دوو ڕۆژ گەڕان لە ئاخیر ئاواییدا یەکیان زوو خۆی گەیاندە لای پیرێژنە عەرەبێك، لەسەر تەندوور ئەستووکی دەبرژاند و یەکسەر گوتی:

- یوممە بە عارەبی دوو ئەستوورکانم وێدە.

هاوڕێیەکەی تاتف گرتی لە ڕووی کرد و گوتی:

- هەی خۆڕی، بەرەللا: مادام ئەو عارەبیەت دەزانی ئەو دوو ڕۆژە لۆ ئەمنت لە برسان دەکوشت.

***

**مادام وایە:**

لە ساڵی: (قالە .. لەخەت گیراو)دا کابرایەك لە شاری هەولێر بە خۆ .. و گوێدرێژەکەیەوە لەسەر خەت دەگیرێن.

داوای پارەی سزا لە خۆی و کەرەکەی دەکەن. بەس پارەی سزای کەرەکە نیوەی هی خۆی دەبێت.

کابرا زۆر هەول دەدات عەفووی بکەن بێ فایدە دەبێت. کە دڵنیا بوو هەر لێیدەستێنن و دەڵێت:(

- مادام وایە هەر وەکی کەرەکەم حسێب بکەن).

***

**ماکوشی ماکوشی:**

من و خوالێخۆشبوو (مەلا عەباسی برایم کارەوان) ئاوزە بووین. ئەو جمکە بوو لەمن کورت و لاوازتر بوو. تەمەنمان لە دەوری (١٢) دوازدە ساڵدا دەبوو. لە حوجرەی گوندی (لاوەر)ی بناری کێوی (قەرەچوغ) فەقێ بووین دەمانخوێند.

ڕۆژێك عەرەبێكی (بەدو) قەسپی هێنا ئاوایی. من و عەباس پارەمان برد قەسپ بكڕین. عەرەب بۆ قەسپ كێشان بە تەرازووچۆكێكی گەیاند بووە عەردی و چوكەكەی تری بڵندكرد بوو. دیشداشەكەی تۆزێك لەسەر ئەو پێیەی بڵندی كردبوو لاكەوتبوو. چشتەكەی لە دەرەوە بوو .. و دەتگوت ماری ڕەشە. هەر ئافرەتێك بۆ قەسپ كڕین دەهات دەیدیت بە چارۆكی ملی چاوی خۆی دەگرت و دەچووە لایەكەی دیكە ڕادەوەستا.

من پەلەپیتكەم خواربوو، كەچی مەلا عەباس یەكاویەك بوو. ئاگای لێنەبوو. چووم بە دزی خەبەرم دایە و گوتم: (لەو چاوەتە هەرەكەتەك بكە).

هەركە دیتی گەڕا بەردێكی بە ئەندازەی قڵە نۆكێكی پەیداكرد و بە هەموو هێزییەوە لە سەرەكەیدا. عەرەب لەگەڵ گوتنی: (یەیابە !)یەك ڕم لە خۆی هەڵداو قەسپی ناو تەرازوو پەرت و بڵاوبووەوە.

خەڵكەكە گوتیان: (چ بوو؟). لەگەڵ هەڵپشافتنی گەل و گوانی گوتی: (ماكوشی، ماكوشی = چ نەبوو. چ نەبوو). بەم جۆرە ئەدەب)مان پێداپۆشت.

***

**مامۆستا كەرسم:**

پیاوێك لە ئاخر و ئۆخری مانگی ڕەمەزاندا دەچێتە لای مەلا سەری خۆی و منداڵەكانی چاك بكاتەوە و سەر فترەی بداتێ. ناوی كچێكی خۆی لە یاد دەچێت. چەند كەسی دەوروجیرانی لادەبن و ڕوویان تێدەكات و دەڵێت:

- ئەرێ ناوی ژنەكەی سوارەی چییە !.

ئەوانیش دەڵێن (كەلسوم).

بە پێكەنینەوە دەڵێت:

ئا ... مامۆستا كەرسم.

***

١- سوارە پیاوێك بوو چەند ساڵ لە مەوبەر چایەخانەی لە ڕاست جۆگە ئاوی مورتكە، لەسەر جادەی كەركووك دانابوو.

***

**مەرجی مێردکردنی بێوەژنێك:**

بێوەژنێکی تەڕ و بڕ دەبێت و دەڵێت: مێرد بە پیاوێك دەکەم یەکەم شەو (٥) پێنج گانان بکات.

موشتەری نابێت. تاکو ڕۆژێك (حەمە ڕەش) ناوێك دەڵێت: (من شەوی یەکەم پێنجت لەگەڵ دەکەم). مێردی پێدەکات.

شەو لە جیاتی پێنجان شەشان دەکات و بێوەژن لە خۆشیان دەڵێت:

- چاوی چاوم حەمە ڕەش.

قەولمان پێنج بوو کردت بە شەش.

***

**مەگەر بەسەر:**

سەردەمایەك بە هۆی نەهاتی و قاتی و قڕیەوە گۆشت خواردن کەم دەبێت، هێندێك لە خەڵکی گوندێك شەو کوێر دەبن.

مەلاش لە خوتبەی جومعەیەکدا دەڵێت:

- هەر کەس ئاژەڵێك بکوژتەوە و گۆشتەکەی بەسەر خەڵك دابە شبکات لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی دەبێتە بۆراق و لە پردی سیراتیی دەپەڕێنتەوە.

ڕۆژی دوایی پیرێژنێکی دیندار بە مەلا دەڵێت:

- مامۆستا من بەرانێکی گەورە و کوشتەوە و گۆشتەکەشم هەموو دابەش کرد، ئایا لە ڕۆژی قیامەتدا لە پردی سێرتێم دەپەڕێنتەوە.

مەلاش دەڵێت:

- بەڵێ دەتپەڕێنتەوە.
- بەس مامۆستا بە داخەوە گەیشتەماڵی ئێوە و خلاس بوو.

مەلاش دەڵێت:

- چما بۆ ماڵی منت نەبردووە.
- ناوەڵلا.

مەلا بە تووڕەیی یەوە دەڵێت:

- مەگەر بە سەر ئەو کیرەی دابپەڕیتەوە.

***

**مەلا و خوتبەدان:**

مەلای گوندێك هەموو جارێ لە ڕۆژی هەینیدا یەك خوتبەی دەخوێندەوە.
ڕۆژێك چەند گەنجێکی مەفتووق خوتبەکەی لە بەرگی جوبەکەی دەدزن.
مەلاش هەرکە هەڵدەستەوە خوتبە بدات و دەست لە بەرگی جوبەکەی دەنێت خوتبەکە نەماوە، یەکسەر دەحسێت خوتبەکەیان لێدزیوە.
لە بەرکەکەی دی خوتبەیەکی یەدەگی هەڵگرتبوو .. و دەردەهێنێت و لە کاتی گوتنی (الحمدلله ثم الحمد لله) بە هێنان و بردنی دەستێکی قوچاوەوە ئاماژە بۆ خەڵکەکە دەکات.

***

**مەی بارد:**

پیاوێکی کورد دەچێتە شاری موسل عەرەبی نەدەزانی کاتێك بیستی کابرایەك بانگ دەکات:

- مەی بارید. مەی بارید.

ئەویش دەبێتە مەراقی و دەیکرێت هەرکە دەیخواتەوە دەڵێت:

- هەر دەڵێن: مەی بارید مەی بارید بە حەقی خودا تام ئاوی ساردی لێدێت.

***

**مەیتی شای ئەجندانە:**

ئەم گەمەیە بە (٥) پێنج مێرد مندالّ شەوان ئەنجام دەدرا. یەکێك لەسەر تیلەقەی پشت درێژ دەبوو .. و گرێی لە خۆی دەبڕی.
بۆ ئەوەی گوێی لە هیچ نەبێت هەردوو پەنجەی دۆشاو مژەی لە نێو گونە گوێیەکانی دەنا.
یەکێك لەلای ڕاستەوەی دوو پەنجە شادە نوێژەی دەخستە بن شانی و یەکێکیش بەرامبەری بە هەمان شێوە.
سێیەم: دوو پەنجەی گۆرین دەخاتە بن ئەستوورایی ڕانی و چوارەم بەرامبەر بە هەمان تەرز.

یەکەم: فیتەیەکی درێژ بەسەر جەستەکەدا لێدەدا و ئەوجا سەری دەبردە بن گوێی ئەوەی تەکیەوە و بە چرپە پێی دەگوت:

- ئەو مەیتە مەیت کێیە؟.

دووەم ڕوو لە سێیەم دەکرد و دەڵێت:

- ئەو مەیتە مەیتی کێیە؟.

سێیەم ڕوو لە چوارەم دەکات و:

- ئەو مەیتە مەیتی کێیە؟.

چوارەم ڕوو لە یەکەم دەکاتەوە:

- ئەو مەیتە مەیتی کێیە؟.

یەکەم ڕوو لە دووەم دەکاتەوە و:

- مەیتی شای ئەنجدانە.

دووەم: مەیتی شای ئەجندانە.

سێیەم: مەیتی شای ئەجندانە.

چوارەم: مەیتی شای ئەجندانە.

یەکەم: ئەمە بە چار دەستانە.

دووەم: ئەمە بە چار دەستانە.

سێیەم: ئەمە بە چار دەستانە.

چوارەم: ئەمە بە چار دەستانە.

یەکەم: دەیبەین لۆ سەر قەبرانە.

دووەم: دەیبەین لۆ سەر قەبرانە.

سێیەم: دەیبەین لۆ سەر قەبرانە.

چوارەم: دەیبەین لۆ سەر قەبرانە.

یەکەم: دووبارە فیتەیەکی درێژ بەسەر جەستەی درێژ بووەکە دەکێشێت و هەر چوار دەلحاز دوای فیتەکە بەلەز قیت دەبنەوە و لەشی درێژ بووەکە بە (٨) هەشت پەنجان وەك تەرمێکی ڕەق بوو بێت بڵند

دەبێت و هەتا دەگاتە کەرخی سینگیان هەر چوار بە یەکەوە پێدەکەنن. واتە درۆیە و مەیت نییە و ئەوسا جەستەکە لە دەستیان بەردەبێتەوە.

تێبینی:

خوالێخۆشبوو مامۆستای نووسەر و قەڵەم بە پێز ڕێزدار: (محەمەد کەریم شەریف) فەرموویەتی:

- (چوار کەسەکە (بسم الله) دەڵێن و تەرمەکە بەردەبێتەوە.

وادیارە لەناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی تر فەرقی هەیە.

بۆ وێنە:

(من خۆم چەندجار بەشداریم لەم یارییە کردووە و بوویمە سەرۆك و هێندەجار بوویمە تەرمەکە و بڵند کراوم و کەچی (بسم الله)ی لەگەڵ دانەبووە. بگرە تەنیا پێکەنین بووە ... نووسەر).

***

**منداڵ بوون پەخوایە:**

دوو ئافرەتی دۆستی یەکتر دەست بە قسان دەکەن و یەکیان دەڵێت:

- کیژی من ئەوا حەفت ساڵی ڕەبەقە مێردی کردییە و منداڵی نەبووە.

ئەوی دیکەیان دەڵێت:

- خوشکم منداڵ بوون بە مێردکردنێ نییە پەخوایە پەخوا.

بۆ ئەوەی قسەکەی خۆی پێ بسەلمێنێت و دەڵێت:

- کیژی من چ مێردیشی نەکرییە و دوو کوڕیژکەشی هەنە.

***

**من وامزانی:**

بێوەژنێك شوانێکی دەبێت ڕۆژێك شوانەکە لە نزیکیدا دەنیشت و دەنگێکی لێوەدێت. بۆئەوەی تێ بجۆلێت تا چەپۆك دەگرێت لەسەری منداڵەکەی نێو کۆشی دەدات و دەڵێت:

- خۆرەچەرت لێکەوێت ئەو ترەت لۆکرد؟.

چەند ڕۆژێکی پێدەچێت ئەو جارە شوانەکە دەنگێکی لێوە دێت و ناکاتە نامەردی شەپێکی حێل لەسەری منداڵەکە دەدات.

بێوەژن بە توورەییەوە دەڵێت:

ئەیە ڕۆ .. لۆ .. لەو منداڵەت دا.

ئەویش دەڵێت:

- من وامزانی ئەوەی لەوماڵەدا تڕ بکات شەپ لەسەری منداڵ دەدات.

***

**مووێك بە قوونمەوە ناهێڵێت:**

پیاوێك چێلێكی بە (كەڵ) دەبێت. لەگەڵ كوڕەكەی دەیباتە ماڵێك لەسەری گەڕەك. جوانەگایان دەبێت.

خاوەن جوانەگا دەڵێت:

- جوانە گاکەمان ناپەڕێت.

ئەویش دەڵێت:

- من وادەکەم بپەڕێت.

مووێك لە قوونی جوانەگایەکە دەردەکێشێت جوانەگاکە دەپەڕێت. جاری دووەم و سێیەمیش هەر ئاوا.

هەرکە دەگەڕێنەوە باوکە بە کوڕەکەی دەڵێت:

- لای دایکت نەگێڕیتەوە.
- لۆ ..؟.
- بە حەقی خودا مووێك بە قوونمەوە ناهێڵێت.

***

**من هەریەك:**

پیاوێكی كورد و ئینگلیز بە یەكەوە: لە (شهر العسل) مانگی هەنگوینی لە ئوتێلێك بەسەردەبەن.

بەیانی یەکەم ئینگلیزەکە بە کوردەکەی دەڵێت:

- ئەمشەو چەندت کردووە؟.

- دوازده (١٢).
- ئەدی ئەتو:
- یەك.

رۆژی دووەم کوردەکە دەڵێت.
- (٨) هەشت.

ئینگلیزەکە:
- یەك.
- چوار (٤).
- یەك.
- دوو (٢).
- یەك.
- یەك.
- یەك.
- من هیچ.
- من هەر یەك.

***

**مێردی خۆم ترد:**

سێ خوشکی فسەزمان هەبوون پیتی (ك) یان دەکردە (ت).

ڕۆژێك سێ برای گەنج دەچنە داخوازی هەرسێکیان.

دایکی کچەکان ئامۆژگاری کردن و گوتی:

- نابێ کەم و زۆر قسان بکەن و زارتان بگەڕێت و داخوازی کەرەکانتان پێ بحسێت ئەگەرنا مسۆگەر لێتان دەڕەونەوە.

ئەوانیش بەڵێنیان پێدا و گوتیان: (سەچاو).

زاواو ڕدێن سپی و جوامێرە میوانەکان هێشتا باسی خوازبێنیان بەسەر زاردانە هاتبوو، لە نکاو (مشك)ێك لە پێش دانیشتووان دەرپەڕی.

کچی گەورە ئاگای لە نسحەتەکەی دایکی نەماو دەڵێت:

- ئەها ... مشتە!.

خوشکی ناوەندی لێوەرگرتەوە و گوتی:

- وەللا چوو تونێ.

کیژی کچکە بەشانازییەوە گوتی:

ئەدی داتمان نەیتۆت: هەتا مێردی خۆتان دەتەن قسان مەتەن.

ئەمن قسەم نەترد و مێردی خۆم ترد.

هەرکە زاواکان ڕاستییەکەیان بۆ .. واژی بووەوە لە مەرامەکەیان پاشگەز بوونەوە.

***

**(نفس الخری):**

لە زەمانی بەعسی گۆڕ بە گۆڕ چوودا، لە سەریتەرەکان گەلی کوردیان زۆر ئەزیەت دەدا. نەخاسمە سەیتەرەی (شێراوە). گوندێکە لەسەر شەقامی کەرکووك، باکووری شارۆچکەی (پردێ)یە.

جارێك نێرینێك لە بەغداوە بەرەو شاری هەولێر دەچێت. هەرکە دەگاتە سەیتەرەکە بەرپرسەکە بە نەفەرەکان دەڵێت:

- یاللا دابەزن.

هەموویان دادەبەزن تەنیا یەکێك نەبێت بەرپرسەکە پێی دەڵێت:

- بۆ دانا بەزیت؟.

ئەویش دەڵێت:

- من کورد نیم، تورکم.

بەغەزەوە پێی دەڵێت:

- (نفس الخری. إنزل).

***

**نەکەیت سوورە نەکەیت:**

سەردەمایەك ژنە ڕەوەندەکان، بۆ کەنگر و ڕێواسان، لە کوێستانەکان بەکۆمەڵ دەگەڕان.

هەرکە تووشی پیاوێکی لاییدە بهات بوونایە، بەسێ چوارێکیان دەیان گرت و بەرزەفتیان دەکرد و شەرواڵیان لە پێدەکردەوە. ئافرەتێکیان کۆشی خۆی هەڵدەماڵی و عەورەتی پیاو و ژنەکەیان بەرامبەر یەکتر .. ڕادەگرت.

ئەگەر عەورەتی پیاوەکە بچوولابووایە، بە سەلکە شەکرۆکان لێیاندەداو دەیانگوت:

- نەکەی سورە. نەکەی غەدار.

ماوەیەك پێیان ڕادەبوارد و ئەوجا بەرەللایان دەکرد.

***

**نەینۆك:**

ڕۆژێك چوومە شار، لۆ ئەوەی هاوسەرەکەم دڵخۆش ببێت نەینۆکێکم بە دیاری بۆ کڕێ. دەمزانی بە عەمری خۆی ئاوێنەی نەدیتووە و ناشزانێت چییە. هەتا بزانم کە یەکەمجار خۆی لەناو ببێنێت چ دەکات. بە قەست لەناو سەندووق، بەرامبەر دەرگەم دانا. کاتێك دیتم لەگەڵ دەرکە کردنەوەی سەندووقەکە لە زرووکەیەکی وایدا بەندی دڵمی پساند و لەبەر خۆمەوە دامە بەرێ: ((ئیلا بیلا بچمی خۆی بە ئەجندە تێگەیشتووە ئەگەرنا ئەوها نەیدەزرووکاند)). بێ ئەوەی زاری لەگەڵم بگەڕێت، بە لە خۆدان و ڕوو ڕنینەوە بەرەوماڵی بابی کە دراوسێمان بوو هەیپەی لێکرد.

من ئەوەندەی لە خەسووم دەترسام، ئەوەندە لە خوا بترساباما، بە پێڵاوەوە دەچوومە بەهەشت. لەو گۆڕە زەندەقم لێچووبوو. نەخەسەلە ئەو قەبەحاتەشی بێتە پاڵ: (بە حەقی خودا حەیام دەکاتە حەیای پیاز فرۆش. مەولوودێکی گەورەم لە خۆم گرت: ئەو کەڕەتە بە سەلامەتی لە دەستی قوتاربیم).

دیتم وا لە پێشەوە بە هەڵە داوانەوە دێت. ویستم پێش کار لە کار ترازانێ، بە پیرییەوە بچم و .. واریقاتەکەی لە سیری هەتا پیازی بۆ دەوریکەمەوە، بەلان های .. هوو .. لەجاری ئەوها هەڵچووندا، گوێ بە باوکی خۆش نادات. لە دوور ڕا گوتی: (قورە مەیتەری سەیانی لە چاو پیاوان دەڵێی چوشتیری بەراویشتەی ئەتوو هی ئەوەی ژن بەسەر کیژی من بێنیت).

هەرکە ئەوەم لێ بیست بۆم واژی بووەوە: (کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە). خێزانەکەم بچمی خۆی بە ئافرەتێکی دی لە قەڵەمداوە.

پشووی ئۆخەم هاتەوە بەرو مچوڕکەی خۆشی لە ناو شا دەمارەکانی لەشم مێروولەی کرد و بە پێکەنین و هەلیکسەوە بە دوایان کەوتم.

حورمەکەم بە دایکی گوت:

- وا لە ناو سندووقێی شاردووەتەوە.

لەگەڵ دەرکە کردنەوەی سەندووقەکە و دیتنی شێوەی خۆی لەناو نەینۆکەدا) لە حریتەیەکی وایدا لە دوورەوە دەبیسترا.

من وای بۆچووم پێشتر نەینۆکی دیتبێت. دڵم داسەکناوە و ترس لە بەدەنم بە یەکجاری بارگەی تێکنا.

بە زمانی خەسواتییەوە پێی گوتم:

- ڕۆڵە ژن لە دنیادا قات بوو بێنیت، تەنیا ئەو پیرەسەیە ڕەزاگرانە، نەبێت.

***

**نووسەر:**

بێوەژنێک کچێکی زۆر جوان و کۆک و تەڕ و بڕی هەبوو. بڕیاریدا کچەکەی، لەبەرئەوە نووسەر بێ ماندوو بوون و کاسبی حەڵاڵ پارەی لەملاو لەو لا دەست دەکەوێت، بداتە نووسەرێك. ئیتر نووسەرێکی دراوسێی بە دڵ کەوت و کیژەکەی گوازرایەوە.

دوای هەفتەیەك، دووان بووك بۆ باوە خوون گەڕاوە و دایکی لێی پرسی:

- ها کچم چتۆ مێردە؟.
- بە دڵساردییەوە گوتی:
- لەبەر نووسینی کاغەز هێشتا دەخلی منی نەکردووە.
هەفتەی سێیەم و چوارەشم هەر ئاوا.
دایکەکە زۆر پێ دڵگیر دەبێت و دوای مشوور خواردنێکی زۆر پێی دەڵێت:
- ڕۆڵە ئەو شەو هەرکە خەریکی نووسین بوو تۆ ئاوەڵکراسەکەی خۆت لە پێ بکەوە و هەردوو لنگت بەرامبەر قوچ بکەوە. ئەوسا هەرکە سەر بەرز بکاتەوە بە دیتنی زەوقی هەڵدەستێت.
هەرکە شەو داهات خەسووەکە دەچێت لە کولانکەوە تەماشا دەکات. کاتێك دیتی نووسەرەکە سەری بڵند کرد و دەستی بۆ درێژ کرد. دڵنیا بوو .. و گوتی:
- تازە کار لە کار ترازا.
گەڕاوە.
بۆ بەیانی دایکەکە گوتی:
- ها .. چ بوو؟.
- هیچ.
- کچێ بە خۆم بەو چاوانە دیتم دەستی بۆ برد.
بە پێکەنینەوە گوتی:
- دایە پەنجەی پێ تەڕ کرد تا پەڕە کاغەزی پێ ئاوا بکات.
***

**نسکێن:**

کابرایەکی ئەو سەرەوە دەچێتە گوندەکانی دەشتی هەولێر ئێوارە خانە خوێیەکە شیوی نیسکی دەداتێ.
ئەویش نسکی قەت نەخواردبوو .. و دەبینێت: سەری نیسکەکە قەتماغەی گرتووە و هێمای سارد بوونی بوو بەنان پارووێکی گەورەی

لێدەدات و دەمی تەواو دەسووتێت.

هەرکە دەچێتەوە لای خۆیان پێی دەڵێن: لەو دەشتە چ هەیە؟.

ئەویش دەڵێت:

- شیوێکت دەدەنێ، پێی دەڵێن (نسکێن) ئەگەر سەرەوەی دوو پەنجە بەفربوو پێی بڕوا مەکە بنەوەی هەر ئاگرە.

***

**نۆبەتە شەوە:**

لە زەمانی زوو ئەگەر ئافرەتێک منداڵی ببووایە شەوان هەتا هەفتەی دەچوو، بۆ ئەوەی شەوە مەلۆتکەکەی نەبات نۆبەتیان هەتا سبیانێ لێدەگرت.

قورئانێکی پیرۆزیشیان لە نزیک سەری دادەنا. بە بیرم دێت هەموو منداڵێك نۆبەتی لێدەگیرا تەنیا ماڵی ئێمە نەبێت.

هەندە منداڵ تووشی نەخۆشی (گوزان) دەبوون و دەمردن و دەگوترا: شەوی بردی.

هەندە ماڵ نەیاندە هێشت هەتا منداڵەکە هەفتەی نەچووبووایە کەس ئامەشۆیان بکات و خەنجەرێکیشیان لە بن سەری مەلۆتکەکە دادەنا.

***

**نێرەکەرە دێزە:**

سێ چوار تەنەکە مێوژمان هەبوو ڕۆژێك خستمە سەر پشتی نێرەکەرە دێزە و لە دێهاتەکانی دەوروبەر بۆ باراش بیفرۆشم. ڕۆژی یەکەم لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە هیچم بۆ نەفرۆشا. ڕۆژی دوام و سێیەمیش هەر هیچ.

سۆرێی خێزانم بە ڕوومدا هەڵشاو گوتی:

- ئەرێ عەولا ئەتوو بەناو ئەوا سەرێ سێ ڕۆژانە ئەو مێوژەی دەگێڕیت ئەوجا هێشتا کێشێکت نەفرۆشتووە.

- ئافرەت چیت لێ بشارمەوە کەرە دێزە لێناگەڕێت بیفرۆشم.

باوەڕی نەهات و بە درۆی حەملاندو گوتی:

- پیاویژکه قسەیەك بکە خەڵك پێت بڕوا بکات.
- حورمێ بەو ڕدێنی سپیەوە درۆم هەڵنەبەستاوە.

به هەڵچوونەوە:

- ئەدی کەر خۆی هەیە تا نەیەڵێت مێوژ بفرۆشیت!.

هەر ئەو سات مێوژەکەم لەسەر پشتی دێزە داناو جلەویم گرت و بردمە دەرەوەی حەوشەو گوتم: (دەتەماشاکە).

هەرکە گوتم: (هۆی .. مێوژ ..) دێزە دەستی بە زەڕین کرد هەتا من سکوتم نەکرد ئەو نەیبڕییەوە.

دووەم و سێیەم جاریش هەرئاوا.

- ئافرەت حالیی بوویت لە بەر زەڕە زەڕی دێزە کەس تێمناگات من بانگی چدەکەم تاکو بێن لێم بکڕن.

زەردەیەکی هاتێ و گوتی:

- نێرەکەرە دێزەی ئاخری زەمانە.

***

**وەحەی دڵداری:**

لە هەرەتی مۆزە مۆزی لاوی دابووم و کوڕێکی کۆك و چوار شانە و تێکچەقی و تادەست هەڵێنیت بالا بەرز و دیدە گەورە و مەڕانی و لووت بەرزی وا شام بە سەپانی خۆم نەدەزانی و لە هەموو دەراوێکیش ئاوم نەدەخواردەوە. زۆربەی کیژ و کاری ئاوایی خواخوایان بوو خۆم لە قەرەیان هەڵسوم. مالی حەزی دڵ خراپ نەبێت: ماری بێ ئیجازە بوو .. و بە خەیالیش بۆ شتاقیان دانەدەوەراوە و بگرە بێزم نەدەهات بە تیچاوێکی کەمیش سەیریان بکەم: (تۆ خوا من و ئەو تیتك بە گووانەیان گوتووە). تەنیا یەکێکیان نەبێت ئەویشم بە گۆمکی گۆپال، لە نێو چەندین کیژی ئاوایی نیشان کردبوو. کەحێڵێك بوو بۆ خۆی تەبەش پان و قولەمس و چاو شینی کۆتری. کوڵمە گوپن بەنچە گوشتن خوێن ئەوەندە شیرین بە حەزی دڵان

بووایە بووکە شووشە ئاسا، تەنیا بۆ سێرەگرتن لەسەر ناو لەپان رابگیرا بووایە.

گەردەنی کتومت گەردەنی کارمامزی دەشتی قەراج و کەندێناوەیە کاتێك لە نێو قۆپەنە دەغلاَندا سەر هەڵدەبڕێت.

ئەو فرشتە بێ هاوتایە، بە جارێك ئاگری تێبەردابووم و کاس و سەرخۆشی وای کردبووم تەرحی سپیانێکی نەبان. کە (بانۆك) بۆ باناندنەوە، لەسەر بەرخەکەی گێژ و هوڕی کردبێت، خراتریشم لێهاتبوو. وێنە شەنگە دلڕفێنەکەی لە خەیاڵ و ناخی دڵمەوە سانییەك چییە نەدەپەڕی. نەخاسمە شەوان هەتا سێباری دەچوو خەوی لە چاوانم دەهەڕماندو گەوزانی بەملا و بەو لای پێدەدام و هەتا لایەکی بالیفم بە ماچ و مووچ و (ئۆخەی نەخشین گیان) تەڕ نەکرد بووایە، وەنەوزم نەدەدا.

زۆر جاریش دەهاتە خەونم بە نازونووز و جرت کێشانی دووراو دوورەوە بەڕووم دەتریقاوە.

وام دابووە بەر مەزندە: (دڵ ئاگای لە دڵە و بێگومان ئەویش منی خۆشدەوێت). کەچی لەم ڕووەوە خوا هەر لە ئیجادەوە پەردەی حەیا و شەرمی بە سەرمدا هەڵکێشا بوو. بە هیچ کلو بابەتێکەوە تاسام نەدەکرد جیڕ بە جیڕی بکەم و: هەستی دەروونم بەڕوویدا هەڵێنم: (گیانەکەم تۆم پڕ بە دڵ خۆشدەوێیت). ئیشارە و برۆ هەڵتەکانیشم لا سوخەتێکی قەلپ و تروهاتی ترۆیان بوو. تەنیا کە بە کنیدا گوزەرم دەکرد تێمهەڵدەکرد (ئحم)ێکی گەورە و بەس، یاخۆ کە ڕووبەڕووی دەبووم بە بارفرە و سمێڵە خچکەوە لێی مووڕ دەبوومەوە. ئەوکات هەستم دەکرد گەشییەك ڕووە تۆکمەکەی دادەگرت. ئەمەش بۆ دڵە گڕگرتووەکەی من مەرهەمێکی کاریگەر بوو .. و لێمدەبووە مچورکەی خۆشەویستی و لە نێو ماسوولکەکانمدا ڕمبازی دەکرد. هەرکە لێی دوور دەکەوتمەوە لەخەنی خۆشیان هەرچی ئازای لەشم بوو دەکەوتە جیهانی لە خۆ هەڵدانی هەلەکە سەمایەوە و لاموابوو دنیا سەرتاپا موڵکی منە. ئەوجا بە داخەوە بە هیچ چەشنێك نەمدەتوانی بە کامی

دڵی خۆم بکەم. ناوەللا. زڕتە بۆزەکەی باوکی تەلاقی سێ بە سێی پێدادا بوو: بێ ژن لە ماڵ دەرناچێت. خواش خوشکێکی نەدابوومێ تاکو بە ژناو ژن ڕازیم بکردبووایە. هەبووەش نیمە، بە زەبری پارە لەبن چنگیم ڕاستاندبووایە. هەردەم لە کێشمەکێشی ئەوەدابووم هانا بۆ چ ڕێگایەك ببەم. ئێ.. خۆ ناشکرێت هەر ئەوها دەست بە تاڵێ، لەسەر ئاوو ئاگر بم و تەکانێك چییە لە خۆم نەدەم. دوای هەڵگێڕ و وەرگێڕ و تەتەڵە کردنی چەند ڕۆژ و حەیام وام بە باش خەملاند (هەڵی بگرم بەڵێ هەڵی بگرم). لەمە زیاتر چڕێی دیکە شك نابەم. نە بە خوا. بەڵێ چارە تەنیا هەڵگرتنە و بەس. بەڵێ: هەڵیدەگرم و تاکەس جێمان پێ نەزانێت دەچینە ناو عەرەبان. ئەمەش خستمیە کۆڕی بیرکردنەوە: (ئێ .. خۆ هەڵگرتنیش گۆترە نییە و مەحاڵە بە کت و پڕی ببێت لە بەراییدا خەم خواردنێکی زۆری گەرەکە: (باکیژەش من خۆش بوێت. ئاخر من هەتا ئەمڕۆ بە چاك و خراپ پڕ بە زار نەمدووانـدووە چۆن، بە چ ڕوویکە بۆم دێتە ڕایی. نەخەسە لە کچێکی ئابڕوومەندی لادێیی و شاران نەدیتە. ئەمە هەرگیز نەبووە و ناشبێت. ئەی تەگبیر؟. قوڕی کێنـدەر بە سەری خۆم دابکەم و چ ڕێگایەك بگرمە بەر خوایە). کەوتمە نێوان چالان و مالانی دوو دڵییەوە:– خۆ ئەگەر بێتو خوانە خواستە بەنسیبم نەبێت ژیانم ئەوسا بێگومان لێدەبێتە ژیانی (سامیری) و کەڵکی ئاوەدانیم هەرگیز نامێنێت. ناوەللا کەڵکم نامێنێت. نا حەقیش نەبووم: چەند ساڵە ئەوینی ئەو بابان کورە لە سکۆڵەی چەپی دڵمدا وا قرمساوە هێز نییە لە جیهاندا تا ئەو ساتەی حەزرەتی (قابیز) چۆك لە سەر سینگم دا دەنێت بە ئاستەمیش بیشڵەقێنێت). جا خوا نەکەرانە یەکجاری لە کیسم بچێت و بەزەقی زەقی چاوانم سەر لە باخەڵی گەمبۆرێك بنێت. هەر چەند سەرم دەهێنا و دەبرد و لە دڵەوە شیکوتم دەکرد لەو ڕێگایەی گوتم بترازێت زیاترم بە خەیاڵدا گوزەری نەدەکرد. ناچار، خۆشی و ترش ملی بۆ لار بکەمەوە، بەڵام لەسەراییدا دەبێ هیچ کۆسپ و گرێ و گواران لەم ڕووەوە نەهێڵم و تەختی

بکەم. ئەوکات مشوور خوادنی قۆڵ و باسك لێهەڵماڵینی سانایە و هیچ گیروگرفتمان نایەتە سەر ڕێگا.

لە پەڕەکەی دڵمەوە بڕیارمدا کۆششی لەمە و دوام دڕاندنی پەردەی شەرمی نێوانمان بێت. بەڵێ دڵدارییەکەمان وا بتەقیتەوە خەڵك و خوا هەستی پێ بکەن ئەوسا لە ترسی ئابڕوو چوون و کوشتندا، بە خوایشتی دڵمانەوە ئەو ڕێیە دەگرینە بەر. ئیدی لەو ساتەوە چاوە چاوی ڕۆژێك بووم لە پەنایەکی نەدیو بۆم تیبێتەوە و چی ڕازی چەند ساڵەی دەروونمە خڕی لەسەری هەتا پیازی بەڕوویدا هەڵڕێژم. ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیشت ئەو پاتەم بۆ نەڕخسا. لە بەختە دەمۆرەکەی مندا ئەو لەو ماوەیەدا توورندییەکی وابوو دەتگوت: پێ حسیایە. بە هیچ کلوجێکەوە بۆم تینەدەبووەوە. تاکو ڕۆژێك وەك سروشت مەیلی لەسەر بێت کت و خوا دیتم لە تەقرانەکەی بەردەرگەی حەوشەیان، کە ڕێگای گشتی بە سەرەوە بوو .. وا بە تاقی تەنێ (باراش) چادەکات. لەبەر گەرمی دنیاش کش و کات کێشکە چیبە بە دەرەوە نەبوو. دەلحاز شادی دایگرتم ئەمما شادی. دڵە هەڵقرچاوەکەی حەیام زەمانمەوە کەوتە دنیای هەڵقۆز هەڵقۆزەوە: (شێروان .. دەی خێراکە و خۆت مەگنخێنە و غیرەت بدە بە خۆتەوە غیرەت. جارێکی دی گورگ ئاوا بەسەر سەدەی مەحموود بایز دانایێت و دەرفەتێکی ئەوها لەبارت لۆ هەڵناکەوێت). وارە وارە بە بزەی سمێڵەوە بۆ لای خشیم و کەوتمە گێژاوی (چیی شایەنە پێی بڵێم). لەلایەکی دیکەوە لەگەڵ هەر شەقاوێك شەرم هورووژمی بۆ دەهێنام و ئاگام لێبوو دڵەکوتە گرتمی. ئەو دووانە، لە دوورڵمەوە خنگە ملانێیان بوو .. و هەر یەکەیان خۆی لەئەوی دی بە ڕەواتر دەحەملاند. ئەویان ڕێ خۆشکەری ئاوقابوونی ئاواتە توریندییەکەم بوو، کە نرخی هەرگیزاو هەرگیز تەواو نەدەبوو، کەچی ئەمیان ماخۆ مردە جلەوی لە دەست خۆمدانەبوو .. و پێویستی حەزمەوە هەر دەهات پەرەی دەستاند و .. وارە وارە سەیتەرەی لەسەر دەکردم. لەو بینە و بەردەی دوو دڵیەدابووم کاتێك گەیشتمە قەرە بە قەرەی و شەرمەکە لێم بوو بە ترسێکی یەکجار زۆر و چۆکم لەرزی لەرزینێکی

وا دەتگوت لە کەڵێنی دزی گیراوم و بەسەر هەست و هۆشمدا زاڵ بوو .. و چەشنی نووشتەی زار بەسترانم لێکرابێت مردم و سۆتم لە ئحمەکەی تایەن بترازێت زارم بۆ چیتر نەپچڕا. ماوەیەك لێیدوور کەوتمەوە و لە نکاوێك مەرامەکە، دوای سەربادانی پەشیمانی و نەفرەت کردنی شەیتانی لەعین شەرم و ترسەکەمی تووڕ هەڵدان و ڕووی بە سۆزەوە چوست پێوە چەرخاندمەوە. لە حیددەتی قارخواردنی قەلە زراوی و بێ غیرەتی خۆمەوە (سەرکەشانە) هەنگاوی جەسارەتیم زل و گورج تر وەچەرخاندەوە: (عەمرت نەمێنێت: خۆ چ مەیدانی زەلام کوشتن نییە! غێر ئافرەتە).

هەننۆب هەرکە گەیشتمەوە کەرخی، زارم بە هەمان شێوە گیرا و چەندی کردم و کۆشام بۆم نەپچڕا، تەنیا بەس بڵێم (کوویت؟). جاری سێیەمیشی چووە پاڵ. ما سەرکۆنەی خۆم بکەم: (دەگ داوەشێیت دافەتێیت غیرەتت سەگ بیخوا .. ئـ .. هـ کە بێتە قسانیش بە خۆت دەڵێیت: پیاو .. و لە مەیدانی شەڕدا خۆت بە کەس نادەیت. ئەوجا ئەوهاش زێلك ڕژاو خۆ هێشتا چ نەبووە وا تۆقیویت. ئەی ئەگەر گەیشتە کاری لێقەومانیٚ؟ لە جێی ژووان، یان لە کاتی هەڵگرتنیدا جەناتیان دیت؟. ئەوکات دەبێ چێ بەکیت و چیت بەسەر بێت؟).

ماڵی نەخشین خان ئاوابێت، لەبەر عوجب گەورەیی بێت، یان هەر شتێکی دیکەوە بە ئحمەکان خۆی گورگە هەڵنەدەخست و زۆر و کەم مرتەی لەبەر وەنەهات. لە ناخەوە بڕوام هات: بێدەنگییەکەی نیشانەی ڕازی بوونە. ئەگەر نا دەسبەرداری کارەکەی دەبوو .. و خۆی لە حەوشە دەکوتاوە.

ئەمە خۆشییەکی وای پەڕاندە دڵە بێ ئۆقرەکەم نەبێتەوە. زۆر نەمابوو جاشکانی لە خۆم هەڵدەم و بە پاشەڵان زرچە لە سمتەکانمەوە بێنم. هەرچی شەرم و ترس بوو بە جارێك لە ناخمەوە بارگەی تێکنا: (کە کیژە پێیخۆشبێت پێم ناڵێیت: تۆ لە چ دەسەنگرێیتەوە ها..؟). وێڕای ئەمەش سوێندێکی مزرم پێداداو: (وەللا وە بیللا وەتەللا هەرسێکیان ناوی خوانە: ئەگەر بشپسێم ئەو کەڕەتە بە جێی دەگەیەنم). دیسان بە موشتاق و

هەشـتاوییەوە گەڕامـەوە و لـە دڵـم ڕوون بـوو دواجـارە و شـتێك بـە شـتێك دەكەم. وەك ئەسپێكی غورد بۆ قۆشمە لە سەری مەیدان وەستا بێت بەدەنم ئاوا گشت كەوتە چرك و هۆڕەوەوە و ڕەنگم بە جارێ پەڕی و ڕنگە ڕنگی دڵم دەتگوت (لاوژۆكە)ی زەنگوڵی ملی بارگینی كار وانچیانە داكەسانی نەبوو. تا حەقیش نەبووم دەربڕینی هەستی خۆشەویستییەكی پـەنگ خـواردەی چـوار ساڵی ڕەقی ناخی دڵم بە یەك ڕستە گۆتر نییـە. هەركـە لێـی نزیـك بوومـەوە لەبـەر سـۆماكانم بـوو بـە پیـاوێكی زەبـەلاحی زەبـر بـە دەسـت و تۆقێنـەر. دووبارە هیچم لە یاد نەما. كەچی سوێندەكە قیچەك گوڕی غیرەتی وە بەرنام و نەیهێشـت جـاران ئاسـا دەسـت بـە تـاڵ بگەڕێمـەوە. ئحمەكـە بـووە پـیش قـەرەورو بـەڵام چـەندی كـردم كۆشـام لـە مـەم زیـاتر نەهاتـە سـەر زار لـە ڕاستیشدا لەبەر ئەوە بـۆ جـارێكی تـر ڕێ خۆشـكەر و شـەرم و تـرس ڕەوێـن دەبێت ئەوەندەم كەیف پێهات لاموابوو كێوی بێستوونم سمیوە:

- دەڵێم: بە جارێك ئەو هەموو گەنمەت لێ بخۆم.

بە ئاوڕدانەوەیەكی سركی ئاسكانەوە لـە حیلكەیـەكی وایـدا لـە دوورەوە دەبیسترا. لە دەڵمی سەقادا مەزەندەكەم بە هەڵە نەچووە و خۆشـییەكی لـە ڕادە بـە دەر دایگـرتم و دوو بـاڵی شـادیی ئومێـدم لێرسـكاو لـە كەشـكەلانی حەواوە باڵە فرِكـەم بـوو .. و پشـووێكی درێـژی سـەر فرازانـەم خـواردەوەو: (ئۆخەی خۆ .. وا لە زگە بە نیازی دڵی خۆم بگەم!). كەچی بە داخەوە، لـە هیكەوە ڕیسە كشتەكەی چەند ساڵەم بـە جارێـك لێبـووەوە خـوری و چـاوی مەرامم مۆڵەق وەستاو قورگ وشك و زەرەند ئاسا تاڵ و پشوو سوار و ڕەنـگ زەعفەرانی كاتێك پێكەنینەكـەی كـەمێك هێـور بـووەوە و ئەمـەم بـە دەنگـی حێلی بێ پەردەوە لێی بە گوێ كەوت:

- وەحە هەرە.

تێبینی: ئەمە فۆلکلۆرە و لە منداڵیەوە وام بیستووە: ( کوڕە گەنجێك بە کن کچێك باراش چادەکات تێدەپەڕێت، شەرم دەکات بڵێت: (تۆم خۆشدەوێت) لە جیاتی دەڵێت: (دەڵێم ئەوەندە گەنمەت لێ بخۆم).
کیژەش بە پێکنینەوە دەڵێت: (وەحە هەرە) منیش بەم چەشنەم داڕشتووە.

***

**وەك بەری دەستی لێدەکات:**

عەتارێك لە دێهاتەکاندا بۆ فرۆشتنی کەل و پەلەکانی دەگەڕێت لە گوندێکدا ئافرەتێك هەندە (دمکانە)ی بۆ تراشینی بەری لێدەکرێت و پێیدەڵێت:

- ئەرێ کووە؟.

عەتاریش بەزەردەوە دەڵێت:

- وەك بەری دەستی لێدەکات.

ئافرەتەکە یەکسەر دەڵێت:

- کەواتە هەندەکی دیشم بدێ.

***

**وەکی ئەو براژنە:**

کابرایەك دەچێتە شاری بەغدا لە قەحپەخانان زۆر رادەبوێرێت.
هەرکە خەڵکەکە لێی دەپرسن:

- بەغدا چۆن بوو؟.

بێوەژنێکی تەڕوبڕیش لەلایان دەبێت کابرا دەڵێت:

- وەکی ئەو براژنە بە (٥) هەزارت دەگا.

***

**وەللا ئەوجاری من لەگەڵ دانەبووم:**

پیاوێك بە منداڵان فێردەبێت. منداڵی نێرینەی گەڕەك و دەوروبەری نەبوارد بوو.

ڕۆژێك دوو منداڵی گەڕەكەكە بە شەڕدێن. پاش لێدان و كوتانی زۆرەوە یەكیان دەڵێت:

- ئەدی فلان لە نێو قەمەر شینەكە ئەوهای لێنەكردیت.

ئەویش بە هەڵچوونەوە دەڵێت:

- وەللاهی درۆ دەكەیت ئەوجاری ئەمن لەگەڵدا نەبووم ئەتوو لەگەڵ دابوویت.

***

**وەللاهـ سودك:**

دكتۆرێك پیاوێكی عەمەلیات كرد و سستەرێك بەر دەستی دەكرد. پیاوە نەخۆشەكە عەورەت و كەپووی زۆر گەورە بوون.

پزیشكەكە بە سستەرەكە دەڵێت:

- هەر پیاوێك كەپووی كەورە بوو شتەكەشی گەورەیە.

هەر ئافرەتێك دەمی گچكە بوو شتەكەشی گچكەیە.

سستەرەكە دەمی خۆی كچگە دەكاتەوە و دەڵێت:

- وەللاهی سودگ.

***

**وەللا هەر ئەوم:**

پیاوێك ڕۆژێك لە كۆلانێكی قەرەباڵغی نێو شاری هەولێر تووشی كابرایەك دەبێت لە دوورەوە بە گوراح خۆشی و پێكەنینەوە بەرەو پیریەوە دەچێت و لەگەڵ دەست ماچ كردنیدا دەڵێت:

- خاڵە ماندی نەبێ و .....

كابرا خۆی لە گوورە نابات و نایەڵێت تەواوی بكات و دەڵێت:

- ببورە ئەمن خاڵت نییمە ڕۆڵە.

ئەمە پیاوەكەی سست دەكاتەوە.

دەسووڕێتەوە كۆلانی دووەم تووشی دەبێتەوە و وەك جاری پێشوو لەگەڵ دەست ماچ كردنیدا دەڵێت:

- وەللا خاڵە تازە تووشی یەکێك بووم کت و مت جەنابت بوو.

به پێکەنینێکی تەوساوییەوە دەڵێت.

- وەللا هەر ئەوم.

***

**وەی بە وەی:**

بێوەژنێك نەخۆش دەبێت سبیانانی وەرزی گەرما، لە سەبان دەنووست و درەنگ هەڵدەستا.

تاقە کچێکی هەبوو .. و گژو .. وژی ماڵەوەی دەکرد.

بەیانییەك لەکاتی ڕۆژ هەڵاتندا سەری لەبن جێگادا دەرهێنا و تەماشای حەوشەی کرد. دیتی نێرەکەرەکەیان حەشەفەکەی دەرهێناوە و ناوە هەڵبەزو دابەزی پێدەکات.

کیژەش مەشکەی دەهەژاند و هەرجارێ کە دەیدیت بەرزی دەکاتەوە، لەگەڵ شەقەی هێنانی لە مەشکەکەوە دەیگوت: (وەی بەوەی. وەی بەوەی).

دایکەکەش هەرکە گوێی لێدەبێت پێ خەفەتخان دەبێت و لە بەرخۆیەوە دەڵێ:

- ئای .. ئەولادی ئەو زەمانەی چەند بێ ڕوحمن، حەواڵەی نەفسی خۆی دەکات و زاری ناپچڕێت و بڵێ: (بەهی دایکە نەخۆشەکەم هەتا شیفای لۆ بێت).

***

**هازە لتیز عەلا ڕاسی:**

کابرایەکی عەرەب لە ئەدەبخانەی مزگەوتێك هەرچەند تەکان لە خۆی دەدات گووی دەرنایەت. یەکێکی تر لە ئاو دەستەکەی تەکییەوە هەرکە دادەنیشێت شیرەی لێوە دەهێنێت.

عەرەب کە گوێی لێدەبێت دەڵێت:

(هازەلتیز عەلا ڕاسی).

***

**های وێن دیچ وێن:**

کوڕێکی گەنج و قۆز و بە کەشخە و پۆشاك نوێ و شام بەسەپانی خۆم نەدەزانی. لە شەقامی (ڕەشید)ی بەغدادا وارە وارە پیاسەم دەکرد. دیتم چەند کەسانێك لەبن (قەتعە)ی (ئامانە) ڕاوەستاون کچێکی زۆر جوان، نەبکەیت، نەبخۆیت هەر تەماشای بکەیت لە پەرگەی لای وێرەوەیە. دڵم یەکسەر بۆی بزواو بە ئومێدی گفت و لفتێکەوە بلەز خۆم گەیاند تەکییەوە و بۆ ئەوەی ئاوڕم لێ بداتەوە هەرکە گوتم: (ئحم) بیلامانا دەنگێکم لێوەهات.

نەبادا کیژە گوێی لێبووبێت، هەتا تێ بچۆلێت پاشپانی قۆندەرەکانم بە قاییم لەیەك خشاندن.

عەرەبێکی یەختیار لەو سەری ڕیزەکەوە بە دەنگێکی بەرزەوە گوتی:

- لا .. یابە لا .. های وێن، دیچ وێن.

***

**هەر بە ژنانی بمنێیتەوە باشترە:**

پیاوێك کچی خۆی بە مێرد دابوو. پاش چەند مانگان بۆ باوە خون دێتەوە.

ڕۆژێك کەسك و سۆر = (پەلکە زێڕینە) لە ئاسماندا پەیدادەبێت.

کچە یەکسەر کۆشی خۆی هەڵدەکات و ڕووبەڕووی کەسك و سۆرەکە دەچێت. گوایا واباوە یەکەم کەڕەت پەلکە زێڕینە لە ئاسماندا پەیدابوو، بە کۆش هەڵماڵدراوییەوە، بە پیریەوە بچێت: (ئەگەر پیاو بیت دەبیتە ژن، بە پێچەوانەوە).

باوکەکە پێی دەڵێت:

- بۆ .. وا دەکەیت؟.
- هەتا ببمە پیاو.
- ڕۆڵە تۆ هەر بە ژناتی بمینێیتەوە باشترە.
- لەبەرچی؟.

- چونکه تازه تۆ فێره گاندان بوویت، جا به ژناتی بتگێن باشتره، نهك ببیته پیاو ئهوجا بتگێن.

***

**ههتا دمو پێیوویت:**

به پیرێژنێکی ههشتا ساڵی و چاو کز و سهر لهرزۆکیان گوت:

- پووریێ دامێنت ههوهستی ماوه؟.
- ئهویش دهڵێت:
- بهڵێ.
- تۆ .. و ئهو تهمهنه و ههوهستیان گوتووه!.

به پێکهنینهوه دهڵێت:

- ههتا دهو = (دهم) پێی بوویت ئهویش پێی دهوێت.

***

**ههتا دوو گون:**

کچێك داخوازی زۆر دهچێت، بهڵام له ئهنجامدا نسیبی ههڵناقهندرێت. ئیتر بووه قهیره کچی ماڵه باوکی. ڕۆژێك داخوازی دهچێت و ماره دهکرێت. کیژه دهڵێت:

- من لهبهر ئهوه زۆرم ڕك له درۆیان دهبێتهوه پێم خۆش نییه درۆم له پێش بکرێت.

له کاتی کڕینی چهك و جلکی بووکینی دهڵێت:

- من لهبهر ئهوه زۆرم ڕك له درۆیان دهبێتهوه پێم خۆش نییه درۆم له پێش بکرێت.

له کاتی ڕازاندنهوه و به ڕێکردنیشیدا ههمان وته دووباره دهکاتهوه.

ههرکه دهگاته ماڵی زاواش ههر بهم شێوهزاری پچڕی.

ئهوسا پێی دهڵێن:

- درۆی چی ئێستا زاوا دێته کنت!.

ئهویش دهڵێت:

- به خوا ههتا دوو گونان لهسهر قوونی خۆم نهبینم باوهڕم نایهت.

***

**هەتا هەتایێ دەیگایت:**

مەلای گوندێك پەیوەندی لەگەڵ بێوەژنێکی تەڕو بڕو کۆکی ئاوایی پەیدا دەکات.

بێوەژن تاقە کوڕێکی دەبێت و هەست پێدەکات: مەلا بە دایکی فێر بووە و ناوە ناوە لەگەڵی جووت دەبێت.

نەیدەزانی چۆن تۆڵەی خۆی بکاتەوە.

شەوێك مەلای دەبینێت والە سەربانی مزگەوت بانگ دەدات، کەسیش دیار نەبوو، لە پشتڕا پاڵێکی قاییمی پێوە دەنێت و مەلا سەراو سەر بەردەبێتەوە فەراقی حنتەی لەبەر دەبڕێت.

دایکی بۆ بەیانی دەڵێت:

- مەلا لەکاتی جێ بە جێ کردنی فەرزی خوا بەربووەتەوە و شەهیدە.

کوڕەش دەڵێت:

- شەهیدی چی ئەگەر ئەمن بەرم نەدا بووایەوە هەتا هەتایێ دەیگایت.

***

**هەر کە چاوم بە توو دەکەوێت:**

لە شارێك لە شارەکانی کوردستاندا پیاوێکی زۆر فەقیر و گێلۆکە ژیان لە مزگەفیتێك بەسەر دەبات.

مەلای مزگەوتەکەش زوو زوو تەلاقی بەمارە بە جاشی چاك دەکردەوە و هەر جارێش لە پیاوی تایەنی مارە دەکرد. کابرای گیلۆکە خەنی بوو .. و هەر جارێ دەگەیشتە مەلا دەیگوت:

- مامۆستا هەرکە چاوم بە توو دەکەوێت کیرم ڕەپ دەبێت.

***

**هەموو چوولەکەر:**

کوردێك و عەرەبێك لەکاتی گەنجاتی دۆست و خۆشەویستی یەکتر دەبن. چەند ساڵ و حەیام لە یەکتر دادەبڕێن. هەرکە دەگەنەوە یەکدی عەرەبەکە دەبێتە میوانی کوردەکە و سەیر دەکاتماڵەکەی لەبەر کوڕ و کوڕەزای زۆر

قەرەباڵغە. هەرکە کوردەکە دەچێتە ماڵی عەرەبەکە دەبینێت منداڵی زۆر وردن و پێی دەڵێت:

- ئەوە لۆ کۆزت ساوایە؟.

ئەویش دەڵێت:

- هی هەوەل هەمووی چوو لە کەر.

***

**هەموویان بە قوربانی:**

دوو کچ مێردیان کرد و لەکاتی باوە خونیاندا هەریەکەیان بە جل و چەک و خشلی خۆی هەڵدەدا و یەکیان گوتی:

- من گوارە و خەزێم و لاسەرە و دە بازن و کەمەربەندم بۆ کڕاوە و جلکی بەریش لە باس نایەت.

ئەویدی بە لچ قرتاندنی دڕدۆنگییەوە ویستی بە ناو هێنانی بابەتەکانی خۆی لافی لەسەر لێبدات، کەچی قەیرە ئافرەتێکی تەکیانەوە نەیهێشت زار هەڵێنێت و گوتی:

ئەوانەی دەڵێن هەموویان بە قوربانی یەکێکی بەرەبەیان ببێت.

***

**هەی بەراز:**

پیاوێك دووژنی دەبێت. ئێوارە پێیان دەڵێت:

- ئەمن سبەی دەچمە شار چتان دەوێت؟.

یەکیان دەڵێت:

- پیاوەکە بە خۆت دەبینیت کراسم لە چەند جێیان دڕاوە و پینەم لێیان داوە کراسێکم بۆ بکڕە.

ئەوی تریش دەڵێت:

- ماوەیەکە چاوم دێشێت دەرمانی چاوم لۆ بینە.

ئەویش ئەوەندە پارەی نابێت. ئێ .. هـ بەڵکی دڵیان نەرم دەبێت شەو لەگەڵ هەردووکیان جووت دەبێت.

بۆ بەیانی:

یەکەمیان دەڵێت:

- پیاوەکە دەزانم پارەت نییە من ئەوساڵ بەو کراسە ڕادەبوێرم.

ئەویتر دەڵێت:

- وەللا چاوم چاك بووەتەوە و بەڵای نەماوە.

مێردەش دەڵێت:

- هەی بەراز هەی بەراز.

دەرمانی چاو پینەی کراس

***

# ناوەرۆك



دەشتی هەولێر و دەڤەری قەراج و کەندیناوەش پێوە، لە رووی کشتوکاڵی ومالاتداری و کەرستەی پەیداکردنی بژێوی ژیانی رۆژانە و کەلەپوورو داب و نەریت و هەڵس وکەوتەوە یەکجارزۆر دەوڵەمەندن وبە کتێبێک ودووان و سێیان بڕ ناشکێنن.

ئەمەی منیش دەربازم کردووە گەوزێکە لە تەبارەیەکی عەڵبە باوییەوە.

تەماخوازم لەلایەن خوێنەرانی ئازیزەوە بەهەندی بقرسێنن و نەیخەنە ژێر باڵتەی حەرەجەوە.